# کوردستان

## لە پەنجەرەی غوربەتەوە

محمد هەریری



بەشی یەکەم

کۆمەڵە وتارێکی
ڕەخنەیی و
سیاسی و
فیکری و
دینی و
مێژووییە

# دەوازەیەك

ئەو كتێبە كۆمەڵە وتارێکن لە نێوان ٢٠٠٦ ـ ٢٠١٥ کە لەسەر بابەتی جۆراوجۆر نوسراون، بەڵام ئەوەی كۆیان دەكاتەوە ئەوەیە لە دڵێکی پڕ لە حەسرەت و خۆشەویستی بۆ نیشتیمان و میللەتەکەی لە غوربەتەوە نوسراون.

خاوەنی ئەو وتارانە سات بە سات و سەعات دوای سەعات و ڕۆژ بە ڕۆژ چاودێری وەزعی كوردستان دەكات، بەجۆرێك زۆرجار هەست دەكات تەنها بە لاشە لە غوربەتە. زۆرجار برادەران و دۆستانم پێمدەڵێن تۆ ئێمە ئاگادار دەکەیتەوە لە بابەتگەلێك لە كوردستان ڕوودەدەن، هێشتا ئێمە پێمان نەزانیوە تۆ ڕای خۆت لەسەر دەدەیت!

هەر ئەوەش وایکردوە لە زۆر بواری گشتی ژیانی ئەو وڵاتە بێ ئاگا بم وەك بوارەكانی سیاسی و كۆمەڵایەتی و یاسایی و هونەری، وكەمترین قسەم هەبێت لە سەریان. نازانم هەڵەم لەوەدا یان ڕاست، بەڵام كارێكە بە دەستی خۆم نییە، كە دەبینم ئەو وڵاتەی من تیایدا دەژیم واپێشكەوتووە لە هەموو بوارەكانی ژیان، سەرەڕای دڵخۆشیم بەو وڵاتەی كە نزیكەی شازدە ساڵە باوەشی بۆ كردومەتەوە و مافی هاوڵاتی بوونی پێداوم و لە هیچ مافێك بێ بەشی نەكردووم و كەرامەتی مرۆیی پێ بەخشیوم، هەرچەندە وەك وڵاتی خۆم سەیری دەكەم، جونكە ئێمەی كورد وەك سەرنجم داوە كەمینەیەكی زۆر كەم نەبێت، قەد بەد نمەك نەبووین وەك میللەتانیتر بەرامبەر ئەو وڵاتە، بەڵام هەر پێمخۆشە هەموو هەوڵ و بیر و ئەزموونی نووسین وخوێندنەوە وژیانم بخەمە خزمەت گەلەكەم لە كوردستان، بەڵكو بتوانین بە وشەكانمان بخەینە گژ توندڕەوی و زەبربەدەستی وگەندەڵی سیاسی و دراوی و كۆمەڵایەتی و دینی.

هیوای خوێندنەوەیەكی بە سوودتان بۆ دەخوازم

## تەنها جوانی کورد وکوردستان لەبەردەم هەڕەشەیە!

میللەتانی دنیا لە پشبڕکێ دان بۆ پێشخستنی وڵاتەکانیان و زۆرکردنی ڕیزی جیهان بۆ خۆیان و زیادکردنی خاڵە پۆزەتیڤەکانیان. کاتێ کارەساتێك لە وڵاتانی خاوەن میللەتی زیندوو و رەوشت بەرز دەقەومێ، ئەو کاتە دەزانین ئەو میللەتانە مایەی ئێرەیی پێ بردنن. میللەتانی جیهانی دواکەوتووش زۆربەیان، ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو دواوە هەنگاو دەنێن، کەمینەیەك نەبێت کە لەو تەوقە دەرچوون، وەک کۆریا و مالیزیا و سەنگافورە وهیندستان. لە نێو ئەو میللەتە دواکەوتوانەش، میللەتە موسڵمانەکانی جیهانی ئیسلامی لە هەموویان زیاتر لە دواوەن، ئەوەی باشیش بوو کەمێك ئێستا بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە وەك تورکیا بۆ نمونە. ئەو ڤایرۆسەی توندڕەوی دینی سەلەفیەت، وەك شێرپەنجە لە هەموو جەستەی جیهانی ئیسلامی داوە، تا دێت ژیان لە خەڵك تاڵتر و قورستر وئاڵۆزتر و نا ئینسانیتر دەکات.

ئەو پاکستانەی کە خاوەن یەکەم بۆمبی ئەتۆمیە لە جیهانی ئیسلامیدا، ئێستا نیوەی زیاتری بودجەی دەچێتە شەڕی دژی تیرۆر، ئەو سوریایەی کە لەسەردەمی دیکتاتۆریەتی ئەسەد، سەرەڕای حوکمی پۆلیسیشی خەڵك ماڵ وگیانی و کاری سەلامەت بوو، ئەمڕۆ بە دەستی داعش و نوسرە و لە شکرەکانی ئیسلام و سونە و هتد، لە هەر شار وشارۆچکەیەك ڕژێمێکی زۆر ترسناکتر لە ئەسەد حوکمی دەکات، و دەکوژێت ودەبڕێت و بێ ئەوەی کەس بتوانێت موحاسەبەی کەس بکات، ویان هەقی خۆی داوا بکات. ئەو شەپۆڵە توندڕەوە سەلەفیە دینیە، وای لە خەڵکی جیهانی عەرەبی وئیسلامی کردوە، وەک سەردەمی زێڕین باسی ڕۆژگاری دیکتاتۆرە کۆنەکانیان بکەن. چونکە هەرنەبێت لەو سەردەمانە یاسا هەبوو، کار هەبوو، تایفیەت ومەزهەبیەت نەبوو، ئافرەت تا ڕادەیەکی زۆر باشتر لەو سەردەمەی پەتای سەلەفیەت ڕیزی زیاتر لێ گیرا بوو، نیمچە ئازاد بوو.

موسڵمانیەتی کورد وەك دیاردەیەکی ناوازەی لیهاتووە لە ناوچەکە. کورد لەناو ئەو میللەتە موسڵمانانەی خۆر هەڵات لە کۆنەوە هێندە موسڵمانێکی میانرەو بوو، ببوە مایەی توانج و تەشەری میللەتە موسڵمانە توندئاژۆکان، ئەوەتە لەناو تورك باوە کە کورد تەنها بە بەروارد لەگەڵ کافراندا موسڵمانە !ئەوەش مانای دیارە کە کوردیان پێ موسڵمانی باش نەبووە! پێش ماوەیەك ژنێکی ئیسلامی سوونەی عەرەبیش بە ناسیاوێکی ئێمەی گوتبوو، دەزانم ئێوەی کورد هێندە موسڵمان نین و هەر پێستی سەرەوەتان موسڵمانە! هەرچەندە ئەو ژنە زۆربەی خزم وکەسانی لە دەسەت توندرەوی برا موسڵمانەکانی ڕایان کردۆتە کوردستان، کە لای ئەو موسڵمانی باش نین!

لە بیرمە لە تەلەفزیۆنێکی عەرەبی قسەم دەکرد لەسەر ئەو کارەساتە گەورانەی ئەحزابی دینی شیعی بەسەر خودی خەڵکی شیعە و عێراقی هێناوە، لەو هەموو بڵاوکردنەوەیەی نەفامی ونەزانی دینی، و گەندەڵیە و دزی و تاڵانیەی کە دەیکەن، ئەوەی بەرامبەرم مەلایەکی شیعە بوو گووتی: تۆ ڕەخنە لە ئیسلام دەگریت، نەك حزبە ئیسلامیەکان، کەمێك ئاوڕدەنەوە لە ئیسلامەکەتان، ئێوەی کورد هەر بەناو ئیسلامن! یانی نە سونەی تورك وعەرەب، نە شیعەی فارس و عەرەب ڕازی نین لە دینداری کورد!

بێگومان ئەوە لای من مایەی خۆشیە، کە ئەو میللەتە توندئاژۆیانە لە لایەنی دینیەوە، ڕایان لە کورد نەبێت، چونکە ئەوە دەیسەلمێنێت کە کورد بەڕاستی ڕێچکەیەکی تایبەتی هەیە لە دینداریدا، کە پێویستە جەختی لەسەر بکرێتەوە، و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەردا بکرێت، و تیۆریزەی بۆ بکرێت. لە سایەی ئەو شێوازە کوردانەی دینداریدا، کۆمەڵگای کوردی کەمترین شەڕی دینی وتایفی تێدا ڕوویداوە، و لە کاتێکدا گەلانی موسڵمانی خۆرهەڵات پڕاوپڕن لە حیقدی مەزهەبی ودینی، موسڵمانی کورد، جگە لە سەلەفیەکان، هیچ ئاوڕێکی جیدی لەو پرسە هەستیارە دینیانە ناداتەوە.

ئەو ڕوحیەتە دینیە کوردانەیە، بە داخەوە لە ژێر هەڕەشەی توندڕەوان و پیلانگێڕی حزبەکانی ناوخۆ و وڵاتانی ئیقلیمی، خەریکە بەرەو قەڵاچۆکردن دەچێت. لە جێگای ئەو میللەتێکی سەلەفی توندڕەو مچومۆڕ دروست بکەن، کە هەموو ئاواتی ئەوە بێت بە شەهیدی بمرێت، نەك بە مرۆیی بژێت!

لە سایەی ئەو ڕوحیەتەیە کە سەدان هەزار و ملیۆنەها عەرەبی ئاوارە، و مەسیحی و خەڵکیتر وا بە ئاسوودەیی دەژین لە کوردستان، خەریکە ئەوان ببنە ساحێب ماڵ، و کورد مێوان!

لە سایەی ئەو ڕوحیەتی دیندارە کوردیەیە کە دینداران هەست بە هیچ بەریەک کەوتنێك ناکەن لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی عەلمانی دیموکراتی، هەرچەندە بەداخەوە ئەو دەسەڵاتە دورترین دەسەڵاتە لە مانای هەقیقی عەلمانیەتی دیموکراتی، خەریکە گەندەڵی سیاسی و دارایی گەنجانمان پاڵ دەنێت بەرەو باوەشی توندڕەوی دینی. ئەو دەسەڵاتە کە بەس پێستی سەرەوەی عەلمانی و دیموکراسیە –وەك موسڵمانێتی کورد لە ڕوانگەی غەیرەکان- ئینجا توانی بەو پێستە تەنکەی دیموکراتیەوە پشتیوانی هەموو دنیای خۆرئاوا بەدەست بێنێت لە شەڕی دژی تیرۆری داعش، و ئەمریکا و ئەوروپا بۆ یارمەتی دانی کوردستانی باشوور بەو گەرم وگوڕیەوە بێنە پێش، لێرە پرسیارەك بەرۆکمان دەگرێت: ئایە ئەگەر کوردیش وەك نەتەوەکانی عەرەب و تورك [تا ڕادەیەك] و نەتەوە ئیسلامیەکانی تری جیهانی ئیسلام

بکەوتبایە ژێر هەژموون و دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسی سەلەفی ئێستا حاڵی کورد چۆن دەبوو؟

لە بیرمە چۆن سەدان گەنجی ئیسلامی خەونیان بە دیتنی عبدالله عزام ی باوکی ڕوحی ئوسامە بن لادن وە دەدیت، چۆن ئەو موجاهیدانەی ئەفغان ببونە قارەمانی گۆرەپانی ئیسلامی هەزار ئەفسانە و موعجیزاتیان دەدایە پاڵیان، ئەگەر ئەو حاڵەتە ئیسلامیە یان وەك ناوان دەنا بە ڕابوونی ئیسلامی، ببوایەتە حاڵەتێکی گشتی و جڵەوی دەسەڵاتی بە دەست گرتبا لە کوردستان، چی ڕووی دەدا؟

جارێ گومانم نیە کە باڵەکانی ناو حزب و بزوتنەوە ئیسلامیەکان وەك حزب و بزوتنەوە ئیسلامیەکانی ئەفغان دەکەوتنە شەڕ و بە موشەکەکانی حیکمەتیار یەکتریان قڕ دەکرد. ئینجا کورد چەندە بەدبەختە بەدبەختتر دەبوو، سەرەڕای پشێویی ناوخۆیی، نەبوونی هێز وپشتیوانیەکی دەرەکیش دەبووە سەربار، وئەگەر هێزیکی دەرەکی وەك داعش یان تورکیا هێرشی کردبایە سەر کوردستانی ئیسلامی، خۆر ئاوا فەرامۆشی دەکرد، وەک چۆن گەلانی سوریایان فەرامۆش کرد لە ترسی بەهێزبوونی ئیسلامی سیاسی سەلەفی توندڕەو، وەك هێزێکی نەیار بە خۆرئاوادا .ئەوکاتە داعش یش هێرشی کردبایە سەر کودستان، خۆرئاوا و جیهان گوێیان پێنەدەدا، خوای دەکرد هەموو کوردیشیان قڕ دەکرد! چونکە داعش و هاوشێوەکانی تەنها دژی شیعە و عەلمانی و لیبراڵەکان نین، بەڵکو دژی ئیسلامیە میانڕەوەکانیشن تا سەر ئێسقان، بەڵکو بیانوو لە دژی توندڕەوەکانی وەك خۆشیان دەدۆزنەوە، وەك دەبینین لە سوریا دژی بەرەی نوسرەش دەجەنگێن، کە بەس بە تەنها لە ناو لێك جیان! داعش دژی سوپای ئازاد و چەندین گروهی ئیسلامیشن و بە دەیان وسەدانیان لێ دەکوژن وسەردەبڕن.

بەڕای من کورد لە سایەی ئەو تێروانینە نادۆستانەی میللەتانی موسلمان، و ئەو قەسوەتەی جیهانی ئیسلامی و بێ پشتیوانیەتەی، پێویستە زیاتر جەخت لەسەر بەهاکانی دیموکراتیەت و عەلمانیەت و مەدەنی بوون بکاتەوە، تا بکرێت دوور کەوێتەوە لە ئیسلامی سیاسی ماڵ کاوڵکەر، چونکە پڕۆژەیەکی فاشیلە وەک خۆکوژی وایە. کورد زۆر بێ کەسە و زۆریش پێویستی بە پاڵپشتی جیهانی مۆدرن و خۆرئاوا هەیە .

لەوانەیە ئەگەر پڕۆژەی توندڕەوانی ئیسلامیە سەلەفیەکانی کورد سەر بکەوێت، گەنجانی میللەتەکەمان هەمووی ببنە ڕیشداری توندڕەو و خالی لە عەقڵ و مەدەنیەت و هەتا لە بزەش، و کچانمان ببنە عەبا و نیقاب وپەچەپۆش، ئەو کاتە تورك وعەرەب و عەجەمیش ئێمەیان پێ موسڵمانی باش دەبێت.

ئەگەر شیعە و مەسیحی و کاکەیی و ئێزدی بە چاوی دوژمنداری سەیرکران لە

کوردستان، ئەو کاتە کورد دەبێتە موسڵمانی باش!

ئەگەر هەموو جۆرە تەرفیهێکی خێزانی و فەرهەنگی لە سینەما و شانۆ و گۆرانی قەدەغە کرا، ئەو کاتە تورك و عەرەب و ئێرانی لێمان رازی دەبن.

پێموایە تاکە سەروەتی مەعنەوی کورد لەو ناوچەیە بریتیە لەو روحە میانرەوەی دیندار و ئینسان دۆستەی بە گشتی، خەڵکی کوردستان و حزبە دەسەڵاتدارەکانیش لەبەری ئەو ڕوحە میانرەوەی کورد دەخۆن، هەر هاریکاریەك بە دژی ئەو ئاڕاستەیە و یارمەتی دانی بڵاوبوونەوەی ڕوحیەتی گرژی توندڕەوی سەلەفیەت خیانەتە بە کورد و بە مێژوو، سەرەڕای ئەوەی بەو یارمەتیەی دەسەڵات تاقە جوانی کورد دەکوژێت، قەبری خۆشی هەڵدەکەنێت ئەگەر کەمێك دوور بینانە سەیری بکەن !

٢٠١٥/٨/١٧

## عەلی قەرەداغی ئیخوان و میر تحسینی ئێزیدیان چی هاوبەشە لە نیوانیاندا؟!!!

ئیمرو ڤیدیویەکی میر تحسین بەگی یەزیدیمان بلاوکردەوە کە لای کەنالە عەرەبیەکان دەلیت ئێزیدی کورد نین، هەر لە کومینتەکاندا کاك جوتیار ڤیدیویەکی داناوە هەمان میر تحسینی یەزیدی دەلیت ئیمە کوردین خو نکولی لە کوردبوونی خومان ناکەین! وا دەزانیت ئیمە عربي نازانین!؟؟
شێخ عەلی قەرەداغی یش کە ئەمینداری گشتی یەکیتی زانایانی ئیسلامیە، کە لە کۆر وکوبونەوەکان،

ئەوە هیچ یەك ئەسەری کوردبوونی پیوە دیار نییە، بە عەبا کەش وفشە خەلیجیەکان، بەلام لە بەیانات و دروشم و بریارەکانی یەکیتیەکە هیچ کاریگەریەکی سەرۆکە کوردەکەی یەکیتیەکەی پیوە دیار نییە، لە دوا کوبوونەوەی یەکێتیەکە لە بیانی خیتامیان باسی روداوی کوشتنی چەند سونەیەکی عەرەبیان کودبوو لە مزگەوتیکی سونە، بەلام باسی ئەو هیرشە درندانە گەورەیەی داعش نەکرابوو بو سەر کوردستان وەك بلیی روداوی مزگەوتەکە گەورەتر بیت لە شەریکی هەزار کیلومەتری سنوردا!!!! من خوم لە یەکیك لە کونگرەی ئیسلامیانی عەرەب و کورد بەژداربووم دەمدیت قەرەداغی چەندە انبطاحی و لەسەر چوك کەوتوو بوو بو قیاداتی ئیخوانی میسری و سوری وعیراقي!!! کەچی کە علي قەرەداغی کە دەگەریتەوە کوردستان هەر لەناو فروکەکەی جلە کوردیە رەسەنەکانی لەبەر دەکات و کونگرە وکۆڕ و سیمنارمان بو دەبەستیت شای کوردایەتی یش بە سەپانی خوی نازانیت!!! ئەویش وەك میر تحسین وادەزانیت کورد عربي نازانیت!! ئەو کوردایەتیە لە کۆڕ وکوبونەوە کانی یەکیتی زانایانی قطر و قرضاوي بکە، ئیمە بە شەهید دانانی پیشمەرگەیی تومان لە کوردستان بۆچیە، لە کاتیکدا دنیای ئیسلام بە کافرمان دەزانیت لەبەر شەرکردن لەگەل داعش؟!! ئیمە لە جیاتی کوردستان دەمانەویت لە دوحە و اسطنبول بە یەك وشە ستایشی رولی شەرعی قارەمانانەی پیشمەرگە بکەن هەرنەبیت خەلکی گەلحۆی جیهانی ئیسلام بە کافرمان نەزانن!!! ئیمە کوردایەتی تۆمان بو چییە لە هەولیر وسلیمانی وکەنالە کوردیەکان کە وەك ئاو فروشتنە لە کولانی ئاوفروشان؟!!!!

٢٠١٤/١٠/١٩

## قەرەداغی پیاوە ناسک و پڕ لە نازونیعەمەتەکەی ئیخوانی جیهانی داوای سەربڕینی مەزنی جووەکان دەکات لە پیناو گەڕانەوەی قودس و ئەقسا!

ئەخر بۆیە مرۆڤ ناتوانیت باوەر بە ئاشتیخوازی ئەو ئیخوانە بکات، دەبێت هەردەم چاوەڕێی توندوتیژی لیبکەیت لە هەر دەرفەتێکی گونجاودا! ئێمە وا پێشبینیمان دەکرد ئیخوان داوا لە ڕاپەڕینی چەقۆکانی فەلەستین بکات بەو شێوەیە نامرۆییە پڕ نەدەنە پیر منداڵ وژن و مەدەنی لەسەر شەقامەکان، چونکە ئەوەی ئەو عەرەبە فەلەستینیانە دەیکەن هەر چی بێت نەخەباتە و نە جیهاد، تەنها تیرۆرێکی رووتی نائینسانیە لەوانەیە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی هەموو تەعاتوفی جیهانیش لەگەڵ دۆزی فەلەستین، کەچی مەلا زۆر کوردەکە بە پۆشاکیکی عەرەبی فەتوای سەربڕینی مەزن دەدات! چی دەمێنێتەوە بۆ میانرەوی؟!
من تێناگەم ئەو پیاوە بۆ باسی بایەخ وگرنگی و پیرۆزی ئامەد ناکات و بۆ باسی قوربانیدان ناکات بۆ خاکی پیرۆزی کوردستان لە باکوور و ڕۆژهەلات وڕۆژئاوا!؟ ئەوەیە ئەو جۆرە ئیسلامەی لە خزمەتی عروبەتدایە. دەبێت جلی ئەوان لەبەر کەیت و سەروڕیش وهەیئەتی ئەوان هەڵگریت، بەزمانی ئەوان بدوێیت و خاکە پیرۆزەکانی ئەوان تەقدیس بکەیت، ومنداڵت هاندەی فێری زمانی ئەوان بن، وکێسەکانی ئەوان پلە یەك بن تا ببیتە موسڵمانێکی باش! ئیسلامیبوون وەک ئاوی ناو جۆگەیەکە لە هەورازدا هەرد دەبێت بەرەو لیژایی عروبەت دابەزێت!

محەمەد هەریری

٢٠١٥/١٠/١٩

# چەواشەکاریەکی تری عەلی قەرەداغی ئەردۆگانی ئیخوانی

لەسەر پۆستێك کە چەندوێنەی قوربانیانی کۆچی بەسەرەوەیەنووسیتی:
هێشتا دەریا لاشەی منالانی بێ گوناح دەردەدات،کە ڕایان کردوە لە بەرمیلە باڕووتی بەشار، بە هیوای ژیانێکی باشتر بەڵام لەسەر کەناری ملشۆڕی عەرەبی مردن!!
قەرەداغی وەك ئیخوانیەك وحزبیەکوشەکانی بە تەرازووی ورد دادەنێت، ئەوە هیچ باسی منالە کوردەکە ناکات کە هەموو دنیایهەژاند نەوەك بە کوردینی بۆی حیساب بکەن! دوایی داعش و ئەردۆگان فەرامۆش دەکات وەکهۆیەکی سەرەکی کۆچی سەدان هەزار کۆچبەر.
دەبینن چەند خاتری داعش و ئەردۆگان ی دەوێت؟ !
ئەو پیاوە وەکهینەکەی بافلۆف دەبێت بەبیری بهێنیەوە کە کوردە، وەك دیتان بەر لە ماوەیەك پۆستێکی کردبوو بۆ تەقاندنەوەی مزگەوتێکی کوێت لە و ڕۆژانەی کە داعش دزەیان کردە ناو کۆبانێ دوو سەد کەسێکیان کوشت، کە ڕەخنەمان. لێگرت یەکسەر پۆستەکەی دەستکاری کرد و بەبیری هاتەوە کوردە. بەخوا نەوشێروان ئەگەر لە حەیاتی کارێکی باشینەکردبێت لەوە باشی کرد کە ئیهمالی کرد.

محەمەد هەریری

٢٠١٥/٩/٦

## مافی سۆزانی کرداری ئەردۆگان و مافی گەی تیۆری دەمیرتاش!

### محەمەد هەریری

ئەردۆگانیەکان دەیانەوێت لێدوانێکی سەلاحەدین دەمیرتاش وەبەرهێنن کە باسی پیدانی مافی هاوڕەگەزبازەکانی کردوە! لەڕاستیدا من ئەو جۆرە لێدوانانەم لەو کاتانەدا کە ڕکابەرەکەت هەموو چەکێکی مەشروع و نامەشروع بەکار دەهێنێت، و لە نێوانیاندا چەکی ئایین، کە لە ناو کوردا زۆر کاریگەرە، و چەندین سەدەیە کورد قوربانی هەستی ئایینی پاکی ساویلکەی خۆیەتی، پێ باش نییە. ماقوڵ نییە ڕکابەرەکەت، ئەردۆگان کە بە حیساب سەرۆکە، و دەبێت یەکسان بروانیتە هەموو هێزە سیاسیەکان و ڕیکلامی سیاسی بۆ کەس نەکات، ئەمڕۆ شار بە شار و شارۆچکە بە شارۆچکە دەگەڕێت بە خۆیی و نوسخەیەك لە قورئانی بە کوردی چاپکراوەوە بۆ فریودانی کوردی موسڵمان، ئەتۆش باڵ بدەیت بەسەر هەموو ئەو هەقیقەتانەی کۆمەڵگای کوردی، بە قەد دوژمنیشت تێی نەگەیت، بچیت باسی مافی گەیەکان بکەیت! ڕاستە ئەگەر واشی گووتبێت، ئەوە موخاتەبەی عەقڵیەتی ئەوروپی دەکات، ئەو عەقڵیەتەی کە ئەردۆگانیش مخاتەبەی کرد بەدانی هەموو مافەکان، هەتا مافی زیناکردنی ئاشکرا لە جامخانەکانی سۆزانیەت لە تورکیا! ئەردۆگان بە کرداری مافی هەموو سۆزانی و سۆزانیخانەکانی تورکیا دەدات، کەچی ناچێت باسی ئەوە بکات، و لە جیاتی ئەوە قورئانێك بەرزدەکاتەوە بۆ فریودانی خەڵك، تۆش جارێ متمانەی نیوەی کۆمەڵگای کوردیت بەدەست نەهێناوە، دەچیت باسی مافی گەیەکان دەکەیت، کە هێشتا لە زۆر وڵاتانی دنیای پێشکەوتوو جێگای مشتومڕە! پیشەسازی سێکسی سۆزانیەکان لە تورکیا هێندە بەرهەمدارە بۆ خەزینەی ئەردۆگان لە ملیارات دۆلار تێ دەپەڕێت. بۆ بۆ ئەردۆگانێکی بەناو ئیسلامی ئاساییە مافی سۆزانیەکان بدات ونەوێرێت سۆزانیخانەیەك دابخات، کەچی هەزارەهای وەك عەلی قەرەداغی و قەرەزاوی بەرگری لێ دەکەن، وەك سوڵتانێکی ئیسلامی عوسمانی سەیری دەکەن، کەچی ئەگەر دەمیرتاشێکی سێکیولار باسی هەمان ئەو مافانە بکات کە ئەردۆگان بە کرداری داویەتی ڕەوا نەبێت؟ بەپێی ژوری بازرگانی ئەنقەرە ئاماری ٢٠٠٤
١٠٠٠٠٠ سەد هەزار سۆزانی لە کارە لە تورکیا
٣٠٠٠ سێ هەزار لە ماڵی سۆزانیخانە تۆمارکراون.

١٥٠٠٠پازدە هەزار لای پۆلیس تۆمارکراون
٣٠٠٠٠ سی هەزار ئافرەت چاوەڕێی وەرگرتنی مۆڵەتی کاری سۆزانین!
داهاتی ساڵانەیان ٣ ــ ٤ ملیار دۆلارە!

٢٠١٥/٥/١٦

# خوێندنەوەیەکی کوردی بۆ کێشەی فەلەستین و ئیسڕائیل

### پیلانی سێنترالیزمکردنی کێشەی فەلەستین

### هەڵوێستی پڕ میهرەبانانەی تورک

ئەگەر باوەڕم بە تیۆری پیلانگێڕیش نەبێت لە لێکدانەوەی ڕوداوەکان، ئەوە باوەڕم بە پیلانی سێنترالیزمکردنی کێشەی فەلەستین هەیە لەسەر حیسابی هەموو کێشەکانی تر، ڕاستە دۆزی گەلی فەلەستین دۆزێکی گەورە وترسناکە، بەڵام تەنها تەرکیزکردن لەسەری خۆی لە خۆیدا پیلانێکە بۆ فەرامۆشکردنی هەموو کێشە گەورە وترسناکەکانی تری جیهانی ئیسلامی وعەرەبی. زۆربەی جیهان کەوتونەتە داوی ئەو پیلانە بە ڕادەیەک هێندە گەرم وگوڕی وحەماسەت لە شەقامی ئەوروپی وجیهانی دەنوێنرێت بەرامبەر کێشەی فەلەستین وەک بڵێی بە چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی جیهان چارەسەر دەکرێت! سەیر نیە فەنزەوێلییەکان وکوریاییەکان وولاتانی ئەمریکای لاتینینی وئەو ولاتانەی کە گوێت لەناویشیان نەبوە خۆپیشاندان بۆ فەلەستین بکەن؟! تاوانەکانی ئیسرائیل گەورەیە بەڵام ئایە لەو تاوانانە گەورەتر ناکرێت لەناو خودی جیهانی عەرەبی وئیسلامی دژی گەلانێک بەدبەخت ونەگبەت ترن لە گەلی فەلەستین؟! ئایە ئەگەر ئەو کامێرانەی ڕوداوە ورد ودرشتەکانی غەزە دەگوازنەوە لەسەر کارەساتەکانی کوردستان بە هەرچوارپەرچەکانی وکەشمیر وبەلوچەکانی ئێران و دارفۆریەکانی سودان بوەستابا وبەهەمان گەرموگوڕی وبەردەوامی ئەوە جیهان تەنها بە کێشەی فەلەستین غەمبار دەبوو؟! خودی کوردیش لەگەڵ قوڕبەسەری خۆی کێشەی فەلەستینی لێبۆتە تەنها کێشە، بە بەڵگەی لەو ماوەیەدا زۆر کوردم دیوە پارە کۆدەکەنەوە بۆ کێشەی فەلەستین. گروپ وحیزبە ئیسلامیەکان ڕۆڵی هەرە سەرەکیان بینیوە لە سێنترالیزمکردنی کێشەی فەلەستین وفەرامۆشکردنی هەموو کێشەکانی تر، کە لەناو گەرمەی کارەساتەکاندا دەنگیان نابیسترێت وەک ئێستا کە دەنگیان نوساوە، یان چەند لێدوانێکی شەرمنانە دەدەن کە نەتینویی پێیان دەشکآ ونە دەرەقەتی برسێتی دێن.

هەڵوێستی تورکەکان لەمەر کێشەی غەزە، کە لە بنچینەدا هەڵوێستی حزبی داد وگەشەپێدان وحزبە ئیسلامیەکانی ترە، ئەو نوکتە خۆشەی عەزیز نەسینم بەبیر دەهێنێتەوە کە لە ڕۆمانێکی باسی پیاوێکی هەژاری موسڵمانی تورک دەکات کە پێویستی بە یارمەتیە کەس یارمەتی نادا بەڵام بە دوای کەمێک گۆڕان لە سەروسیمای، وا لە خەڵک دەگەیەنێت کە ئەو پیاوێکی ئەڵمانییە بۆتە موسڵمان، ئەوجارەیان هەموو خەڵکی شوێنەکە بە لێشاو یارمەتی دەدەن، چونکە ئەڵمانیە وخوا هیدایەتی داوە، بەڵام هەژارە تورکەکە کێشە نیە، ئەو تازە موسڵمانە خوای دەکرد گومڕا دەبوو چ زۆرە موسڵمان زۆرە (فمن شاء فلیؤمن ومن شاء فلیکفر!(

ئەوە نزیکەی یەک سەدەیە ئەو تورکانە بە دڕندانەترین شێوە کورد دەچەوسێننەوە وقەڵاچۆی ناسنامەی مێژوویی وکلتوری وجوگرافی وئیتنیکی یان دەکەن بە هەموو شێوەیەک هەتا بە هاوپەیمانی کردن لەگەڵ خودی ئەهریمەنیش. یەک سەدەیە بە هەموو جۆرێک هەوڵ دەدەن ناوی کورد نەهێنرێت هەتا لە دەرەوەی تورکیاش، بەڵکو دەوڵەتی تورک بۆتە لایەن لە کێشەی هەر وڵاتێکی کوردی تێدا بێت، چاکترین نمونەش عێراقە کە چۆن بە دزی وبە ئاشکرا تورکیا هانی بەرپرسە عێراقیەکان دەدا وفوو لە گیانی شوفێنیەتیان دەکات بۆ تێکدانی بارەکە وکەمکردنەوەی دەسکەوتەکانی کورد.

ئەو هەموو خۆپیشاندانە ملیۆنییەی تورکەکان شتێکی بە مانا دەبوو ئەگەر بە هەمان شێوە هەستیان بۆ وەتەن داشەکانی (هاونیشتیمانەکانی) خۆیان ببزواندبا، مانای دەبوو ئەگەر ڕۆژێک خۆپیشاندان کرابا لە دژی قەدەغەکردنی زمانی میللەتێک کە خوا وەک هەر زمانێکی تر ڕیزی لێناوە (ومن ایاته خلق السماوات والارچ واختلاف السنتکم والوانکم)، ئەو خۆپیشاندانانە ئەو کاتە مانای دەبوو کە موسڵمانە تورکە غەیورەکان لەسەر ئیسلام دەیانوت بۆچی هەزاران گوند ودێهاتی کورد وێران دەکەن بە بیانووی پرۆژەی گاپ وکە لە ئاکامدا زیاتر لە ملێۆنێک ئاوارە کران بۆ شارە دەوارە شڕەکانی دەوروبەری شارە گەورەکان وەک ئیستانبۆل، بە سەدان هەزار خێزان لێک هەڵوەشاوە، وسەدان هەزار گەنج لە کوڕ ولە کچ بەرەو جیهانی بێکاری وتاوان ولەشفرۆشی پاڵیان پێوەنرا، وسەدان کارەساتی تری لێکەوتەوە. کەچی کەس لەو جەماوەرە غەیورە لەسەر موسڵمانان مێشێکیشی لێ میوان نەبوو.

ئه‌گه‌ر جه‌ماوه‌ری تورک خۆپیشاندانی ملیۆنی ده‌که‌ن بۆ موسڵمانانی غه‌زه‌، ده‌با رۆژێکیش خۆپیشاندانێکی چه‌ند هه‌زارکه‌سیان کردبا بۆ برای دینی ونیشتیمانی خۆیان ئه‌ی قورئان نافه‌رمویێت: (الاقربون اولی بالمعروف)؟! یان ئه‌وان موسڵمانی خۆمانه‌ ولۆکالن گرنگ نیین وه‌ک موسڵمانه‌ تورکه‌که‌ی عه‌زیز نه‌سین، وزیاتر له‌ پازده‌ ملیۆنیان هه‌یه‌، هیچ گرنگ نییه‌ با دوو سآ ملیۆنیشیان لێ قڕ بکرێت، یان هه‌ڵگه‌ڕێنه‌وه‌ له‌ ئیسلام، گرنگ ئه‌وه‌یه‌ موسڵمانه‌ بێگانه‌که‌ (یان موسڵمانه‌ ئه‌ڵمانیه‌که‌ی عه‌زیز نه‌سین) باوه‌ڕی نه‌له‌قآ ووانه‌زانێ ئێوه‌ی موسڵمانی تورک هه‌موتان له‌ پشتیانه‌وه‌ نین. ئه‌وه‌یه‌ شازی موسڵمانه‌تی!.

ئه‌م وتاره‌ له‌ گۆشه‌ی [ورشه‌ی بیر] له‌ ڕۆژنامه‌ی ستاندارد بڵاوبۆته‌وه‌ له‌ ٢٠٠٩/١/١٠

# غەزە و وتارێکی چەواشەکارانەی ئیسلامیەکان

محەمەد هەریری

بەڕاستی وتارێکی چەواشەکارانەیە ئەمڕۆ ئیسلامیەکانی کورد پەیڕەوی دەکەن سەبارەت بەو بار و دۆخەی کەرتی غەزە وئیسرائیل. دەیانەوێت سەرەڕای ئەو هەموو ترسناکیەی لە نێو ماڵی کورددایە زوومی بیرودەروونی کورد هەمووی بخرێتە سەر شەڕە دێرین ونوێکەی حەماس و ئیسرائیل، و خەمسارد بین بەرامبەر ئەو هەموو مەترسیانەی لەسەر کوردە لە عێراق، کە ئەمڕۆ کوردستان بۆتە هاوسێی دەوڵەتی خیلافەتی داعش، کە فاشسترین هاوسێی کوردە لەوەتی کوردستان هەیە، و لەوانەیە هەزاران لایەنگری داعشی لەناومان هەبێت! کوردستانێك پڕیەتی لە ئاوارە و عەرەبی بێ کۆنترۆڵ کە بۆی هەیە لە ساتێکی تەنگاویدا گەورەترین مەترسی لەسەر ئەمن وئاسایشی نەتەوەیی دروست بکەن، کوردستانێك بە ئاشکرا دوولەت بووە لەسەر کێشەکانی دوای داگیرکردنی موسڵ وناکۆك لەسەر مادەی ١٤٠ و چۆنیەتی رەفتارکردن لەگەڵ داعش و حکومەتی عێراق، وپرسی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار وبێ مووچەیی ودەیان وسەدان کێشەی تر.

ئەو برادەرە ئیسلامیانە پێیان وایە کورد زۆر موقەسیرە بەرامبەر خەمخواردن بۆ غەزە و گریان وفیغان وشین بۆ کردن!! لەوەتی من و دەیان نەوەش پێشە من ودوای منیش بەخۆمان زانیوە هەمووومان خەمی قورس وفرمێسکی سوێرمان بۆ فەلەستین ڕژاندوە لە بەرامبەر هێزی جەرگبڕی ئیسراائیل، کە زۆر بێ ڕەحمانە دەیان کوتێت، هەرچەندە ئیسرائیل یش فەلسەفەی خۆی هەیە لەوەدا، ودەزانێت چ کەراهیەتێك دروستکراوە لەناو عەرەب وموسڵمانان لە دژیدا، بەجۆرێك هیچ بوارێکی بۆ پێکەوەژیان نەهێشتۆتەوە، وهاوکێشەکەی کردۆتە یان دەبێت یان نابیت!

پاش سزادانی مەلایەك لەسەر وتاردانی بێ مۆڵەت، کە دەکرا تێپەڕێت ئەگەر خەڵك سکاڵای لە دەست نەکردبا ، لەبەر دوعاکردن بۆ حەماس و موجاهیدانی سوریا و دەیان وڵاتیتیر وفەرامۆشکردنی دوعایەکی خێر بۆ پێشمەرگەی کوردستان، کە دەیان شەهیدیان داوە لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ داعشدا، وئەوانەی لەسەر سنوور لەژێر پلەی ٥٠ سەدی بەرگری لەو ژیانەی کوردستان دەکەن، کە لە چاو بەشەکانی تری عێراق هەر بەهەشتێکە بۆ خۆی، پاش ئەو سزادانە سوکەی بەرامبەر ئەو بێ شعوریەی کە خەڵکی مزگەوتەکەش پێییان قبوڵ نەکراو وسکاڵایان لەدژی کرد، دەیان نوسەر ولایەنگری ئیسلامی قسەی زۆر سارد وسڕ بە خەڵکی کورد و بەرپرسەکانی دەڵێن گوایە هەستیکی برایانەیان نیە بەرامبەر برایانی حەماس، باس لەو بێ شعوریە و بێ بەهاییەی ئەو مەلایە ناکەن کە لەسەر خێر وبێری ئەو وڵاتە

دەژیت وەك وەفایەك دوعایەکی خێریش بۆ ئەو برا پێشمەرگانە بکات، کە من دەزانم کە نەشیکردوە زۆر ڕێی تێدەچێت هەر داعشێکی خەوتوو بێت و پێشمەرگە بە کافر بزانێت، چونکە داعش فکرێکی زۆر هەن لەناو مەلاکاندا، کە بەو چاوە لە کۆی ئەزموونی کوردی دەڕوانن.

دەیانەوێت لەو بێ مووچەییەی خەڵک هەموو کورد خەریکی پارە وکۆمەك کۆکردنەوە بێت بۆ غەزەیەك هەتا مەسیحیەکانی دنیاش پشتگیریان لیدەکەن وکۆمەکیان بۆ کۆدەکەنەوە.
بەڕای من ئەوەی دڵی ئازاری نەدا لەبەرامبەر دیمەنی ئەو هەموو خوێن وکوژراوانە دەبێت گومان لە مرۆڤایەتی خۆشی بکات، بەڵام کێشەکە لەوەدایە حەماس تەنها ئەو چیرۆکە دووبارەیە دەزانێت وهیچ لە شێوازی خەباتی خۆی ناگۆڕێت. ئەویش لەناو غەزەدا کە یەکێکە لە قەرەباڵغترین زەوی دنیا و ناوچەکەیە لەسەر ٣٦٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە دوو ملیۆن کەس زیاتری لێ دەژێت وبە ڕێژەی ٢٦٤٠٠ کەس لەسەر یەک کیلۆمەتری چوارگۆشە، لەو شوێنە قەرەباڵغە چەند ڕۆکێتێك بە ئیسرائیل وەدەنێ، ولە وەڵامیشدا ئیسرائیل بە وردترین تەکنۆلۆژیا و بە گۆترەش رۆکێتەکانی باوێ قوربانی زۆری لێ دەکەوێتەوە، لەبەر چڕی دانیشتوان، بەڵام دەبێت یەکێك بپرسێت ئایە حەماس کە دەزانێت ڕۆکێتەکانی هێندە ورد و پێشکەوتوو نین هیچ حیسابێك بۆ مەدەنیەکانی ئیسرائیل دەکات؟! وەڵام نەخێر، چونکە هەموو کۆمەڵگای ئیسرائیل ئامانجی سەربازیە لە گۆشەنیگای حەماس وهەموو ئیسلامیە جیهادیەکان وموفتی سەتەلایتەکان بە قەرەزاویشەوە! کەوابوو کە حەماس ئەمڕۆ مەدەنیەکانی ئیسرائیل ناکوژێت لە مرۆیی و ئینسانیەتی خۆی نیە، بەڵکو لەبەر جیاوازی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیایە، دەنا من گومانم نیە ئەگەر عەرەب بە گشتی وئیسلامیەکانیان بە تایبەتی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی لەدەست ئەواندابا ئێستا قەسابخانەی جولەکە بەڕێوە بوو لە هەموو لایەك، و گومان دەبەم ئێستا یەك جولەکەش بە زیندوویی بمێنێت، کەوابوو ئیسرائیل بەو تەرسانە گەورەی چەکە کۆکوژەکانی هێشتا لە چاو عەرەب بە بەزەییترە کە غەزە لەسەر نەخشە ناسڕێتەوە، چونکە عەرەب لەو هەڵوێستە با دەیکرد ومن یەك تۆزقاڵ گومانم نیە.
کە هێزی وا بەکار دەهێنێت، ئیسرائیل دەزانێت لەگەڵ چ دوژمنێك هەڵسوکەوت دەکات، خۆ کوردی ساویلکە نیە دوژمنی خۆی نەناسێت، وچاکیان دەناسێت ودەزانێت کە نایکەن هەر ئەوەندەیان پێ دەکرێت!
یەك لەو ئیسلامیانە بە ناوی ئیکرام کەریم چاوەڕێی ئەوە دەکات خوا سزای هەموو میللەتی کورد بدات لەبەر ئەوەی بەرپرسەکانی وەك دەڵێت:
"زۆر ئەترسم-خوانەکردە- کورد ئاوارەییەکی گەورەی بەسەردابیت لەبەرئەوەی کەسانێك لەپلەی بەرپرسیاریتیدان و بەزەییان ناجولی بۆ ئەو هەمووە منال و ژن و مەدەنیە لەتوکوتکراوەی غەززە.ئەو کاتە ئێمە گلەیی لەکی بکەین کە دلی بۆمان نەسووتیت؟"

من داوا لە كاك ئیكرام وهەموو ئەوانەی وا بیر دەكەنەوە بۆ یەك ساتیش بێت بیر لەوە بكەنەوە: ئایا ئەو هەموو كوشتارەی بەین نا بەین لە فەلەستینیەكان دەكرێت و ئاوارە و برسی دەكرێن وگەمارۆ دەدرێن، بڵێی هۆكەی - بەپێی لۆژیكی خۆیان - لەبەر بێ شعوری فەلەستینیەكان و نەجولانی بەزەییان بێت بۆ ئەو هەموو مناڵ و ژن و مەدەنیەی لەتوكوتكراوەی، ئەنفالكراوەی، كیمیا بارانكراوەی، موسڵمانان ومرۆڤەكانی تر نەبێت؟

ئایا دەبێت هەموو دنیا بسوتێت بۆ فەلەستینیەكان كەچی ئەوان وەكو هێزێكی شۆڕشگێڕ و میللەتێكی چەوساوە كەمترین هاوسۆزیان نەبێت بەرامبەر ئەو میللەتانەی كە لەوان چەوساوەتر نەبن كەمتر نین؟!

بۆ نمونە كورد زۆر لەوان چەوساوە ترە، ئەوان گیریان بە دەست دەوڵەتێك خواردوە كە گەلەكەی موسڵمان نین و بە سوود وەرگرتن لە توراسی دینی ومیژوویی توانیتیان وەك شەیتان وێنای بكەن لە میدیای عەرەبی وئیسلامی ولەلایەن كۆمەڵگاكانیشیان، كە ئیسرائیلە، كەچی كورد گیری خواردوە بەدەست چوار دەوڵەتی داگیركەر وچوار گەلی سەرەكی موسڵمانان، كە نەک نەیتوانیوە ستەم و بێ دینی ئەو گەلانە دەربخات، بەڵكو ئەوان توانیتیان زیاتر كورد بشێوێنن و لە كەمترین هاوسۆزی بێ بەش بێت لەلایەن گەلانی ئیسلامی و عەرەبی، بەس چونكە ئەو دەوڵەتانە خاوەنەكانی بە حیساب موسڵمانن! لە زیهنیەتی ئیسلامی عروبی، كە زۆربەی ئیسلامیەكانی جیهان بە كوردەوەش لە ژێر كاریگەری ئەو ئیسلامە عروبەییەن، كێشەی فەلەستین وەك ڕوكنێكی ئیمانی لێهاتووە، كەچی كێشەی كورد وەك بەتاڵكەرەوە ونەواقزی وزو و دەستنوێژی لێهاتووە! بۆیە دەبینیت وتاری فەرامۆشكراوی ئیسلامی میانڕەو و وتاری توندوتیژی ئیسلامی داعیشی بەرامبەر ورد، تەنها جیاوازیەكەی لە بوونی دوژمنێكی چەكدار و دوژمنێكی بی چەكدایە!

خاك و ژمارەی كورد دە هێندەی فەلەستینیەكانە گەر زیاتریش نەبیت، لەگەڵ ئەوەشدا قەبارەی پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ كورد ناگاتە ١٠% فەلەستینیەكان. وچەندین لایەنی تریش دەیسەلمێنێت كە دۆز و حاڵی كورد چەندە نالەبارترە لە حاڵی فەلەستینیەكان.

ئیسلامی كوردی هیچ بەرپرسیارەتێكی ئایینی و ڕەوشتی نابینێت لەلای حەماس و فەلستینیەكان بەرامبەر كێشەی كورد و گەلانی تر، كە من پێمو ایە هەڵوێستیان لەبەر نەزعەی عرووبی سەدامی زۆر خراپترە بەرامبەر كورد تا میللەتانی تر، بێ دەنگە بەرامبەر خەمساردیان وبێ هەڵوێستیان دەرهەق بە دۆزی كارەساتاوی كورد، كەچی ئەگەر كوردێكی وەك من ئەو پرسیارانە بوروژێنم ئامادەیە هەزار تانە وتەشەرم لێدات، كەچی لەوەتی هەم ولەوەتی میللەتەكەم خەبات دەكات لایەنگری كێشەی فەلەستین بووین، و ماوەیەكە گەیشتووین بەو تەسائولاتانە، بەڵام ئەو فەلەستینیانە لەوەتی هەن هەر وابوون، وادیارە هەرواش دەمێننەوە لە سایەی ئیسلامیزمی عرووبی وكلك و پاشكۆكانیان لەناو ئیسلامیەكانی میللەتانی تر.

٢٠١٤/٧/٢٣

# سه‌ربه‌خۆیی كوردستان له‌ ڕونگه‌ی ئێران وحه‌ماس وئیسرائیل

**محه‌مه‌د هه‌ریری..**

وه‌ك ئاشكرایه‌ حه‌ماس به‌ر له‌وه‌ی هه‌ر شتێك بێت پیشه‌سازیه‌كی ئێرانیه‌، له‌و ڕۆژگاره‌ش ئێران له‌وه‌تی باسی سه‌ربه‌خۆیی كوردستانی باشوور هاتۆته‌ گۆرێ ، به‌ ئاشكرا و ڕاشكاوی دژایه‌تی ده‌كات وخه‌ڵكی لێ هانده‌دات و تا ڕاده‌ی هه‌ڕه‌شه‌ش ده‌كات، كه‌ له‌ حاڵه‌تی ڕاگه‌یاندنی ده‌وڵه‌تی سه‌ربه‌خۆیی كوردستان، كوردستان چه‌ندین ده‌یه‌ بۆ دواوه‌ بگه‌ڕێنێته‌وه‌! یانی به‌ كوردیه‌كه‌ی كرده‌یه‌كی سه‌ربازی گه‌وره‌ ئه‌نجام ده‌دات به‌ هاوكاری حكومه‌ته‌ شڕه‌كه‌ی به‌غدا و به‌كرێگیراوانی ناخۆ.

یه‌كێك له‌ ئاكاره‌ ناشیرین و دزێوه‌كانی وڵاتانی ئیسلامی ئه‌وه‌یه‌ هه‌ر ته‌نگژه‌یه‌كیان هاته‌ پێش، به‌ر له‌ هه‌موو شتێك بۆ دوورخستنه‌وه‌ی سه‌رنج ودیدی خه‌ڵك لێی، چه‌ند كێشه‌یه‌كی ده‌ستكرد دروت ده‌كه‌ن، چاكترین كێشه‌ی ئاماده‌ش كێشه‌ی فه‌له‌ستینه‌، كه‌ نه‌زار قه‌بانی جوانی وتوه‌ كه‌ ده‌ڵێت:

كانت فلسطين لكم......دجاجة من بيضها الثمين تأكلون

كانت فلسطين لكم.......قميص عثمان الذي به تتاجرون

]فه‌له‌ستین بۆ ئێوه‌ ئه‌و مریشكه‌یه‌ له‌ هێلكه‌ به‌ نرخه‌كه‌ی ده‌خۆن....فه‌له‌ستین بۆ ئێوه‌ كراسی عوسمانه‌ كه‌ بازرگانی پێوه‌ ده‌كه‌ن[

وادیاره‌ ئێران وه‌ك كارتێك بۆ دروسكردنی غه‌ڵبه‌غه‌ڵب وته‌شویش له‌سه‌ر هه‌واڵی سه‌ربه‌خۆیی كوردستان، فه‌رمانی بۆ حه‌ماسه‌كان ناردوه‌ بۆ دروستكردنی ئه‌و كێشه‌یه‌ی ئێستا، كه‌ هه‌رچه‌ند ساڵ جارێك حه‌ماس دروستی ده‌كات له‌ ڕێگای تێگرتنی چه‌ند ڕۆكێتێكی بێ ئه‌رزش ودواكه‌وتوو به‌ پێوه‌ری ته‌كنۆلۆژی كه‌ به‌ده‌ستی ته‌نه‌كه‌چیه‌كانی دروستی كردوه‌ وبه‌ حیسابی خۆی زیان به‌ ئیسرائیل ده‌گه‌یه‌نێت!! بێگومان ئیسرائیل یش وه‌ک زانراوه‌ بێده‌نگی ونه‌رمی نانوێنێت، چونكه‌ هه‌ر نه‌رمی وبێده‌نگیه‌ك به‌مانای كۆتایی ئیسرائیل دێت، به‌ڵكو به‌ چه‌ندین قات به‌ توندی وه‌ڵامی ڕۆكێته‌كان ده‌داته‌وه‌، له‌و ناوه‌ش ته‌نها زه‌ره‌رمه‌ند خه‌ڵكی مه‌ده‌نی فه‌له‌ستین ده‌بێت. حه‌ماس جۆرێك له‌ شیعه‌گه‌راتی سیاسی به‌ پله‌ یه‌ك و عه‌قایدی به‌ پله‌ دووی تێدایه‌ وكه‌س ناتوانێت نكوڵی لێبكات.

شیعه‌گه‌راتی سیاسی بریتیه‌ له‌ ستایش كردنی رۆڵی سیاسی ئێران، و جوێندان وسه‌ركۆنه‌كردن وئاشكرا كردنی پلانه‌كانی ئه‌مریكا وئیسرائیل وخۆرئاوا به‌ گشتی، خۆ گێلكردن و دیزه‌ به‌ده‌رخونه‌كردنی كاره‌ قیزه‌ونه‌كانی ئێران و هاوپه‌یمانانی له‌ حزب الله و رژێمی به‌شار وهتد..

حه‌ماس هه‌تا ناوێرێت ئیدانه‌ی ئه‌و میلیشیا شیعانه‌ش بكات كه‌ ڕۆژانه‌ له‌ فه‌له‌ستینیه‌كانی عێراق ده‌كوژن، نه‌وه‌ك دڵی ئێران بڕه‌نجێت. شیعه‌گه‌راتی عه‌قایدیش هێنده‌ زۆربوه‌ له‌ فه‌له‌ستین و ناو حه‌ماس ئێستا ده‌توانن حزبێكی سیاسی لێ دروست بكه‌ن ئه‌گه‌ر ئێران بیه‌وێت، ڕاوێژكاری هه‌نیه‌، ئه‌حمه‌د یوسف ده‌ڵێت: بۆ عه‌یبه‌ شیعه‌ بیت له‌و زه‌مانه‌دا؟ شیعه‌ ئه‌مڕۆ عیزه‌تی ئه‌و زه‌مانه‌ن! دژی ئیستكباری جیهانی وه‌ستانه‌وه‌ كه‌ ئه‌مریكا و ئیسرائیل نوێنه‌رایه‌تی ده‌كات، پشتگیری موسته‌زعه‌فان ده‌كه‌ن...."١

ببینه‌ هه‌تا ده‌سته‌واژه‌كانیشی ئێرانی ڕوون وه‌ك: ئیستكباری جیهانی و موسته‌زعه‌فان وئه‌و قسه‌ ودروشمه‌ قه‌ڵه‌وه‌ دووڕوانه‌ی ئێران!

ئه‌وه‌ی ئێستا له‌ غه‌زه‌ ده‌گوزه‌رێت به‌ ئیعازی ئێرانه‌ وجێبه‌جێ كردنی حه‌ماسه‌ وپه‌یامێكه‌ بۆ كوردستان و به‌ پله‌ یه‌كیش بۆ ئیسرائیل كه‌ به‌ ئاشكرا پشتگیری خۆی بۆ سه‌ربه‌خۆیی كوردستان راگه‌یاند.

ئه‌و پشتگیرییه‌ی ئیسرائیل بۆ سه‌ربه‌خۆیی كوردستان به‌و ئاشكراییه‌ ئێران وولاَتانی عه‌ره‌بی وئیسلامیه‌كانی جیهانی هاركرد له‌ كورد، چونكه‌ ئیسلامیزمی جیهانی بیناغه‌كه‌ی له‌سه‌ر ده‌ستی ئیسلامیه‌ عه‌ره‌بیه‌كان دامه‌زراوه‌، هه‌موو كیشه‌ی گه‌وره‌ وقورسه‌كانی خۆیان وه‌لا ناوه‌، ته‌نها ته‌ركیزیان له‌سه‌ر ئیسرائیله‌! كێشه‌كه‌ له‌وه‌دایه‌ له‌و مه‌نزوره‌ ئیسلامیه‌دا هیچ خاڵێك به‌ديناكرێت بۆ كۆتایی هێنان به‌ كێشه‌ی ئیسرائیل وعه‌ره‌ب ته‌نها به‌ شه‌ڕێكی ئاپینی ئه‌رماجیدۆنی Armageddon گه‌وره‌ نه‌بێت، كه‌ سیناریۆیه‌كی دینییه‌ بۆ دواڕۆژه‌كانی دنیا ونزیكبوونه‌وه‌ی قیامه‌ت، وه‌ك محمد قطب وسه‌دان نوسه‌ر وبیرمه‌ندی ئیسلامی پێیان وایه‌ كار به‌وه‌ ده‌گات وه‌ك له‌ حه‌دیسه‌كه‌ی ابو هريرة هاتوه‌: " قیامه‌ت هه‌ڵناسێت هه‌تا موسڵمانان له‌دژی جوله‌كه‌ ده‌جه‌نگێن، موسڵمانان ده‌یانكوژن وجوله‌كه‌ خۆیان له‌ دوای داروبه‌رد ده‌شارنه‌وه‌، كه‌ داروبه‌رده‌كان به‌ زمان دێن وده‌ڵێن: ئه‌ی موسڵمان، ئه‌ی به‌نده‌ی خوا ئه‌وه‌ جوله‌كه‌یه‌ خۆی له‌ په‌نامدا شاردۆته‌وه‌ وه‌ره‌ بیكوژه‌، ته‌نها داری غه‌رقه‌د نه‌بێت كه‌ قسه‌ ناكات چونكه‌ داری جوله‌كه‌یه‌!!!"

ئه‌و حه‌دیسه‌ خورافیه‌ مێشكی ده‌یان نه‌وه‌ی ئیسلامی ژه‌هراوی كردوه‌، له‌ جیاتی گه‌ڕان به‌دوای چاره‌سه‌رێك، چاوه‌ڕێی دواشه‌ڕی ڕۆژی قیامه‌ت ده‌كه‌ن تا داروبه‌رد به‌ جواب بێت

ویەك جولەکە لەو ناوە نەهێڵن! حەدیسێك کە ساختەکاری بە ئاشکرا دیارە، ئەخر نەمزانیوە داروبەردیش دابەش بوبێت بەسەر موسڵمان وجولەکە، داری موسڵمان هەبێت وداری جولەکەش؟! یانی چی داری جولەکە؟مەگەر هەر ابو هریرە وبرادەرە جولەکەکانی لەوە تێبگەن! ئەی قورئان بۆ لە دەیان شوێندا دەڵێت :لله ما في السموات و الارض؟ خوا خاوەنی ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویشە؟!

عەرەب شەو ورۆژ باسی داگیرکاری ئیسرائیل دەکەن ومافی وجودیان لەو جوگرافیایە نابینن، کەچی کە دەچیتە سەر تێکستە دینیەکانی هەر سێ دیاناتی ئیبراهیمی دەبینیت، چۆن خودا لەو جوگرافیایە سەدان و هەزاران پێغەمبەری جولەکەی ناردوە شانۆی ڕوداوەکانی ژیننامەیان لەو جوگرافیایە بووە، وعەرەب بەر لە فەتحی ئیسلام هیچ وجودێکی وای نەبوە لە فەلەستین، و وجودی جولەکە لە فەلەستین زۆر کۆنترە لە وجودی عەرەبی، کەچی هەر هاواری داگیرکردنیانە، باشە ئەگەر بە داگیرکردن بیت، نە میسر ونە لیبیا و نەجەزائیر ونە مەغریبیش خاکی عەرەب نین ئێستا داگیرکراوە، وکاتی خۆشی داگیراکرا بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام، بەڵام ئێستا پەیامیشیان تەواو گەیاند، کەچی ئەوان دژی هەموو هیوایەک ومافێکی نەتەوە ڕەسەنەکانی ئەوێن لە ئەفرقیەکان وبەربەرەکان زۆر خراپتر لە دژایەتی ئیسرائیل بۆ عەرەب. بۆ ئەوە داگیرکردن نییە، ئەوەی ئیسرائیل داگیرکردنە کە کاتی خۆی هەموو مێژووی باوباپیران وپێغەمبەران و کتێبە ئاینیەکانیان لەو ناوچەیە بووە؟!

ئەو ئیسلامیە کوردانەی کە وا دژی پشتگیری ئیسڕائیل وەستاونەتەوە نا هەقیان نیە لەژێر کاریگەری ئیسلامیزمی عەرەبی ئەو هەڵوێستە وەردەگرن، ئەو ئیسلامیزمەی کە هەموو جەوروستەمی سەرگەلانی فەرامۆش کردوە جگە لە جەوروستەمی ئیسرائیل نەبێت بەرامبەر فەلەستینیەکان، دەنا کوردێکی بی پشتیوان لە ناو چەندین دەوڵەتی داعش ڕەوشتی ناوچەکەدا دەبێت زیانی چی بێت کە ئیسڕائیل قسەیەکی خێری بۆ بکات؟! هەرچەندە من پێم باش نەبوو بە ئاشکرا بیکات، لەبەر تەشویشی ئەو عەقڵیەتیانەی کە بە ئیسلامی عروبی تەشکیل بوونە. ئینجا ئەو پشتگیریەش تەنها بۆ کورد نیە، بەڵکو ستراتیژیەتیکی ئیسڕائیلیە وەك چەکێکی بەرگری دژی خەونە ئاڵ ووواڵەکانی ئیسلامی عەرەبی دەجەنگن، کە خەون بە دەوڵەتێکی خەلافەتی ئیسلامی دەبینن، بۆ ئەوەی ئیسڕائیل هەمووی بخەنە بەحرەوە!

بەپێی تیۆری دەیڤد بن غوریون دەبێت ئیسرائیل پشتگیری لەهەر نەتەوەیەکی غەیری عەرەبی بکات لە ناوچەکەدا وپشتگیری لە وڵاتانی بازنەی سێیەم بکات کە سنوری هاوبەشیان نیە لەگەڵ ئیسڕائیل، کە لە بەرژەوەندی ئەو دایە هێزگەلێك بێلایەن بکات لە دژی خۆیدا.

ئەگەر ئەوەی موسڵمانی هەقیقی بێت دەبێت زیاتر دژی ئەوانە بوەستێتەوە کەساڵەهایە دەیکوژن وقەڵاچۆی دەکەن وبە مرۆڤی نازانن وبە شایستەی سەربەخۆیی نابینن لە وڵاتە بەناو ئیسلامیەکانی ناوچەکە و میللەتە مەنگۆلیەکانی کە لەسەر کوشتن وزیندەبەچاڵکردنی دووسەد هەزار کەس فزەیان نایەت، بەڵام بۆ کوشتنی چەند فەلەستینیەک دنیا پڕدەکەن لە داد وفیغان!!

پێویستە کورد بە ئیسلامی ونائیسلامیەوە دیدێکی تایبەتی هەبێت بۆ کێشمەکێشی عەرەبی – ئیسرائیلی، نەك ببێتە زایەڵەی ئیسلامیزمی عەرەبی کە بێ گومان نوسخە هەرە دواکەوتوو و نامرۆیی ئیسلامە.

چوار شەممە, 16 تەمموز 2014

1 - http://www.muslm.org/vb/showthread.php?332633-

## دەربارەی شیعرە قرتاوەکەی پەشێو لەسەر فەلەستین!*

بێگومان هەمووومان ومنیش یەکێکم لەوانەی دڵم بەوشیعرە جوانەی شاعیری مەزن پەشێو خۆش بوو لە بارەی کیشەی فەلەستین، چونکە دەیسەلمێنێت، کورد نەك هەر ئیسلامیەکانی، بەڵکو نەتەوەیی وچەپەکانیشی زۆر لە مێژە سەر بە هەر فیکر وئایدیا ودینێك بن پشتگیری تەواویان لە کێشەی فەلەستین کردوە.

بەڵام لەگەڵ بڵاوکردنەوەی شیعرەکە هەستم دەکرد تەواوی شیعرەکە نیە، وبەشێکی لێقرتاوە لەبەر هەر هۆیەك بێت، نەزانی یا چەواشەکاری یان هەرشتێکی تر. چونکە دیوانەکەیشم لا نەبوو، نەمتوانی ڕاستەوخۆ بگەڕێمەوە سەر شیعرەکە. بەڵام پاش ناردنی بابەتەکەم بە ناونیشانی: "غەزە و وتارێکی چەواشەکارانەی ئیسلامیەکان" بە ئیمێلێک بۆ شاعیری مەزن پەشێو، سەرەڕای دەستخۆشی بابەتەکەم، دەڵێت کە ئەو شیعرە کۆنە لە ١٩٦٩ نوسراوە، کە لەو سەردەمەش وەك عادەتی هەمیشەیی کورد، کورد لە فەلەستینی فەلەستینیتر بوون!

ئەوەی زۆر جێگای سەرسوڕمانم بوو کە پەشێوە ئاماژەی بەوە کردبوو کە کاتی خۆی سەرەڕای ئەو شیعرە بەرزەش کەسانێکی شۆڤینیستی عەرەب هێرشێکی زۆریان کردوتە سەر!!

بەڕاستی سەیرم پێهات، چۆن کەسێك وا فەلەستین بلاوێنێتەوە و ئەو هەموو هاسۆزیەی بۆ دەربڕێت، کەچی هێشتا ببێتە ئامانجی تانە و تەشەری عەرەبە شۆڤێنیستەکان؟!!! چۆن یەکێك بڵێت:

چەند حەز دەکەم

منی کوردیش

ئادەمزادێکی سەربەست بم،

بە چەلین و کەوشی کوردی

لە چیاکانی فەلەستینا چەکبەدەست بم؛

هێرش بەرم

بۆ سەر ئەو بووکەشووشانەی،

بۆ سەر ئەو داڵە تووشانەی

گۆشتی کۆرپەی ساوا دەخۆن،

مزگەوتەکان،

کڵێسەکان...

بە خوێن دەشۆن.

* * *

چەند حەز دەکەم

بژیێنمەوە

داستانەکەی سەلاحەددین،

دیسان، وەکوو بوومەلەرزە،

ڕاچڵەکێنم دڵی زەمین؛

تاو بسێنم وەك فەرتەنە،

لەسەر لێوی خاچپەرستان

ڕیشەکێش کەم زەردەخەنە.

بەڵام، چبکەم!

خۆشم ئەمڕۆ وا دەستبەستەم،

داگیرکەران لە چوارلاوە

ناهێڵن بجووڵێ جەستەم.

من کوردێکم...

هەرچەند ئەمڕۆ دەنگ هەڵبڕم،

دەنگم نییە.

ئەو فەلەستینیانە بە حەماس وفەتحەوە هێندە بوغرابوون بە پاڵپشتی سەدان دەوڵەتی عەرەبی وئیسلامی بە گەلەکانیانەوەو سەرەڕای پاڵپشتی سەدان وڵاتی تری نا ئیسلامیش وهەزاران حزب و رێکخراو ودامەزراوەکانەوە، تا ڕادەیەك غیرەیەکی هەوێ یانیان هەیە بەرامبەر هەر گەلێکی تر کەسانێك پاڵپشتیان بکات، بۆیە لە بیرمە لە کاتی کارەساتەکانی کورد کە میدیا جیهان بایەخی بە کێشەی کورد دەدا، دەیان وتاری فەلەستینی لە دژی ئەو بایەخە دەنووسرا تا جارێکیان من وەڵامی وتارێکی شۆڤێستێکم داوە کە وتارێکی نووسیبوو بە ناوی: ناشێت بەراوردی دۆزی فەلەستین بکرێت بە دۆزی کوردی!!! کە تیایدا ئەوەی خراپ بوو دەرهەق بە کوردی گووتبوو!

دوایی کە تێکستی تەواوی شیعرەکەم پێگەیشت لەلایەن پەشێوی خۆشەویست ئەو کاتە دوو ڕاستیم بۆ بەدیارکەوت:

١- چەواشەکاری ئیسلامیە کوردەکانی خۆمان لە قرتاندنی نیوەی دووەمی شیعرەکە، چونکە پەشێوە تیایدا یارمەتی دانی گەلانی دنیا لەلایەن کورد بە ڕزگاربوونی گەلی کورد دەبەستێتەوە، ئەوەش هیچ تەفسیرێکی بۆ ناکرێت تەنها سروشت دەروێشی تاکی کورد نەبێت کاتێ دەبێتە دەروێشی هەر فیکرەیەك جا مارکسی بێت یان ئیسلامی یان هەر شتێك، ئامادەیە بەرژەوەندی میللەتەکەی خۆی بکاتە قوربانی بەرژەوەندی فەلەستین وهەر نیکاراگوا وڤیەتنام وئەفغانستان! دەنا بۆ ئەو بەشە گرنگەی دەقرتێنێت، کە هانی تاکی کورد دەدات جارێ هەوڵی ڕزگارکردنی خۆی بدات، دوایێ بیر لە یارمەتی کەسانێك بکەوە کە ماشەڵڵا هەموو جیهان یارمەتیانە!

٢- کاتی خۆشی کە عەرەب هێرشی کردۆتە سەر ئەو شیعرە لەبەر ئەو بەشەی دووەمە بووە، چونکە عەرەب حەز ناکات باسی ڕزگاربوونی خۆت بکەیت، دەبێت هەر شیعارات ودروشمگەلی ئومەی عەرەبی دووبارەکەیتەوە تا لێت ڕازی بێت، چۆن باسی ڕزگاربوون دەکەیت، ئەگەر ئەو ڕزگار بوونە ببێتە هۆی نەخشە تێکچوونی دوو وڵاتی عەرەبی؟!!

بەشی دووەمە قرتاوەکەی شیعرەکە ئەوەیە:

کوردستانی گەورە و مەزن،

وەك خەرمانی جوتیاری کورد، بەش کراوە...

باستیلێکە،

توند کوردی تێ ئاخنراوە.

بەڵام پەیمان...

هەزار پەیمان...

لە دواڕۆژا،

کە خۆم بینی کەسێکم نایێ بە گژا،

کە خۆم بینی،

لە سێبەری کوردستانی ڕزگاربووما،

لەکەی دیلی سڕاوەتەوە لە ڕووما-

ئەوسا منیش،

وەك کوردێکی خاوەن کیان،

چەك هەڵگرم

بۆ هەر کەسێك بڵێ: ژیان!

پەیمان...

پەیمان...

هەزار پەیمان،

کە ڕزگار بووم

لەو گەردەلوولەی تێی کەوتووم،

ئەوسا بڕۆم،

تا لە خاکی فەلەستینی ئاسمانگەشا،

نەك هەر لەوێ،

لە جەنگەڵە چڕەکانی ناو ڤێتناما،

لە ئەفریکای قولەڕەشا،

لە ئێرتیریای بێ بەهارا،

لە هەر خاکێك دۆلار بژی،

بژیێنمەوە سەد گیڤارا!

ئێستا دەزانن ئەو چەواشەکارییە چەند ئاشکرا وبێ پەردەیە بە دەستی خودی کورد دەکرێت، من گومانم نییە ئەوانەی ئەو شیعرەیان بە قرتاوی بڵاوکردەوە، ئامادەنین بە تەواوی بڵاویکەنەوە، چونکە ئامانجە ئایدیۆلۆژیەکەی ئیسلامی عرووبی شینگێڕ بۆ فەلەستین ناپێکێت.

٢٠١٤/٧/٢٥

سەرچاوە

ئەوەش تەواوی شیعرەکەیە:

دەنگێك لە كوردستانەوە *

چەند حەز دەکەم

منی کوردیش

ئادەمزادێکی سەربەست بم،

بە چەلین و کەوشی کوردی

لە چیاکانی فەلەستینا چەکبەدەست بم؛

هێرش بەرم

بۆ سەر ئەو بووکەشووشانەی،

بۆ سەر ئەو داڵە تووشانەی

گۆشتی کۆرپەی ساوا دەخۆن،

مزگەوتەکان،

کڵێسەکان...

بە خوێن دەشۆن.

* * *

چەند حەز دەکەم

بژیێنمەوە

داستانەکەی سەلاحەددین،

دیسان، وەکوو بوومەلەرزە،

ڕاچڵەکێنم دڵی زەمین؛

تاو بسێنم وەك فەرتەنە،

لەسەر لێوی خاچپەرستان

ڕیشەکێش کەم زەردەخەنە.

بەڵام، چبکەم!

خۆشم ئەمڕۆ وا دەستبەستەم،

داگیرکەران لە چوارلاوە

ناهێڵن بجووڵێ جەستەم.

من کوردێکم...

هەرچەند ئەمڕۆ دەنگ هەڵبڕم،

دەنگم نییە.

من کوردێکم...

هەرچەند ئەمڕۆ خۆم نیشان دەم،

ڕەنگم نییە.

کوردستانی گەورە و مەزن،

وەك خەرمانی جوتیاری کورد، بەش کراوە...

باستیلێکە،

توند کوردی تێ ئاخنراوە.

بەڵام پەیمان...

هەزار پەیمان...

لە دواڕۆژا،

کە خۆم بینی کەسێکم نایێ بە گژا،

کە خۆم بینی،

لە سێبەری کوردستانی ڕزگاربووما،

لەکەی دیلی سڕاوەتەوە لە ڕووما-

ئەوسا منیش،

وەك کوردێکی خاوەن کیان،

چەك هەڵگرم

بۆ هەر کەسێك بڵێ: ژیان!

پەیمان...

پەیمان...

هەزار پەیمان،

کە ڕزگار بووم

لەو گەردەلوولەی تێی کەوتووم،

ئەوسا بڕۆم،

تا لە خاکی فەلەستینی ئاسمانگەشا،

نەك هەر لەوێ،

لە جەنگەڵە چڕەکانی ناو ڤێتناما،

له‌ ئه‌فریکای قوله‌ڕه‌شا،

له‌ ئێرتیریای بێ به‌هارا،

له‌ هه‌ر خاکێك دۆلار بژی،

بژیێنمه‌وه‌ سه‌د گیڤارا!

1969/12/5 – کوردستان

* باستیل: ناوی ئه‌و زیندانه‌ به‌ناوبانگه‌ی پاریسه‌، که‌ له‌ سه‌ده‌ی چوارده‌مه‌وه‌ شایه‌کانی فه‌ڕه‌نسا بۆ نه‌یارانی خۆیانیان به‌کار ده‌هێنا. له‌ ڕاپه‌ڕینی ١٧٨٩دا کۆمارییه‌کان ده‌ستیان به‌سه‌ردا گرت.

## شارل دیگۆلو کەرتکردنی کوردستان

محەمەد هەریری

شارل دیگۆل (1890 - 1970) ئەو پیاوە مەزنەی سەرکردایەتی بەرهەڵستکاری نازیەکانی کرد لە جەنگی جیهانی دووەم، سەرکردایەتی حکومەتی فەرەنسای ئازادی کرد و لە ساڵی 1943 سەرۆکایەتی لیژنەی فەرەنسی بۆ ڕزگاری نیشتیمانی کرد، کە حکومەتی کاتی کۆماری فەرەنسا بوو، لە پاش کۆتایی جەنگ بوە سەرۆکی یەکەمی کۆماری پێنجەمی فەرەنسا لە ١٩٥٨ بۆ ١٩٦٥ حوکمی کرد، سەرەڕای ئەو هەموو خزمەتەی فەرەنسای کردبوو و سەرۆکی ڕزگارکەری فەرەنسا بوو، باوکی ڕوحی میللەت بوو، بەڵام هەموو ئەو چاکە و ئەو مێژووە پاکە بۆی دادیان نەدا، خۆپیشاندانی گەورە وزەبەلاح لە دژی دەرچوون لە فەرەنسا..ئەو بڕیاری دا هەمەپرسیەك بکات لەسەر پیادەکردنی ناناوەندیەتی زیاتر لە فەرەنسا، و پەیمانی دا ئەگەر دەنگدەران بە بەڵێ کەمتر بوون لەو ڕێژەیەی ئەو دیاری دەکات، ئەوا دەست لە کار دەکێشێتەوە، سەرەڕای سەرکەوتنی هەمەپرسیەکەش، بەڵام چونکە ڕێژەیەکی کەمێك کەمتری هێنا لەوەی ئەو دیاری کردبوو، یەکسەر دەستی لە کار کێشایەوە!!! گەڕایەوە شارۆچکەکەی خۆی خەریکی باخچە بچوکەکەی ماڵەکەی بوو!

یانی نەیگووت من زەروڕەتێکی مێژووییم و هێندە خەبات و براکوژیم کردیە ودەبێت هەر بمێنمەوە، چۆن جورئەت دەکەن بە من بڵێن وازبێنە، و یاریدەدەرانیشی نەیانگووت، فەرەنسا دەکەینە دوو لەت و نۆ لەت ئەگەر سەرۆکمان نەبێتەوە سەرۆك! جا بەو لۆژیکەی سیاسەتی کوردی بوایە، دەبوایە شارل دیگۆل بە کیمیاوی لە گەلی فەرەنسی دابا، کە سەرەڕای ئەو هەموو خزمەتەی کردن بە زەبری خۆپیشاندان هێنایەنە خوارەوە.

کەی سیاسیەکانمان ئەگەر حیسابی خەڵك لە حازریش ناکەن، حیسابێك بۆ مێژوو ناکەن، ئەو مێژووەی شاهێدە لەسەر هەموو تەفسیر و کەمتەرخەمی و فەشەلەکانیان؟!

## ئامێری خاین ناسی پارتی و یەکێتی وەك بلوتوسی من تێکچووە

ماوەیەکە بلوتوسەکەی من تێك چووە هیچ ئامێرێك ناناسیتەوە ئەگەر دەوروبەری هەزار بلوتوسی کراوەشی لێ بێت، واتە بلوتوسی دۆست و نەناس وەك یەک مامەڵە دەکات.
ئەو دوو حزبەی کە خۆیان سەپاندوە بەسەر موقەدەراتی کورد لە ناسکترین پێچەر و لۆفەی مێژوویدا، لەوەتی یەکەم ڕۆژی حوکمکردنیان دەڵێی لە بنەڕەت وبیلادیەوە ئامێری خاین ناسی و هەستی ناسیەوەی ناپاکییان ئیش ناکات وهەر نەبووە!
ڕووی هەزاران جاش و رەفیق بەعسی و پەرپرسی باڵای سەربازی وسیاسی بەعسیان سپی کردەوە! هێندە دڵفراوان لە خۆشبوون لەوانەی خیانەتی نەتەوە ونیشتیمان دەکەن، یەك لەسەدا ئەو دڵفراوانیە و لێبوردەییە نیشان نادەن بەرامبەر ئەوەی خیانەتی شەخسی و حزبیان لێدەکەن، یان جنێو بە خۆیان و بنەماڵەیان دەدەن یان هەر ڕەخنەیەکی توند لە خودی کەسایەتیان دەگرن.
ئامێری خایین ناسی ئەو دوو حزبە زلهێزە هیچ جیاوازیەك ناکات لە نێوان شەهیدی پێشمەرگە و ڕێخراوە نهێنیەکانی ناو شار و شەهیدی جاشایەتی و خۆفرۆشی، هیچ جیاوازیەک ناکەن لە نێوان ئەوانەی لە وەتی هەبوون باجی هەڵوێستی مەردایەتی وکوردایەتیان داوە، لەگەڵ ئەوانەی لە باجی دایرەی تاپۆ زیاتر هیچیان نەداوە، هەردەم کوڕی ڕۆژ بوون و لە کردنی هیچ تاوانێك وخیانەتێك سڵیان نەکردۆتەوە.
هەر ئەو ئامێر تێك چوونەی ئەو دوو زلهێزەیە و پارتی یە ئەمڕۆ، پاش ئەوەی ئەردۆگان لە ناسکترین ساتی هەستیاری کوردستاندا خیانەتی لە دەسەڵاتی هەولێر کرد، وسەدان راپۆرت باسی تێوەگلانی دەکات لەگەڵ داعش، کەچی ئەمڕۆ کە ئەردۆگان و تورکەکان زانییان پیلانەکەیان نوشوستی هێنا و دنیا خۆرائاوا هەموو بوونە یەك ڕیز لە دژی ئەو جانەوەرانەی داعش، و پاش شانۆگەریە کۆمێدیەکەی ئازادکردنی گیراوە و بارمتەکانی لە موسڵ لە ژێر دەستی داعش، ئەوە چەند ڕۆژێکە ئەردۆگان وداود ئۆغلۆ لێدوان لەسەر لێدوانی ئاگرینی دەدەن لە دژی داعشی دۆست و دروستکراوی خۆیان!! من گومانم نییە کە هەزار لێدوانی وا جیهانی خۆرئاوا ناخەڵەتێنێت، بەڵام ئەوەی جێگای ئەسەفە، سەرۆك وەزیرانی کوردستان نێچیرڤان بارزانی وا بە پەلەپروزکی ڕاکات بەرەو ئەنقەرە بۆ خێراتر سپیکردنەوەی ڕووی ڕەشی ئەردۆگان و حکومەتەکەی کە لە هەموو جیهان میسداقیەتی لە دەست داوە! وبۆ ئەوەی دانیشێت لەگەڵیان بێ ئەوەی ئاڵای کوردستانیش یان عێراقیش لە پشتی هەڵبکەن!
با کورد خیانەتێکی وای لە تورك یا عەرەب یان فارس کردبا، بەخوا بەسەد ساڵی

سوخرەکێشیمان بۆیان لایان نەدەسڕایەوە!! من ئەوەم بۆ تەفسیر ناکرێت، بۆ ئەردۆگان خیانەتت لێبکات و تۆش راکەیت بۆ ئەنقەرە و دووپاتی کەیتەوە کە هیچ نەبووە و هەمووومان براین و ڕێککەوتنەکان وەك خۆیانن، و دادۆشینی تورك بۆ کورد بە مەمنونییەوە وەك خۆی دەڕوات بەڕێوە!!! ئەگەر ئەو هەڵوێستە پڕ لە تەساموحە گێلانە بە تێك چوونی ئامێری خیانەتناسی تەفسیر نەکرێت، ئەوە دەبێت ئەو دەنگۆیە بێت کە دەڵێن پارتی و تورکیا و قەتەر دروستکەری داعشن، بەڵام داعش لە قۆناغێکدا وەك ئەکتەرە بزێوەکان لە دەق دەرچوو!!

محەمەد هەریری
30/9/2014

## پەکەکە و خەونە یوتیۆپییەکانی ئاپۆ!

قەسەم بە خوا، وا هەست دەکەم بۆ تێگەیشتن لە وتاری سیاسی پەکەکە و سەرانی چەندین پسپۆر وخەبیرت دەوێت! ئەوە سەعاتێکە "دەقی چاوپێکەوتنەکە )دۆران کالکان) بە زاراوەی سۆرانی" لە سایتی ستاندارد دەخوێنمەوە وەکی قسەکانی یونس شەلەبی ڕەحمەتی لە شانۆگەری [مدرسە المشاغبین] قوتابخانەی چەتوونەکان دێتە بەرچاوم، کە کەس نەیدەزانی چ دەڵێت و مەبەستی چیە لەو تێکەڵ وپێکەڵ کردنەی؟!
باسی شەنگال و کۆنگرەی نەتەوەیی و دیموکراسیەتی نازانم چی؟! باسی نەتەوەی دیموکراتی، باسی کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراست، باسی ڕۆڵی سەرەکی کورد لە بەدیموکراتی کردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست!

دۆران کالکان لە بەشێکدا دەڵێت: " لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا دوو پرۆژە کەوتنە بەرباس، یەکێکیان زیاتر بەشکردنو پارچەکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست. هێزی ناونەتەوەییو هەرێمی هەن پشگیری ئەم پرۆژەیە دەکەن. لە بەرامبەر ئەم پرۆژەیەی کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو کارەسات دەبات، تەنها یەک ئەلتەناتیف هەیە، ئەویش کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراستە. لەسەر هێڵی مۆدێرنیتەی دیموکراتی ڕێبەر ئاپۆ بە پشتبەستن بە نەتەوەی دیموکراتی، کۆنفیدرالیزمی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست گرنگە. سیستەمێکی دیموکراتی دەتوانێت گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێیدا بە برایانە، لەگەڵ یەکتردا بە ئازادانە خۆیان بەڕێکخستن بکەنو بژین ".

خۆزگە پەکەکە بەس لە گۆڕەپانی شەڕ با لە دژی دوژمنانی کورد، وجڵەوی سیاسەتی بدابایە دەست نوخبەیەکی سیاسی کوردستانی باکوور، چونکە ئەو سەرسامیە وخۆسەویستیەی خەڵك بۆ پەکەکە دروست دەبێت لە مەیدانی جەنگدا، لە گۆڕەپانی سیاسەتدا دەیدۆڕێنن! من تێناگەم میللەتێك بە دەستی هەموو هاوسێیە درندە ونا دیموکراتەکانی دەچەوسێتەوە، کوردیسن پێ حەشەرەیە وپێیان ئاساییە بە دەرمان مێش بیکوژن، لە جیاتی هەوڵدەیت بەشێك لە مافەکانت کە بە ڕوبارێك خوێن وەرتگرتوە، ڕیسکی پێ بکەیت وبیکەیتە قوربانی ئەو خەونە دەبەنگەی " کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراست" و ببیتە مامە خەمەی قسەە گەورەی "

بەشکردنو پارچەکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست"! ئەخر پێمناڵێیت تۆ چیت و کام تورک وعەرەب و فارس گوێت بۆ دەگرن بۆ پێکهێنانی: " کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراست"؟! یان هێشتا بەنجی مارکسیزم و زڕخەونەکانی بەری نەداون، لەو وڕێنانە خۆیان مانفێست دەکەنەوە؟!

خۆزگە کورد دەبوە خاوەن قەوارەیەك یان چەند قەوارەیەکی خۆی لەو رۆژهەڵاتی ناوەراستە، خۆزگە وەك ئادەمیزادێك لێمانیان دەڕوانی و دەبووینە خاوەن سەنگ وپێگە و سنووری خۆمان نەفرەت لە کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراست وهەموو خەونە ئوممەمیەکان بێت. عەرەب بە یەك زمان و، یەك دین، ویەك مێژوو و یەك جوگرافیا، پاس هەزاران کۆبوونەوە و لوتکەی عەرەبی و سەدان مەترسی هاوبەش هێشتا کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراست یان پێ دروست نەکرا، بە هەموو عەقڵی خۆتان دێن بیرۆکە ئایدیالیەکانی زیندانیەکی دابڕاو لە دنیادا جێبەجێ دەکەن؟!

لە وڕێنەیەکیتردا لە جیاتی فەرامۆشی جیاوازیە دینی ومەزهەبیەکان و زارزمانەکانی کورد بکەن دەڵێت: " باشوری کوردستان لەناو بەڕێوەبەرایەتیەکی مەرکەزیدا ناتوانێت ژیان بکاتو نابێتە یەک .چونکە زۆر زاراوە لەخۆ دەگرێت، زۆر گەلی جیاواز لەخۆ دەگرێت. واتا هەم لەلایەنی مەزهەبی، دینی و هەم نەتەوە و ئەتنیکی جیاوازی تێدا دەژین.
کوردەکانیش یەک رەنگ نین: زاراوەی بادینی و سۆرانی هەن، سۆرانیش کوردیەو بادینیش هەرکوردییە باشە چۆن لە چوارچێوەی یەک زمانی نەتەوەییدا هەردوکیان دەکەنە یەک؟"

توخواکەی شەرم نییە باسی سۆرانیەتی وبادینیەتی بکەیت؟! باسی موسلمانیەتی ویەزیدایەتی وکاکەییاتی بکەیت، لەو کوردستانەی کە بە موو جیاوازیان پێ ناکات لەگەڵ زۆربەی موسلمان؟! دیارە پەکەکە وەك مریشکی جیرانی لێهاتوە :ڕیقنەکەی [زەق کردنەوەی زاراوەگەری و مەزهەبگەرایەتی] بۆ کوردە، و ئوممەمەیتەکەی [هێلکەکەی] کۆنفیدرالیزمی رۆژهەڵاتی ناوەراست بۆ عەرەب وتورک و فارسە؟ !

لە هەمووی خۆشتر دەڵێت: " کوردستان خاڵی کلیلی بەدیموکراتی کردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و شوێنی چارەسەرکردنیەتی."! پەکوو، ئەو هەموو ئەکتەرە زلانەی عەرەب و تورک وفارس فەرامۆش کەیت و لەو فیلمە ترسناکە ڕۆڵێکی بچوکیشیان نەدەیتێ لە

به‌دیموكراتی كردنی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست، كه‌چی بێت ئه‌كته‌رێكی بی ده‌ره‌تانی، تازه ده‌رچووی، كۆمبارسی وه‌ك كورد بكه‌یته قاره‌مانی فیلمی به‌دیموكراتی كردنی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست؟! هه‌ر ئه‌وه‌ش نا به‌رپرسیاره‌تكه ته‌نها بخه‌یته سه‌رشانی كوردان وبپرسیت: " كوردان چۆن پێویستیه‌كانی ئه‌م به‌رپرسیارێتیه ده‌هێننه جێ؟ خاڵی یه‌كه‌م :یه‌ككگرتنو دیموكراسی. ئه‌مه‌ش به‌یه‌كه‌وه په‌یوه‌سته. یه‌ككگرتن به دیموكراسی ده‌بێت. له كاتێكیشدا كه زهنیه‌تو سیاسه‌تی كوردان دیموكراتیزه ببێت، ده‌توانرێت یه‌ككگرتن ئاوابكرێت. بۆ به‌دیموكراتیزه كردنی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست، یه‌ككگرتنی دیموكراتی كوردان به‌ردی بناغه‌یه".

یانی ده‌بێت كورد به‌ر له داگیركه‌رانی به دیموكراتیزه تێپه‌ڕێت بۆ به‌دیموكراتیزه كردنی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست!! په‌كه‌كه باشتره باسی دیموكراتیه‌ت نه‌كات، چونكه لێی نایه‌ت!
ده‌كرێت بڵێین په‌كه‌كه هێزیكی شه‌ڕكه‌ره، ڕێكخراوه، به دیسپلینه، به‌ڵام قه‌ت ناتوانین بڵێین تا ئێستا توانیویه‌تی پۆلی یه‌كه‌می دیموكراتیه‌ت ببڕێت!
وابزانم خه‌مه‌كانی كوردی باكوور هێنده گه‌وره و زۆرن، پێم سه‌یره په‌كه‌كه ده‌په‌رژێته سه‌ر باسی پارچه‌كانیتری كوردستان و هه‌وڵی سه‌پاندنی ویسایه‌ی خۆی ده‌دات به‌سه‌ر كوردستانی باشوور و هێنده‌ی باسی هه‌ولێر و كه‌ركوك و شه‌نگاڵ ده‌كات، هێنده باسی ئامه‌د و وان و ده‌رسیم ناكات؟!
باشتره بۆ خۆتان و لایه‌نگیرانتان واز له‌و خه‌یاڵ پڵاویه‌ی ناو كتێبه تیۆریه‌كانی بهێنن و خه‌ونی به‌دیموكراتی كردنی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست، و كۆنفیدرالیزمی رۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست به ده‌ستی كوردان زۆر له كۆماره‌كه‌ی ئه‌فلاتوون قورستر وخه‌یاڵیتره، كه‌مێك ڕه‌حم به بێ كه‌سی كورد بكه‌ن!
٢٠١٥/٤/٢٠
سه‌رچاوه‌ی چاوپێكه‌وتنه‌كه:
http://skurd.net/index.php/news/news-kurdistan/2102-2015-04-19-07-36-30

## فەتواکەی حەکیم و زامەکەی عادل ئیمام

عادل امام لە فلمێکی زۆر کۆمێدیدا بە ناونیشانی [الواد محروس بتاع الوزیر] هەڵوێستێکی زۆر پێکەنیناوی تێدایە کاتێ ئەو دەبێتە حیمایەی )پارێزەری) وەزیرێکی هەڵکەوتوو لە گوندەکەی خۆیان، ڕۆژێك هەوڵێکی تیرۆرکردنی دەدرێت بەڵام سەرکەوتوو نابیت، مەحروسیش کە عادل ئیمام ڕۆڵەکەی دەبینێ لەو هەوڵە پەنجەیەکی بە حاڵ زامدار دەبێت، ئیتر بۆ ئەوەی سەرنجی جەنابی وەزیر ڕاکێشێت بۆ قارەمانیەکەی یەك تۆپ شاشی سپی لە دەستی دەپێچێتەوە ودەیان داواکاری لێدەکات، هەر کە وەزیر دوودڵی دەکات لە داواکاریەکی مەحروس، یەکسەر دەستە پێچراوەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ نێو چاوی وەزیر، وچەندین کۆڕی گەورە دەبەستێت لەناو گوندەکەیان بۆ باسکردنی پاڵەوانیەتی خۆی کە ڕوداوەکە خۆی یەک دوو دەقەی خایاند بوو، کەچی مەحروس بە چەندین سەعات باسی دەکرد.

بە دەستە خۆم نیە کە فەتواکەی حەکیمم بەر گوێ دەکەوێت زوو زوو، ئەو فیلمەم بەبیر دێتەوە. لەوەتی هەستی نەتەوایەتیمان هەیە ڕۆژانە هەر خۆمان پێش شیعەکانیش هەر باسی ئەو فەتوایەی حەکیم دەکەین کە گوایە بۆ حەرامکردنی شەڕ لە دژی کورد دەری کردوە لە تەموزی ١٩٦٥. ئەگەر ئەو هەموو پێزانینە لە سەرێکەوە نیشانەی نمەك حەڵاڵی و وەفایی کورد بێت بەرامبەر چاکەکانی کەسانی تر، ئەوە لە سەرێکی ترەوە ئاماژەیەکی زەقە بۆ ساویلکەیی کورد وعەقڵیەتی زیادڕەوی وخۆ بە بچوك زان بەرامبەر بچوکترین ئاوڕلێدانەوە غەیرەکان .

ئەگەر فەتواکە ڕاست بیت، منیش دەڵێم هەڵوێستێکی جوامێرانەیە لە کاتی خۆیدا، بەڵام وەک گوتومە ودەیڵێمەوە؛ فەتوای حەکیم لە ناو شیعە گریمان لە کاتی خۆیدا کاریگەریشی هەبوبێت، بەڵام بێگومان لە لای سونەکان کە ئەوان زۆربەی پایە سەربازیەکانیان بە دەست بوو، نەگوێیان لی بووە، ئەگەر گوێشیان لێ بوو بێت، پولیکی قەڵبی نە هێناوە، چونکە ئەگەر بۆ شیعەی دەرکردبێت، ئەی سەربازەکانی سوپای عێراق هەمووی یان زۆربەی شیعە نەبوون لە دژی کورد دەجەنگان؟! ئەگەر فەتواکە دەریش کرابێت بۆ شیعەکان، بەرای من فەتواکە لە کاتي خوشیدا ئەو سود وسەنگەی نەبوە، چونکە فەتوایەک لە غیابی میدیا وئیعلامي بینراو وبیستراودا بلاوکرابێتەوە دەبێت چ کاریگەریەکی بو بێت؟ !!!ئێ خۆ سەردەمی ئینتەرنێت وفاکس وفەیسبوکیش نەبوە بە کلیکێك بە دونیایدا بڵاویکردبیتەوە، وەك چۆن ئێستا بچوکترین ڕوداوی بێ ئەرزش لە چەند چرکەیەکدا دەگاتە هەموو دونیا.

ئەگەر ئیسرائیل بەو عەقڵیەتە ساویلکەیە بیر بکاتەوە دەبێت سەرۆکەکانی ئەمریکا و ئەوروپا وەک خوداوەندی گریکەکان بپەرستن وپەرستگایان بۆ دروست بکەن، کەچی هەر باسیشیان

ناكەن وشەو وڕۆژیش وەكو ئێمە پێیان هەڵنادەن كەچی ئێمە بۆ فەتوایەكی دراوی ناو حوجرەیەك، شەو و ڕۆژ بەبیری خۆمانی دەهێنینەوە، ولە جیاتی شیعەش ئەو كارە دەكەین، شەقام و شوێنی گشتیان بەناو دەكەین، كۆنفرانسیان بۆ دەبەستین، ولە نووسیندا زوو زوو ئاماژەی پێ دەكەین !ئەی كاتی خۆی شێخ مەحمودی نەمر بە شێوەیەكی كرداری یارمەتی شۆڕشی شیعە وعێراقیەكانی نەدا لە دژی هێزی بەریتانیەكان، ئەگەر ئەوان جاروبار لە كتێبی مێژوودا باسی بكەن، زۆرجاریش هەر ڕۆڵی گەورەی كورد لە شۆڕشی بیستی عێراقدا فەرامۆش دەكەن لە جیاتی ستایش وپیاهەڵدان دا. من لە لێكۆڵەرێكی گەورەی عەرەبی شیعە وەک بەڕیز ڕەشید خەیوونم بیست كە ئەو فەتوایە هیچ بنەمایەكی نیە، وبەڵگەش لەسەر ئەوە ئێمە لە مێژوودا فەتواكانی سەردەمی مالكی كوڕی ئەنەس و شافیعی و ابن تیمیە و شەوكانی و محمد بن عبدالوهاب و محمد عبده مان ماوە، كەچی ئەو فەتوایە دەقەكەی كەس نەیدیتوە وكەس دەستی نەكەوتوە! دەكرێت هەر قسەیەكی مەجلیس بوبێت ودوایی وەك فەتوا بەناو خەڵكیان بڵاوكردبێتەوە !خۆم سەرلەبەری ئینتەرنێت گەڕام، سەرەڕای بازرگانی كردنی خێزانی حەكیم و شیعەی عێراق بە گشتی بەو فەتوایە، یەكێكیان بڵاوی نەكردۆتەوە لە سایتێك كتێبێك، خەیوون لە زمانی كەسێكی نزیك لە محسن الحكیم وە دەڵێت: تەنها هەڵوێستێك لە حەكیم ڕویدا بێت، ئەوە بوە كە كاتێ عبدالسلام كۆنفرانسێكی بۆ مەلاكانی سونە وشیعە بەست بۆ دەركردنی فەتوایەك دژی كورد، حەكیم نەچۆتە ئەو كۆنفرانسە، و عوزری هێناوەتەوەش، بە غەیری تەحریمكردنی ئەو هەڵوێستە لە دژی كورد! بێگومان محسن الحكیم تەنها زاناش نەبوە كە ئامادەی ئەو كۆنفرانسە نەبوو بێت، بەڵام شیعە زۆر بلیمەتن بۆ گەورەكردنی بچوكەكانیان، وەك پەنجە زامدارە سوكەكەی عادل ئیمام یەك تۆپ شاشی لێ دەپێچن! نەك وەك كورد باسی گەورەكانیشی ناكات بە دەگمەن نەبێت، دەبزانە تا سەد جار گوێمان لە فەتواكەی حەكیم دەبیت، چەند جار گوێمان لە بەهانا چوونەكەی شێخ محمود دەبیت بۆ هێزەكانی شیعە لە خوارووی عێراق؟!

محەمەد هەریری

13-04-2015خەندان

## وتارێکی چەواشەکارانەی ئیسلامیەکان

بەڕاستی وتارێکی چەواشەکارانەیە ئەمڕۆ ئیسلامیەکانی کورد پەیڕەوی دەکەن سەبارەت بەو بار و دۆخەی کەرتی غەزە وئیسڕائیل. دەیانەوێت سەرەڕای ئەو هەموو ترسناکیەی لە نێو ماڵی کورددایە زوومی بیرودەروونی کورد هەمووی بخرێتە سەر شەڕە دێرین ونوێکەی حەماس و ئیسڕائیل، و خەمسارد بین بەرامبەر ئەو هەموو مەترسیانەی لەسەر کوردە لە عێراق، کە ئەمڕۆ کوردستان بۆتە هاوسێی دەوڵەتی خیلافەتی داعش، کە فاشسترین هاوسێی کوردە لەوەتی کوردستان هەیە، و لەوانەیە هەزاران لایەنگری داعشی لەناومان هەبێت! کوردستانێك پڕیەتی لە ئاوارە و عەرەبی بێ کۆنترۆڵ کە بۆی هەیە لە ساتێکی تەنگاویدا گەورەترین مەترسی لەسەر ئەمن وئاسایشی نەتەوەیی دروست بکەن، کوردستانێك بە ئاشکرا دوولەت بووە لەسەر کێشەکانی دوای داگیرکردنی موسڵ وناکۆك لەسەر مادەی ١٤٠ و چۆنیەتی رەفتارکردن لەگەڵ داعش و حکومەتی عێراق، وپرسی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار وبێ مووچەیی ودەیان وسەدان کێشەی تر.

ئەو برادەرە ئیسلامیانە پێیان وایە کورد زۆر موقەسیرە بەرامبەر خەمخواردن بۆ غەزە و گریان وفیغان وشین بۆ کردن!! لەوەتی من و دەیان نەوەش پێشە من ودوای منیش بەخۆمان زانیوە هەموومان خەمی قورس وفرمێسکی سوێرمان بۆ فەلەستین ڕژاندوە لە بەرامبەر هێزی جەرگبڕی ئیسرائیل، کە زۆر بێ ڕەحمانە دەیان کوتێت، هەرچەندە ئیسڕائیل یش فەلسەفەی خۆی هەیە لەوەدا، ودەزانێت چ کەراهیەتێك دروستکراوە لەناو عەرەب وموسڵمانان لە دژیدا، بەجۆرێك هیچ بوارێکی بۆ پێکەوەژیان نەهێشتۆتەوە، وهاوکێشەکەی کردۆتە یان دەبیت یان نابیت!

پاش سزادانی مەلایەك لەسەر وتاردانی بێ مۆڵەت، کە دەکرا تێپەڕێت ئەگەر خەڵك سکاڵای لە دەست نەکردبا ، لەبەر دوعاکردن بۆ حەماس و موجاهیدانی سوریا و دەیان وڵاتیتیر وفەرامۆشکردنی دوعایەکی خێر بۆ پێشمەرگەی کوردستان، کە دەیان شەهیدیان داوە لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ داعشدا، وئەوانەی لەسەر سنوور لەژێر پلەی ٥٠ سەدی بەرگری لەو ژیانەی کوردستان دەکەن، کە لە چاو بەشەکانی تری عێراق هەر بەهەشتێکە بۆ خۆی، پاش ئەو سزادانە سوکەی بەرامبەر ئەو بێ شعوریەی کە خەڵکی مزگەوتەکەش پێییان قبوڵ نەکراو وسکاڵایان لەدژی کرد، دەیان نوسەر ولایەنگری ئیسلامی قسەی زۆر سارد وسڕ بە خەڵکی کورد و بەرپرسەکانی دەڵێن گوایە هەستیکی برایانەیان نیە بەرامبەر برایانی حەماس، باس لەو بێ شعوریە و بێ بەهاییەی ئەو مەلایە ناکەن کە لەسەر خێر وبێری ئەو وڵاتە

ده‌ژیت وه‌ك وه‌فایه‌ك دوعایه‌كی خێریش بۆ ئه‌و برا پێشمه‌رگانه‌ بكات، كه‌ من ده‌زانم كه‌ نه‌شیكردوه‌ زۆر ڕێی تێده‌چێت هه‌ر داعشێكی خه‌وتوو بێت و پێشمه‌رگه‌ به‌ كافر بزانێت، چونكه‌ داعش فكرێكی زۆر هه‌ن له‌ناو مه‌لاكاندا، كه‌ به‌و چاوه‌ له‌ كۆی ئه‌زموونی كوردی ده‌ڕوانن.

ده‌یانه‌وێت له‌و بێ مووچه‌ییه‌ی خه‌ڵك هه‌موو كورد خه‌ریكی پاره‌ وكۆمه‌ك كۆكردنه‌وه‌ بێت بۆ غه‌زه‌یه‌ك هه‌تا مه‌سیحیه‌كانی دنیاش پشتگیریان لیده‌كه‌ن وكۆمه‌كیان بۆ كۆده‌كه‌نه‌وه‌.

به‌ڕای من ئه‌وه‌ی دڵی ئازاری نه‌دا له‌به‌رامبه‌ر دیمه‌نی ئه‌و هه‌موو خوێن وكوژراوانه‌ ده‌بێت گومان له‌ مرۆڤایه‌تی خۆشی بكات، به‌ڵام كێشه‌كه‌ له‌وه‌دایه‌ حه‌ماس ته‌نها ئه‌و چیرۆكه‌ دووباره‌یه‌ ده‌زانێت و هیچ له‌ شێوازی خه‌باتی خۆی ناگۆڕێت. ئه‌ویش له‌ناو غه‌زه‌دا كه‌ یه‌كێكه‌ له‌ قه‌ره‌باڵغترین زه‌وی دنیا و ناوچه‌كه‌یه‌ له‌سه‌ر ٣٦٠ كیلۆمه‌تری چوارگۆشه‌ دوو ملیۆن كه‌س زیاتری لێ ده‌ژێت وبه‌ ڕێژه‌ی ٢٦٤٠٠ كه‌س له‌سه‌ر یه‌ک كیلۆمه‌تری چوارگۆشه‌، له‌و شوێنه‌ قه‌ره‌باڵغه‌ چه‌ند ڕۆكێتێك به‌ ئیسرائیل وه‌ده‌نێ، وله‌ وه‌ڵامیشدا ئیسرائیل به‌ وردترین ته‌كنۆلۆژیا و به‌ گۆتره‌ش رۆكێته‌كانی باوێ قوربانی زۆری لێ ده‌كه‌وێته‌وه‌، له‌به‌ر چڕی دانیشتوان، به‌ڵام ده‌بێت یه‌كێك بپرسێت ئایه‌ حه‌ماس كه‌ ده‌زانێت ڕۆكێته‌كانی هێنده‌ ورد و پێشكه‌وتوو نین هیچ حیسابێك بۆ مه‌ده‌نیه‌كانی ئیسرائیل ده‌كات؟! وه‌ڵام نه‌خێر، چونكه‌ هه‌موو كۆمه‌ڵگای ئیسرائیل ئامانجی سه‌ربازیه‌ له‌ گۆشه‌نیگای حه‌ماس وهه‌موو ئیسلامیه‌ جیهادیه‌كان وموفتی سه‌ته‌لایته‌كان به‌ قه‌ره‌زاویشه‌وه‌! كه‌وابوو كه‌ حه‌ماس ئه‌مڕۆ مه‌ده‌نیه‌كانی ئیسرائیل ناكوژێت له‌ مرۆیی و ئینسانیه‌تی خۆی نیه‌، به‌ڵكو له‌به‌ر جیاوازی پێشكه‌وتنی ته‌كنۆلۆژیایه‌، ده‌نا من گومانم نیه‌ ئه‌گه‌ر عه‌ره‌ب به‌ گشتی وئیسلامیه‌كانیان به‌ تایبه‌تی پێشكه‌وتنی ته‌كنۆلۆژی له‌ده‌ست ئه‌واندابا ئێستا قه‌سابخانه‌ی جوله‌كه‌ به‌ڕێوه‌ بوو له‌ هه‌موو لایه‌ك، و گومان ده‌به‌م ئێستا یه‌ك جوله‌كه‌ش به‌ زیندوویی بمێنێت، كه‌وابوو ئیسرائیل به‌و ته‌رسانه‌ گه‌وره‌ی چه‌كه‌ كۆكوژه‌كانی هێشتا له‌ چاو عه‌ره‌ب به‌ به‌زه‌ییتره‌ كه‌ غه‌زه‌ له‌سه‌ر نه‌خشه‌ ناسڕێته‌وه‌، چونكه‌ عه‌ره‌ب له‌و هه‌ڵوێسته‌ با ده‌یكرد ومن یه‌ك توزقاڵ گومانم نیه‌.

كه‌ هێزی وا به‌كار ده‌هێنێت، ئیسرائیل ده‌زانێت له‌گه‌ڵ چ دوژمنێك هه‌ڵسوكه‌وت ده‌كات، خۆ كوردی ساویلكه‌ نیه‌ دوژمنی خۆی نه‌ناسێت، وچاكیان ده‌ناسێت وده‌زانێت كه‌ نایكه‌ن هه‌ر ئه‌وه‌نده‌یان پێ ده‌كرێت!

یه‌ك له‌و ئیسلامیانه‌ به‌ ناوی ئیكرام كه‌ریم چاوه‌ڕێی ئه‌وه‌ ده‌كات خوا سزای هه‌موو میلله‌تی كورد بدات له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌رپرسه‌كانی وه‌ك ده‌ڵێت:

"زۆر ئه‌ترسم-خوانه‌كرده- كورد ئاواره‌بییه‌كی گه‌وره‌ی به‌سه‌ردابیت له‌به‌رئه‌وه‌ی كه‌سانێك له‌پله‌ی به‌رپرسیاریتیدان و به‌زه‌ییان ناجولی بۆ ئه‌و هه‌مووه‌ منال و ژن و مه‌ده‌نیه‌ له‌توكوتكراوه‌ی غه‌ززه‌..ئه‌و كاته‌ ئێمه‌ گله‌یی له‌كی بكه‌ین كه‌ دلی بۆمان نه‌سووتیت؟"

من داوا له‌ كاك ئیكرام وهه‌موو ئه‌وانه‌ی وا بیر ده‌كه‌نه‌وه‌ بۆ یه‌ك ساتیش بێت بیر له‌وه‌ بكه‌نه‌وه‌: ئایا ئه‌و هه‌موو كوشتاره‌ی به‌ین نا به‌ین له‌ فه‌له‌ستینیه‌كان ده‌كرێت و ئاواره‌ و برسی ده‌كرێن وگه‌مارۆ ده‌درێن، بلێی هۆكه‌ی - به‌پێی لۆژیكی خۆیان - له‌به‌ر بێ شعوری فه‌له‌ستینیه‌كان و نه‌جولانی به‌زه‌ییان بێت بۆ ئه‌و هه‌موو منال و ژن و مه‌ده‌نیه‌ی له‌توكوتكراوه‌ی، ئه‌نفالكراوه‌ی، كیمیا بارانكراوه‌ی، موسلمانان ومرۆڤه‌كانی تر نه‌بێت؟

ئایا ده‌بێت هه‌موو دنیا بسوتێت بۆ فه‌له‌ستینیه‌كان كه‌چی ئه‌وان وه‌كو هێزێكی شۆڕشگێر و میلله‌تێكی چه‌وساوه‌ كه‌مترین هاوسۆزیان نه‌بێت به‌رامبه‌ر ئه‌و میلله‌تانه‌ی كه‌ له‌وان چه‌وساوه‌تر نه‌بن كه‌متر نین؟!

بۆ نمونه‌ كورد زۆر له‌وان چه‌وساوه‌ تره‌، ئه‌وان گیریان به‌ ده‌ست ده‌وله‌تێك خواردوه‌ كه‌ گه‌له‌كه‌ی موسلمان نین و به‌ سوود وه‌رگرتن له‌ توراسی دینی ومیژوویی توانیتیان وه‌ك شه‌یتان وێنای بكه‌ن له‌ میدیای عه‌ره‌بی وئیسلامی وله‌لایه‌ن كۆمه‌لگاكانیشیان، كه‌ ئیسرائیله‌، كه‌چی كورد گیری خواردوه‌ به‌ده‌ست چوار ده‌وله‌تی داگیركه‌ر وچوار گه‌لی سه‌ره‌كی موسلمانان، كه‌ نه‌ك نه‌یتوانیوه‌ سته‌م و بێ دینی ئه‌و گه‌لانه‌ ده‌ربخات، به‌لكو ئه‌وان توانیتیان زیاتر كورد بشێوێنن و له‌ كه‌مترین هاوسۆزی بێ به‌ش بێت له‌لایه‌ن گه‌لانی ئیسلامی و عه‌ره‌بی، به‌س چونكه‌ ئه‌و ده‌وله‌تانه‌ خاوه‌نه‌كانی به‌ حیساب موسلمانن! له‌ زیهنیه‌تی ئیسلامی عروبی، كه‌ زۆربه‌ی ئیسلامیه‌كانی جیهان به‌ كورده‌وه‌ش له‌ ژێر كاریگه‌ری ئه‌و ئیسلامه‌ عروبه‌یه‌ن، كێشه‌ی فه‌له‌ستین وه‌ك ڕوكنێكی ئیمانی لێهاتووه‌، كه‌چی كێشه‌ی كورد وه‌ك به‌تالكه‌ره‌وه‌ ونه‌واقزی وزو و ده‌ستنوێژی لێهاتووه‌! بۆیه‌ ده‌بینیت وتاری فه‌رامۆشكراوی ئیسلامی میانڕه‌و و وتاری توندوتیژی ئیسلامی داعیشی به‌رامبه‌ر ورد، ته‌نها جیاوازیه‌كه‌ی له‌ بوونی دوژمنێكی چه‌كدار و دوژمنێكی بی چه‌كدایه‌!

خاك و ژماره‌ی كورد ده‌ هێنده‌ی فه‌له‌ستینیه‌كانه‌ گه‌ر زیاتریش نه‌بیت، له‌گه‌ل ئه‌وه‌شدا قه‌باره‌ی پالپشتی نێوده‌وله‌تی بۆ كورد ناگاته‌ ١٠% فه‌له‌ستینیه‌كان. وچه‌ندین لایه‌نی تریش ده‌یسه‌لمێنێت كه‌ دۆز و حالی كورد چه‌نده‌ ناله‌بارتره‌ له‌ حالی فه‌له‌ستینیه‌كان.

ئیسلامی كوردی هیچ به‌رپرسیاره‌تێكی ئایینی و ڕه‌وشتی نابینێت له‌لای حه‌ماس و فه‌لستینیه‌كان به‌رامبه‌ر كێشه‌ی كورد و گه‌لانی تر، كه‌ من پێموایه‌ هه‌لوێستیان له‌به‌ر نه‌زعه‌ی عرووبی سه‌دامی زۆر خراپتره‌ به‌رامبه‌ر كورد تا میلله‌تانی تر، بێ ده‌نگه‌ به‌رامبه‌ر

خه‌مسار دیان وبێ هه‌ڵوێستیان ده‌رهه‌ق به‌ دۆزی کاره‌ساتاوی کورد، که‌چی ئه‌گه‌ر کوردێکی وه‌ك من ئه‌و پرسیارانه‌ بوروژێنم ئاماده‌یه‌ هه‌زار تانه‌ وته‌شه‌رم لێدات، که‌چی له‌وه‌تی هه‌م وله‌وه‌تی میلله‌ته‌که‌م خه‌بات ده‌کات لایه‌نگری کێشه‌ی فه‌له‌ستین بووین، و ماوه‌یه‌که‌ گه‌یشتووین به‌و ته‌سائولاتانه‌، به‌ڵام ئه‌و فه‌له‌ستینیانه‌ له‌وه‌تی هه‌ن هه‌ر وابوون، وادیاره‌ هه‌رواش ده‌مێننه‌وه‌ له‌ سایه‌ی ئیسلامیزمی عرووبی وکلك و پاشکۆکانیان له‌ناو ئیسلامیه‌کانی میلله‌تانی تر.

٢٠١٤/٧/٢٣

# وەستایی کورد لە دۆڕاندنی دۆستەکانی
## لە پەڕاوێزی کۆڕەکەی حەسەن عەلەویدا لە سلێمانی

بەر لە ماوەیەک نوسەر وبیرمەندی عێراقی حەسەن عەلەوی هاتە کوردستان بۆ ئەنجامدانی چەند چالاکیەکی سیاسی، لە نێو ئەوانەشدا بەستنی چەند کۆڕێک بوو لە شارەکانی کوردستان و لەنێویاندا کۆڕێکی لە سلێمانی بەستبوو باسی سەرەکی کۆڕەکە هاندانی کورد بوو بۆ جاڕدانی سەربەخۆیی کوردستان ووەک بیرمەندێکی شارەزا بە مێژووی کورد وعێراق...

کۆڕەکەی عەلەوی ئێوارەی رۆژی 2011/10/15 لە هۆڵی تەلاری هونەر لەسلێمانی، بەناوی (دەوڵەتی کورد، دواڕۆژەکانی بێدەنگی) سازکردبوو، سەرەڕای ئەوەی کۆڕەکە سەرتاپای تەرخان کرا بوو بۆ زیندوو کردنەوەی گیانی خەوتووی سەربەخۆیی لە مرۆڤی کورددا، بەڵام وەک هەمیشە کە کورد بەشێوەیەکی گشتی زۆر وەستایە لە دۆڕاندنی دۆستەکانی یان هەر لە بنچینەدا موبادەرەی دروستکردنی دۆست بۆ خۆی گەلێک لاوازە هەتا بەراورد ناکرێت بە هەندێک گەلانی خەباتگێر کە لە چاو کوردا سەرەتایین، هەر لەو کۆڕەدا کانی بلیمەتی مەلا بەختیار تەقیەوە وەک مەلایەکی تازە فێری کوردایەتی بوو، وەک بڵێی هەموو ئەو قسانەی عەلەوی یەک زەرە کاری لێنەکردبێت، وتەریق نە بوبێتەوە وەک بەشێک لەو دەسەڵاتە کوردییەی کە بیرۆکەی دەوڵەتی کوردی کردە خەونی شاعیران وماعیران، لەو کۆڕەدا مەلا بەختیار وەک بەرپرسی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، رەخنەی لە حەسەن عەلەوی گرتبو لەبەرامبەر بەکارهێنانی وشەی (الاکراد) لەجیاتی (الکورد) !! حەسەن عەلەوی زۆر پەست ببوو بە ڕەخنەکەی مەلا وهەستابو کۆڕەکەی بەجێهێشت و لەهۆڵەکە چووە دەرەوە، من لێرەدا هەقم بەسەر هەڵسەنگاندنی حەسەن عەلەوی نییە ودلنیاش نیم لە نیازی چونکە لە خوێندنەوەی کتێبەکانی سەرنجی لا دروستکردووم، بەڵام هەقی پێدەدەم کە ئەو کاردانەوەی هەبێت، شیاو نییە ڕەخنەیەکی وا سووک بە ڕووی بیرمەندێکی وا دابدەیت کە هاتوە باسی سەربەخۆبوونی کوردستانت بۆ دەکات جا با بەهەر پاڵنەرێک بێت...

بەو جۆرە رەفتارانە دۆستێکی زۆرمان دۆڕاندوە زۆربەی ئەوانەشی بونەتە دۆستمان کەسانی بودەڵە ومفتە خۆرن. حاڵی مەلا بەختیار وەک نوێنەرێکی دەسەڵاتی کوردی وەک حاڵی ئەو کابرا کوفیەیە کە پرسیاری خوێنی مێشولەی لە ئیبنو لعەباس کردبوو بەر لە زەردبوونی کفنی حەزرەتی حوسێن، کە لە وەڵامدا ئیبنو لعەباس پێی گوتبوو خوێنی حوسێن دەڕێژن وپرسیار لە خوێنی مێشولە دەکەن؟!! بێگومان رەخنە وپرسیارێکی وا لە کاتێکی وا ناکرێت لە کەسێک باسی پێویستی جاڕدانی دەوڵەتی کوردیت بۆ دەکات، ئەو پرسیار و رەخنە هەرزەکارە بۆ سەرودڵ گرتنی شۆڤێنییەک ئاڕاستە دەکرێت، خۆزگە سەرکردەکانی کورد بە نیوەی حەسەن عەلەوی هەستیان بەو زەرورەتە دەکرد خوای دەکرد هەموو دونیا بە

ئەکراد بانگیان دەکردین، هەروەک چۆن ئێستا هەموو دونیا بە هەولێر دەڵێن ئەربیل وهەتا دەسەڵاتیش ناوی فڕۆکەخانەی ئەربیلی نێودەوڵەتی کردە ئەمری واقیع، ئەگەر ئێمە بە خۆمان هەوڵ نەدەین ئەربیل بگۆڕین بە هەولێر، تۆ چاوەڕوانی حەسەن عەلەوی وعەرەب بەگشتی (الاکراد) لەجیاتی (الکورد) بڵێن؟! کێشەی مەلا بەختیار زیاتر دەروونییە حەزی خۆدەرخستنی خۆی بۆ کۆنترۆڵ ناکرێت جا با بەهەر شێوەیەک بێت، حەز دەکات هەردەم وەک بیرمەندێک وفەیلەسوفێکی مارکسیزم لە ڕابردوو وسۆشیال دیموکرات لە ئێستا وڕۆشنبیرێکی بلیمەت وحەداسەوی وموتەنەور خۆی دەرخات، کەچی ئەگەر بڕوانینە ژیننامەی مەلا بەختیار لەناو دەسەڵاتی کوردیدا شوێنکاری هیچ یەکێک لەو ئیدیعایانە نابینین، کەچی ئەو برادەرە هێشتا بە عەقڵیەتی ئاڵای شۆڕش دەژیت و وادەزانی هێشتا لەناو کۆمەڵی پێشمەرگەی نیمچە خوێندەوارە ووەک باران زاراوەی مارکسیزم ولینینیزمیان بۆ دەبارێنێتو هەموومانی سەرسام کردوە بە عەبقەریەتی!

مەلا بەختیار وادەزانی کێشەی ئێمە کێشەی زمانەوانییە (الاکراد) و (الکورد)ە ، نازانێت کێشەی ئێمە کێشەی چارەنووس وجودییە، ئەوەی دەسەڵاتی کوردی بە هەردوو ئیمارەتەکەوە بە خەونی کوردیان کرد لەوەتی ١٩٩١ وە کارەساتە بەمانای وشە، لە ژێر سایەی ئەو دەسەڵاتە گەندەڵەدا گیانی ئینتیما بوون خەریکە بەتەواوی لەناو دەچێت لەناو تاکی کوردا... لە ژێر سایەی ئەو دەسەڵاتە خاینبوون وفایلداربوون میدالیای شەرەفە لەسەر سنگی هەر خائینێک، لە سایەی ئەو دەسەڵاتە ئەوەی کاتی خۆی هەزار قوربانی داوە تا خیانەت نەکات لەو ڕۆژگارە پەشیمان بۆتەوە ودەڵێت چیم بەخۆم کرد ئەگەر خیانەتیشم کردبا دوور نەبوو ئێستا بەرپرسێك بام!! هەرنەبا دڵتەنگ نەدەبووم بە بەرجاوی ئێمە خائینان لە دڵسۆزان نزیکتر کەنەوە!

لە ژێر سایەی ئەو دەسەڵاتە باشوری سودان بەو هەژاری ودواکەوتویەوە سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت، ئێمەش لەو عێراقە نا موبارەکە وا لکاوین پێی وەک ئەو کۆتە تۆپە ئاسنینە لێهاتوە کە ناهێلێت هەنگاوێک بهاوێژین بەرەو ئاسۆ، وەک مەڕ چاوەڕوانی قەسابەکەمان دەکەین تا جوان جوان چەقۆکەی بۆما تیژ دەکاتەوە وڕۆژانە گوێمان لە کڕینی چەک وتفاقی سوپای عێراقی عەرەبی دەبێت، خەممان نییە بە کەچە دەبابەکانی پاشماوەی سەدام بەگژ نوێترین چەکی ئەمریکی دەبینەوە کە لە دەست حکومەتە دیموکراسیەکەی عێراقە وبەسرودی کەس نەڵێ کورد مردوە بەرەنگاری چەکی ئەتۆمیش دەبینەوە!
کورە مەلا گیان بەو هەموو تاوانەوە باسی (الاکراد) و (الکورد) م بۆ دەکەیت، بەو هەموو سوکایەتیەوە کە دەسەڵات بە کورد وکوردستانی کردوە دەبێت زۆر مەمنوون بیت پێمان بڵێن (الاکراد)
٢٠١٢/١/٧

## کوشتنی کاوە پیلانێکی قورەیشیە!

کاتی خۆی قورەیشەکان کە بێزاربوون لە پەیامی پێغەمبەر محمد [د.خ] کە گومانی دەخستە سەر دین وبیروڕاو وداب ونەرێت وهەموو گەندەڵیەکانیان، بڕیاریان دا تیرۆری کەن لەناو ماڵەکەی خۆی. بەڵام بۆ ئەوەی کەس وکاری پێغەمبەر نەتوانن تۆڵە بکەنەوە پیلانیکی نەگریسیان بە مێشک داهات، بێگومان مێشکی گەندەڵان بۆ کوشتن وحیزفرسەتی زۆر چاك ئیش دەكات. ویستیان لە هەر قەبیلە وعەشیرەتێك گەنجێکی شەلاتی بێنن وەك شەلاتیەکان وچەورەکانی دەسەڵاتی کوردی، تا بەیەکڕا پێغەمبەر تیرۆرکەن وخوێنی بەناو عەشیرەتەکاندا بڵاوبێتەوە، وبەنی هاشمیش بێگومان ناتوانێت شەڕی هەموویان بکات، ئەوەبوو خۆشبەختانە پیلانە نەگریسەکە سەرنەکەوت.

ئەمڕۆ خوێنی کاوە گەرمیانی شەهید وەك هەمان پیلانەکەی لێهاتوە، چونکە هەر یەکێك وبەرپرسێك دەگریت بە توندترین وشە ئیدانە ومەحکومی تاوانەکە دەکات هەتا خولە ژەنگاویش کە بە تۆمارکراوی سەدان جوێنی شەلاتیانەی بە کاوە دا ودەیان هەڕەشەی لێکرد، ئێستا دەڵێت تا بکوژەکانی نەدۆزمەوە هەدا نادەم! کاوەی جوانەمەرگ دۆسێی گەندەڵی زۆرێك لە بەرپرسانی یەکێتی جوڵاندبوو، چەندینیان سکالای یاساییان لەسەر تۆمارکردبوو، علی اساس زۆر یاسادۆستن. کە هەموویان ئیدانە بکەن وهەمووشیان گەندەڵ بن، کەوابوو بە زمانی حاڵ دەڵێن هەموومان بکوژی ئەوین، کەوابوو خوێنی بەسەر هەموو شەلاتیە گەندەڵەکان دابەشکراوە وەك شەلاتیەکانی دوێنێی قورەیش، بەس داخەکەم بەنی هاشیمێکیش نیە ئەو. بەنی گەندەڵانە لێی بترسن وەك چۆن قورەیش دەترسان.

دووشەممە, 09 کانونی یەکەم 00:122013

## هەڤاڵ ئەبوبەکر لە ڕۆشنایی بەڵگەکاندا

پێش ماوەیەك کورتە نوسینێکی سەرتاسەر ستایش بۆ بەعس وڕژێمەکەیم بەرچاو کەوت، ناوی کاک هەڤاڵ ئەبوبەکری لەسەر بوو منیش نازانم بۆ هەر لە یەکەم تماشاکردنی بە دوورم زانی ئەو جۆرە نووسینە ئاست نزمە هی کاک هەڤاڵ بێت، هەر بۆ زانینی زیاتر دەربارەی نوسینەکە وەك خۆی شەیرم کرد وبڵاوم کردەوە ولەسەر بابەتەکەشم نووسیبوو من تاوانباری کاک هەڤاڵ ناکەم، تەنها دەمەوێت بزانم خوێنەران چی لەسەر دەزانن. ئەوەبوو برادەرێکی بەڕێز زوو هاتە سەرخەت وگووتی ئەو شیعرە ساختەیە وهی کەسێکی سوکی بێ رەوشتە بەناوی هـ ب! وبۆی تەئکید کردم لە ڕێگای گفتوگۆیەکی نوسراودا کە هی کاک هەڤاڵ نیە وهی هـ ب یە.

بەڵام لێرە ولەوێ قسەی وا دەکرا وگوم لێدەبوو کە کاک هەڤاڵ زۆر هەلپەرست بووە وخۆ دەرخەر بووە، هەتا لە سەردەمی رژێمی سەدامیش شیعری نیشتیمانی [بەمانا بەعسیەکەی] نووسیوە وبەژداری زۆر کۆڕ وکۆبوونەوەی کردوە، کە کەسانی تر خۆیان لیی دەپاراست وەك میکرۆب.

هەڤاڵ ئەبوبەکر و د. ئاسۆ هەردوو سەرۆکی لیستەکانی بزوتنەوەی گۆڕان‌و یەکێتی لە دیبەیتەکدا دیتمانن چۆن شەڕی مان ونەمانی یەکتر تاڵ کردنیان دەکرد، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوانەی پییان وایە کە ڕاستی ون دەبێت لەو جۆرە دەبەرێك چوونانەدا، من پێم وایە دەکرێت زۆر ڕاستی ببینین وبدۆزینەوە کاتێ ئەندامانی دوو لایەنی ناحەز بە یەك بە گژ یەکدادەچن!

هەتا زۆرجار پۆلیس ویاسا سوود لە کیشەی نیوان دوو مافیاش وەردەگرێت، کە لیک تورە دەبن و زانیاری لەسەر یەکتر بڵاودەکەنەوە. بێگومان مەبەستم لە نمونە هێنانەوەیە نەك تەوسیف کردن.

بە نسبەت یەکێتیەوە من زۆر دەمیکە قسەی خۆم دەرهەقیان کردوە وخاڵێکی سپی نابینم تیایاندا تا بڵێم ئەو شتەیان باشە، کەوابوو ئەگەر رایەکی نێگەتیڤیشم هەبێت بەرامبەر گۆڕان یان کاندیدی گۆران پەیوەندی بە هەقیقەت خوازی نەبێت هیچی تر نیە.

کاتێ د. ئاسۆ فرەیدون رۆژنامەیەکی دەرهێناوە وتی "ئەمە رۆژنامەی هاوکارییە کەهەڤاڵ ئەبوبەکر شعری بۆ سەددام وتوە" بێ ئەوەی ناوبراو دەقەکە بخوێنێتەوە، و هەڤاڵ ئەبوبەکریش پێیوت کە دەقەکە بخوێنێتەوە، و داوای لێکرد رۆژنامەکەی بداتێو خۆیی بیخوێنێتەوە. کەمیك گوومانم کرد لەو بەڵگانە ڕاست بن، بەڵام کە من ئەو بەڵگانەم خوێندەوە کە چەند نووسینێکی شیعر ودیمانە وکۆڕی هەڤاڵ ئەبوبەکری تی تێدا بوو، تەنها ئەگەر بیوتبا هی ئەو نیە، لەوانەیە تا ساغ دەبوەوە بڕیارم لەسەر نەدابا، بەڵام وەك دیارە ئینکاری نەکرد کە نووسینەکان هی ئەون وبەڵکو تەنها داوای دەکرد بیدەنێ بەخۆی بیخوێنیتەوە! تا لەو قەڵەبالغیە وابخاتە میسکی لایەنگرانیەوە کە هیچی تیدا نیە، گریمان کاك ئاسۆ رۆژنامەکانی بدایە هەڤاڵ ئەبوبەکر، چی دەخوێندەوە کاك هەڤاڵ؟!

من کە لە هەقیقەت زیاتر خزمایەتیم لەگەڵ کەس نیە، پێوەریکم هەیە شوکر بۆ خودا دانی ناهەق بە کەس دانانێم، هەموو مرۆڤێك لە ئاست هەقیقەتدا یەکسانە لای من، وهیچ لەبەرئەوەی فلان هەڵگری ئەو ئایدیۆلۆژیا وئەو دین وئەو حزبەیە کار لە بڕیاڕی من ناکات، ئەگەر هەق لای مولحیدك، ئیسلامیەك، عەلمانیەک ، وەسەنەك، بەداییەك بێت، هەر هەقە وکەس پەسند ناکەم بەسەر ئەویت، بۆیە لێرەدا سەرەڕای ڕای نێگەتیڤم لەسەر یەکیتی، بەڵام ئەو بەڵگانە کاتێك کەسێك لێبڕادەمینێیت هیچ بوارێك بۆ ئەو هەقیقەتە ناهێڵنەوە کە ئەو هەڤاڵ ئەبوبەکرە کەسێکی هەلپەرست وماستاو کەر بووە بۆ بەعس ورژێم.

کەسانێك دەڵێن نابێت بەگوێی ئەو دوو حزبەی دەسەڵات بکەین چونکە خۆیان لە لوتکەی گەندەڵین وکەس بەقەد پیاوەکانی ئەوان پەیوەندیان لەگەڵ بەعس نەبووە، منیش دەلێم گومانم نیە لەو ڕاستیە، بەڵام ئەمرۆ نەوشێروان مستەفا کە گەورەترین عەقڵیەتی ئەرشیفیە باسی نەکات، ودلسۆزەکان باسی نەکەن لەبەر خاتری ئینتیمای حزبیان، وئەرشیفیش لای دوو حزبەکەی دەسەڵات بێت. ئەگەر ئەوان واتە دوو حزبەکە باسیان نەکردبا کێ باسي دەکرد کە هەڤاڵ ئەبوبەکر وا لە بونەکانی بەعس شیعری بە هەوەستی سیاسي بەعس هونیوەتەوە؟! یا کەسانی تری خاوەن ئەرشیفی سەربەخۆ ودڵسۆز باسیان کردبا، بەرلەوەی یەکێتی باسیکردبا. من پیموایە ئەوەی بە بچوکترین وتە پشتگیری بەعسی کردبیت شایەنی ریسواکردنە .دەزگای روشنبیری کوردی، چونکە بەعسي نەبووم، کتیبیکی منی هەر بزر کرد، کە من نوسخەشم لێی نەگرتبوەوە لەبەر بێ پارەیی ویستم ئەوان چاپی بکەن!!، ئەی خیرە دوو پیشانگا بو هەڤاڵ ئەبوبەکر دەکاتەوە؟!!!!

ئەگەر یەكێك كوڕی ئەو ڕۆژگارە بایت ولەناو ئەو هەموو تۆقینەی بەعس با، دەیزانی چ ناپاكیەكە لەو ناپاكانەی ئەو سەردەمە خۆش بین، ئیمە هەموو ژیانمان لە ترس ودڵەڕاوكێ دا بوو، ئەویش بەو پەڕی هەلپەرستانە بیت وشیعر بە ستایلی بەعسی بنوسێت بە كوردی. ڕاستە هیچیان ڕاستەوخۆ باسی صدام ناكەن، بەڵام مەرج نیە باسی بكەیت ڕاستەوخۆ تا بزانی ئەو شیعرە بۆ صدام وبەعس وتراوە، هەر كەسێك كەمێك لە دنیای نووسین سەردەركات دەزانێت، هەردەقێك بەپیی شوێن وكات مانای خۆی وەردەگرێت. ئەوەی جۆرج ئۆرویل لە لەندەن دەینووسی لە بوێریدا بەراورد ناكرێت بەوەی باسترناك دەینووسی لە ژێر ترس و تۆقینی سەركوتكرین دەزگای دەوڵەتی كۆمەنستی، فەرقی زۆرە تۆ بە ئازادانە دژی ئەمریكا بنوسیت وەك قەناعەتێكی شۆڕشگێڕانە ولە دەرەوەی فشار ودەسەڵاتی بەعس بە پاڵنەرێكی ئیسلامی یان ماركسی یان لە ژێر كاریگەری بیرمەندێكی وەك چۆمسكی، ولە نێوان هێرش كردنە سەر ئەمریكا وزایۆنیزم بە شێوازی بەعسیانە ودیان ڕەمزی بەعسی تیكهەڵكێشی شیعرەكەت كەیت تا پێت بڵێن [بارك الله فيك يا بطل]!!!. ئەو شیعرانەم خوێندەوە مادام دان بەوەش دادەنێت كە هی ئەو، ئەوە بەهیچ جۆریك گوومانم لە ناپاكی و هەلپەرستی هەڤاڵ ئەبوبەكر نەما، با نەك كاندیدی گۆڕان بێت، خوای دەكرد كاندیدی حەزرەتی عومەر وعەلی دەبوو.

نوسینەكان دیارە لە هەشتا ونەوەتەكان نووسراوە، لەو سەردەمەدا بەعس وەك سەگی هار لە یەک كاتدا پری كورد وشیعە وئیرانی دەدا ولەپاش داگیركردنی كوێتیش ڕووبەڕووی هێزی هاوپەیمانی خۆرئاوا ببوەوە، شەو ڕوژ لە دەزگا میدیاییە جاڕسكەرەكانی خەریكی خوێندان بوو بە ئەمریكا وزایۆنیزم، وباس هەر باسی پیلانە گڵاوەكانی ئەمریكا بوو كە گەمارۆی ئابووری خستبوە سەر عێراق، ودەزگاكانی سەدام بە ئەنقەست منداڵی عیراقیان لەبرسان وبێ دەرمانی دەكوشت بە بیانووی گەمارۆی ئابووری. ئایە ئەوەی دێت وبە شیعر گوزارس لەو وەزعە دەكات وجوین ونەفرەت بۆ ئەمریكا دەنیرێت وبەشان وبالی قودس هەڵدەدات، لە كاتێكدا دەیان قودسی كوردی داگیركراوە ودیت وباسی دەرمان بڕین دەكات بەوكەسە دەڵێین هەر لە ڕای خواوە ئەو بیرۆكانەی بۆ هاتوە؟! یان ئەو بیرۆكەیە لە دەوڵەتی ئیستیبدادی بە شێوەیەكی تۆماتیكی دەگوێزرێنەوە بۆ خەڵكی لەرزۆك وترسنۆك وهەلپەرست، ئەوانەی دەیانەوێت لە هەموو سەردەمیكدا خاوەن ئیمتیاز بن بێ ئەوەی هەڵوێستێكی مرۆیانەیان هەبوو بێت، بی ئەوەی ڕۆژێك تا بەیانی لە ترسی گیران ودڵەڕاوكی وهەڕەشەی بەعس خەوی نەزڕابیت؟!

تەسەور کە یەکێك لە ١٩٩٠/١٢/١٨ بێت لە کۆڕێک شیعر بخوێنێتەوە بە ناوی دژایەتی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق، بە ناوی پەردەلادان لە ڕووی ڕەشی ئەمریکا وهاوپەیمانەکانی!! یانی چەند مانگێك پێش راپەڕین، ئەی کەی ئەو کەسە هەڵوێستیکی هەبووە بەرامبەر ئەو ڕژێمە لە ئاستی قسە زلەکانیدا بێت؟!!

لە شیعری قەسابخانەکەی قودس و پەیامێك، هەڤاڵ ئەبوبەکر پاش ئیدانەیەکی دوور ودرێژ بۆ ئەمریکا و زایۆنیزم، بەشێوەیەك پیاو قێزی دێتەوە بەو جۆرە لەو سەردەمە وەك نصیر متقدم ورفیق حزبیەک وا بدوێت، لە چەند دێرێکدا وا غەزەل لەگەڵ بەعس وڕژێمەکەی دەکات:

وا لێرەوە..

لەم وڵاتە ئاشتی خوازە

بەهێزەوە

نامەم دەنێرمە ئاسمان و

هتد....

ئەو وڵاتە ئاشتی خوازە؟! کە نوقمی خوێنی ورد وشیعە وسونەش کرابوو لەسەر سنوورەکان؟!

لە شیعری [پەرەی مێژوو هەڵدەنەوە]، هەڤاڵ ئەبوبەکری بەزمانی عێراقچیەکی عەرەبی فەللوجە وئەنبار وئەعزەمیە قسە دەکات، باسی خیانەتی بازۆفت دەکات، کە رۆژنامەنووسێکی بەریتانی بە ئێرانی رەگەز بوو، صدام گرتی ولە سێدارەی دا بە بیانووی سیخوڕی، هەتا ئەگەر بابڵێین ڕاستیش بێت، وسیخوڕ بێت، سیخوڕ بووە بەسەر دوژمنەکەی کورد، ئیمە لە بیرمە ٩٩% ی لاوان ئەو کاتە هەتا لە تۆپێنیشدا حەزمان لیبوو عێراق بدۆڕێنیت، کوردێکی قوڕمساغی وەك هەڤاڵ ئەبوبەکر کاندیدی گۆڕان، چی داوە لە بازۆفت، یان بە زمانێکی بەعسیانە بڵێیت کاتی سایکس بیکۆ بەسەر چوو!!! ئێمە تا ئەو ساتەش ولەوانەیە سەدان جیلی تریش بەدەست سایکس بیکۆ دەناڵێنین، ئەوە تەنها کەسێك

وادەڵێت كه‌ خۆی به‌ به‌عس فرۆشتبێت ووه‌ك عه‌ره‌بێكی قه‌ومی توندره‌و بیربكاته‌وه‌. هه‌ڤاڵ ئه‌بوبه‌كر له‌و شیعره‌ وا ده‌ڵێت:

بزانن ئه‌و بایه‌ی كه‌ دێ

له‌ سێداره‌ی ناپاكیه‌وه‌

هه‌ر بۆنی [بازۆفت]ی لێ دێ

ئینجا بۆ چه‌ندان جاری تر

به‌رێگه‌تانا بچنه‌وه‌

چاك بزانن له‌م وڵاتا

جێگای خۆتان ناكه‌نه‌وه‌

كاتی [سایكس بیكۆ] نه‌ما

گشت سامانی وڵاته‌كه‌م

به‌ دیاری بۆ پاشا ببا!!!!!!!!!!!!

من ده‌زانم ماكینه‌ی دیعایه‌ی گۆڕان هه‌مووی له‌ خزمه‌تی لووس وپووس كردنی كاندیده‌كه‌یانن، ده‌زانم كه‌سی له‌ هه‌ڤاڵ ئه‌بوبه‌كر، زۆر بێ هه‌ڵوێستر وناپاكتر ئاشكرا بوون كه‌س سزای نه‌داوه‌، نه‌ میللەت ونه‌ ده‌وڵه‌ت وحكومه‌ت، به‌ڵام ئێمه‌ هه‌رده‌بێت له‌ كاری به‌رچاوڕوونی سڵ نه‌كه‌ینه‌وه‌ وبێ هیوا نه‌بین. من ده‌نگدان به‌ علی حسن مجید و هه‌ر كه‌سێك به‌ وشه‌یه‌ك پاڵپشتی ڕژێمی به‌عسی كردبێت له‌ ڕۆژه‌ سه‌خته‌كانی ترس وتۆقین وهه‌ڕه‌شه‌ وه‌ك یه‌كن.

سێ شه‌ممه‌, 22 نیسان 2014 00:54

## شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تی

كاره‌سات ئه‌وه‌یه‌ هه‌مومان كێشه‌یه‌كمان هه‌بێت ورۆژانه‌ وله‌ زۆرترین بۆنه‌كان یه‌خه‌مان پێ بگرێت، كه‌چی زۆربه‌ی بیرمه‌ند ونوسه‌ران ورۆشنبیرانمان لێی بێده‌نگ بن، ئه‌گه‌ر تێیدا به‌ژداریش نه‌بن.

شارچیه‌تی ئه‌و شێرپه‌نجه‌یه‌ بێ ئازاره‌یه‌ كه‌ خشپه‌ ده‌كاته‌ ناو هه‌موو قه‌واره‌ی بونمان وهێدی هێدی په‌ل داوێته‌ هه‌موو ده‌مار وشاده‌ماری جه‌سته‌ی نه‌ته‌وه‌ییمان، به‌ڵام وه‌ك زۆربه‌ی جۆری شێرپه‌نجه‌كان زۆر به‌ هێمنی وبێ ئازار كاری خۆی ده‌كات بێ ئه‌وه‌ی كه‌س ڕاچڵه‌كێ وداچڵه‌كێ. نوسه‌رانمان گفتوگۆ له‌سه‌ر هه‌موو كێشه‌ فیكری وفه‌لسه‌فیه‌كانی جیهانی ده‌ره‌وه‌ قسه‌ ده‌كه‌ن وده‌نوسن، زۆرجار به‌ زمانێك ده‌نوسن پڕ له‌ زاراوه‌ی سه‌یروسه‌مه‌ره‌ ودوور له‌زیهنیه‌تی گشتی، كه‌چی له‌سه‌ر كێشه‌ی شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تی نانوسن باسی ترسناكی ئاكامه‌كانی ناكه‌ن به‌سه‌ر كۆی قه‌واره‌ی كوردی، هه‌وڵ ناده‌ن وه‌ك ڕێنیشانده‌رێك وكه‌سانێكی ڕوناكبیری ئه‌و نه‌ته‌وه‌یه‌ فێری كوردپه‌روه‌ریان بكه‌ن، فێری قێز لێبونه‌وه‌یان بكه‌ن له‌ شارچیه‌تی وناوچه‌گه‌رێتی وعه‌شیره‌تچیه‌تی وهه‌ر ئینتیمایه‌كی تری به‌رته‌سك له‌سه‌ر حیسابی كوردبوونمان.

دیارده‌ی خۆشویستنی شاری خۆت زۆر سروشتیه‌ وشتێكی غه‌ریزیه‌، به‌ڵام كاتێك ئه‌و خۆشه‌ویستیه‌ له‌ ڕاده‌ی خۆی ده‌رده‌چێت وده‌بێته‌ پاڵنه‌رێك بۆ ڕق وسوكایه‌تی نیشاندان به‌رامبه‌ر شاره‌كانی تری هاوزمان وهاونه‌ته‌وه‌ت، لێره‌دا ده‌بێت هه‌زاران نیشانه‌ی ستۆپ وبوه‌سته‌ی بۆ به‌رزبكرێته‌وه‌، نه‌ك خه‌ڵكی نوخبه‌ی فیكریش لاسایی ئه‌و جۆره‌ ره‌فتاره‌ نزمانه‌ بكه‌نه‌وه‌ و وشوێنی كه‌ون.

شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تی له‌و سایتانه‌ ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ به‌ تایبه‌ت كراوه‌ بۆ گاڵته‌ كردن به‌ خه‌ڵكی شاره‌كانی تر: هه‌ولێریه‌ك هه‌بوو....هه‌ورامیه‌ك سواری ته‌كسی بوو، خانه‌قینیه‌ك نازانم چی كرد، كه‌ركوكیه‌ك وتی.... ئه‌وه‌ كۆی ئه‌و نوكتانه‌یه‌ی كه‌ تا راده‌یه‌كی زۆر سوكایه‌تی تێدایه‌ به‌ خه‌ڵكی شاره‌كانی تر، كه‌چی هێشتا سه‌رنجی هیچ نوسه‌رێكی بلیمه‌تی رانه‌كێشاوه‌.

شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تی وایكردوه‌ هێشتا هه‌ستی یه‌ك نه‌ته‌وه‌ییمان دروست نه‌بێت، له‌ قورئاندا ده‌ڵێت: [وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا] ئیمه‌ی كورد به‌ره‌فتارمانه‌وه‌ دیاره‌ هێشتا له‌ قۆناغی قبائلین ونه‌بوینه‌ته‌ شه‌عبێك له‌ شعوبه‌كان. ڕاسته‌ دوو ئیداره‌ییش وه‌زعه‌كه‌ی خراپتر كرد، به‌ڵام ئه‌ شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تیه‌ به‌ر له‌ ئیداره‌ی كوردیش هه‌ر هه‌بوو هه‌تا له‌ یادمه‌ جارێك

صدام حسێن ئاماژەی پێکرد وگوتی لە کوردێکم پرسی تۆ خەڵکی هەولێری؟ وتی: هەولێری چی من خەڵکی سلێمانیم! گوتی : اهل السليمانية حەز ناکەن وقبوڵ ناکەنپێیان بڵێن خەلکی هەولێرن!!

لە وڵاتان خەڵکی لە وەرزشدا بۆ نمونە پاڵپشتی یانەی شارەکەی خۆی دەکات. کە ئەوە شتێکی ئاساییە، بەڵام کە یانەیەکی وڵاتەکەی هەتا ئەگەر دوێنێ لە یانەی شارەکەی ئەوی بردبێتەوە، کاتێ لەگەڵ یانەیەکی بیانی یاری دەکات هەموو پاڵپشتی دەکەن، چونکە مەسەلەکە لە ناوخۆوە دەگۆرێت بۆ نیشتیمانی. لێرە لە کوردستان وانیە لەبیرمە پار کە یانەی هەولێر لە کۆتایی جامی ئاسیا یاری دەکرد کە دۆڕا، خەڵکانێک بەوپەڕی بێ هەستی وناکوردانە خۆشی خۆیان دەربڕی بەو دۆڕاندنە.!! هەر بەر لە چەند رۆژێك دوبارە بۆوە کاتێ هەولێر بە شورتە دۆڕا.

ئەگەر بیینە سەر نمونەیەکی تر، ئەویش بەژداری کچێکی کوردە لە هەولێر لە بەرنامەی ئەرەب ئایدل، لەسەرەتادا من رەئیم لەسەر نیە کوردێک بەژداری بکات لە بەرنامەیەکی عەرەبی چونکە جۆرێک لە پاشکۆیەتی وهیوایەتی حوکمی زاتی پێوە دیارە، بەڵام کە بەژداری کرد وراغب عەلامە وهەموو لیژنەکە رێگایاندا بە کوردی گۆرانی بڵێت، پەرواز حسێنیش گۆرانی بە کوردی گوت لەو ماوەیە کەمەدا بەرای من بەقەد چەندین ساڵی میدیای کوردی کوردی بە خەڵک ناساند، من لەشارێکی کۆسمۆپۆلیتی وەك لەندەن هەست بە کاریگەریەکەی دەکەم لە ناساندنی کورد وهونەری کوردی بە جەماوەری عەرەبی، بەس نیە هونەرمەندێکی گەورەی وەك راغب علامە گوتی تۆ نەخشەی هونەری کوردیت ئاشنا کرد بە نەخشەی هونەری عەرەبی، کچێك بەو عەرەبی نەزانیەوە وا بە جورئەت خۆی لەو بەرنامەیە بدات وبە کوردیش گۆرانی بڵێت، بەڕاستی ئەگەر دەستخۆشیشی لێناکرێت شایەنی ئەوە نیە قسەی خراپی پێ بگوترێت وەك کەسانێک لە پەیجەکانی فەیسبوك دەیکەن بەتایبەتی پاش لێدوانەکانی ئەحلام لەبەرنامەی ئەرەب ئایدڵ لەسەر ناوی کوردستان و گوتی کوردستان بەشێکە لە عێراق، ئەو قسەیەش هی هەموو سەرکردەکانی کوردە بڕۆن لە جیاتی هێرش کردنە سەر ئەحلام وپەرواز یەخەی سەرکردەکان بگرن وەك هونەرمەندی بەڕێز خالید رەشید دەڵێت. شار پرێس دەڵێت :لەشاری هەولێر بانگەشەکردن بۆ ئەوەی دەنگ بدرێت بە پەرواز حسێن کە بەشدارییکردووە لەبەرنامەی(arab idol) ی کەناڵی ئێم بی سی، گەیشووەتە قۆناغی هەڵواسینی لافیتە لەسەر شەقامەکان، بەڵام لەشاری سلێمانی هیچ نیشانەیەکی گەرموگوڕی دیار نیە بۆ پشتگیرییکردنی پەرواز. بۆ تەنها لەبەر ئەوەی لە هەولێرە؟!

نمونه‌یه‌کی تر زنجیره‌ی گه‌رده‌لوله‌، به‌ڕاستی ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ تێڕوانینی ڕۆشنبیرێك بێت وشارچیه‌تی وای لیبکات خه‌ڵکی شاره‌کانی تر وه‌ك کۆمبارس وقه‌شمه‌ر وکۆمێدی وبێ که‌ڵک ببینێت، ئه‌ی ده‌بێت تێروانینی نه‌زانه‌کان چۆن بێت؟! ئه‌وه‌ی له‌ گه‌رده‌لول بینم گوزارش بوو له‌ ڕای خه‌ڵکه‌ هه‌ره‌ شارچیه‌که‌ بوو که‌ به‌ چاوێکی سوك ده‌ڕوانێته‌ کار وخه‌باتی شاره‌کانی تر، وتێڕوانینی شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تی توختر ده‌کاته‌وه‌ له‌نێو نێوه‌نی ئه‌ده‌بی وگشتیدا.

ئه‌و جۆره‌ ره‌فتارانه‌ کاردانه‌وه‌ی خراپ دروست ده‌که‌ن، هه‌ر ئه‌وڕۆ که‌ باسی روداوه‌کانی حه‌ویجه‌ وکوژرانی چه‌ند پێشمه‌رگه‌یه‌کی خه‌ڵکی سلێمانی کرا، یه‌کێك گوتی: ئه‌گه‌ر کوژراوه‌که‌ سلێمانی بن هیچ کێشه‌ نیه‌؟! ئه‌و که‌سه‌ زۆر خولیای وه‌رزشه‌ چه‌ند جار گوێم لێی بوه‌ ره‌خنه‌ی گرتوه‌ له‌ شارچیه‌تی که‌سانێك له‌ سلێمانی، هه‌ستم کرد وه‌ک کاردانه‌وه‌یه‌ک وای گوت، هه‌تا من که‌ ناڕه‌زاییم نیشاندا له‌ قسه‌که‌ی وگوتم به‌ڕاستته‌؟! گوتی ناوه‌ڵڵا گاڵته‌م ده‌کرد!!

پێویسته‌ لێره‌دا ڕاستیه‌ك بڵێین که‌ خه‌ڵکی دینداری هه‌موو شاره‌کانی کوردی له‌ نێو خه‌ڵکانی تردا له‌ هه‌موان چاکترن له‌ نه‌بوونی ئه‌و حه‌ساسیه‌ته‌ شارچیه‌تیه‌ ئه‌گه‌رچی تاڕه‌ده‌یه‌کیش هه‌ر هه‌یه‌، ئه‌ویش له‌به‌ر ئاڕاسته‌ی ئایینی که‌ هه‌موو موسڵمانان وه‌ک برا وخوشکی یه‌ک سه‌یر ده‌کات، رۆشنبیرانمان هه‌موو ئه‌رکه‌ کۆمه‌ڵایه‌تیه‌کانیان فه‌رامۆش ده‌که‌ن بۆ مامۆستایانی ئایینی، که‌ ئه‌وانیش کاری خۆیان ده‌که‌ن دێن ڕه‌خنه‌یان لێده‌گرن!! چه‌ند نوسه‌ری ئێمه‌ کارێکی وای کردوه‌ ئه‌و شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تیه‌ نه‌مێنێ؟!

کاتی ئه‌وه‌ هاتوه‌ هه‌موو نوسه‌ران وروناکبیرانمان ئاوڕ له‌و شێرپه‌نجه‌ی شارچیه‌تیه‌ بده‌نه‌وه‌، کۆ هه‌ست ونه‌ستێکی وا دروست بکه‌ن خه‌ڵک پێی شه‌رم بێت باسی شارچیه‌تی بکه‌ن، چونکه‌ به‌ڕاستی هێشتا ئێمه‌ نه‌ گه‌یشتوینه‌ته‌ قۆناغی به‌ گه‌ل بوون!.

پێنج شه‌ممه‌, 02 ئایار 2013

## چۆن كورد ڕزگاری ده‌بێت له‌ ژێر كاریگه‌ری فۆرمی عه‌ره‌بی بۆ ئیسلام؟

به‌ڕای من سۆفیه‌ت له‌ بنه‌ڕه‌تدا كه‌ دروست بوو، هه‌وڵێك بوو بۆ قووڵبوونه‌وه‌ له‌ لایه‌نی ڕووحی و مه‌عنه‌ویات، و جۆرێك له‌ یاخیبوونی بێ ده‌نگانه‌ بوو له‌و ڕوحیه‌ته‌ جه‌نگاوه‌ره‌ی كه‌ زاڵه‌ به‌سه‌ر كۆی ده‌قه‌كانی ئیسلامدا، وه‌ك له‌ زنجیره‌یه‌ک وتار باسم كردوه‌ به‌ ناوی: ئیسلام وه‌ك ئاینێكی جه‌نگاوه‌ر!

هه‌روه‌ها ئه‌نجامی كارلێكه‌ری عه‌قڵیه‌تی میلله‌تانی نا عه‌ره‌بی و عه‌ره‌ب بوون. بۆیه‌ كه‌ ده‌ڕوانیته‌ كه‌سه‌ هه‌ڵكه‌وتوه‌كانی ته‌سه‌وف له‌ زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆریاندا عه‌ره‌ب نین .میلله‌تانی ناعه‌ره‌ب تووشی شۆك هاتن كه‌ بینیان هه‌ڵمه‌تی سوپایی گه‌وره‌ وه‌ك گه‌رده‌لووله‌ی بیابان دێت بۆ سه‌ریان به‌ ناوی دین و له‌ ژێر دروشمی دینیدا !چونكه‌ به‌رله‌وه‌ هێرشه‌كان هه‌ر به‌ ناوی ئیمپراتۆریه‌ت و ده‌وڵه‌ت و سیاسه‌تی داگیركردن و ڕووتاندنه‌وه‌ ده‌هاتن، وه‌ك هه‌ڵمه‌ته‌كان و شه‌ڕه‌كانی ده‌وڵه‌تی ڕۆم وفارس، هه‌رچه‌نده‌ قورئان ده‌یه‌وێت ڕه‌هه‌ندێكی دینی بداته‌ ئه‌و شه‌ڕانه‌، وه‌ك شه‌ڕی مه‌جوسیه‌ت و ئه‌هلی كیتاب باسی ده‌كات، و ده‌ڵێت موسڵمانان حه‌زیان به‌ سه‌ركه‌وتنی ڕۆمه‌كانی ئه‌هلی كیتاب ده‌كرد! به‌ڵام له‌ هه‌قیقه‌تدا ئه‌وه‌ ته‌نها شعوری موسڵمانان بوه‌ كه‌ له‌ زووه‌وه‌ ته‌فسیری دینیان بۆ هه‌موو ڕووداو و دیارده‌یه‌ك كردوه‌، ده‌نا ئه‌و شه‌ڕانه‌ له‌ ژێر هیچ دروشمێكی دینیدا نه‌ده‌كرا، وه‌ك شه‌ڕ و غه‌زای موسڵمانان. سۆفیه‌ت هه‌ر بۆیه‌ زۆر زوو ده‌ركه‌وت له‌ گۆڕه‌پانی ئیسلامدا، ویه‌كه‌م كه‌س كه‌ ناونرابێت سۆفی وه‌ک له‌ قسه‌كانی ابن تیمیة و"كشف الظنون" هاتوه‌ [ أبو هاشم الصوفي] كه‌ له‌ ساڵی سه‌د و په‌نجای كۆچی ١٥٠ هـ وه‌فاتی كردوه‌.

بێگومان كوردیش ڕۆڵی كاریگه‌ری هه‌بوو له‌ ده‌ركه‌وتنی سۆفیه‌ت وگه‌شه‌كردنی، شێخ عه‌بدولقادری گه‌یلانی و مه‌ولانا خالیدی نه‌قشه‌به‌ندی وسوهره‌وه‌ردی كوردبوون ، كه‌ ئه‌وانه‌ به‌ كه‌سه‌ هه‌ره‌ دیاره‌كانی ئه‌و مه‌یدانه‌ داده‌نرێن، جگه‌ له‌و كه‌سایه‌تیه‌ سۆفیانه‌ی كه‌ سه‌ره‌ڕای مه‌زنایه‌تیان، به‌ڵام شوهره‌تیان هه‌ر له‌ ناو كوردستان مایه‌وه‌، وه‌ك مه‌لای جزیری و مه‌حوی و ئه‌حمه‌دی خانی وگه‌لێكیتر.

ته‌ریقه‌تی سۆفی دیارده‌یه‌كی ئیسلامی گشتی بووه‌، به‌ڕای من ته‌نها شێوازی دینداری كورد نه‌بووه‌، به‌ڵكو زۆر له‌ كۆمه‌ڵگا ئیسلامیه‌كانی عه‌ره‌بی و فارسی وئه‌فغانی وهیندستانی

وئەفریقایی و مەغریبی وئەندەلوسی تەریقەت لە ناویاندا باو بووە .ئینجا دوو تەریقەتی تەسەوف کە هەبوو بێت لە ناو کورددا، تەریقەتی قادری و نەقشەبەندی بوون، یەکەمیان هەتا ئەگەر خاوەنەکەشی کورد بێت، بەڵام لە کوردستان لە دایك نەبوو، بەڵکو لە بەغداوە دەرکەوت وبڵاوبۆوە وگەیشتەوە کوردستان لەوێوە! نەقشەبەندیش هەر لە بوخارا وهیند دەرکەوت، مەولانا بەپێی خۆی چوو بۆ هیندستان و لە شاه عبداللە ی دهلەوی وەریگرت و هێنای بۆ کوردستان، هەرچەندە مەولانا خالید ئیزافاتی خۆشی خستە سەر تەریقەتەکە و سەرلەنوێ بنیاتی نایەوە، و ئەو قۆناغەی تەریقەتەکە بە ناوی ئەو ناونرا :نەقشەبەندی خالیدی! لەبەر ئەو هۆیانە من بە ڕەهایی لەو باوەڕە نیم کە دینداریەکی تایبەت بە کورد بێت، بەڵام دەکریت بڵێین کە تەسەوف نزیکترین شێوازی دینداریە بۆ دەروون و نەزعەی دینداری کوردی، لە سوودەکانی تەریقەتی نەقشەبەندیدا: نووسەری کتێبی النقشبندية نشأتها وتطورها لدي الترك، الدكتورة بديعة محمد عبد العال، الطبعة الأولى القاهرة ، الدار الثقافية للنشر، 2009، ص22: 28، دەڵێت: بە دەرکەوتنی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گیانی زوهد ودینداری زۆر بڵاوبوەوە و ڕێژەی تاوان و دزی و راوەڕووت و ڕێگری زۆر کەم بوەوە لە ناوچە کوردیەکان، ودەڵێت کاریگەری ڕابیتەی سۆفی ڕۆڵێکی گرنگی بووە لە هێورکردنەوەی ئەعسابی خەڵك و دوورکەوتنەوە لە خاتیرەی شەڕ و دووژمنکاری لە دەروونی مرۆڤایەتی! لە ژێر کاریگەری ڕێنوێنی وتەعالیمەکانی مەولانا. ئینجا تەریقەت توانی خەڵك بپارێزێت لە هیرشی مەزاهیبی توندرەوی سەلەفی، چونکە ئەگەر سەلەفیەت بگەیشتبا کۆمەڵگای کوردی، کوردیش خۆی سروشتێکی جەنگاوەرانەی هەڵچووی هەیە، ئەو کاتە کۆمەڵگای کوردی دەبووە داخراوترین و توندڕەوترین کۆمەڵگای ئیسلامی، ودەبوایە سعودیە بێت لە ئێمەی کورد فێری توندڕەوی بووایە، وەك چۆن ئێستا کەسانێکی تووندڕەوی خۆمان لەوێوە تووندرەویمان بۆ هاوردە دەکەن، تازە بە تازە باسی حەڕامێتی سەیارە لێخوڕین و ناردنی کچ بۆ خوێندنی زانکۆ، ودەم وچاو دەرکەوتنی ئافرەت دەکەن!

سەرەڕای ئەوەش ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی کوردی زیرەك بوایە، کە قەت نەبووە، دەیتوانی سەرەڕای ئەمن وئاسایشی کۆمەڵگا کە ئەو تەریقەتە دابینی دەکرد، سوودێکی زۆری لەو گوێڕایەڵی سەرتاسەریەی بۆ قسەی مەولانا خالید بکردبایە بۆ یەک دەنگی کورد و پرۆژەی بنیاتنانی دەوڵەتێکی فراوانی هەموو کوردستان بگرێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە وەك شێخ عەبدولکەریم مودەریس ئاماژەی پیدەکات، کە دەسەڵاتی بابانەکان تۆقیبوون لەبەر گوێڕایەڵی

خەڵك و خۆشەویستی خەڵك بۆ مەولانا خالید، هەر بۆیەش ئاگری دووبەرەكێی هەردوو تەریقەتی قادری ونەقشەبەندیان گەرمتر دەكرد، تا ئەو ڕادەیەی مولانا بە ڕاكردن ڕای كرد لە سلێمانی، بۆ ئەوەی هیچیتر كێشەكان پەرەنەستێنن، وپاشاكانی بابان یش تەنها وەك تەماشاكەرێك دویانڕواننیە ئەو هەموو كێشە وبیشەیە بێ ئەوەی هەوڵی چارەسەركردنی بدەن!

مەولانا وادەردەكەوێت وەك كوردە هەڵكەوتوەكانیتر نەبوو، كە گەیشتە بەغداد، كوردستانی لە بیربچێتەوە، بۆیە سەرەڕای ئەو ناوناوبانگەی لە بەغدا دەریكرد و هەزاران موریدی لە دەورە كۆبوونەوە، بەڵام لە یەكەم دەرفەتدا كاتێ محمود پاشای كوری عبدوڵرەحمان پاشای بابان داوای گەڕانەوەی كرد بۆ سولێمانی، یەكسەر گەڕایەوە لە دەوروبەر ١٢٣٠ هـ دا. دوایێ جارێكیتر هەمان بەزمی پێدەكەن تا لە ١٢٣٦ هـ جارێكیتر ڕادەكاتەوە بەغدا و دوایش بۆ دیمەشق، كە هێندە شوهرەت وڕیزدار وپایەدار دەبیت لەناو خەڵكدا، هەتا خەلیفەی عوسمانی لیی دەكەوێتە گوومان ونامە بۆ والی بەغدا دەنیرێت دەربارەی نیازی سیاسی مەولانا خالید!! خوا خێری والی بەغدا بنوسێت كە بەرگریەكی جوانی لێدەكات لای خەلیفە، دەنا لە بەغداشیان وەدەر دەنا! كەوابوو هۆكاری سیاسی و جیاوازی تەریقەتی نێوان قادری ونەقشەبەندی ببوە مایەی نارەحەتی وپشێویەكی زۆر لەناو كۆمەڵگای كوردی! ئەگەر لەسەر دەستی مەولانا خالید ئەو یەكێتیەی چین وتوێژەكانی كورد لەسەر ڕێڕەوی تەریقەت دانەمەزرێت، ئەوە لە نەبوونی ئەوە ڕاستە تا ڕادەیەكی زۆ كە تەریقەت لایەنی پۆزەتیڤی زۆری هەبووە بۆ كۆمەڵگای كوردی، بەڵام وەك هەر شتێك تەریقەتی سۆفیەت لە ناو كوردا لایەنی نێگەتیڤیشی هەبووە، لەبەر خەلك مەشغولكردن بە زیكر وئەوراد و عیبادەتی زۆر، زیاتر ئەو شێوازە دینداریە گونجاوە لەگەڵ كۆمەڵگای كشتوكاڵی كوردی، ئاسان نییە گونجانی لە ژیانی هاوچەرخدا، دووەم ڕۆڵێكی ترسناكی گێڕاوە لە بڵاوبوونەوەی نەخوێندەوار و جەهل لە كاتی خۆیدا، چونكە هەموو بایەخەكان بۆ لایەنی رووحی ودەروونی بوو، لایەنی فێركاری بە تەواوی فەرامۆشكرا بوو لەو تەریقەتانە. تەنها بۆ نوخبەیەك نەبێت.

یەكیكیتریش لە لایەنە نێگەتیڤەكانی تەریقتی تەسەوف لە ناو كوردا، خراپ بەكارهێنانی شێخەكانی تەریقەتە بۆ تەعالیمەكانی تەریقەت كە دەڵێت مورید لەگەڵ شێخەكەی یان لەگەڵ مورشید دەبێت هێندە گوێڕایەڵ و مل كەچ بێت، وەك مردوو بێت لە ژێر دەستی مردوو شۆر!! یانی هیچ بیرورا و كەسایەتی و كەرامەتی نە بێت، چی پێگووترا جێبەجیی كات، ئەو شتەش زیاتر قوڵدەكرێتەوە لە ڕێگای جۆری زیكرەكانی تەریقەت وەك لە نەقشەبەندیدا دەبێت

مورید ڕوحی مورشید بهێنێتە بیری خۆی کاتێ زیکر دەکات، مورشیدیش ڕوحی پێغەمبەر [د.خ] و پێغەمبەریش خوا!!

هەموو کەسێکیش مەولانا نییە ئیستیغلالی ئەو ملکەچیە و لاشە مردوە وبێ دەسەڵات وبێ ئیرادەیە نەکات بۆ مەرامە کەسێتیەکانی خۆی، بۆیە شێخەکانی تەریقەتە جیاوازیەکان بە خراپترین شێوە کەرامەتی مرۆڤە شوێن کەوتوەکانی خۆیان دەسڕنەوە، ومرۆڤێکی ترسنۆک وبێ ڕەئی و دەمارگرژی بودەڵە بنیات دەنێن، کە هەموو ئاواتی ئەوەیە دەست وپێ و کەوشەکانی شێخەکەی ماچ بکات! ئەوە لە کاتێکدا لە ئیسلامدا ئەو مرۆڤ پەرستیە نییە، وپێغەمبەر پەرستیش نییە، بەڵکو نابێت زیادەڕۆیش لە خۆشەویستی بکرێت، وهەتا قورئان لە چەندین جێگادا جەخت لەسەر بەشەریەتی پێغەمبەر [د.خ] دەکاتەوە، و پیی دەڵێت: قل انما انا بشر مثلكم! واتە بڵێ من تەنها مرۆڤێکم وەك ئێوە! ئەوەش بۆ ئاسایی کردنەوەی وێنەی پێغەمبەرە لە زهنیەتی ئیمانداران.

بۆیە بەڕای من تەریقەتەکان ئەگەر بیانەوێت ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕن لەناو کۆمەڵگای کوردی، دەبێت چاکسازی زۆر گەورە بکەن لە ڕێنوێنیەکانی و جۆرێتی کەسەکانی، و هەوڵی خۆ گونجاندن بدات لەگەڵ ڕۆژگاری هاوچەرخدا، دەنا بەو شێوەیەی ئێستا زۆر زەحمەتە سەرنجی مرۆڤی کوردی دیندار بۆ خۆی ڕاکیشێت. هەرچەندە بەڕای من تەریقەت ناتوانێت بەربەستیەکی تەواو و کاریگەر بکات لە بڵاوبوونەوەی توندڕەوی سەلەفی، چونکە چەندە تەریقەت داوای ملکەچی دەکات لە موریدان وشوێن کەوتووانی بۆ شێخەکان ومورشیدەکان، هێندەش سەلەفیەت دژایەتی ملکەچی دەکات بۆ شێخ و مەشایخەکان، مرۆڤی کوردیش بە سروشت یاخییە زیاتر، هەرچەندە خەڵکی ئاسایی تێناگەن کە سەلەفیەتیش جۆرێکە لە چەپاندن و کۆیلایەتی کردن بۆ دەقگەلێك بە ناوی دەقی پیرۆزی حەدیس و کۆیلەی دەقە زۆروبۆرەکان، وکۆیلەی قال فلان و حدثنا فلان، بە ناوی گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر [د.خ]!!
بەڕایی من کورد لە کۆنەوە گوزارشی کردوە لە زەرورەتی وجودی مەزهەبێکی سەربەخۆی خۆی، بەڵام لەبەر نەبوونی متمانە بە خۆ، ئەو پڕۆژە تا ئەمڕۆش دواخراوە، خۆزگە زانایانی دینی ئەو سەردەمە هەستیار دەبوون، چونکە بەڕاستی جێگای ئەسەفە زانای گەورەی وامان هەیە هەموو ژیانی لە ناو زانستە ئیسلامیەکان سەرف کردوە، کەچی هەر شوێن کەوتەی مەزاهیبە باوەکانە بست بە بست!

ئەمڕۆ خۆشبەختانە ئەو بابەتە زۆر بە شێوەیەکی بەهێز لەناو رۆشنبیرانی دینداری کورد دەوروژێنرێت، بەڕای من دەبێت ئەو کارە بە منەوەر و ڕۆشنبیرانی دینداری ناو جەماوەر بسپێردرێت، نەك بە مەلای تەقلیدی کە ناوێرێت قسە لە قسەی فەقیهێکی شافیعیش بکات، نەك ئیمام شافیعی خۆی!

موسڵمانی کورد هەر لە ئێستادا زۆر خاسیەتی عەمەلی وئیعتیقادی تایبەت بە خۆی تێدایە کە دەکرێت کار و توێژینەوەی دەربارە بکرێت، کورد پێویستی بە مەزهەبێکی دینییە:

-کە دوور بێت لەو ناکۆکیە مێژوویە بێ مانایانەی نێوان شیعە وسونە، لە بواری عەمەلیش هەر وایە، کورد هێندە دەربەست بەو مێژووە نیە.

-نزیکتر بێت لە قورئان و هیچ حەدیسێك و قسەیەکی توراسی دینی وەرنەگرێت کە پێچەوانەی قورئان دەکات.

-ئیسلام دابڕێنێت لە ڕوحی جەنگاوەری و بیباتەوە سەر ئەسڵی دینی عیبادەت کردن، و ڕوانینە ئەو دەقانەی کە لەسەر جەنگ وجیهاد هاتوون وەك ئەحکامێکی مەرحەڵی وتایبەت بە قۆناغی چەسپاندنی دین.

-جەختکردنەوە لەسەر تەوجیهاتە مەدەنی ومرۆییەکانی ئیسلام، ڕاگرتنی هەر ئەحکامێکی مێژوویی کە مەشروعیەتی نەماوە وەك کۆیلایەتی و دەستبڕینی دز، وستیتر، چونکە کە دەستت بڕی دەبێتە کەمئەندام، کەمئەندامیش ئەمڕۆ لە وڵاتانی دونیا دەوڵەت ناچارە هەموو نەفەقاتی ژیانی بکێشێت!

-هەڵگرتنی سزا توندەکانی کە لە قورئاندا نەهاتوە وەك بەردباران کردنی زیناکەران و سزای هەڵگەڕانەوە.

ئەوە چەند سەرباسێك بوون دەکرێت زیاتر تێیدا فراوانتر باس بکرێت، هیوادارم بەرچاو ڕوونیەکم کردبێت لەسەر چۆنیەتی ڕزگار بوونی کورد لە کەوتنە ژێر کاریگەری نەتەوەکانی تر.

تەوەری نوچەنێت 2015/02/15

## بوەستن ئێوە لە حزوری پەشێودان

بەڕاستی ئەو میللەتە کێشەیەکی مۆڕاڵی قوڵی هەیە کاتێك کەس لە سەرکردە وسیاسی وشاعیر وهونەرمەند ونوسەر ڕزگاری نابێت لە دەست سوکایەتی ورەخنە مومارەسەکردن بە شێوازی چەقۆ وەشێنی. ئەوە چ عەقڵیەتێکی بۆگەن وبێ لۆژیکە بە باڵایەکی بەرزی شیعر وئەدەبی وەك پەشێو دەڵێت لە کۆڕەکەی هەولێر "پەشێو دڵی بنەماڵەی مەلا مستەفای لە خۆی نەرەنجان، وەک پارتییەکیش دەیشیران". شیراندن قابیلی ئەو کۆلکە نوسەرە نەناسەیە کە هەر ڕۆژەی لەترسی سەلامەتی خۆیەوە بە ناوێك دەنوسێت زاتی ئەوە ناکات هەتا خۆی بەخەڵك بناسێنێ، ئەگەر ئەو ترسنۆک وبێ مستەوایە بچێتە هەولێر گومانم نییە یان هەروەک چۆن نەناسە قروقەپی لێدەکات یانیش دەبێتە باش کاتبی دەسەڵات ولەوێوەش هەرکاری جوێن بەخشینەوە دەبێت بە ئاڕاستەکەی تردا.

یان ڕەخنەکەی ئەوەیە پەشێو لە تەک وێنەی مەلا مستەفای بارزانی شیعرەکانی خوێندەوە، وەک بڵێی لە تەک وێنەی ئەتاتورک وسەدام شیعری خوێندبێتەوە !نازانم ئەوە چ نەنگیەکە، ئەگەر ئەمڕۆ کەسانێک بە ناوی بارزانی خوالێخۆش بوو گەندەڵی وکاری خراپ نەکەن، کێ زاتی ئەوەی هەبوو لەناو خەڵک بە خراپ باسی بارزانی بکات، سەرکردەیەک لەناو جوگرافیایەکی وا تەژی لە دوژمن وموخابەرات وپلانگێری بتوانێت ئەوەندە بکات کە کردی بۆ دەبێت نەنگی بێت کە ببێتە جێگای ڕیز وخۆشەویستی میللەتەکەی، لەبیرمە لە ماڵەکان وێنەکەی بارزانیان بە شاردراوەیی هەڵدەگرت وەک شتێکی بەنرخ وبەها، هەرچەندە لە ماڵێک بدۆزرایەوە لەوانەیە توشی گەورەترین سزا وئازار دەبوون، ئەوە بیروڕای خەڵک بوو، دەکرێت هەڵە وغەڵەتیشی هەر بوبێت خۆ پێغەمبەر نەبوو.

ئەگەر بە پێوەری مەعسومیەتی پێغەمبەرایەتی مامەڵە لەگەڵ سەرکردەکانمان وشاعیرانمان وسیاسیەکانمان ونوسەرانمان وهونەرمەندانمان بکەین، بڕواتان هەبێت نەك مەلا مستەفای بارزان بەڵکو هیچ سەرکردەیەکی تری وەک شێخ سەعید وسەید تەها وعبید الله ی نەهری وقازی مەحەمەد وشێخ مەحمودیش لەدەست ئەو عەقڵیەتە شەڕانگێز ونا واقیعیە ڕزگاری نابێت... جاری تریش باسم کردوە کە بە بەردەم ساختومانی وێستمینستەری بارەگای پەرلەمانی بەریتانی تێدەپەڕم بە سەرسوڕمانەوە تەماشای پەیکەرێکی قەبەی گەورەی [ریتچارد لاینهارت] دەکەم کە چەند بە شانازیەوە لەوێ قوتیان کردۆتەوە، کەچی هەڵسەنگاندنی ئەو سەرکردەیە بدەیتە دەست ڕەخنەگرێکی واقیعی کوردیش نەک کوردێکی نەزانی بە شێوازی شەرە چەقۆ، لەوانەیە بڵێ ئەو سەرکردەیە هیچ چاکە وخێرێکی بۆ بەریتانیا نەبوە، پاشایەک لە بنەڕەتدا لە ڕەچەڵەکی نورماندیەکان بوو کە فەرەنسی بوون، لە ساڵی ١١٨٩ کە کرا بە مەلیك، گەورەترین قەسابخانە لە دژی جولەکەکانی مەملەکەتە کراوە،

دوایی پاشایەکی وا موتەعەسیب ودەمارگرژی خوێن ڕێژی وادڕندە کە وەک سەرکردەی سێیەم هەڵمەتی خاچ پەرستی لەیەک ڕوداودا لە شاری عەکا ٣ هەزار دیلی موسڵمانی کوشت وجگە لە چەندین بەدکاری تردا کە لێرەدا باس ناکرێت، دەبێت چ هێمایەک بێت بۆ پەرلەمانی مەزنترین دیموکراتیەتی جیهان؟!!! سەرکردەیەک هەردەم شانازی بە فەرەنسیەتی خۆی دەکرد دەڵێن زمانی ئینگلیزیشی باش وپاراو نەبوو تەنها لە یادەوەری گەلێری بەریتانیەکان کراوەتە سوارچاك، کە یەك سیفاتی سوارچاکیشی نەبوو، ویەکپارچەی درندایەتی بوو کەچی لەڕیزی گەلانی بەریتانیا بەو شێوەیە ڕیزی لێدەگیرێت، ئێمەش بۆتە عەیب ونەنگی لە تەك وێنەی سەرکردەیەك شیعر بخوێنیتەوە، هەرچەندە من تا سەر ئێسقانیش دژی دیاردەی وێنە هەڵواسین وگەورەکردنی سەرۆکەکانم وکە تەنها دیاردەیەکی سیاسی دواکەوتوویی رۆژهەڵاتییە وئەنجامەکانیشی هەردەم عەکسییە وخۆشەویستی خاوەن وێنەکە زیاد ناکات وبگرە کەمیش دەکات ئەگەر حزب شوێنگرەوان وبنەماڵەی خاوەن وێنەکە بە قەد ئەو یان زیاتر پاك وباش نەبن!

گومانیشم نییە کە بارزانی ڕەحمەتی دەیان جار چاکتر بوو بۆ کورد لە ریچارد شێردڵ بۆ ئینگلیز، ئەوەش ڕیزی ئینگلیزە بۆ ئەو وئەوەش ڕیزی کوردە بۆ ئەم. دەبا بنەماڵەی شێخ مەحمود یان قازی محەمەد لەسەر دەسەڵات بان وگەندەڵ وستەمکاریش بان، دەماندیت چۆن هەزار ویەک عەیب وجوینیان پێدەدرا بەبێ ئەوەی هیچ جیاوازیەک بکرێت لە نێوان شێخی نەمر وپێشەوا قازی محەمەد وکەس وکارەکانیان! سەیر لەوەدایە ئەو کەسە لەو ئاستە نزمەوەدا بە کەیفی خۆی لێکدانەوە بۆ شیعرەکانی پەشێوی باڵا دەکات بێ ئەوەی هەتا هەقی [المعنی في بطن او قلب الشاعر] [واتە مانا لەناو دڵ ودەروونی شاعیردایە [یش بۆ خودی شاعیر ناهێڵێتەوە ، دەڵی شیعرەکە مەبەستی لە کۆسرەتە وتۆمەتباری دەکات بە کوشتنی شەهید سەردەشت، نازانم خوا لە کوێ ئەو ئیلهامە عەبقەریەی پێ بەخشی تا بگاتە ئەو دەرەنجامە، لەوەش سەیرتر ڕێگا بە خۆی دەدات بڵێ شیعرەکەی لاوازە کە بۆ سەردەشتی گوتوە عەرەب دەڵێ چاوی نارەزا کوێرە لە ئاست بینینی جوانیەکان، هەڵسەنگاندنی شیعری پەشێو بە هەموو داماوێک ناکرێت ڕەخنەگرێکی بابەتخواز ودەروون پاکی دەوێت نەك سوکە نوسەرێکی پشت کۆمپیوتەرێکی شڕ کە جوێن بۆ عەرز وئاسما دەبەخشێتەوە وشاش بە سەپان نازانێت!!

شیعرە ڕەخنەئامێزەکانی پەشێو کەسی نەبواردەوە لە کوردستان بە تایبەتی دوو زلحزبەکە وهەموو دونیاش ئەوە دەزانێت، ئەگەر شیعری تەزبیحیشی بۆ کەسێکی دیاریکراو گوتبێت، ئەوە مانای ئەوە نییە پێوەرە دواکەوتوەکەی کوردستانی لەسەر جێبەجێ بکرێت: [ئەگەر قسە بە یەکێتی بڵێیت کەواتە پارتی وبە پێچەوانەشەوە، یان کراست زەرد بوو کەوابوو پارتی وبۆینباغت سەوز بوو کەوابوو یەکێتی]!!! پەشێو نە قەرزاری کەسە ونە لەکەس دەترسێت

ئەگەر ئینتیمای سیاسی بۆ پارتی یان هەر حزبێک ئاشکرا بکات، ئەگەریش ئەوەی دەکرد ئێستا وەک شاعیرەکانی تری دەسەڵات ملیاردێر دەبوو وا هەژاری مادە و دەوڵەمەندی جەماوەر نەدەبوو لە کوردستان.

بەڕاستی عەیبیشە باسی هەولێریەتی شاعیرێکی وا نەتەوەیی گەورە بکرێت کە من گومانم نییە فەرق لە نێوان هەولێر وئامەد وقامشلی وبۆکان ناکات چ جای فەرق بکات لە نێوان هەولیر وسلێمانی. سوکایەتی کردن بە شاعیرێکی وەك پەشێو هەموو کوردێکی دەست ودامێن ودەروون پاك ئازار دەدات نەک برادەرە هەولێرییە دڵ ناسکەکان، هەرچەندە پەشێو قەڵای دووەمە بۆ هەولێر، لە هەمان کاتیشدا نەنگیە بۆ هەر سەکۆیەك کە ئەو هەوڵە نەزۆکانە بڵاودەکاتەوە. پەشێو کە قسە دەکات دەبێتە مێژوو، کەس مافی ئەوەی نییە بۆی دیاری کات کەی شیعر بڵێ وبۆ کێی بڵێ، ئەوە قسە وکاردانەوەی پیرەژنێک نییە یەکسەربە لەکاردانەوەی هەر ڕوداوێکدا سنگی بکوتێ و بڵێت: چاوی دایکت کوێر بێت!!! منیش ئەگەر تاکە گلەییەکم لە پەشێو هەبێت ئەوەیە دەبێت هەموو ڕۆژ قسە وهەڵوێستی خۆی هەبێت لەسەر ڕوداوەکان و دەوری سەرەکی هەبێت لە تەشکیل کردنی ڕای گشتی کوردی وڕۆحی نەتەوە بنیات بنێت ورزگاری کات لە دەست ناوچەگەرێتی وشارچێەتی وعەشیرەتخوازی وبنەماڵەیی.
٢٠١٢/٥/٢٠

## دیاردەی تەها محی الدین معروف

## محەمەد هەریری

زۆر جاران کە چاودەدەینە ئەدای سەرۆک وبەرپرس ووەزیرە کوردەکان ئەو دەربڕینە توراسیەی (الف لیلە ولیلە)م بیردێتەوە کە سەبارەت بە چونە ناو ئەشکەوتێک دەڵێت: (الداخل الیها مفقود والخارج منها مولود) (ئەوەی بچێتە ناوی ون دەبێت وئەوەشی هاتە دەرەوە تازە لە دایک دەبێت) سەرۆک وبەرپرسەکانی ئێمەش هەر لەو بەغدایەی هەزار ویەک شەوەدا هێندە بڕوایان بەو خورافاتە پتەوە، بۆیە هەر قاچیان خستە بەغدا ون دەبن. لە هەمووی ناخۆشتر ئەو بارە دیاردەیەکی کارتۆنیمان بەبیر دێنێتەوە، ئەویش دیاردەی (تەها محی الدین معروف) ە، ئەو پیاوە زل وقەبەیەی کە گوایە جێگری سەرۆک کۆمار (سەدام) بوو، کەچی هەموو عێراق بەتاسەی بیستنی دەنگی بوون ودەتگوت پەیکەری ئەبو هۆلە ڕۆژێک دەمی نەکردەوە.

بەڵام ئەگەر ئەو (تەها محی الدین معروف) ە لەلایەن بەهێزترین دکتاتۆر دەست بەسەر بو بێت وناچاری بینینی ئەو ڕۆڵە کرابێت، بۆ دەبێت بەرپرسەکانی ئێستای بەغدامان هەمان ڕۆڵ ببینن، بۆ دەبێت هەمان تەنازولات وخۆ بچوک کردنەوە بکەن، بۆ دەبێت لەسەردەمێک کە چەمکی نەتەوەی برا بچوک وبرا گەورەیی بەرەو نەمان دەچێت ئەوان بێن و بەزۆری کورد بکەنە برای بچوک بۆ زڕبراکان؟!

لەوانەیە ئەو بەرپرسانە خەڵکی تر تاوانبار کەن بە سەرەڕۆیی نەتەوایەتی، ڕاستە نەتەوە پەرستی واهەن بە هیچ ڕازی نەبن کەمتر لە سەربەخۆیی بەبآ گوێدانە هەل ومەرجە خودی وبابەتیەکان، بەڵام ئەدای بەرپرسانی کورد لە بەغدا هەموو کوردێک ڕادەتەکێنآ هەتا ئەوەی تۆزقاڵێک گیانی کوردایەتی هەبێت .

باسی سەرۆک کۆماری عێراقی عەیار 21 ناکەین، چونکە پێشتر باسمان کردووە. بابڕوانینە ئەدای وەزیری دەرەوەی عێراق، ئەو پیاوە تا پێش بوونە وەزیر ، سیاسی ورۆشنبیرێکی کورد بوو خەڵکێکی زۆر هیوای پێبوو کە لە هەر سەنگەرێک بێت بۆ کورد چۆڵی ناکات، بەڵام داخی گرانمان لە ڕووی شکلی وناوەرۆکیەوە هەنگاو بەرەو دیاردەی (تەها محی الدین

معروف) دەنێت، لەگەڵ یەک جیاوازی کە وەزیری بەڕێز لەو زیاتر قسە دەکات، بەڵام قسەکانی زیاتر دەرسی (سەقافە قەومیە) ی سەپێنراومان بیردەهێنێتەوە.

نمونەیەکی تر سەرۆک ئەرکانی سوپای عێراقە، ئەو پیاوە هەندە غەریبۆکە ونەرم ونیانە لەبەرامبەر تەهمیش کردنی ولە سفرڕدانی تا ڕادەی ئەوەی کە ئاگاداری جموجۆڵی سوپاکەشی نییە، کەچی ئەو بزەیە فەقیرانەیە هەرگیز لە لێوی جیانابێتەوە. بوونی ئەو پیاوە لەوآ ئەگەر زیانیشی نەبێت دەبێت سودی چی بێت؟!

هەتا ڕۆشنبیرێکی وەک دکتۆر بەرهەم ساڵح خەریک بوو لە بەغدا دووچاری هەمان چارەنوس بێت، بەڵام زوو فریای خۆی کەوت و بەو ڕەخنانەی کە ئاڕاستەی نوری مالیکی کردن هاوسەنگی خۆی پاراست، ئینجا ئەو پیاوە بە توانایەیان هێنایەوە کوردستان گوایە دەبێتە سەرۆک وەزیری کوردستان، کەچی کورد وەک جاڵجاڵۆکەی نێر بێچوەکانی خۆی دەخوات وئەو پیاوەیان هێندە بچوک کردۆتەوە لە دەڤەری پارتی توانای بەقەد توانای ڕەحمەتی (تەها محی الدین معروف) لێکراوە، بەڵام دیسان لەگەڵ جیاوازیەک ئەویش ئەوەیە دکتۆر بەرهەم ساڵح زیاتر قسە دەکات بەڵام قسەکان هەرگیز نایەنە واری جێبەجآ کردن. ئەو سوکایەتیەی بەو پیاوە بەڕێزە دەکرێت سوکایەتیە بە هەموو دەنگدەرانی کورد کە دەنگیان بۆ دوو حزبە گەورەکە داوەوئەگەر ویستی باڵای لەدواوە نەبێت هیچ مەردێک ناوێرآ پێنج جار لە یەک کاتدا کارەبا بەسەر سەرۆک وەزیرانی کوردستان بکوژێنێتەوە یان بەو جۆرە ئیهمالیەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت. خەمی ئێمە بۆ کەسی دکتۆر بەرهەم ساڵح نییە بەڵکو بۆ ئەو عەقڵیەتانەیە کە نایانەوێت لە جوغزی تەسکی حزبیەت ودەستەگەری دەرکەون وببنە نەتەوەیی. نابینن هەتا سەفەرێکی گرنگی دەرەوەی وەک سەفەری ئەمریکا چۆن کرایە ئاهەنگی چاخواردنەوەی عائیلی!!

٢٠١٠/١/٣٠

زاراوەی دیاردەی تەها محیەدین من یەکەم کەس بووم ئاماژەم پیکرد لە نووسیندا، دوایێ زۆر کەس و سیاسی وڕەخنەگر ئاماژەیان پێدا، هەڵبەتە بێ ئاماژەکردن بۆ کێ بەکاری هێناوە یەکەم جار!

## زیندوو کردنەوەی زەردەشتیەت درزێکی تر لە ڕیزی کورد

دووشەممە، 24 کانونی یەکەم 2012 23:51

ماوەیەکە هەواڵی زیندوو کردنەوەی ئایینی زەردەشتیەت مان بەرچاو دەکەوێت لێرە ولەوێ کە خەریکی ئەنجامدانی کاری پەرستی وسیمنار وکۆبونەوە ودەرکردنی بەیاناتن بە بۆنە وبێ بۆنە..

زەردەشتیەت لە پاش هاتنی ئیسلامەوە تا ئەو رۆژگارەش بەو روحیەتە گەرمەوە قسەی لەسەر نەکراوە لە لایەن ئەو کەمینەیەی کە ئێستا بە کەڵک وەرگرتن لە شۆڕشی ئینفۆمیدیا قسەی لەسەر دەکەن، چونکە ئەگەر ئامرازی پیویستت بە دەست بوو دەتوانی دنیا پڕ بکەیت لە پڕوپاگەندە ئینجا با سێ کەسیش بن، ژمارە گرنگ نیە بۆ ئەوەی دەنگت بگەیەنی بە ملیۆنەها کەس لە سایەی سەری ئەو شۆرشە تەکنۆلۆژیە ئەوەی بە خەونیش پێی وانە بوو کەس گوێی بۆ بگرێت لەو ڕۆژگارە قسە وبیروڕای خۆی بڵاودەکاتەوە بێ ئەوەی پولێکی قەڵپیش بهێنێت.

زەردەشتیەت لەو پیرەژنە دەچیت کە شانازی بە جوانی سەردەمی جحێڵیدا دەکات، کەچی هەموو ئەوانەی گوێی بۆ دەگرن دەزانن لەو سەردەمەشدا ئەو جوانە نە بووە بەڵام لەبەر تەمەن وڕیزی گەورە وبچوک بە پێکەنینێکی قوتدراوەوە بێ دەنگی لێ دەکەن، ودەڵێن با موجامەلەی بکەین چی دەڵێت با بیڵێت ئەو لە حوکمی مردوو دایە.

کورد میللەتێی هێشووییە [عەنقودیە] وەک بۆمبی عەنقوودی هەر جارێک دەتەقێتەوە چەندین پارچەی لێدکەوێتەوە وئەو پارچانەش چەندین جاری تر بەسەر خۆیدا دەتەقیتەوە. بەس نیە دوو حزبە دەسەڵاتدارەکە دوو ئیمارەت ودوو ئیدارە ودوو قەڵەمڕەویان دروست کردوە تا ڕادەیەک حاڵەتەکە بۆتە ئاسایی ودوو ددەروونی جیایان دروست کرد وکەس هیچی تر تواناي چاوەڕوانی نەماوە کەی دەبنەوە یەک ئیدارە، ئەگەرچی جاروبار لێرەولەوێ هەر بۆ بیرهێنانەوە یەکێک قسەیەک لەوبارەوە دەکات؟! بەس نیە ئیدارەی کوردی خۆماڵی پاش ٢١ ساڵ نەیانتوانی زمانێکی یەکگرتوی ستاندەرد بۆ کورد دروست بکەن؟! بەس نیە برا هەورامیەکانمان ئێستا زۆر بە قەناعەت باسی جیاوازی خۆیان لە کورد دەکەن وەک میللەتیکی سەربەخۆ؟! بەس نیە زۆر لە یەزیدیەکانش هەروا دەڵێن وتا ئەمڕۆش دڵیان نایەت

عەگالەکانی سەریان بگۆڕن بە جەمەدانی کوردی؟! بەس نیە زیاتر لە ملیۆنێک کوردی شیعە ئەمڕۆ هێندەی بە تەنگ مەزهەبەکەیانەوەن چارەگی ئەوە بە تەنگ کوردایەتیەکەیانەوە نین دوور نیە بە فەتوایەکی مەرجەعەکانیان چەکیش هەڵگرن لە دژی کورد؟!!

ئەوانەی بە تەنگ زیندوو کردنەوەی زەردەشتیەتن لە بنەڕەتدا بڕوایان بە ئیسلام نیە ولە دژایەتیەکی سەرسەختی ئیسلامدا ئەو کارە دەکەن وبە بۆچوونی ساویلکە ومنداڵکارانەیان دەتوانن ئەو کارەساتەی کە ڕویداوە کاتی ئیسلام هاتوە وبە زەبری شمشێر خەڵکی لە زەردەشتیەتەوە وەرگێراوە بۆ ئیسلام دەکرێت ئەمڕۆ ئەوان وەک مەسیحێکی ڕزگارکەر بێن ئەو بارە لارە ڕاست کەنەوە سەرلەنوێ خەڵکی بە کۆمەڵ هەڵگەڕیننەوە بۆ زەردەشتیەت کە بە بڕوای ئەوان ئایینی ڕاستەقینەی کوردە وگوزارش دەکات لە کورد!! لەگەڵ سەزاجەتی ئەو بۆچونەش بەڵام گریمان ڕاستە -کە هەرگیز ڕاستیش نیە- با وادابنیین ئیسلام لەو سەردەمانە بە زەبری شمشیر سەپێندرایە سەر کورد، بەڵام پاش تێپەڕبوونی نزیکەی ١٤٠٠ ساڵ لە موسڵمان بوونی کورددا ئەو ئایینە لەگەڵ زهنیەت وبیر ومێژوو وئەدەب وداب ونەرێتی خەڵک تێکەڵ بوە، تێکەڵ بونێک مەگەر ئەو میللەتە تاک تاک بهێنین و بە شۆکی کارەبایی کە لە هەندێک نەخۆشی دەروونی بەکار دەهێنرێت بۆ لە بیربردنەوەی هەموو بیروبۆچونی نەخۆشەکان ئیسلامیان لە بیر بەرین تا بڕوا بێنن بە پێغەمبەرەکەی کورد! ئەوەش کارێکە نە دەکرێت ونە کەسیش دەتوانێت بیری لێ بکاتەوە، کەوابوو ئەو هەموو هات وهاوارەی زەردەشتیەت لەوانەیە چەند کەسێک کۆبکاتەوە ولە چاکترین حاڵدا با بڵێین چارەگە ملیۆنیکیشت کۆ کردەوە کە ئەوە خەونی ئیبلیسە لە چونە بە هەشت، دەبێ لەوەو بەدواوە سوودی چی بێت؟! زۆر زۆر درزێکی تر دەخەیتە ناو جەستەی کورد ودەبێتە هاوتای درزەکانی تر.

خوا خێری پێشینانمان بنوسێت کاتێ بەو حەماسەتەوە بونەتە موسڵمان، ئێمە بە موسڵمانیشەوە زۆربەی ساتەکانی مێژوو چەوساوەی دەستی برا هاودینیەکانی خۆمان بوین، زۆر جار بچوکترین ئیعتباریان بۆ هاودینی بونیشمان نەکردوە، ئەی ئەگەر هەر زەردەشتی مابایینەوە دەبێت دوچاری چ کارەساتێکی مێژوویی بباینەوە، بێگومان لەوانەبوو ئێستا شتێک نەبا بە ناوی کورد.

٢٠١٢/١٢/٢٤ لەندەن

## ئەی ڕەقیب یان ئەی ڕەقیبەکان کوردیش دیاردەیەکی دەنگەوەرە!

کاتی خۆی نوسەری بەناوبانگی سعودی عبدالله قوسەیمی له گاڵته هاتنی به عەقڵیەتی عەرەبی کتێبێکی نووسی تیایدا عەرەبی تاوانبار دەکات به هەرانانەوە ودەنگەوەری بێ بەرهەمی ژیاری، به ناونیشانی : العرب ظاهرة صوتية. عەرەب دیاردەکی دەنگەوەرە!! لەوە دەچێت کوردیش لەبەر هاوسێیەتی عەرەب پەتاکەی گرتبێتەوە وبوبێتە دیاردەیەکی دەنگەوەر!

لەوەتی ساڵانی نۆهەتەوە له پاش یەکەمین پەرلەمانی بەناو ئازادی کوردی، کێشەی ئەی ڕەقیب هەر چارەسەر نەبوو. ناوە ناوە له بێ ئیشی وبێ پرۆژەیی پەرلەمانتارانی ئیسلامی ونا ئیسلامیەکان ئەو کێشەیە بێ مانایە دەوروژێننەوە! له جیاتی هەوڵ دەن لەناو کارەکانی پەرلەمان چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، دەچن ئەکشنی میدیایی بۆ دەکەن وهەرای ڕاگەیاندنی بۆ سازدەدەن .دینداران دەڵێن ئەی ڕەقیب کوفری تێدایە، سیکیولارچیەکان [مەبەستم سێکیولاری هەقیقی وشارستانی نیە] دەڵێن هیچی تێدا نیە. ڕاستیەکەی کەس ناتوانیت نکوڵی له بوونی دەستەواژەی دژە دینی بکات له ئەی ڕەقیب، حەز دەکەی تا بەیانی مەریوان نەقشبەندی و واعیزە مفتەخۆرەکانی تر بڵێن مەبەستی کوفر نەبوە، باوەڕ ناکەم هیچ ئیماندارێك به ئاسودەییەوە بڵێت: [نایشکێنێ دانەریی تۆپی زەمان ... دینمان، ئایینمان هەر نیشتمان]!! ڕاستە ڕۆژانە شاعیرمان هەیە ڕاست وچۆپ قسەی وادەکات وخوا وخەڵك به قوربانی تاڵە قژێکی خۆشەویستەکەی دەکات، بەبێ هەراش تێدەپەڕێت، نوسین بۆ خۆت شتێکە بۆ یەك میللەت بنوسیت شتی ترە. ناکرێ کابرایەك با هەر چی بێت بێتو له چلەکانی سەدەی بیستەم شیعرێك بنوسێت به پێی میزاجی ساتی و سیاسی ومێژوویی ئەو سەردەمە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی که دەکرێتە سرودێکی ناودار، چونکە خۆشی نەیدەزانی، بیسەپێنین بەزۆر بەسەر خەڵکدا! گومانم نیە ئەگەر پەرلەمانێکی کوردی ئەو کات هەبوایە به فەرمی داوای له دڵدار بکردایە هەرگیز بەو شێوەیە تەنها گوزارشی له خودی خۆی ناکرد، ئەگەر بشیکردبا پەرلەمانتارانی نوێنەری خەڵک ڕازی نەدەبوون، جیاوازی زۆرە له نوسینی شیعرێك له ژورێکی پڕ دووکەڵ وخەیاڵی هەڵفڕیوی شاعیرانە ولە نێوان نوسینی شیعرێک بۆ سرودی نیشتیمانی نەتەوەیەك دەنوسرێت.

دەکرێت ئەی ڕەقیب وەك سرودێکی مێژوویی ونەتەوەیی تەماشا بکرێت وبەس، بەڵام نازانم پیرۆزیەکەی له کوێیە وا شەڕی مان ونەمانی لەسەر بکەین؟! لای کورد هەموو شتێك پیرۆز

ده‌بێت، هه‌موو مردوێكی ناودار ده‌بێته‌ هه‌میشه‌ زیندوو، هێنده‌ شتی پیرۆز ومردووی هه‌میشه‌ زیندوومان هه‌یه‌ له‌ مه‌تحه‌فه‌كه‌نیش جێیان نابێته‌وه‌ .ئه‌ی ئه‌و میللەته‌ دیارده‌یه‌كی زمانه‌وانی وده‌نگدار نه‌بێت چیه‌؟! پیرۆزیه‌ ئایینه‌كانئ ئیسلام ومه‌سیحی وئیزدی وكاكه‌یی دیاره‌ كه‌من تا پیرۆزی تریان بخه‌ینه‌ سه‌ر؟ ئه‌گه‌ر ئه‌ی ڕه‌قیب هێنده‌ پیرۆز بێت ودوور بێت له‌ ده‌ستكاری كردن وگۆڕیندا، نه‌ ده‌بوایه‌ له‌ بنه‌ڕه‌تدا هێچ وشه‌یه‌كی ده‌سكاری بكرێت وبگۆڕێت. جاریَ تا ئێستا من بزانم پێنج نوسخه‌ی ئه‌ی ڕه‌قیب هه‌یه‌، كه‌ هه‌ندێكیان پێویستیان به‌ وه‌رگێڕ هه‌یه‌ تا زۆربه‌ی خه‌ڵكی كوردستانی عێراق وئێران تێبگات، بۆ كوردستانی توركیاش هه‌مان شت! له‌ نوسخه‌ سۆرانیه‌كه‌شی ده‌ستكاری وشه‌كانی دلداریان كردوه‌.
بۆ نمونه‌ به‌راورد كه‌ له‌ نێوان شیعره‌ ئه‌سڵیه‌كه‌ی دڵدار وئه‌و گۆڕانكاریانه‌ی به‌سه‌ریدا هاتوه‌، هه‌ر له‌ نوسخه‌ سۆرانیه‌كه‌، وشه‌ خه‌ت له‌ژێردراو وسوره‌كان ئاماژه‌یه‌ بۆ ده‌ستكاریه‌كان، ئه‌وه‌شی هێلی سوریشی به‌سه‌ردا هاتوه‌ هه‌ر لابراوه‌ له‌ سرودەكه‌:

ئه‌ی ڕه‌قیبی دڵدار ئه‌ی ڕه‌قیبی ده‌ستكاریكراو

ئه‌ی ڕه‌قیب!
ئه‌ی ڕه‌قیب هه‌ر ماوه‌ قه‌ومی كورد زوبان
نای ڕمێنیَ دانه‌یی تۆپی زه‌مان
ئێمه‌ ڕۆڵه‌ی ڕه‌نگی سوور و شۆڕشین
سه‌یریكه‌ خوێناویه‌ ڕابووردومان
ئێمه‌ ڕۆڵه‌ی میدیا و كه‌یخوسره‌وین
دینمان ئاینمانه‌ هه‌ر نیشتمان
كه‌س نه‌ڵیَ كورد مردووه‌ كورد زیندووه‌
زیندووه‌ هیچ نانه‌ویَ ئاڵاكه‌مان
چه‌ند هه‌زار لاوانی كوردی نه‌ڕڕه‌شێر
بوون به‌ قوربانی و هه‌موویان نێژران
لاوی ئێستاش حازر و ئاماده‌یه‌
جانفیدانه‌ جانفیدانه‌ جانفیدان
لاوی كورد هه‌ڵسانه‌ سه‌رپیَ وه‌ك دلێر
سا به‌ خوێن نه‌قشی ئه‌كه‌ن تاجی ژیان

کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان
ئەی ڕەقیب!
ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان
نایشکێنێ دانەریی تۆپی زەمان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە قەت نانەوێ ئاڵاکەمان
ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین
سەیری کە خوێناوییە ڕابردوومان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە قەت نانەوێ ئاڵاکەمان
لاوی کورد هەستایە سەر پێ وەک دلێر
تا بە خوێن نەخشی بکا تاجی ژیان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە قەت نانەوێ ئاڵاکەمان
ئێمە رۆڵەی میدیا و کەیخوسرەوین
دینمان، ئایینمان هەر نیشتمان
لاوی کورد هەر حازر و ئامادەیە
گیان فیدایە، گیان فیدا، هەر گیان فیدا

باشە گەر وا پیرۆزە بۆ دەبێت ئەو هەموو دەستکاریە بکرێت؟! بۆ دەبێت دوو هێڵی لێ لاببرێت؟!
چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕەشێر
بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران

لە نوسخە بادینیە باکوریەکەی هەر دەقێکی تەواو سەربەخۆیە:
ئەی رەقیب هەر، مایە قەومێ کورد زمان
ناشکێ و دانایێ ب تۆپێ زەمان
کەس نەبێ کورد دمرن، کورد ژین دبن

ژین دبن قەت ناکەڤیٚ ئالا کوردان
ئەم خۆرتێن رەنگیٚ سۆر و شۆرەشن
سەیر بکە خوینا دییان مە دا رژاند
لاویٚ کورد رابوویە سەر پیٚ وەک شێران
تا ب خوین نەخشین بکە تاجیٚ ژیان
ئەم خۆرتێن میدیا و کەیخوسرەوین
دین ئیمان و ئایینمان، هەر نشتیمان

لە زازاکی پێویستت بە موتەرجیمە تا تێی بگەیت:
ئەی ڕەقیب هەر مەندۆ قەومیٚ کوردزوانی
نێشکینۆ، نێکوونۆ ب تۆپا زەمانی
کەس مەڤاژۆ کورد مرەنۆ، کورد جوییینۆ
جوییینۆ، قەت نێنا وار بەیراقا ما
ما دۆمانیٚ رەنگیٚ سوور و شۆرەش ئیمە
تەماشەکە، گۆنن ئۆ راڤێردەییٚ ما
لاژیٚ کوردی ڤاشتۆ را پایان ڤێندا چێران
تا ب گۆنی بنەقشنە تاجیٚ جویانە
ما دۆمانیٚ مەدیا و کەیخوسرەو ئیمە
دین ئیمان، ئایینیٚ ما هەر وەلات ئۆ
لە هەورامی هەر ئەو ناوچەیەی هەورامان تیی دەگەن، لەگەڵ ڕیزم بۆ هەورامیەکان بە دەست من نیە واقیعەکە وایە، ئەوە بەشێکتی:
ئەی ڕەقیب هەر، مەنەن میللەتی کورد زوان
نمەماڕۆیچش، جمنەری، چەرخی زەمان
کەس نەواچۆ کورد مەردەن، کورد هەر زیننەن
زیننێنەو قەت مەنامیۆرە ئاڵاکێمان
ئێمە ڕۆڵێ ڕەنگێ سووریٚ و شۆڕشی
بدیە چن وناڵینەن، ویەردەمان
میللەتو کوردی هورزاوە سەرو، پای
بە ونێش نەخشین کەرۆ تاجەو ژیوای

ئه‌وه‌ش به‌شێکه‌ له‌ ئه‌ی ڕه‌قیب به‌ به‌ کوردیی باشووری:
ئه‌یٚ ڕه‌قیب هه‌ر ماگه‌ قه‌وم کورد زوان
نیه‌شکنێگه‌یٚ گه‌ردش چه‌رخ زه‌مان
که‌س نه‌ۆشێ کورد مردگه‌، کورد زینگه‌
زینگه‌ هه‌ر ئه‌و شه‌کیٚ ئاڵاگه‌مان
ئیمه‌ ڕووڵه‌یٚ ڕه‌نگ سوور و شووڕشیم
سه‌یریٚ که‌ خۆناویه‌ وێه‌رده‌مان
که‌س نه‌ۆشێ کورد مردگه‌، کورد زینگه‌
زینگه‌ هه‌ر ئه‌و شه‌کیٚ ئاڵاگه‌مان
ڕووڵگ کورد هه‌ڵساسه‌ پا وێنه‌یٚ دلێر
تا وه‌ خۆن ڕه‌نگین بکه‌یٚ تاج ژیان

یانی به‌یانی بوینه‌ ده‌وڵه‌ت ده‌بێت شه‌ڕی ئه‌وه‌ش بکه‌ین کام نوسخه‌ له‌ ئه‌ی ڕه‌قیب لێبدرێت له‌ نێوه‌نده‌ نێوده‌وڵه‌تیه‌کان!! تۆ جاریٚ له‌ نێو سیٚ پارێزگا ناته‌ویٚ کێشه‌ی زمانی ستاندارد چاره‌سه‌ر بکه‌یت له‌به‌ر نه‌خۆشی ناوچه‌گه‌رێتی وعه‌شایریه‌تی سیاسی باسی پیرۆزی سرودی نیشتیمانی چی ده‌که‌یت که‌ پێنج نوسخه‌ت تا ئێستا لێی به‌رهه‌م هێناوه‌!!

که‌وابوو قورئان نیه‌ هه‌ر حه‌رفێکی ده‌ستکاری بکرێت دنیا خراپ ده‌بێت، ئه‌گه‌ر هه‌ر زۆر موسیڕن له‌سه‌ر مانه‌وه‌ی ئه‌و سروده‌ به‌ پیرۆزکراوه‌، چۆن توانیتان ئه‌و هه‌موو ڤێرژن ونوسخه‌یه‌ی لێده‌ربکه‌ن وچه‌ندین دێری لابه‌رن، ده‌با ئه‌و دوو وشه‌ وده‌سته‌واژه‌یه‌شی لیٚ لابه‌ن که‌ خه‌ڵکێکی زۆری به‌ڵکو زۆرینه‌ی هه‌ره‌ زۆری میلله‌ته‌که‌ به‌ پێچه‌وانه‌ی باوه‌ڕی خۆی ده‌یبینێت. له‌ ئیسلامیه‌کانیش گه‌ڕیٚ هه‌ر نه‌بێت ئاوڕێك له‌ زۆرینه‌ی موسڵمان بده‌نه‌وه‌، یانیش سرودێکی تر ئاماده‌ بکرێت ڕه‌نگدانه‌وه‌ی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ بێت به‌ عه‌قڵیه‌تێکی گشتگیرانه‌ نوسرابێته‌وه‌ نه‌ك گوزارش له‌ ناخی ته‌نها شاعیرێك وچه‌ند نه‌ته‌وه‌چیه‌کی حه‌وسه‌ڵه‌ وسیقڵدانه‌ ته‌سك بکات.

له‌نده‌ن 18-04-2015

# خەڵك برسی كەن باش دەیچننەوە!

دووشەممە, 05 تشرینی یەکەم 2015 18:52

هیچ تاكێك لەو كوردستانە نییە نەزانێت كە هەموو یان بەشی شێری موقەدەراتی دراوی لە دەست پارتییە، موقەدەراتی پارتیش لە دەست بنەماڵەی بارزانییە، موقەدەراتی بنەماڵەش لە دەستی مەسعود بارزانیە بە پلە یەك، دوایی نێچیرڤانە بە پلە دوو وهتد..

بۆیە هەر نە هامەتیەكی خۆكردە وكورد كوردە بەسەر خەڵك بێت ئەوە خەڵك ناچێت یەخەت كاك فەلاحی هەڕەشەكەر لە ڕووسیا بگرێت، یان هەتا ملی ئاشتی هەورامی. لەوانەیە ئەوانەش جوێن بخۆن وقسەیان پێ بوترێت، بەڵام خەڵك لە قووڵایی دڵیەوە نەشوێرێت گوزارشی لێبكات، مەسعود بارزانی سەرۆكی هەڵواسراو و نێچیری ئەندازیاری نەوت بە هەدەردان بە بەرپرسی یەكەمی ئەو دۆخە دەزانێت.

كاتی خۆی لە حەسار و گەمارۆی سەدامدا، سەرەڕای ئەوەی ئەو كاتەش خواردن وتاڵان هەبوو بۆ سامانی گومرگەكان و شتیتریش، بەڵام كەس یەخەی پارتی وبارزانی ودەسەڵاتی نەدەگرت، دەیانگووت خەتای بەغدایە. ئێستا خەڵك خەتای بەغدا وەك جاران نابینێت، چونكە دەزانێت هەتا دەست وپێوەندەكانی بارزانی ملیاردێرن!

خەڵك دەزانێت یەك ڕۆژیش نەوت كێشانەوە و بە قاچاغ فرۆشتن نەوەستاوە! خەڵك دەزانێت ئێوە ئەگەر خەمخۆری ئەو میللەتە بان، هەرنەبا پێشمەرگەتان لە بارودوخێكی شەڕافەتمەندانە دەژیانت! خەڵك دەزانێ بەرپرس و كوڕ ونەوەكانی بارزانی و چەند حزبێكیتریش بە بای پیلان سەرف دەكەن و بە هەدەری دەدەن.

خەڵك دەزانێت ئەوەی پارتی و ئەندازیارانی پارتی دەیكەن لە ڕیسواكردنی مووچەخۆران وپێشمەرگە و پۆلیس وهتد، سیاسەتێكی دێرینی دزێوترین دیكتاتۆرەكانی دنیایە، لە پێناو مەرامە سیاسیە كورت بینەكانیان.

وامەزانن خەڵك گێلە ونازانێ هەفتانە دوو سەد ملیۆن بەس پارەی نەوتی بۆڕیەكانتان دێتە دەست، جگە لە نەوتی تڕێڵەكان و باقی داهاتیتی تر..

شورەییە بۆ حزبەكان بە تایبەتی گۆڕان و كۆمەڵ ویەكگرتوو بۆ یەك ساتیتر وەك شەیتانی ئەخرەس وكەڕ وكوێر بێدەنگ بن و لەو كابینە لەرزۆكە و نا مرۆییە نە كێشەنەوە.

پارەی نەوت و نەوت هەناردەكردن وەك پارەی مەزرەعەی پارتی لێهاتووە، كەس بۆی نییە هیچی لەبارە بزانێت، جەندیان فرۆشتوە وچەندیان پارە وەرگرتووە؟!

ئەخر ئەو نەوتە یان بە خۆڕایی دەینێرن بۆ ئاغا توركیەكانتان، یانیش بە پارە دەینێرن، كەوابوو كوا پارەكانی؟! كە مەعاشی خەڵك نادەن هەتا پێشمەرگەش، دەبێت چی لێ بێت ئەو پارانە؟!

توخوا هەتا وا فەرزمان كرد پارە نییە، نەدەبوایە بارزانی كە بەخۆی دەڵێت من تا دەمرم پێشمەرگەم سواڵیشی بۆ كردبان، تا پێشمەرگە بێ نازتر و ناپۆشتەتر و برسیتر و ڕیسواتر نەبا لە بەراورد هەتا لەگەڵ شەڕكەری داعشدا؟! پێشمەرگە هەیا بە ملیارات دۆلاری هەبیت جگە لە بارزانی؟!

بەردەوام بن لەسەر برسیكردنی خەڵك، خەڵك تێگەیشتووە، سەركەوتوو بوون لە برسیكردنی خەڵک، وتێكدانی شیرازەی خێزانی ودەروونی زۆران خەڵكێك، بەلام ئەمرۆ دەبێت بزانن چ زامێكتان لە دلەكانی خەڵك دروست كردوەە، دەبێت بزانن بوونەتە قێزەونترین پارت وبنەماڵە و دەسەلات لە لای خەڵكدا. ئەو هەموو جوێن و سوكایەتیەی لە سایتەكان و تۆڕە كۆمەلایەتیەكان بە بارزانی و پارتەكەیی و كوڕەكانی دەدرێن ئاماژەی هەڵگرتنی شۆڕشێكی پەنگخواردوە لە هەناوی برسی كراوەكان. ڕۆژیكی ڕەش چاوەڕوانتان دەكات، كاتێك تەكنیكیكی دیكتاتۆرانە لە فەزایەكی بەناو دیموكراتدا جێبەجێ دەكەن.

# خانه‌نشینی و خه‌ساندن

**محه‌مه‌د هه‌ریری**

هه‌موو دنیا ده‌زانێت كه‌ مرۆڤ كائینێكی ئیشكه‌ره‌ و زۆر جار كاركردن وه‌ك عیلاج و چاره‌سه‌ر وه‌سف ده‌كرێت بۆ زۆر له‌ نه‌خۆشه‌ ده‌روونیه‌كان. خه‌ڵكی وڵاتان كاتێ له‌ ته‌مه‌نی گه‌نجی و كاركردنن تا ئه‌وپه‌ڕی وانایان كار ده‌كه‌ن و باجێكی دیاریكراو ده‌ده‌ن له‌ پێناو یاه‌مه‌تیدانی خه‌ڵكی بێكار و خانه‌نشینكراودا، تا كاتێ خۆشی گه‌یشته‌ ته‌مه‌نی خانه‌نشینی، به‌سه‌ربه‌رزی موچه‌ی خانه‌نشینی خۆی وه‌رگرێت، چونكه‌ كاتی كاركردنی چه‌ندین ساڵه‌ی ئه‌ویش باجی داوه‌ به‌و كه‌سانه‌ی وه‌ك ئه‌و خانه‌نشین كرابوون. لای خه‌ڵك ژیانی كار یانی كار، خانه‌نشینیش یانی خانه‌نشینی، ڕوینه‌داوه‌ تۆ له‌ هه‌ڕه‌تی لاویدا و ساغ و سه‌لیم و جوان بیت، و چه‌ندین كارت هه‌بێت به‌ ئاشكرا، كه‌چی له‌ ژێره‌وه‌ خانه‌نشین كرابیت!! ئه‌و كاره‌ قێزه‌ونه‌ كه‌ هه‌زاران پیر وگه‌نج ، كچ و كوڕ، ئیماندار وموڵحید، ئیسلامی وعه‌لمانی، و ڕۆشنبیر و نه‌زان، وخوێنده‌وار و نه‌خوێنده‌وار، سیاسی و دمبكچی، حزبی و ناحزبی، داوێن پیس و داعیه‌ی ئیسلامی، ڕه‌شۆكی و ئه‌میر و پێشه‌وای وهتد، یه‌كێكه‌ له‌ ئیبداعاتی عه‌قڵیه‌تی گه‌نده‌ڵپه‌رستی ده‌سه‌ڵاتی كوردی، به‌ تایبه‌تی پارتی ویه‌كێتی، به‌ هاوكاری هه‌موو ئه‌وانه‌ی ناومان هێنان له‌ سه‌ره‌وه‌.

كه‌وابوو، ناكرێت هه‌ر غه‌ڵه‌ته‌كه‌ بخه‌ینه‌ ئه‌ستۆی دوو حزبه‌ ده‌سه‌ڵاتداره‌كه‌، ئه‌گه‌ر ئه‌و میلله‌ته‌ قابلیه‌تی گه‌نده‌ڵبوونیان تێدا نه‌بووایه‌، نه‌یانده‌توانی له‌گه‌ڵ ئه‌و گه‌نده‌ڵییه‌ بێ وێنه‌یه‌ هه‌ڵ بكه‌ن، و ببنه‌ لێسه‌ره‌وه‌ی پاشماوه‌ی قاپ و مه‌نجه‌ڵه‌كانیان.

كێ هه‌یه‌ له‌و وڵاته‌ به‌ ده‌گمه‌ن نه‌بێت دژی هه‌وڵی خانه‌نشین كردنی خۆی وه‌ستابێته‌وه‌؟! كێ هه‌یه‌ نموونه‌ی خانه‌نشینكراوی هه‌موو لایه‌ن و ئاڕاسته‌كان و هه‌موو ڕه‌گه‌زه‌كان و ئایدیۆلۆژیه‌كانی نه‌زانیبێت؟ !

شوره‌یی نییه‌ بۆ وه‌زیرێك هێشتا وه‌زیره‌، مووچه‌ی خانه‌نشینیش وه‌ربگرێت؟! مردن باشتر نییه‌ بۆ بێژه‌رێك چ ژن چ پیاو شه‌وانه‌ وڕۆژانه‌ كاری هه‌بێت له‌سه‌ر سكرینی تیڤیه‌كاندا، كه‌چی به‌ عه‌قید و عه‌مید و شتی تر خانه‌نشین كرابێت؟! توخوداكه‌ی عه‌یب نییه‌ بۆ ئه‌میرێك هێشتا ئه‌میری حزبێكه‌ به‌ مودیر عام و ئه‌ندام په‌رله‌مان خانه‌نشین كرابێت؟! مردن باشتر نییه‌ له‌وه‌ی شه‌و و ڕۆژ باسی سه‌له‌فی ساڵح بكه‌یت، یه‌ك ڕۆژیش پێشمه‌رگه‌ نه‌بوو‌بیت، و هێشتا ته‌مه‌نی خانه‌نشینیشت ناهاتبێت، كه‌چی به‌ پله‌ی عه‌قید خانه‌نشین كرابیت؟!! ڕیسوایی باشتر نیه‌ تۆ له‌ نوخبه‌ی ڕۆشنبیران و نووسه‌ران بیت، له‌ چه‌ندین ده‌زگا كار بكه‌یت، كه‌چی

خانەنشین کرابیت؟! شورەییە گەورەکەش بۆ ئەو گەندەڵکارە گەورانەیە کە ئەو بیرۆکە دۆزەخییەیان بەدیهێناوە بۆ خەساندنی مەعنەوی هەر دەنگێکی نارەزایی، بۆ دڵنیابوون و بەستنەوەی کەری خۆیان نەوەك لوشکەیەکی فیکری رەخنەیی بهاوێژێت! کاتی خۆی لە کۆشکەکانی سوڵتانەکان منداڵ وپیاویان دەخەساندن تا سوڵتانەکان بە خەیاڵێکی ئاسوودە تێکەڵی ناو حەرەم و کچ و ژنەکانیان بکەن بۆ خزمەتکردن، چونکە ئەو بە شێوە نێرانە، ئەندامی نێرینەیان لێکردبوونەوە و ئەگەر بشیان ویستبا کاری خراپ بکەن لەگەڵ حەریمی سوڵتان بۆیان نەدەکرا!

دەسەڵاتی گەندەڵیش بەو مووچەیەی خانەنشینی، خانەنشینکراوەکانیان خەساندوە لە ڕووی مەعنەویەوە، ئەگەر بیانەوێت کارێکی نا دۆستانە و نەیارانەش بکەن دژی دەسەڵات پێیان ناکرێت، دەبێت ئەوەندە پێدرێژی و دەمدرێژی بکەن، کە لە سنوورەکاندا بۆیان دەستنیشانکراوە، ئەو سنوورانەی بەدەستی دەسەڵاتی گەندەڵ کێشراوە. خانەنشینکراوی ئەوبەر جاروبار ئازاد دەکرێت لە بەزاندنی سنووری سوپەر گەندەڵی ئەمبەر، بە پێچەوانەوەش، بەڵام زۆر کەم خانەنشینکراوێک دەبینیت بتوانێت سنووری هەردوو بەر ببەزێنێت، چونکە مرۆڤی خەسێندراو هەردەم چاوشۆڕی خەسێنەرەکانیەتی .
٢٠١٤/٩/٣

## تێڕوانینێک لە هونەری هەڵکەوت زاهیر دا

هەڵکەوت زاهیر دیاردەیەکە لەگەڵ لێشاوی گەندەڵی وەک پاشکۆو پاشگرێکی ئەو تسونامیە گەندەڵەی کوردستان لەو خاکەدا سەوز بوو و باڵای دەرکرد. بەردەوامیشی لەسەر سوتەمەنی ئەو گەندەڵیەوە وەستاوە، دەنا کێ باوەڕ دەکات ئەو هونەرە نارەسەنە مایەی خۆشی بهێنێتەوە چ جای لەوەی قازانج بکات .ڕاستە ڕێژەیەکی زۆر لە هەرزەکاران وخەڵکی تر سەیری ئەو کارانە دەکەن، بەڵام بلێی پارەی پێبدەن ئەوە زەحمەتە. ئەوانەی پاڵپشتی ئەو هونەرە دەکەن هەر ئەوانەن کە پاڵپشتی وەزیرو وەزارەتە گەندەڵەکان دەکەن کە بە ملیۆنەها دۆلاردیزە بەدەرخونە دەکەن بێ ئەوەی ڕۆژێک لێیان بپرسنەوە، یان وەك وەزارەتە ناو جانتاکەی ئاشتی هەورامی سەرەرای ئەو هەموو تاڵانکردنەی نەوت وسامانی نەتەوەیی هێشتا بە زیان کەوتۆتە سەر بودجەی هەرێم!!

کێشەی هەڵکەوت زاهیر لەوەدایە زۆر بە نەفەسێکی بەرزەفڕو بوغرایەوە قسە دەکات، لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ [ئێن ئار تیڤی] چەندین جار هەر وشەی تەحەدا بەکار دەهێنێت، لەوەش سەیرتر هەر لەسەرەتاوە خۆی لەسەروی ڕەخنەوە دادەنێت ودەڵێت گوایە ئەوانەی ڕەخنەی لێدەگرن دەیانەوێت لە سایەی عەزەمەت و گەورەیی ئەودا ناو دەر بکەن!! ئەو لەهجەیە لە خۆباییە نوسەرێکی کوردی کاتی خۆی، کە یاخی بوو لە سێبەرەکەی خۆشی، بەبیر هێنامەوە، کە ئەویش هەروای دەگوت، شەو وڕۆژ وەک شۆڕشگێرە ئاشوبیەکان یان فەوزەویەکان خەریکی پەلاماردانی ئەم وئەو بوو، کەچی کەس بۆی نەبوو وەڵامی داتەوە نەوەک تاوانبار بکرێت بەوەی دەیەوێت بە پلیکانەی باڵای بەرزی ئەودا سەرکەوێت، تا لە کۆتاییدا دەستەمۆ کرا لە لایەن ئەوانەی کە جوێنی بە باوک وباپیریانیشی دەدا بە ڤایرۆسی سەوزە دۆلار، ئێستا بۆخۆی لە ئوتێلیکی راقی میوانی هەمیشەییە وهەرسەرگەرمی خواردنەوە ووڕێنەیە. کاتی خۆی لەڕابردودا خەڵکی زۆر هەبوو وەڵامی نەدەدایەوە نەوەک بڵێت دەیانەوێت لە سایەی زەبەلاحی و گەورەیی ئەودا ناودار بن، ئێستا هێندە سوک و ڕیسوا وقێزەون بووە خەڵک بێزی نایەت ناوی بخاتە ناو وتارەکانیان!!.

هەلکەوت زاهیریش جگە لە چەند کارێکی کەم کە دەتوانی بڵێی بەکار دەچێت وهەرچەندە سەرچاوەکانی ئاوازەکان ئەمڕۆ بۆ ئێمە مەعلوم نیە، ڕاست و چۆپ کەوتۆتە شێواندن

وقێزەون كردنی هونەری كوردی. ئەو بەناو هونەرمەندە هەموو بەهرەكەی ئەوەندەیه لاسایی تیاترۆخانەكانی لوبنان و میسر بكاتەوه، چونكه لەوه دەچێت به قەلب وقالبەوه لەو بەشه هونەره نزمەی ئەو دوو وڵاته توابێتەوه، ئەو پیاوه سەرچاوەی ئیلهامی (....) ئەو ئیلهام بەخشەی هەڵكەوتی گرتوە.! هەڵكەوت خەریكی هونەرێكه كه پێشان تەنها درەنگی شەو له مەلهاكانی بەیروت و شارع الهرم قاهیره پێشكەشی سەرخۆش وعەوداڵانی داوێن پیسی دەكرا، وتایبەتیش بوو به بادانی سمت وسینگ ودەربڕینی وشەی وروژێنەر بۆ جوڵاندنی هەستە نزمەكانی خوارەوه، وەكو نۆتی وهۆم شیكەواوەو تامی ئەو وئەویش بكه وتا دوایی!!! كەچی ئێستا بەڕۆژی ڕوناك له سكرینی تەلەفزیۆنەكان یەكێک له مێگەڵەكەی هەلكەوت زاهیر بەشیوەیەكی زۆر ڕەخیس وبازاڕی به تەنها یان به یاوەری پلەی بۆیەكی playboyهەڵكەوت باسی دەست بردن بۆ سینه وگۆنا ولێو ماچ كردن دەكات وگوایه نۆتیه واته[ بزێوو شەیتانه]... گوێبگره بۆ ئاستی ئەو وشانه كه سەرەڕای ئەوەی دەڵێی عەرەبێكی تازه كوردی فێربوو نوسیویەتی، تەنها ئاخ وئۆفی هەیفا وەهبی وبوس الواوا و [بحبک یا حمار]ت بەبیر دێنێتەوه:

تۆ كۆرێكی هاری لاچۆ له سەر رێگام

چاو له چاوم دائەگری ماچت كرد له گۆنام

ویستم له دەستت ڕاكەم خۆت نزیک كرد له لام

دەستت خستە ناو دەستم ماچت كرد له لێوم

كاک هەلكەوت زاهیر تەحەداش دەكات كه هونەرەكەی ئەو لەناو هونەری كوردی له لوتكه دایه، چونكه ئاهەنگەكانی پڕدەبن له كچ وكوری هەرزەكار، ئەو برادەره یان نازانێ یان خۆی له گێلی دەدات كه لەبەرچی ئاهەنگەكانی ئەو له ئاهەنگی بۆ نمونه هونەرمەندێكی ڕەسەنی وەك عەدنان كەریمیش قەرەباڵغتر بێت .چونكه هەڵكەوت ئاسانترین چەك لەو گۆڕەپانه بەكاردەهێنێت، كه چەكی وروژاندنی سێكسییه وهێزی جوانی ئافرەته، بۆیه گومانم نییه هەیفا وەهبیش بینەری زیاتری هەیه له ئوم كەلسوم لەسەر یوتیوبدا، له یەتیوب كچێكی مەسیحی میسری باسی سیاسەتیش دەكات نەک بابەتێكی سێكسی، بەڵام چونكه زۆر جوانه و زۆر به نازوعیشوەوه ئەدای دەكات، وسەرەڕای ئەوەی قسەكانی فلسێكی قەڵب ناهێنێت له دنیای سیاسەت وفیكردا، كەچی زیاتر له ملیۆنێك و سێ سەد هەزار بینەری هەیه !!ئەوانەی

لە مێگەڵەکەی هەلکەوت و هەیفا کۆدەبنەوە بە پاڵنەری جنسی وسێکسیەوە دێن بۆ ئەوێ نەک بە پاڵنەری دیتن وبیستنی هونەرێکی ڕەسەن، ئەی ماقوڵە ئەو ناسلی ولۆکە ودەشنێ وئەوانی تر بە نیمچە ڕووتی وبە وشە ڕوتەکانیان وجوڵە سێکسیەکانیان نیشانی گەنجانی وروژاو بدات لەجیاتی بچنە لای ئەو دەچن بۆ کۆڕی فاروق ڕەفیق بۆ نمونە؟!! کاری هونەرمەندی هەقیقی بەرزکردنەوەی هەست وچێژی هونەرە لای خەڵک نەک تەخدیرکردنیان بە غەریزەی سێکسی.

سەیر لەوەدایە لە چاوپێکەوتنەکەیدا هێندە خۆی فریشتە ئاسا دەردەخات خەریکە شەیتان شەرمی لێدەکات، کەچی قسەکانی هانی و باخان دەیسەلمێنن کە لەبەرامبەر ئەنجامدانی کاری هونەری داوای بەرامبەری نا (...)و نامادیان لێدەکرێت جا لەلایەن (.....)، نازانم کێ داوایان لێدەکات؟!! بێگومان کەسێکی زیرەکی ناوێت تا بزانێت ئەو شتە نامادیانە چیین کە داوایان لێدەکرێت، بەداخەوە نێوەندی هونەری کوردی بەرەو ئەو هەڵدێرە بردوە!!

کورە نازدارەکەی ڕاوێژکارەکەی حکومەتی پێشو وەک چۆن ژمارەی پێوانەیی لەو ئاوازو وشە بەرزانە شکاندوە بە دانانی ٦٠٠ ئاوازی بێ دایک وباوك کە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت لۆکە وناسلی بە کوردی بیکەنە گۆرانی یان نانا ودومنیک وهەیفا وەهبی بە عەرەبی بیان چڕن، بە هەمان شێوە خەریکە ژمارەی پێوانەیی دەشکێنێت لە زیادەڕۆییەکانی لە دەربڕینە بێ پەردەکانی وەك:

هەوەس و هەوەسبازی هاتیتە بەر دەرگام

ویستت ماچێکم بکەی لێوت هێنا بۆ لام

دەستت برد بۆ سینەی من وتت ئاە پێم خۆشە

یان هاندانێکی بێ پەردە بۆ ڕابواردنی بێ سنوری کچان لەگەڵ ئەم وئەو و شوو نەکردن: بە قسەم کە شوو مەکە

یاری بە ئەو وخۆت مەکە

تا ئەتوانی خۆت ئازاد کە

تامی ئەو وئەویش بکە!!

ڕۆژ به‌ڕۆژ قسه‌ بێ په‌رده‌كانی زیاد ده‌كات ئه‌جوائی بێ مۆڕاڵی مه‌لهاكانی به‌یروت وقاهیره‌ ده‌هێنێته‌ ناو هونه‌ری كوردی به‌ پشتگیری كه‌سانێك له‌ ده‌سه‌ڵاته‌وه‌، ئه‌و ده‌سه‌ڵاتدارانه‌ی كه‌ به‌س نیه‌ ئه‌و پیاوه‌یان كردۆته‌ صدام حسێنی هونه‌ری كوردی به‌ قه‌ولی باخان، به‌ڵكو ده‌یانه‌وێت یه‌ك كه‌ناڵی ئاسمانی تایبه‌تیشی بۆ دامه‌زرێنن تا زیاتر هونه‌ره‌ بێ په‌رده‌ ونۆتی وپۆرنۆیه‌كه‌ی بره‌و پێبدات! ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ چی ماوه‌ تێكی نه‌دابێت تا لێی ئه‌مین بین له‌سه‌ر هونه‌ری كوردی و ئه‌ویش تێک نه‌دات؟! له‌ جیاتی زمانێكی فۆڕماڵی كوردی یه‌كگرتوو، دوو زمانی فه‌رمی دروست كردوه‌ له‌ جوگرافیایه‌كی بچوكدا...

پێناسنامه‌ی نه‌ته‌وه‌یی له‌ نێو گۆمی وه‌لائی حزبیدا خنكاند... گیانی ئینتیمای نه‌ته‌وایه‌تی له‌ ده‌رونی زۆربه‌ی خه‌ڵكدا كوشت به‌ گه‌نده‌ڵیه‌ زه‌به‌لاحه‌كان كه‌ هه‌موو سنورێكی لۆژیكی تێپه‌ڕاندوه‌.
سه‌روه‌ت و سامانی ئه‌و میلله‌ته‌ی هه‌موو تاڵان كردوو و به‌ هه‌ده‌ری دا، وای لێهاتوه‌ ده‌ست و پێوه‌نده‌ كانیان فڕۆكه‌ی تایبه‌ت بۆ مناڵه‌كانیان به‌ دیاری ده‌كڕن! ڕۆژێک دێت ئه‌و وڵاته‌ ده‌گاته‌ چاخی ته‌واو بوونی نه‌وت هه‌مومان یه‌كسان ده‌بین له‌ هه‌ژاری و سواڵكه‌ریدا، چونكه‌ خۆ وه‌ك وڵاتانی ئه‌وروپا خه‌می نه‌وه‌ی دواڕۆژ وئاینده‌مان نه‌خواردوه‌ تا سامانه‌ زیاده‌كانمان بۆیان بخه‌ینه‌ حیسابێكی تایبه‌ته‌وه‌، هه‌تا وڵاتێكی بچوكی وه‌ك كوێت، له‌ترسی ته‌واو بوونی نه‌وت هێنده‌ پرۆژه‌ی وه‌به‌رهێنانی ئه‌نجامداوه‌ له‌سه‌ر ئاستی جیهاندا، ئه‌گه‌ر ئێستا نه‌وت كۆتایی پێ بێت كاریان لێ ناكات !!

موفره‌داته‌كانی گه‌نده‌ڵی یه‌ک پاكێچن...

پاره‌ی زۆری به‌ هه‌وه‌نته‌ ده‌ست كه‌وتوو پێویستی به‌ كاڵای گرانبه‌ها هه‌یه‌، پێویستی به‌ سه‌یاره‌ی دوا مۆدێل هه‌یه‌، پێویستی به‌ قه‌سرو ته‌لاری خه‌یاڵی هه‌یه‌، پێویستی به‌ گازینۆی قومار هه‌یه‌، پێویستی به‌ هونه‌رێكی شازونۆتی وه‌ک (....)هه‌لكه‌وت زاهیری هه‌یه‌، پێویستی به‌ ئاخ وئۆفی نیشه‌بزوێنی ده‌شنێ ولۆكه‌ وناسیلی وباقی مێگه‌ڵه‌كه‌یه‌، به‌ڵكو له‌جیاتی هێنانی نانسی عه‌جره‌م وهه‌یفا وئه‌لیسا وسه‌ماكه‌ره‌ ئیرۆسیه‌كانی جه‌مشید به‌رهه‌می خۆماڵی بره‌و پێبده‌ین تا عومله‌ی سه‌عبه‌مان بۆ بگه‌ڕێته‌وه‌ نه‌چێته‌ گیرفانی (....) عه‌ره‌ب و فارس و تورک چونكه‌ هینه‌كانی خۆمان ئه‌ولاترن، كه‌ ئه‌وه‌ جۆرێكیشه‌ له‌ كوردایه‌تی!

له‌ كێشه‌ی كتێبی [ئایه‌ته‌ شه‌یتانیه‌كان]ی سه‌لمان ڕوشدی وفه‌توا به‌ناوبانگه‌كه‌ی كوشتنی، خه‌ڵكێكی زۆر به‌رگریان لێكرد یان له‌ دژی بوون، به‌ڵام ئه‌وه‌ی له‌ هه‌موان زیاتر سه‌رنجی منی ڕاكێشا ئه‌وه‌ بوو نوسه‌رێكی به‌ریتانی گوتی:" من ده‌ڵێم سه‌لمان ڕوشدی موسته‌هه‌قی فه‌توای كوشتنه‌ له‌به‌ر بیروڕاكانی نا، به‌ڵكو له‌به‌ر ئاستی نزمی ئه‌ده‌بی نوسیندا"!!

هه‌ڵكه‌وتیش موسته‌هه‌قی ڕه‌خنه‌ وئیدانه‌كردنه‌ له‌به‌ر هونه‌ر نا، به‌ڵكو له‌به‌ر ئاستی نزم وناڕه‌سه‌نایه‌تی هونه‌ره‌كه‌ی. ده‌سه‌ڵاتیش وه‌ک له‌و بواره‌ی به‌رهه‌م هێنانه‌دا سه‌ركه‌وتنی به‌ده‌ست هێناوه‌ و هه‌لكه‌وت زاهیر توانیویه‌تی له‌ ساڵێكدا ٦٠٠ ئاوازی [نۆتی و هۆم شیكه‌واوا وتامی ئه‌و وئه‌م بكه‌] دابنێت، ئه‌گه‌ر له‌ بواره‌كانیی تری به‌رهه‌مهێناندا هێنده‌ بلیمه‌ت بایه‌ نه‌ پێویستیمان به‌ كه‌ره‌وزی ئێرانی و نه‌ به‌ پیازی كوێتی ونه‌ به‌ ته‌ماته‌ی سعودی وڕۆنی توركی وماستی مۆزه‌مبیقی ده‌بوو.

04-06-2012

## پرۆژە یاسای نیشتەجێکردن بۆ پێشمەرگەی بێ خانوو

ماشەڵلایان لێ بێت زۆربەی زۆری سیاسەتمدار و دەسەڵاتدارانمان، لە سەرۆکی هەرێمەوە تا وەزیر و ئەندام پەرلەمان وسەرۆکی حزبەکان، بەشێك لە ژیانیان لە وڵاتانی ئەورووپی و ئەمریکا بەسەر بردوە. بەڵام لەوە ناچێت کەمترین سوودیان لەو ژیانەی ئەوێ کردبێت بۆ ڕیزگرتنی زیاتری مافی مرۆڤ، و بۆ دەستاودەستکردنی پایە و وازهێنان لە کورسی بە خواهیشی خۆیان، نەك لەو ساتە وەختە عەسیب و ترسناکانەدا وەزعەکە وا تەنگژاوی بکەیت بیگەینیەتە لێواری شەڕی ناوخۆ، لە پێناو مانەوەت، مانەوەش لە پێناو چی؟! خۆزگە ئەوەندەی حوکمت کرد دوو شتی چاك و دوو دەسکەوتی گەورەمان بەدی دەکرد!

دەزانم کات بە فیرۆدانە هانی ئەوەتان بدەین وەك خۆرهەڵاتیەکان بن، بەڵام دەکرێت لە هەندێك لەو سیستمە جوانانەیان سوودمەند بین بۆ هێنانەدی کەمترین عەدالەتی کۆمەڵایەتی. لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا هەرکەسێك کە کاری نەبوو و دەستی کورت بوو، مووچەیەکی خوار مام ناوەندی بۆ خۆیی و بۆ خێزانی دابین دەکەن، و کرێی خانووشی هەموو بۆ دەدەن، جا ئەو خانوەی تێیدایە هی شارەوانی بیت یان هی خەلکی تر بێت تۆ بەکرێت گرتبێت.

ئەوە باسی خەڵکانی کەمئەندام هەر ناکرێت چ نازێکیان دەکێشن ئەو حوکمەتانە .مووچەیان دوو تا سێ قات زیاترە لە کەسی ئاسایی، خەڵکیان بۆ دەگرن بۆ خزمەت کردنیان، بۆ بازاڕکردنیان وشتیتریش. هەموو هاتوجۆکردنیان بە پاس و قیتار وهەندیکیان تاکسیش بە خۆڕاییە! نوێترین ئوتۆمبیل بە هەموو خزمەتگوزاریەکانیەوە وەردەگرن بە کرێیەکی کەمی مانگانە، ولە کاتێکدا خەڵک گەورەترین کێشەی، ڕاگرتنی ئوتۆمبیلە، ئەو کەمئەندامانە بۆیان هەیە لە هەر شوێنێك ڕایگرن! هێندەیان ناز دەکێشن تا ئەو ڕادەی زۆریان لە خۆیان گۆڕاون، پۆز لەسەر خەڵکی نا کەمئەندام لێدەدەن، لە جیاتی کەمێك هەستی مرۆڤایەتیان لا بەهێزتر کات! حوکمەتە مرۆییەکانی ئەوان ئەو خزمەتەی خەڵك دەکەن بێ ئەوەی ڕەچاوی نەتەوە و ڕەگەز و ئایینی خەڵکە نەدار و کەمئەندامەکان بکەن، بێ ئەوەی پرسیار لە سوودمەندی و بێ سوودی ئەو تاکە بکەن! زۆربەیان لە یەکەم ڕۆژی چوونیان بۆ ئەو وڵاتە نەخۆش بوون، یان خۆیان بە نەخۆش کردووە! یانی تەنها لەبەر ڕیزیان بۆ مرۆڤایەتی ئەو مرۆڤانە خزمەتیان دەکەن، دەنا هیچ سوودێکیان لێ نابینن!

من لەو حوکمەتە بێ پارەیەی، کە ئەگەر گەندەڵی و تاڵان وبڕۆیی ساڵانیکی نەبوایە، ئێستا بەلایەنی کەم پاشەکەوتی سی ساڵی هەبوو بۆ ڕۆژێکی وا. من لەو سیستمە گەندەڵە چاوەڕوانی ئەوە ناکەم مرۆڤایەتیان تا ئەو سنوورە بڕ بکات، هەموو تاکێکی وڵات وا خزمەت بکات، بە تاکی سوودمەند و بێ سوودەوە! بەڵام بەلایەنی کەمەوە ئێوە خزمەتی

سوودمەندەکان بکەن، هیچیتر هەیبەتی پێشمەرگەکان مەشکێنن لەبەر چاوی دۆست و دوژمن! پێشمەرگە چۆن هەیبەتی دەمینیت وەك ئافرەتێکی لانە شێواو لەسەر تەلەفزیۆن بە بەرچاوی دەیان کچی جوانەوە بگرییێت لەبەر بێ مووچەیی؟!

دەڵێن پێشمەرگەکانی شێخی نەهری وبەدرخان و شێخ سەعید پێش چوونە شەڕ خۆیان زۆر جوان دەکرد، و قژ و سمێڵ و ڕیشیان چاك دەکرد، دەیانگووت ئەگەر شەهید بووین با کچی کورد بە دزێوی نەمانبینن! ئێستاش پێشمەرگە لەبەرچاوی کچی کورد و منداڵی کورد دەگرییێت لەبەر بێ دەرەتانی!

پێشمەرگە چۆن هەیبەتی دەمینیت وەك سواڵکەرێك بۆ قەرز کردن دەستی پان بکاتەوە تا بڕێك پارە وەرگرێت پێی بجیتەوە بەرەی شەڕ! پێشمەرگە چۆن هەیبەتی دەمینیت لەبەر بێ چارەسەری بگرییێت؟ پێشمەرگە چۆن هەیبەتی دەمینیت بڵێت من زیاتر لە داعش لە کرێچیەکەم دەترسم!!
پێویستە پەرلەمانی کوردستان و سەرۆکایەتیەکەی پرۆژە یاسایەکی خیرا بە ناوی پرۆژەی نیشتەجێ کردن یان هاوسینگی پێشمەرگە پێشکەش بکەن و تیایدا حوکمەت:

-کرێی خانووی هەموو پێشمەرگەیەك بگریتە ئەستۆ و مووچەی پێشمەرگە بە سواڵکردن و مرزکردن و هەر شێوەیەك بێت بدرێت، لەوەتەی شەڕی داعش دەستیپێکردوە.

-ئەو پێشمەرگەی خانووی کرێی نییە، پێویستە شارەوانی بەپێی ژمارەی ئەندامانی خێزانی خانوویان بۆ کرێ بۆ بدۆزێتەوە.

-مەسەلەی چارەسەرکردنی پێشمەرگە بە چاکترین چارەسەر بکرێتە ترۆپکی یەکەمەکان، هەرچەندە ئەوە بابەتێکی ترە دەکرێت لە پرۆژە یاسایەکیتریش چارەسەر بکرێت.

-پرۆژەی دروستکردنی یەکەی نیشتەجیکردن بۆ پێشمەرگە خێرایی تێدا بکرێت، تا حکومەت ڕزگاری بێت لە کرێدان.

ئەگەرنا چاوەڕوانی ئەوە بکەن بەتەواوی هەیبەتی پێشمەرگە بشکێت، لە خەیاڵدانی خەڵك، و

له‌به‌ر چاوی نه‌وه‌ی نوێ. پێشمه‌رگه‌ پێویستی به‌ قسه‌ی قه‌ڵه‌ و گۆرانی وسروودی زۆر وبۆر، و وتاردانی درێژ و خۆ سوورکردنه‌وه‌ی بۆش نییه‌ !پێشمه‌رگه‌ پێویستی به‌ دووپاتکردنه‌وه‌ی سه‌رۆکی هه‌رێم نییه‌ له‌ هه‌موو بۆنه‌یه‌ك، كه‌ ده‌ڵێت من پێشمه‌رگه‌م! سه‌رۆك با ببێته‌ پێشمه‌رگه‌یه‌كی بێ پاره‌ وموو‌چه‌، و كرێچی و خێزانی پاره‌ی كارتێكی كۆڕه‌ك و ئاسیای نه‌بێت ته‌له‌فۆن بۆ مێرده‌كه‌ی بكات، ئه‌و كاته‌ ده‌زانێت ئه‌و پێشمه‌رگه‌یه‌ یان نا !

بیر له‌ چاره‌نووسی خۆتان ناكه‌نه‌وه‌ ڕۆژێك ئه‌و پێشمه‌رگه‌ بێ مووچه‌ و بێ خانه‌ ولانه‌ وبی كه‌رامه‌ت لێتان یاخی بێت له‌ ڕقی برسیبوونی منداڵ و ژنی؟! ناترسن له‌ كاردانه‌وه‌ی ده‌رهه‌ق به‌ سوكایه‌تیكردنی كرێچیه‌كانی و چوونه‌ سه‌رماڵی له‌ كاتێكدا ئه‌و له‌به‌ره‌ جه‌نگ دا بێت وبه‌رگری له‌ خاكێك بكات تێیدا كرێچی بێت و سه‌د مه‌تری چوارگۆشه‌ی نه‌بێت بۆ خێزانی، له‌ كاتێكدا ملیۆنێك عه‌ره‌بی كۆنه‌ به‌عسی و داعشی له‌سه‌ر خاكه‌كه‌ی به‌ ڕیزه‌وه‌ بژین؟ !

٢٠١٥/٧/١

## ڕەخنەش ماندووەو ئیبن خەلدونیش حەپەساوە لە گەندەڵان!

باوەڕ ناکەم لە هەموو مێژووی هاوچەرخدا لە هیچ وڵاتێک بەقەد کوردستان ڕەخنەی تێدا بنوسرێ و ڕەخنەشی تێدا ڕیسوا بکرێت بە فەرامۆش کردنی وگوێ پێ نەدانی .دەسەڵات لە ئاست ڕەخنەکان گوێی کەڕ کردوە ومێشێکی لێ میوان نییە، لەوەش نەگبەتتر ئەو ڕەخنانەش نەبونەتە هێزوگوڕێك بۆ جەماوەر لە قۆناغی گوێگرتنەوە تەکان بدات بۆ قۆناغی کردار.لە کوردستان هەر دەسەڵات بێباکی خۆی نیشان نادات لە ڕەخنە، بەڵکو خەڵکیشیان واڕاهێناوە کە پرۆسێسی ڕەخنەگرتن کارێکی بێ هودەیە، لە زۆر کەسم بیستوە کە ڕەخنە لە کێ دەگریت وبۆ کێی دەنوسیت، بەرپرسەکان ئەوە هیچ نایخوێننەوە، چونکە سکرتێرەکانیان تەنها هەواڵە خۆشەکانیان پێ دەڵێن، ئەوە تەنها دەزگا ئەمنیەکانی دەسەڵاتە گرنگی دەدەنە ئەو نوسەرانەی کە ڕەخنە دەگرن لە دەسەڵات یان جوێن بە دەسەڵات دەدەن بە عەقڵیەتی ئەمنی، چونکە بەپێی ئەو عەقڵیەتە ئەمنیە ڕەخنە شتێک نیە لە جوێن پێدان زیاتر.

بەرپرسانی وڵاتانی عەرەبی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک چۆن منداڵان دەکوترێن لە دژی نەخۆشیە درمەکان ئاوا خۆیان کوتاوە لە دژی ڕەخنە، گەورەترین کارەسات وفەزیحە لای ئەوان بە قەد گزەی مێشێك کاریان تێناکات، نابینیت سەدا ٩٠% خەڵک دژی گەندەڵی دەسەڵاتە کەچی بە زەبری زۆرداەرکی بودجە تێدەپەڕێنێ و بۆ سەرقاڵ کردنی پەزەکانی پێشبرکێی شاجوانی کوردستان دەکات بە دەست کۆمپانیایە بێ ئابروەکانی لوبنان کە تەنها لە پیشەسازی سێکسی بلیمەتن. یان لە سەدا ٩٠% خەڵک زیاتر لە ساڵێکە دژی بەشار ئەسەد خۆپیشاندان دەکەن و پاش کوشتنی نزیکەی ٢٠ هەزار کەس، هێشتا خۆڕاگرە لە بەردەم ئیرادەی خەڵکی پیلانگێڕ!! ئەو ئابڕو چونانەی لە دەسەڵاتی کوردی ڕۆژانە ئاشکرا دەبێت دەیان حکومەتی پێ دەڕوخێت وهەڵدەوەشێتەوە لە وڵاتانی کە یاسا بەڕاستی بەرقەراە و پەرلەمان بەڕاستی پەرلەمانە وپریەتی لە پەرلەمانتارانی خاوەن ئیرادەی سەربەخۆیی خۆیان. کوردستان کە هێشتا قەوارەیەکی فیدرالیە ونەبۆتە دەوڵەتیش کەچی ئاستی گەندەڵیەکانی زۆر لە وڵاتانی سەربەخۆشی تێپەڕاندوە.

بەپێی تیوری ئیبن خەلدون بێت یەکەم دەستەی دەسەڵاتدار کە لە قۆناغی دروست کردن ودامەزراندنی دەوڵەتن لەسەر بنەمای عەسەبیەت[هاوسۆزی] وهاوڕەگەزیدا، دەبێت دەستەیەکی زۆر خاکی و چاونەترس ودەست پاک ودڵسۆز و قوربانی دەر بن، زۆر یەکگرتوو بن وهەماهەنگی تەواو هەبێت لە نێوان فەرمانڕەوا وخەڵکەکەی ودەسەڵات لەو قۆناغە بە بەژداری دەبێت لە نێوان سەرۆک و پێشەوا و سوڵتان لەگەڵ میللەتەکەی، ئەو قۆناغە دوور دەبێت لە تەرەف و فەنتازیای پارە بە هەدەردان و پارەکە بۆ پتەوکردنی

بنەماکانی قەوارەکە دەخرێتە گەڕ. قۆناغی دوەم قۆناغی تاکڕەوی دەسەڵاتە، سێیەم قۆناغی سەرسوکی وئاسودەییە [الفراغ والدعە] کە دەوڵەت بەری کارەکانی پێشوی دەچنیتەوە، قۆناغی چوارەم قۆناغی سەرکزی وسەلامەت خوازیە [القنوع والمسالمە] تێیدا دەوڵەت لەسەر دەسکەوتەکانی پێشو دەژێت، قۆناغی پێنجەم قۆناغی [الإسراف والتبڑیر] هەڵەخەرجی و بە هەدەردانی سامانە!! کە لەو قۆناغەدا دەوڵەت سامانی میللەتەکە تەنها بۆ چڵێسی و بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆیی وحاشیەکەی بە بای پیلان سەرف دەکات و بە هەدەری دەدات ولەو قۆناغەدا وەک ئیبن خەلدون دەڵێت دەوڵەت توشی پیربوون وبە تەمەن داچوون دەبێت، نەخۆشی کەڤنار بەرۆکی دەگرێت کە چارەسەری نییە وتا لە ناو دەچێت!! ئەو پێنج قۆناغە ١٢٠ ساڵی دەوێت بە مە زەندەی ئیبن خەلدون!!

یەکێک لە بلیمەتیەکانی دەسەلاتی کوردی ئەوەیە توانیویەتی ئەو هەموو قۆناغانەی دەوڵەت ببڕێت سەر لە باوکی ئیبن خەلدون یش بشێوێنێ کاتێ لە یەکەم قۆناغدا هێشتا تازە لەوبەر سنور وچیاکان هاتنەوە لەو پەڕی پەڕپوتی ونەداریدا چاوەڕێیان نەکرد بە دڵسۆزی بنچینەی یەکەمی دەوڵەتی کوردی یان قەوارەی کوردی دامەزرینن، بەڵکو یەکسەر بە بازە کولەیەك گەیشتنە قۆناغی [الإسراف والتبذیر] ی پێنجەم، دەڵێی قەومەکەی یاجوج وماجوجن لەپشت شورەکاندا بە برسێتی بەندکرابوون و کاتێ شورای بەندیان شکاند بەو شێوەیە برسێتیەی سەدان ساڵەوە بەربونەتە هەڵلوشینی سامانی ئەو نەتەوەیە ولەو پێناوەدا لە هیچ جۆرە رەخنە ونەقد وقسەیەکیش سڵ ناکەنەوە. ئەو قۆناغە لای ئیبن خەلدون قۆناغی هەڵوەشاندنەوەی عەسەبیەتە بەمانای [سۆزی نەتەوەیی یان هۆزگەلی] وقۆناغی لە نێو چوونی سامانەکانە کە بە زەرورەت بەرەو ڕوخانی قەوارەی دەولەت دەچێت لە ڕووی سیاسی وئابووریەوە.

بەرای من گوێنەدان و فەرامۆس کردنی ڕەخنە لەلایەن دەسەڵاتەوە وماندوو بوونی ڕەخنەی کوردی لە دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەسەڵات و ڕەخنە لە دوو قۆناغی جیاوازن لە ڕووی زهنیەت وقۆناغ وگۆڕەپاندا، ڕەخنە هێشتا لە قۆناغی یەکەمی دامەزراندن دایە، کەچی دەسەڵات لە قۆناغی هەڵەخەرجی و بە هەدردان وئیسراف دایە کە تێیدا دەسەڵات بە هەڵوشینی سامانەکان وەک تلیاک خۆرەکانی جیهانە خەیاڵیە بەرزە فڕەکەی تلیاک خۆرانی لێ دێت نە دەتوانی گوێ بۆ کەس بگرێت ونەتێ بگات لە کەس، جگە لە وڕێنە تلیاکیاوەیەکانی خۆی گوێی لە هیچی تر نییە!! لەو قۆناغەدا ڕەخنە ماندوو و شەکەت دەبێت، لەوانەیە دەسەلاتی مەست بوو بە تلیاکی گەندەڵی دڵی خۆش بێت کە ڕەخنە ماندوو بوە وجەوی نەماوە هیچی تر بنوسێت، بەڵام ترسناکی قۆناغەکە ئەوەیە تورەیی ڕەخنە وماندوو بوونی خەڵک بەرەو تەقینەوەیەکی سەرتاسەر ببات و تا ئەو دەسەڵاتە سەرخۆشەی بە تلیاکی گەندەڵی بە هێز باڵبەست بکەن و بەرەو نزیکترین کلینیکی چارەسەری عەقڵی یان چارەسەری لە ئاڵودە بوون بە تلیاک بەرن! 08-07-2012

## هاتنی دکتۆر هۆرجۆن بۆنەیەکی جەماوەریە یان بۆنەی خواوەندەکانی گەندەڵیە؟

بەڕاستی کورد سەلماندی کە گەلێکی زۆر هۆشمەندن وحەز بە شارستانیەت و ئاستی بەرزی ڕەوشتی دەکەن ئەگەر بواریان هەبێت. ئەگەر دڵسۆزانە کاربکرایە لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی ژیاری و فەرهەنگی کورد، دەستە وحزب و گروپگەلێک بەرژەوەندیان لە مانەوەی کورد بە ناحاڵی نەبوایە، ئێستا گومانم نەبوو کە پێش هەموو گەلانی ناوچەکە دەکەوتەوە. یەکەم جارە لە مێژووی گەلان هونەرمەندێک لە ڕۆڵی دکتۆرێکدا ئەو هەموو لاینگرەی هەبێت تا ڕادەی ئەوەی لەبەر مەرگی دکتۆرەکە لە دراماکە جلی ڕەشی بۆ بپۆشن وتازیەباری بۆ بکەن ولافیتەی رەشی بۆ هەڵواسن.

هاتنی دکتۆر هۆرجۆن کەسایەتی دیاری زنجیرە درامای پزیشکی ئەفسانەیی بۆ کوردستان بەداوەتێکی فەرمی کۆمپانیایەک زۆر مانا ودەلالاتی گەورە هەڵدەگرێت، هەرچەندە خەریکە لەبەر دیتنی بەرپرسان و پیاو ماقوڵان و خواوەندەکانی گەندەڵی بۆنەکە زۆر بچوك کەنەوەو لەبەر چاوی خەڵکی بکەوێنن. دکتۆر هۆرجۆن [جۆن کوانگ رایۆڵ] لە میللەتێکی زیندوو وداهێنەرو بەڕەوشتی یەکێک لە پڵنگەکانی ئاسیا هاتوە،و نازانێت چی دەگوزەرێت لە کوردستان،و نازانێت زەمەن لە کوردستان راوەستاوە ئەو حاڵەتەی گەندەڵی ویژدانی پزیشکەکان کە ئەو ئاماژەی پێدەکات لە سەدەکانی پازدە و شازدە لە کوردستان تازە بازاڕی گەرمە وتا دێت گەرمتریش دەبێت و بەشێکی بچوکی کۆی گشتی گەندەڵستانەکەیە. دکتۆر هۆرجۆن نازانێت وەک چۆن ئەو لە پاکی و بێگەردی وهەژار دۆستی داهێنەر بوو، ئاواش گەندەڵکارانی ئێمە لە قۆچینەوە و دزین وتاڵانی سامانی نەتەوەیی وخنکاندنی هەژاران داهێنەرن، گومانی تێدا نییە گرەویان لە باندە مافیایەکانی ئەمریکای لاتینیش بردۆتەوە، چونکە لەوانیش چڵێسترن وچاوچنۆکترن و بێ خێرترن بە بەڵگەی ئەوەوە کە سەرانی مافیاکانی ئەوێ زۆریان لایەنگروخۆشەویستێکی زۆریان هەیە لەناو گەلەکاندا، هەندێ جار وەک کەسانی ئەفسانەیی سەیریان دەکەن! دکتۆر هۆرجۆن نازانێت هاوکات لەگەڵ هاتنی ئەودا ئەوانەی پێشوازی لە ئەو دەکەن چەند ساڵە بە زەبری چاوسورکردنەوە بودجە لە پەرلەمان تێدەپەڕێنن، هێندە داهێنەرن بە کون فەیەکونێك لەسەر نەخشە گوند وئاوایی خەیاڵی دروست دەکەن بۆ ئەوەی بودجەی خەیاڵی بۆ دابنێن وبچێتە گیرفانە خەیاڵیەکان .

با کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ دکتۆر هۆرجۆن بکەن خەڵک پێی بڵێن بۆچی ئەویان خۆش دەوێت ...ئەگەر ئەو کۆمپانیایەی داوەتی کردوە پاشکۆیەکی گەندەڵکاران نییە لەجیاتی بردنی بۆ لای ئەوانەی خەڵک لە دژی ئەوان دکتۆر هۆرجۆنی خۆش دەوێت، با لەسەر شەقامەکانی سلێمانی وهەولێر و ڕانیە و دهۆک کۆبونەوەی جەماوەری بۆ سازبدەن و پێی

بڵێن چ باسەو بۆ ئەو خەڵکە تا ئەو ڕادەیە ئەویان خۆش دەوێت؟ بۆچی لەبەر مردنێکی درامی ناڕاستەقینەش خەڵکی ڕەشپۆشیان گرت بۆی ولافیتەی سەرەخۆشیان بۆ نووسی [وانا لله وانا الیه راجعون] با خەڵک بە دکتۆر هۆرجۆن بڵێن چۆن زۆربەی دکتۆرەکانی کوردستان وەک مەڕومالاَت سەیری نەخۆشە هەژارەکانیان دەکەن بە بەڵگەی ئەوەی سێ سێ و چوار چوار نەخۆش دەهێننە ناو ژوری پشکنینی خۆی، بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ تایبەتمەندی و پاراستنی نهێنی نەخۆشەکانی بکات.

با خەڵک بە دکتۆر هۆرجۆن بڵێن چۆن دکتۆرە نا مرۆڤەکان هەتا جێگایەکی گونجاوی چاوەڕوانکردنیش بۆ خەڵک دابین ناکەن، نەک ئەوە، بەڵکو نزمترین پلەی تەندروستیشی تێدا ڕەچاو ناکرێت، بۆ نمونە بۆ ئاوی خواردنەوە یەک پەرداخ دانراوە، کە خەڵکێکی زۆر لێی دەخواتەوە بەبێ گوێدانە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی. با خەڵک بە دکتۆر هۆرجۆن بڵێن چۆن زۆربەی دکتۆرەکانی کوردستان لەسەر نەخۆشەکانیان فەرز دەکەن کە دەرمان لای دەرمانخانەکانی خۆیان بکڕن و بەفێڵ پێیان دەڵێن کە دەرمانەکانت کری وەرەوە لام تا چەند ئامۆژگاریەکت بکەم وەک دکتۆرێکی گەنج لە هەولێر وای لەگەڵ من کرد.

با خەڵک پێیان بڵێن چۆن زۆر لە دکتۆرەکانی کوردستان هێندە بێویژدان بوونە دەرمانی زیادە و بێ پێویستی و بگرە دەرمانی وا دەنوسن بۆ هەندێ نەخۆش کە پەیوەندی بە نەخۆشی نەخۆشەکەوە نیە. با خەڵک بە دکتۆر هۆرجۆن بڵێن لە وڵاتان دکتۆروسیستەر ئەگەر لەکاتی قسەکردندا لەگەڵ نەخۆش لەجیاتی ناوهێنانی بەڕێزەوە پێی بڵێت مای دیەر my dear کە دەستەواژەیەکی زۆر ئاساییشە کەچی سزا دەدرێن ئەگەر دووبارەیان کردەوە، کەچی دکتۆرو پەرستارەکانی کوردستان لە جیاتی فریشتەی ڕەحمەت بن بۆ نەخۆش بونەتە میرغەزەبی عەزاب بۆ نەخۆشەکانیان، و ئاگادارم زۆربەی ژنانی کوردستان تۆقیون لە منداڵبوون لەو نەخۆشخانانە لەبەر سوکایەتی پێکردنیان و جوێن پێدانیان، بەڵکو لێدانیشیان لەکاتی ژانی منداڵبوندا!! ئەو جوێنانەی دەدریت لەلایەن ئە دکتۆرو پەرستارانە هێندە سوک وپیسن ڕووی مەجلیسیان نییە!

با خەڵک بە دکتۆر هۆرجۆن بڵێن ئەوە دەگوزەرێت لەو وڵاتە گەندڵستانە وئەگەر وەک ئێمە تۆ دەیان ناسیت هەرگیز قبوڵ ناکەیت وێنەتان لە یەک چوارچێوە لەگەڵ خوداوەندەکانی گەندەڵی کۆببێتەوە. بەهاتنی دکتۆر هۆرجۆن دەبێت هەموو خوداوەندەکانی گەندەڵی ودکتۆرە بێویژدانەکانی کوردستان کە زۆربەی هەرەزۆریان تا سەرئێسقان خراپن و ویژدان گەندەڵن، ئارەقەی شەرمەزاریان بێتەوە، ئەوانەی وادەکەن وەکو ئەو کەچەڵە وایە کە شانازی بە قژی هاوسێکەیانەوە دەکات. 17-06-2012

## كه‌ دز ڕۆڵی ماڵخۆ ده‌گرێت

ڕاسته‌ فلسێكی ئه‌حمه‌ری ئه‌و كوردستانه‌ نه‌چۆته‌و ناچێته‌ گیرفانم ومن له‌ده‌ره‌وه‌ ده‌ژیم و بودجه‌ ده‌خورێ و ده‌دزرێ به‌من هیچ، وه‌ك برادەرێک پێی گوتم تۆ بۆ خۆت سه‌رقاڵ ده‌كه‌یت به‌و بابه‌ته‌! به‌ڵام ئه‌و ئیستهتاره‌ی په‌رله‌مانتارانی ده‌سه‌ڵات به‌ سامانی خه‌ڵك و ئه‌و هه‌موو دزیه‌ و پێشێلكاریه‌و كه‌موكورتیه‌ی له‌ بودجه‌دا ده‌رده‌كه‌وێت، ئه‌وه‌ بۆ چه‌نده‌مین ساڵه‌، مرۆڤ توشی كوفر به‌ كوردبوونیشی ده‌كات و ده‌یهێنێته‌ قه‌ناعه‌ت كه‌ ئه‌و برادەرانه‌ تا چ ڕاده‌یه‌ك ده‌ماری مرۆیی و كوردایه‌تیان سڕ بووه‌ له‌ ئاستی گه‌له‌كه‌یان. حاشا لیلا ئه‌گه‌ر په‌رله‌مانتارانی توركه‌ كه‌مالیسته‌كان نوێنه‌ری خه‌ڵكی كوردستانی عێراق بن، ئه‌وانه‌ نوێنه‌ری ئه‌و خه‌ڵكه‌ نین، ئاخر ئه‌وه‌ی ده‌نگ ده‌دات به‌ تێپه‌ڕبوونی ئه‌و بودجه‌یه‌، یانی ده‌نگ ده‌دات به‌ دزی وتاڵانی و بێ به‌هایی و به‌شدار ده‌بێت له‌ هه‌موو ئه‌و سیفه‌تانه‌. ئه‌وه‌ی فشار ده‌كات به‌ ئاراسته‌ی تێپه‌ڕاندنی ئه‌و ده‌عبایه‌ دزێوه‌ی كه‌ ناویان ناوه‌ بودجه‌ بیه‌وێ یان نا خه‌ڵك وه‌ك سه‌رۆك باندی ئه‌و دزی وتاڵانیه‌ سه‌یری ده‌كات.

ئه‌و بێ ویژدانیه‌ی له‌ قوچانده‌نه‌وه‌ی سه‌روه‌ت وسامانی خه‌ڵك به‌ بیانوی وه‌همی و بێ هۆ و به‌ هۆكاری پێكه‌نین هێنه‌ر زاده‌ی عه‌قڵیه‌تێكی نه‌خوێنده‌واری، بی ئینتیمای كوردایه‌تی و شوراوه‌یه‌ له‌ مرۆڤایه‌تیش... ئه‌وه‌ی ئه‌و بودجه‌یه‌ی نوسیوه‌ به‌ عه‌قڵیه‌تی ره‌ئیسی بانده‌ دزیه‌كانه‌وه‌ نوسیویه‌تی و به‌و عه‌قلیه‌ته‌وه‌ش دابه‌شی ده‌كه‌ن، ئه‌وه‌ی ئه‌وها بیرده‌كاته‌وه‌ دزه‌ هه‌رگیز ماڵخۆ نیه‌ و باوه‌ڕی به‌ ئاینده‌ی ئه‌و میلله‌ته‌ نییه‌، به‌ ده‌رونێكی كۆچه‌ری نه‌ك نیشته‌جێیی بیرده‌كاته‌وه‌...

ماقوڵه‌) ٢٠٠ (ملیارد بۆ حزب و ڕێكخراوه‌كان ته‌رخان بكرێت كه‌ به‌قه‌د سه‌ره‌ ده‌رزیه‌ك خێریان بۆ كورد و میلله‌ت نییه‌؟! كه‌ به‌و ٢٠٠ ملیارده‌ ئه‌گه‌ر مه‌ڕوماڵاتی پێ بكڕن چاكتره‌ نه‌ك له‌ ماستاوچیه‌كانی وخاوه‌ن موچه‌كانی بندیواری حزب سه‌رفی كه‌ن، ئه‌گه‌ر مه‌ڕوماڵاتی پێ بكڕن هه‌ر نه‌بێت به‌و پاره‌یه‌ كوردستان پڕاوپڕ ده‌بێت له‌ خێروبیر! ئه‌و به‌شه‌ زه‌به‌لاحه‌ی بودجه‌ كه‌ بۆ هه‌ردوو ده‌زگای [ده‌زگای ئاسایش له‌ لایه‌ن یه‌كێتی نیشتمانیه‌وه‌ به‌ڕێوه‌ ده‌برێت‌و ئه‌نجومه‌نی ئاسایش له‌ لایه‌ن پارتی دیموكراته‌وه‌] حكومه‌ته‌ یه‌كگرتوه‌كه‌ی كوردستان به‌ جیا ته‌رخان كراوه‌ پیاو توشی قێزهاتنه‌وه‌ ده‌كات، ئاخر كه‌ی ماقوڵه‌ دوو ده‌زگای سیخوڕی كه‌ ته‌نها بۆ تۆقاندن ولێدانی وتیرۆر كردنی كورد ته‌رخان كراوه‌، وبۆ شه‌ڕی حزب حزبێنه‌ دروست كراوه‌ كه‌چی ئه‌و بودجه‌یه‌ زه‌به‌لاحه‌ی بۆ ته‌رخان بكرێت؟ !له‌كاتێكدا هێشتا دوو ده‌زگای فه‌رمی حكومه‌تیش نین وده‌زگای حزبن!! ئه‌گه‌ر ئه‌و دوو ده‌زگایه‌ هێنده‌ ڕه‌شید وئازان با چاره‌سه‌ری ئه‌و ناوچانه‌ بكه‌ن كه‌ كورد به‌ نوێژی نیوه‌ڕۆ چاوی لێ سورده‌كرێته‌وه‌ وشاپ له‌ده‌ریان ده‌كه‌ن له‌سه‌ر زێدی باوك وباپیرانیان، ئه‌وه‌ كورد به‌ لێشاو له‌ناوچه‌ به‌ناو جێناكۆكه‌كان ڕاوده‌نرێن، نه‌یانتوانی به‌ر به‌ دوژمنانی ده‌ره‌كی بگرن،

ئەگەر وا دڵسۆزن کەمێک کەرامەتی نەتەوەییان هەبێت دەبێ نەهێڵن کورد بە دەستی ئێران وتوران بە بەرچاوی ئەوانەوە تیرۆر بکرێن وبڕفێنرێن بەرەو ئێران وکوێ وکوێ. دەبا چالاکیە پیس ونەگریسەکانیان لە تیرۆر وئەشکەنجە ولێدانی نوسەران ورۆژنامەنوسان وبەرهەڵستکاران وقۆنەرە پێ ماچکردن بە ڕۆڵەی کورد بگوێزنەوە بۆ بەرەی ئەو دوژمنانە کە کوردیان لەو شوێنانە تۆقاندوە وپەکیان خستون، دەزگایەک بەس لەبەر دەرگای ماڵەوە ئازان ودەنەڕێنێن کەچی ۹۰۰ ملیارد دیناریان بۆ تەرخان بکرێت، بەو پارەیە کەرتی کشتوکاڵی کوردستان دەبوژێتەوە.

ئەگەر باسی دزی وتاڵانیەکانی خودی پەرلەمان بکەین وەک تەئسیساتی ئاو و کارەبا و کرێی بینایەی پەرلەمان کە دەبێت کرێیەکە بدەنە ساجیدەی ژنی سەدامی یان رەغدەی کچی، چونکە بینایەکە هی سەردەی صدامە کە بۆ مەجلیسی تشریعی وتەنفیزی تەرخانی کردبوو، هێشتا لەو بودجە زەبەلاحانە نەیانتوانی بینایەکی نوێ بۆ پەرلەمان دروست بکەن، مانەوەیان لەو بینایە دەلالەتێکی زۆری هەیە وئاماژە بە نەگۆڕی ناوەرۆکی مەجلیسە کارتۆنیەکانی سەردەمی سەدام و پەرلەمانە کارتۆنیەکانی سەردەمی کوردایەتی پڕ خەوش وعەیب وعار دەکات. ئەو دوو مەجلیسە کارتۆنیانەی لە کارتۆنیەتدا هیچیان کەمتر نەبوو لە کارتۆنیەتی پەرلەمانەکەی کوردستان لەگەڵ ڕیزمان بۆ ئەو دەنگە ئازایانەی ئۆپۆزسیۆن وتاک وتەرای دەسەڵاتیش کە بێوچان وبێ هودە دژی تالانچیەتیەکەی دەسەڵات وپەرلەمان زۆر مەردانە ڕابوون، ئەو دەنگانە ئەگەر بەری ئەو گەندەڵیەشیان پێ نەگیرێت، ئەوا مێژویەکی پاك بۆخۆیان تۆمار دەکەن، کاتێ گەندەڵچیەکان بەر نەفرەتی مێژوو ونەوەکان دەکەون، خەڵک سەری ڕیز ونەوازش بۆ ئەوانی دژە گەندەڵ ئەچەمێنن. ئەو پەرلەمانەی گوایە چاودێرە بەسەر دەسەڵاتی تەنفیزی وجێبەجێ کردن، بەڵام کە گەندەڵیەکانی خۆیان دەبینین ئەو کاتە دەزانین ڕانە مەڕ بە گورگ سپێدراوە یان وەك گوتویانە [حامیها حرامیها] پارێزەرەکە دزەکەیە.

زۆر سیاسی ورۆشنبیر وبیرمەندی وڵاتانی ئەو جیهانەی سێیەمە جاروبار دەڵێن داگیرکەرانی پێشوی وڵاتەکەمان چاکتر بوون لە دەسەڵاتی نیشتیمانی، ئێمەی کورد بەرلە گەیشتن بە سەربەخۆیی گەیشتینەتە ئەو قەناعەتەی خۆزگە وەک هەر دورگەیەکی کۆلۆنی لەژێر حوکمی یەک لە ئیمپریالیە جیهانیەکانی وەک ئەمریکا وبەریتانیا وفەرەنسا باین، هەرنەبا بە قەد هۆنگ کۆنگ بایەخیان پێدەداین، ئەو زلهێزە گەورانە بێ گومان لەو دەسەڵاتە بەناو کوردە مرۆڤ تر و بەبەزەیی تر دەبوون بەرامبەر بە مولک وسامانی ئەو وڵاتە، کریس کۆچێرا چاکی بۆ چوە کە بەراوردی سەرانی کورد دەکات بە چەتە دەریاییە سۆمالیەکان، هەرچەندە من پێم وایە هێشتا زوڵمی لە چەتە سۆماڵیەکان کردوە، چونکە ئەوان لەبەر بێکاری وبێ دەرامەتی وشەری ناوخۆ وپشت گوێ خستنی جیهان وبرسێتی وادەکەن،

ئه‌وانه‌ی ئێمه‌ له‌به‌ر تێری وه‌ک جه‌هه‌نه‌می قورئانیان لێهاتوه‌ [یوم نقول لجهنم هل امتلئت، وتقول هل من مزید] که‌ به‌ دۆزه‌خ ده‌ڵێن پڕ بوویت، ده‌ڵێ هێشتا ماومه‌ زیاترم تێکه‌.!!!

24-06-2012

## سوالّی مەڵتی ملیاردێرەکان

دیاردەی کۆکردنەوەی کۆمەك و سوالّ کردن بە ناوی هەژارانەوە تەقلیدێکی کۆنی حزب وگروپە ئاینیەکانە بە قەد کۆنی ئایینەکان کۆنە. حزب وگروپە ئاینیەکانیش کە خۆیان بە میراتگری ئاینەکان دەزانن درێژەیان بەو پراکتیسە داوە، هیچ بۆنەیەکی ئایینی نەماوە داوای کۆکردنەوەی کۆمەك و پارە نەکەن، جاروبار لەکاتی خوتبەی جومعەشدا دەفرەکە دەخەنە بەردەمت و زۆر ئیحراجیشت دەکەن... ئەگەر عوزرێك بدەینە چەند حزبێکی ئیسلامی لەبەر نەبوونی پارەو ئۆپۆزسیۆن بوونیاندا یان بوونیان لە قۆناغی [ئیستزعاف] دا بە قەولی خۆیان، بەڵام دەبێت چ عوزرێک بدەینە حزبە زەبەلاحەکانی کوردستان بە سەدان ملیۆنیان تازە قوت داوە لە بودجەی بێ ساحێبی کورد وبە راست و چەپ سامان و پارەی ئەو میللەتە دەکێشنەوە، دێت و ئەو دیمەنە جەرگبڕانەی هەژارو پەککەوتەکانی کوردستان نیشانی خەڵک دەدەن، بە هەمان دەستوری ڕێکخراو و مزگەوتە هەژارەکان پارە کۆدەکەنەوەو داوا لە خەڵك دەکەن پارە بنێرن بۆ چاککردنی ژیانی ئەو خێزان و ئەم خێزانە، چەند مامۆستایەکی ئاینیش بۆ بەرنامەکە دێنن تا بە سۆزی ئاینی خەڵک ببزوێنێ، لە جیاتی گەڕان بەدوای چارەسەرێکی یاسایی و بەردەوام، دەیانەوێت خەڵک لە رەمەزان بۆ رەمەزان ئەو هەژارانەیان بیرکەوێتەوەو بە شێوەیەکی مەوسیمی یارمەتیان بدەن.

لە بەرنامەیەکی زاگرۆس تیڤی کە لەسایەی خواوە سەر بە بە دەوڵەمەندترین و بەهێزترین پارتی کوردستانە کێشەی خێزانێکی پڕ کارەساتیان خستە بەرچاوی بینەران کە مرۆڤ توشی شۆک دەکات، کێشەی ئەو خێزانە بریتی بوو لە دایکێکی یەک دەست و کچێکی بەستەزمان کە بەدیار دوو کوڕو کچێکی گەورەی بە تەمەن و بە لاشەو ناتەواو لەرووی عەقلیەوە دانیشتوون لەسەر خێرو خێراتی خەڵك دەژین. کەی کێشەی ئەو خێزانە بە [خێروخۆشی] بینەران چارەسەر دەکرێت؟! لە سایەی بوونی بودجەیەکی وا زەبەلاح کە بە قەد بودجەی چەندین دەوڵەتی گەورەیە، شورەییە ئەو حزبە هەتا ڕێگا بە دەرهێنانی ئەو جۆرە بەرنامانە بدات. ئەگەر پارتی پارتیە هەژارەکەی ئاوارەی ئێران و سەردەمی شاخ بێت، ئەگەر هەولێر کابولی ئەفغانستان بێت، یان سلێمانی مەقەدیشۆی سۆماڵ بایە، کەس گلەیی لێ نەدەکردن وهەزار دوعای خێریشمان بۆ دەکردن، بەڵام دەسەڵاتداران خاوەنی سەدان ملیۆن وملیار بن کە هیچیان بە ئارەقەی نێوچەوانیان پەیدایان نەکردوە، کەچی سوالّ لە خەڵکی ئاسایی بکەن، ئەوە شەرم وشورەیی نییە؟! لەوەش گەڕێ بودجەیەکی وا زەبەلاح لە 10% ی نەخرێتە خزمەت ئەو جۆرە هەژارانە کە گومانمان نییە ئەو ڕێژەیە زۆربەی کێشەکانیان چارەسەر دەکات، ئەو خەڵکە هەژارەو پەککەوتەو نەخۆشە عەقلّیەکان بە یاسا یارمەتی نەدرێن وموچەیەکی هەقیقیان بۆ نەبڕێتەوە، سوالّ سودی چیە؟ ئەی پاش رەمەزان کێ سوالّیان بۆ دەکات؟ !دوایی بۆ لە بوونی سەروەت وسامانێکی وا زۆر وگەورە سوالّ بۆ هەژاران

بكه‌ین؟!
پێغه‌مبه‌ر [د.خ] بۆ هه‌ژارێكی له‌ش ساغ ڕازی نییه‌ سواڵ بكات كاتێ ده‌فه‌رمویێ:
[لأن يأخذ أحدكم حبله فيأتي بحزمة الحطب على ظهره فيبيعها فيكف الله بها وجهه خير له من أن يسأل الناس أعطوه أو منعوه] رواه البخاري

[ئه‌گه‌ر یه‌كێک په‌ته‌كه‌ی له‌گه‌ڵ خۆی به‌رێت باره‌ دارێک بكات و به‌سه‌ر پشتی بیهێنێته‌وه‌ وبیفرۆشیت وخوا ئابڕووی بپارێزیت پێی، چاكتره‌ سواڵ له‌ خه‌ڵک بكات كه‌ ده‌یده‌نێ یان نایده‌نێ]

ئه‌وه‌ سواڵ بۆ هه‌ژارێكی له‌ش ساغ مه‌كروهه‌، ئه‌یده‌بێت له‌ پێناو چیدا ئه‌مڕۆ مه‌ڵتی ملیاردێره‌كانی كوردستان سواڵ له‌ ئێمه‌ی بینه‌ران ده‌كه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی یارمه‌تی ئه‌و هه‌ژارانه‌و كه‌مئه‌ندامانه‌ بده‌ین له‌ كاتێكدا سه‌دان ملیۆن دۆلاری ئه‌و میلله‌ته‌ ده‌چێته‌ گیرفانی ئه‌و ده‌زگا ناشه‌رعیانه‌ی كه‌ وه‌ک قات له‌لای خه‌یات به‌ كردنی ده‌ده‌ن تا له‌ شان و شه‌وكه‌تی سه‌ركرده‌ قاره‌مانه‌كانمان بوه‌شێته‌وه‌، ئه‌وانه‌ی به‌ سروشت و فیتره‌ت هه‌ر له‌ دایكبوونه‌وه‌ سه‌ركرده‌ن خوا بیانپارێزێت وچه‌نده‌ ده‌وڵه‌مه‌ندن ده‌وڵه‌مه‌ندتریان كات، وهه‌ولێری گوته‌نی سندانیش له‌ فه‌قیری دا.

hariri66@yahoo.com

07-08-2012

## خەمی ساڵانەی قەسابخانەکەی بودجە!

**".کۆمەڵگای مێگەل، زوو یا درەنگ حکومەتێک لە گورگ حوکمی دەکات**
**برتراند دی ژوڤنیل، فەیلەسوف وئابوری زانی فەرەنسی**

سەرەڕای خەمی ڕۆژانەی خەڵکی کوردستان بۆ کارەبا و ئاو وبەنزین وکەل وپەلی ئێکسپایەر ودەرمانی ئێکسپایەر وقۆڵبڕینی دکتۆرە ناچیزەکان وستەمی بەرپرسەکان ومونافەسە تافیهەکان لەسەر جوانترین سەیارە وخانوو وناوماڵ و هەر رۆژەی لەبەرکردنی جل وبەرگی نوێ بۆ خانمان بە شێوەیەکی تایبەتی، زۆر شتی ساڵانەش هەیە خەڵک قەڵس دەکات وناچاری دەکات خەمێکی لێ بخوات، بۆ نموونە لە کوردستان خەمی زستان ونەوت وغاز وکارەبا دەستەبەربوون لەو وەرزە سارد وبەستەڵەکەدا، خەمی دامەزران بۆ ئەوانەی لە ماڵەوە دانیشتوون، وخەمی دروستکردنی خێزان بۆ ئەو گەنجانەی بێکار وبێ پارەن وچەندین خەمی تر. ژیان لە هەندەرانیشدا مرۆڤ توشی خەمی ساڵانەی تر دەکات بۆ نموونە ساڵانە دەبێت ئوتومبیلەکەت ئینشوور کەیت [تأمین] کە زۆربەی جار ساڵ بە ساڵ نرخی گرانتر دەبێت، بەڵکو زۆربەی جا نرخی لە خودی ئوتومبێلەکەت زیاتر دەبێت بە تایبەتی ئەگەر چەند غەلەتێکت هەبوو وچەند خاڵێك لەسەر مۆڵەتەکەت هەبوو. خەمی ام ئۆ تی پشکنینی ساڵانەی ئوتومبیلەکەت ومۆڵەتی ڕۆیشتن بەسەر ڕێگا وبان ومۆڵەتی وەستاندن لە گەڕەکەکەت وچەندین خەمی تر.

بەڵام مرۆڤی هەستیاری کورد لە ناوەوە ودەرەوە، بۆیەش دەڵێم هەستیار چونکە بەداخەوە خەڵکێکی زۆر هەن بە بەرماوەی بەرماوەیش ڕازین بەو پەڕی ئاسودەییەوە بەرماوەکە لوش دەن، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو بێدەنگیە سەرتاسەریەیە لە ئاست ئاشکرا کردنی ئەو هەموو ژمارە تراژیکۆمێدیایەی بودجە کە بە هەدەر دەدرێت ودەدزرێت بەبەرچاوی هەموان بەبێ ئەوەی دەسەڵات شەرمێک دای گرێت وبێ دەسەڵاتیش فزەی لێوە بێت.

**لە چوارچێوەی ئەو هەواڵانە و زنجیرە راپۆرتانەی ژوری لێکۆڵینەوەی ئابوری بزوتنەوەی گۆڕان لەبارەی کەموکورییەکانی پرۆژە یاسای بودجەی خەمڵێنراوی ئەمساڵی هەرێم ٢٠١٣ کە برەکەی بریتییە لە ١٥ تریلیۆنو ٢٥٧ ملیارو ٨٤٩ ملیۆن دینار. ئامادەی دەکات،دا هاتووە:**

٣ هەزارو ٦٠٠ دەفتەر بۆ کڕینی ئەساس، ١٦ ملیار دینار بۆ ئەساسی دارو ١٥ملیار بۆ ئەساسی مەعدەنی، ١١ ملیار بۆ ئەساسی دیکە.

"٤هه‌زارو ٢٠٠ ده‌فته‌ر بۆ كڕینی ئۆتۆمبیل

بۆ ده‌رماڵه‌و خه‌رجییه‌كانی گه‌شتكردن 30 ملیارو 889 ملیۆن دینار ته‌رخانكراوه‌، ئایا به‌رهه‌می ئه‌م گه‌شتو وه‌فدانه‌ چی بون له‌ رابردودا، سوده‌كه‌یان به‌ ئه‌ندازه‌ی پاره‌ی ته‌رخانكراو ده‌بێت؟

500 "ده‌فته‌ر بۆ ئاهه‌نگ و ڕابواردنی فه‌رمی (الترفیه الرسمی)، له‌شه‌ش مانگی یه‌كه‌می پارساڵدا 10 ملیارو 2 ملیۆن دینار خه‌رجكراوه‌ و وه‌ك ئه‌وه‌ی حكومه‌ت بڕیاریدابێت بۆ ساڵی 2013 رابواردنه‌كانی زیادبكات بڕی 28 ملیارو 382 ملیۆن دیناری بۆ ته‌رخانكردوه‌ و به‌م شێوه‌ دابه‌شكراوه‌".

663"ده‌فته‌ر دۆلار بۆ كۆڕو كۆبونه‌وه‌كانی حكومه‌تی هه‌رێم ته‌رخانده‌كریت"

"حكومه‌ت (10) كارگه‌ی هه‌یه‌، شه‌شیان له‌ كاركه‌تووه‌و چواریان كارده‌كاتو خه‌رجییه‌كانیان 10 ئه‌وه‌نده‌ی داهاته‌كه‌یه‌تیو له‌ ئێستاشدا هیچ پلانێكی نییه‌ بۆ نۆژه‌نكردنه‌وه‌ی ئه‌م كارگانه‌، به‌ڵام ساڵانه‌و به‌شێوه‌ی جیاواز پاره‌ نۆژه‌نكردنه‌وه‌ی كارگه‌ ته‌رخانده‌كرێتو هیچ به‌رهه‌میش دیارنییه‌... ئه‌م ساڵ بڕی 4ملیارو 253 ملیۆن دینار ته‌رخانكراوه‌، ئه‌م كارگانه‌ كامانه‌ن؟ به‌رهه‌مه‌كانیان كوا؟"

نه‌ک هێنده‌ به‌ڵكو ئه‌و دوو فرۆكه‌خانه‌ گه‌وره‌یه‌ی هه‌ولێر وسلێمانی مشه‌ خۆره‌ له‌سه‌ر بودجه‌ و هیچ داهاتێكی وای دیار نییه‌، وه‌ك بڵێی ده‌زگایه‌كی خێرخوازیه‌ وبه‌س!

"ده‌سه‌ڵاتی دادوره‌ی داوای پاره‌ بۆ كرێی ئاوه‌رۆو به‌كرێگرتنی ئامێری په‌یوه‌ندیكردنو ئاهه‌نگ ده‌كات

ده‌سه‌ڵاتی دادوه‌ری داوای 40 ملیۆن دیناری كردووه‌ بۆ كریی ئاوه‌رۆ، وه‌زاره‌تی دارایی وتوویه‌تی ئاوه‌ڕۆ كرێی نییه‌و هیچی بۆ ته‌رخاننه‌كردووه‌.

ئه‌گه‌ر دادگاو ده‌سه‌ڵاتی دادوه‌ری نه‌زانێت ئاوه‌ڕۆ كرێی هه‌یه‌ یان نییه‌تی؟ و خه‌ریكی ئاهه‌نگ بیت. چی لێ چاوه‌ڕێ ده‌كرێت".

"حكومەت 4 ملیۆن رۆژنامە دەكڕیت كام رۆژنامانەن؟ بۆ ئیشتیراكی رۆژنامە، لە ساڵی 2012دا (یەك ملیارو 675 ملیۆن) دینار تەرخانكرا، بەڵام لە ئەم ساڵدا بەبێ هۆكار بە ئەندازەیەكی بەرچاو زیادیكردوە بۆ 2 ملیارو 430 ملیۆن دینار"

خوێنەرێك دەڵێت: هەقی خۆیانە ئاهەنگ وسەما بكەن بەو هەموو پارەیە ئەگینا دڵیان شەق دەبات!

"لەبودجەی ئەمساڵدا موچەو پاداشتی خانەنشینی سەربازی 12 ئەوەندەی خانەنشینی مەدەنی بۆ تەر خانكراوە لەكاتێكدا ئەو كەسانەی كە لە دەزگا مەدەنییەكاندا كاردەكەن زۆر زیاترن لە ئەو كەسانەی لە دەزگا سەربازییەكاندا كاردەكەن ."

ئەو چ لە شكرێكە لەشكری ڕایخی گێرمانی مەزنە ئەو هەموو ژەنەڕاڵ وكۆلۆنێلەی خانەنشینەی هەیە؟!!

لە هەمووی خۆشتر بەزمی گەڵابەكانی پەرلەمانە كە لە ماوەی دوو ساڵە پەرلەمان بڕی (600) ملیۆن دینار بۆ چاكردنەوەی گەڵابە خراپبووەكانی پەرلەمان تەرخاندەكات، نەمانزانیوە پەرلەمان ناوچەی پیشەسازیشی هەیە بۆ چاككردنوەی هەزاران گەڵابە، هەرچەندە برادەرێكی شەریكە بەش لەبەرنامەیەكی تەلەفزیۆن گووتی: كە ئەو گەڵابەیەكی دیوە لەناو پەرلەمان!! لەوانەیە هەر بۆ ئەوەی شایەدی ئەو برادەرەیان بە درۆ نەچێ بۆیە گەڵابەیەكیان بۆ هێنابێتە ناو پەرلەمانەوە.

باسی چی وچی وچیترتان بۆ بكەین، قەسابخانەی ساڵانەی بودجەش بۆتە خەمێكی سەربار بۆ سەر خەمی ساڵانەمان خۆزگە وەك هەڵبژاردنە ساختەكان چوار ساڵ جارێك دەبوو تا هەر نەبا ساڵانە تووشی هەژانی ئیمان وباوەڕ ومتمانە نە دەبووین بە خۆمان ومیللەتەكەمان ودەسەڵاتە سوپەر گەندەڵەكەمان.

چەند پێشنیارێك بۆ بودجەی ساڵی داهاتوو

لە ئیلهامی گەڵابەكانی پەرلەمان و كرێی ئاوەرۆی وەزارەتی داد و ڕابواردنی فەرمی و خەرجییەكانی دیكە وكارگە ڕاوەستاو وداخراوەكاندا ئەو خاڵانەش پێشنیار دەكەین بۆ ئەو دەسەڵاتە تا تاڵان ودزیەكان شەرعیەتێكی زیاتری پێوە دیار بێت:

بڕە بودجەیەك بۆ كرینی یاری ولەعابە بۆ منداڵەكانی دەسەڵاتداران بە وەزیر وگزیر وفەرمانبەرانەوە تا بتوانن خزمەتی میللەتەكەمان بكەن بەبێ هەراوهۆریای منداڵان!

بڕە بودجەیەك بۆ كرینی میكیاژ وئارایشت وسوبغی ڕەنگردنەوەی قژ وسمێڵ ونەشتەرگەری جوانكار بۆ پیاوانی دەسەڵاتدار تا خۆیان وژن ومنداڵەكانیان جوان دەركەون لە كاتی سەردانی سیاسەتمەدارەكانی خۆرئاوا یان هەتا ئەكتەرەكانی وەك ئەنجلینا جۆلی كە وتی لەبەر وێنە گرتن لەگەڵ مەسئولان نەپەرژام كارێك بكەم لە كوردستان.

بڕە بودجەیەكی ئاشكرا بۆ كرینی ویژدانی سیاسی ونوسەر ومەلا وبیرمەندانی كوردستان ودەرەوە، چونكە ئەو پارەیە هەر سەرف دەكرێت بەڵام بۆ لە كیسەی دەسەڵاتداران دەرچێت خۆ هەتیو بەخێو ناكەن! دەتوانن بۆ زیاتر شەرعیەت پێدانی ناوی بنێن بودجەی [مؤلفة قلوبهم] دڵ نەرم كردوەكان!

بڕە بودجەیەك بۆ كرینی پایسكیل بۆ پیاوانی دەسەڵات وهیزی حیمایە وفەرمانبەران وسكرتێرە قەڵەوەكان بۆ لەش ساغی وپاراستنی ژینگە لەو هەموو ئوتۆمبیلەی كە بە دوایان دەكەوێت.

كورە چوزانم پێشنیاری داهێنەرانە زۆرە بەڵام باوەڕ ناكەم گەورەترین بیرمەند وداهێنەر بەقەد داهێنەرانی موفرەداتی بودجەی پەرلەمان داهێنەر بن لە خولقاندنی بلاك هۆلەكان Black holesبۆ لوشدانی بودجە...

ئەوەی كۆمێنتەكان بخوێنێتەوە لەژێر هەواڵەكانی قەسابخانەی بودجەدا دەزانێت ئەو میللەتە گەیشتۆتە چ ڕادەیەك لە بێزاری ونا ئومێدی وعەبەسیەت وبێ ئومێدی ودەسەوسان بەرامبەر ئەو دەسەڵاتە تاڵانكەرە لەژێر بابەتێكی پەیوەند بە بودجەی تاڵانكراودا كۆمێنتێك زۆر سەرنجی ڕاكێشام كە نوسیبووی :تكایە موراعاتی باری دەروونی خەلكیش بكەن لە نیشاندانی ئەو هەموو تاڵان ودزییە!! كەس نییە ئەو هەموو ژمارە گەورانەی تاڵان ودزی نەبینێت وباری دەروونی تێك نەچێت، دەبێت ڕۆژێك بێت بودجە لە نێو لیستی خەمی ساڵانەمان دەرچێت؟!! لەوە ناچێت.

لەندەن

٢٠١٣/١/٢٨

## به‌ختیار عه‌لی:کاتێ ترسنۆك باسی مێژووی ترسنۆكه‌كان ده‌كات

له‌ ئینگلیزی ئیدیۆمی كۆپی كات :(a copy-cat) بۆ ئه‌و كه‌سه‌ به‌كار دێت، كه‌ لاسایی یه‌كێك، یان كه‌سانێكی تر بكاته‌وه‌، به‌ڵام به‌ باره‌ نێگه‌تیڤه‌كه‌ی.
دیسان ئیدیۆمی فات كات یش (a fat cat) بۆ ده‌سه‌ڵاتدار و سیاسی وسه‌رمایه‌داریی زه‌به‌لاح به‌كار ده‌هێنرێت، كه‌ ده‌سه‌ڵات و سه‌رمایه‌كانیان به‌ شێوه‌یه‌كی خراپ و نایاسایی به‌كار ده‌هێنن، واته‌ ناونیشانه‌كه‌ (كۆپی كات كردنی فات كات) ئاماژه‌ به‌و رۆشنبیره‌ خۆ پێ زه‌به‌لاحه‌ ده‌دات كه‌ لاسایی ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ ده‌كاته‌وه‌، كه‌ له‌ هه‌مان كاتیشدا وانه‌ی ڕه‌وشتیان بۆ ده‌ڵێته‌وه‌.
زۆر جار مێژوو بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌، كه‌ چۆن كه‌سانێكی ترسنۆك تا ماوه‌یه‌كی كورت یان درێژ توانیویانه‌ خه‌ڵكانێكی زۆر هه‌ڵخه‌ڵه‌تێنن به‌ ئازایه‌تییه‌كی ساخته‌، كه‌ له‌وانه‌یه‌ به‌سه‌ر كه‌سانێكی ئاسایی سه‌رقاڵ به‌ دونیا و بژێویی وكێشه‌كان وماندویی تێپه‌ڕێت، به‌ڵام هه‌رگیز تاسه‌ر؛ به‌سه‌ر هه‌موو كه‌سێكدا تێ ناپه‌ڕێت، كه‌سانێك هه‌ن زۆر به‌قه‌د به‌ختیار عه‌لی و هاورێكانی زیاتر ده‌خوێننه‌وه‌، به‌ڵام پێیان نه‌نگییه‌ به‌قه‌د 2% ئه‌وان شت بنووسن. به‌ختیارعه‌لی و پێره‌ بوغراكه‌ی له‌ به‌دبه‌ختی و بێ یاده‌وه‌ریی و ساویلكه‌یی كورده‌ ئه‌مڕۆ خۆیان وه‌ك سوپه‌رمانی گۆره‌پانی رۆشنبیریی نیشان ده‌ده‌ن. بێگومان ئه‌گه‌ر ئه‌و برادەره‌ و پێره‌كه‌ی له‌ناو میلله‌تانی تردا ببونایه‌ به‌تایبه‌تی میلله‌تانی زیندوو، ووریا و چالاك، هه‌رگیز نه‌ ئه‌و كێش و نه‌ ئه‌و پایه‌یان نه‌ده‌بوو، ئه‌وه‌ ته‌نها كورده‌، پێی ئاساییه‌ كه‌سانی فایلدار له‌ناو ژیانی سیاسییاندا هه‌بێت، ئه‌وه‌ ته‌نها كورده‌ سه‌ركرده‌ی وای هه‌یه‌، كه‌ تانك و هێزی دوژمنی هێناوه‌ته‌ ناو شه‌ڕی براكوژی، زۆریش لایان ئاساییه‌ ئه‌مانه‌ سه‌ركرده‌یان بێت، ئه‌وه‌ هه‌ر كوردیشه‌ كه‌سانێكی گه‌نده‌ڵچی و به‌شدار له‌ په‌رده‌پۆشكردنی گه‌نده‌ڵی پێی قبوڵ بێت و ده‌رسی ئه‌خلاقی و پاكیی ونه‌زاهه‌تیان پێبده‌ن!

ئه‌و گه‌نده‌ڵییه‌ زه‌به‌لاحه‌ی ده‌زگای سه‌رده‌م و نێوه‌ندی رۆشنبیری كوردستان، كه‌ رۆشنفكرێكی وه‌ك (شوان ئه‌حمه‌د) په‌رده‌ی له‌سه‌ر هه‌ڵدایه‌وه‌، ئه‌گه‌ر له‌ سه‌دا ده‌شی ڕاست بێت، ده‌بوو كه‌سانێكی وه‌ك شێركۆ بێكه‌س و به‌ختیار و ئه‌وانی تر شه‌رمیان به‌ خۆیان بوایه‌ جارێكی تر قسه‌ی كه‌ش و فشی وابكه‌ن، گوایه‌ هێشتا خۆیان هه‌ر ئه‌و زاته‌ پاكانه‌ی پێش فه‌زیحه‌ته‌كه‌ن.

به‌ختیار و هاورێكانی ... كه‌ خواكردی ئه‌و كه‌سه‌ی گه‌نده‌ڵییه‌كانی ئاشكرا كردن، یه‌كێك بوو له‌ ناو بازنه‌كه‌ی خۆیان، چونكه‌ ئه‌گه‌ر بۆ نمونه‌ ئیسلامیه‌ك بوایه‌، ئه‌وه‌ به‌ زاراوه‌ سه‌یر و تیژه‌كانیان ده‌یانكرده‌ گه‌وره‌ترین تیرۆریست له‌ جیهاندا، تا ڕاده‌ی ئه‌وه‌ی فشه‌ی به‌ ئوسامه‌ بن لادن بێت.

ئەوەی منی زیاتر هاندا بۆ نووسینی ئەم بابەتە، نووسینەكەی بەختیار عەلی بوو بەناوی (لە مێژووی ترسنۆكەكانەوە فێربن) ئاوێنە 29/12/2010 ، كە تێیدا دەرس و پەند بە گوێی فەرمانڕەوایانی كوردستاندا دەدات، گوایە ناتوانن بەر بە بوێری قەڵەمە بوێرەكان بگرن. وەك عادەتی خۆی نووسینەكەی پڕكردووە لە زاراوە و قسەی قەبە، وەك چۆن كەلاوەیەك بە جوانترین دیكۆر دەڕازێنیتەوە، ئەوەش تەنها بۆ خەڵەتاندنی نیمچە خوێندەوارەكانە.
بەختیار داوا دەكات، كە دەسەڵاتدارەكانی كوردستان لە دەسەڵاتدارە ترسنۆكەكانەوە فێربن و ڕێ بە نووسینی ئازاد نەگرن. لەو بارەیەوە دەڵێ:

"هیچ حاكمێک لەمسەر زەوییە ناتوانێت خەیاڵێكی ئازاد لەبیركردنەوە و نووسین بترسێنێتو بوەستێنێت. لەهەر شوێنێک وشە بترسێت، عەدالەتی لێنییە ...عەدالەت ئەوەیە ئازادانە بیربكەینەوەو بنوسین، حوكمی حاكمێكی زاڵمیش هەمیشە وەک دڵۆپە ئاوێكی بێتینە كاتێک بەر گەورەیی بەردی داهێنان دەكەوێت .حوكمی حاكمەكانی هەولێریش لەمڕۆدا، بێگومان دەبێتە گاڵتەجاڕی مێژوو، وەک چۆن حوكمی ئەو حاكمانەی حەلاجیان سووتاند، بووە گاڵتەجاڕی مێژوو، وەک چۆن حوكمی دادگاكان دژ بەفلۆپێر، دژ بە ئۆسكار وایلد، دژ بە دی، ئێچ، لۆرانس بووە گاڵتەجاڕی مێژوو. ئەوەی دەسەڵاتدارانی كورد دەیكەن هیچ نییە جگە لە دووبارەكردنەوەی مێژووی بێئاگایی خۆیان
".

ئەو قسانە هەمووی جوانن و كەس لاری لێیان نییە، بەڵام وەك ئەوە وایە كەسێكی داوێنپیس ئامۆژگاریی خەڵك بكات بۆ داوێن پاكی و ڕەوشت بەرزیی. ئەگەر ئەمڕۆ بەختیار و هاوڕێكانی ڕەخنە لە دەسەڵاتداران دەگرن لەسەر گەندەڵیی و دژایەتی وشە، ئەوە هەرخۆیان بوون گەورەترین گەندەڵییان لێ ئاشكرا بوو، لە جیاتی دەست خۆشی كردن لەو بوێرەی كە ئەو هەموو گەندەڵیانەی ئاشكرا كرد، كەچی كەوتنە خۆ بە دەستە جەمعی، وەڵامی ترسنۆكانە و بێ بنەماكانی خۆیان بە كاك شوان ئەحمەد دایەوە و بەیانیان لەسەر دەردەكرد، هەڕەشەیان بۆی دەنارد، تا كار بەوە گەیشت لە بەهەشتە پاوانكراوەكەی شێركۆ بێكەس، بەختیار و ڕێبین و ئەوانی تر دەركرا (مەزمومەن مەدحورا) وەك قورئان دەڵێت، لە هەمووشی قێزەونتر ڕێگایان نەدا كاك شوان ئەحمەد هیچی تر وەڵامەكانی خۆی لە بڵاوكراوە پاوانكراوەكانی ئەوان بنووسێت.

پرسیارێك بۆ بەختیاری خوداوەندی زاراوەسازی و وشەگەلی فەنتازی:
ئایا وشەكانی شوان ئەحمەد گوللە بوون یان نارنجۆك، تا ئێوە بە قەولی خۆتان هێندە نا عادیل بن ونەهێڵن بڵاوی بكاتەوە؟! خۆ ئێوە دەسەڵاتی باڵا نین تا ئەو كارە بكەن؟ ئێوە و هاوڕێكانتان تەنها دیكۆر و زەخرەفەیەك و ئێكسسوارێكی ئەو دەسەڵاتەن، ئێوەش بۆ خۆتان بەشدارن لە هەموو گەندەڵییەكان، هەر لەو نووسینەی سەرەوەدا بەختیار دەڵێت:

"له‌ هه‌ر شوێنێك وشه‌ بترسێت، عه‌داله‌تی لێ نییه‌... عه‌داله‌ت ئه‌وه‌یه‌ ئازادانه‌ بیربكه‌ینه‌وه‌ وبنوسین" ئه‌ی كوا ئه‌و عه‌داله‌ته‌ بۆ كه‌سانی تر ئه‌وانه‌ی نه‌یاری ئێوه‌ن، یان ئێوه‌ش وه‌ك دیكتاتۆره‌ ترسنۆكه‌كانی مێژوو ته‌نها ئازادی ستایش كردنی خۆتان وپێڕه‌كه‌تان لا ڕه‌وایه‌."

خۆزگه‌ كاك به‌ختیاریش پایه‌ی خۆی بزانیبایه‌، ئایا له‌به‌ره‌ی نووسه‌ره‌ بوێره‌كانه‌ یان ترسنۆكه‌كان!؟ به‌ر له‌وه‌ی باسی مێژووی ترسنۆكه‌كان بكات.
ده‌كرا ئه‌م نووسینه‌ له‌ سایته‌ ترسنۆكه‌كه‌ی ئاوێنه‌ یان هاوڵاتی بڵاوكرێته‌وه‌، به‌ڵام ئێمه‌ ئه‌زموونی تاڵمان هه‌یه‌ له‌گه‌ڵیان و ده‌زانین ئه‌و سایتانه‌ش هی ئه‌و پێڕه‌ن و پاوانی خۆیانه‌. چاك نه‌بوو سایتێكی ئازادی وه‌ك كوردستانپۆست هه‌یه‌، ده‌نا ده‌نگی سه‌دانی وه‌ك شوان ئه‌حمه‌د و ئێمه‌ و هاووێنه‌ی ئێمه‌ بزر ده‌بوون.
محه‌مه‌د هه‌ریری

1/1/2011

سه‌رچاوه‌: به‌ختیار عه‌لی: له‌ مێژووی ترسنۆكه‌كانه‌وه‌ فێربین!

محه‌مه‌د هه‌ریری

## كەڵەشێرەكەی نەزار قەبانی و دەستاودەست پێكردنی دەسەڵات

لە هەواڵێكدا كە سایتی ئاوێنە بڵاوكردۆتەوە و لە رۆژنامەی چاودێر وەریگرتوە بەبۆنەی پێكهێنانی كابینەی نوێی حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە، لێپرسراوی دەستەی كارگێڕی مەكتەبی سیاسی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان مەلا بەختیار، پەیامێك ئاڕاستەی نێچیرڤان بارزانی دەكات. مەلا بەختیارلەو پەیامە پرسیارێكی زۆر هەستیار دەوروژێنێت كاتێ بە نێچیرڤان بارزانی دەڵێت: " لەم دوو هەفتەیەدا، پێدەچێت، كابینەی شەشەم، بە كابینەی حەوتەم، لەچوارچێوەی چوار ساڵ دەستاودەست پێكردنی دەسەڵات لەنێوان یەكێتیو پارتیدا، بگۆڕدرێت. ئەمەش بەپێی رادەی پێشكەوتنی ئەزمونی دیموكراسیمان، سەرەتایەكی باشی دەستاودەست پێكردنی دەسەڵاتە. بەڵام هێشتا بە چەمكە دیموكراسیە فراوانەكەی، یەكێتیو پارتی ماویانە، لە دوا مەحەكی دەستاودەست پێكردنی دەسەڵات بدرێن. ئەویش تەنها ئەوەیە، جگە لە خۆیان، ئاخۆ لە هەڵبژاردنێك لە هەڵبژاردنەكاندا، هێزێكی براوەی دیكە بۆ سەر دەسەڵات قبوڵ دەكەن یان نا؟ "

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە هەستیارە دەبوایە بەر لە نێچیرڤان ئاڕاستەی بەرهەم ساڵح كرابایە هەرچەندە مەرامی جەنابت لە بارەی ئەو پرسیارە وروژاوە ڕوون نییە، چونكە هەموومان قەبارەی نەفەسی دیموكراسی ئێوە وەك مەلا بەختیار و وەك یەكێتی و وەك پارتی هاوپەیمانی ستراتیژیتان دەزانین، دەكرێت ئەو لێدوانە لە چارچێوەی موشاكەسەی سیاسی بخوێندرێتەوە، وەڵامێكیش بێت بۆ موشاكەسەكانی فازیل میرانی كە ئەگەر سەركردایەتی پارتی بێدەنگی نەكات لەوانەیە كێشەی زۆر گەورەتر بۆ پارتی بخولقێنێت، چونكە وەك خۆت لە نامەكەدا دانی پێدا دەنێیت

" :بەڵام هێشتا بە چەمكە دیموكراسیە فراوانەكەی، یەكێتیو پارتی ماویانە" ئێوە وەك دوو حزبی قۆرخكەری دەسەڵات نەك بە تەنها دەسەڵاتتان قۆرخ كردوە، بەڵكو هەموو وڵاتەكە وخاكەكەیی و چارەنووس و سامانیتان قۆرخ كردوە، زۆر زەحمەتە چاوەڕوانی دەستاودەست پێكردنی دەسەڵات بكەین لە دەرەوەی دوو زلهێزەكەدا، ئێوە وەك دوو برای سەیر دێنە بەرچاوم كە لە منداڵی لەبارەیانەوە دەمبیست كە پەیوەندیەكی نامۆ دەیانبیەستەوە، ئەو دوو برایە بەردەوام پێكەوە بوون، پێكەوە نانیان دەخوارد، پێكەوە لە منداڵی تریان دەدا، پێكەوە ڕاوەڕوتیان دەكرد و پێكەوە یاریان دەكرد، زۆر شەڕاوی بوون زۆربەی منداڵانی كۆڵانەكەیان تۆقاند بوو، ئەو دوو برایە ناوە ناوە وەردەگەڕانە سەر وگێلاكی یەكتر یەكتریان شل وكوت دەكرد، هەر كەسێك سەری بەرزكردبایەوە ئەوە هەموو ناكۆكیەكانیان دەخستە لاوە لە پێناو ئامانجە ستراتیژیەكەیان كە ئەوان بە تەنها كەڵەشێری كۆڵان بن بە تەعبیری

شاعیری مەزن نەزار قەبانی لە شیعرێك بەناونیشانی [في حارتنا ديك] كە من لێرەدا بە پێویستی دەزانم هەوڵی وەرگێڕانی بەشێک لە ماناکەی دەکەم، هەرچەندە زەحمەتە ئەو زمانە بەرز وموزیکیە تەرجەمە بکرێت:

في حارتنا
ديك سادي سفاح
ينتف ريش دجاج الحارة ،
كل صباح
ينقرهن، يطاردهن، يضاجعهن، ويهجرهن
ولا يتذكر أسماء الصيصان
[لە گەڕەکەکەمان، کەڵەشێرێکی سادی خوێنڕێژی ملهوڕ، پەڕوبالی مریشکەکانی کۆڵانەکە دەکات بە گوڕ، هەموو بەیانیەک، دەنوکیان لێدەدات، ڕاویان دەنێت، لەگەڵیان دەخەوێت، تڕۆیان دەکات، کەچی هەتا ناوی جوجەڵەکانیشی لە بیر دەکات]
في حارتنا
ثمة ديك عدواني ، فاشيستي ،
نازي الأفكار
سرق السلطة بالدبابة
ألقى القبض على الحرية والأحرار
ألغى وطنا
ألغى شعبا
ألغى لغة
ألغى أحداث التاريخ
وألغى ميلاد الأطفال
و ألغى أسماء الأزهار
[لە گەڕەکەکەمان، هەیە کەڵەشێرێکی فاشستی دوژمنکار، نازی لە بیر و ڕەفتار، بە زەبری تانك دەسەڵاتی دزی، ئازادی وئازادیخوازانی خستە زیندانی ژێربار، وڵاتی سڕیەوە، گەلێکی سڕیەوە، زمانێکی سڕیەوە، ڕوداوەکانی مێژووی سڕیەوە، سڕیەوە ساڵیادی منداڵان ، سڕیەوە ناوەکانی گوڵان]

في حارتنا
ثمة ديك أمي
يرأس إحدى الميليشيات
لم يتعلم

إلا الغزو و إلا الفتك
و إلا زرع حشيش الكيف
وتزوير العملات
كان يبيع ثياب أبيه
ويرهن خاتمه الزوجي
ويسرق حتى أسنان الأموات
[ گەڕەکەکەمان، کەڵەشێرێکی نەخوێندەواری لێیە، سەرۆکایەتی میلیشیایەک دەکات، هیچ نازانێت، جگە لە شەڕ وغەزا وزەفەر پێبردن، جگە لە چاندنی حەشیشی کەیف وڕابواردن، جگە لە دراو تەزویرکردن، کەڵەشێری ناوبراو پۆشاکی باوکی ئەفرۆشیەوە، ئەڵقەی هاوسەری دەخستە بارمتەوە، هەتا دانی مردووەکانیشی دەدزیەوە]
كيف سيأتي الغيث إلينا ؟
كيف سينمو القمح ؟
وكيف يفيض علينا الخير ، وتغمرنا البركه ؟
هذا وطن لا يحكمه الله
ولكن تحكمه الديكه
[ چۆن هاناو فەرەجمان پێدەگات، چۆن گوڵە گەنمەکان نەشونما بکات، چۆن خێر وبەرەکەت چوار دەورمان دات، کە ئەو وڵاتە خودا حوکمی ناکات، بەڵکو کەڵەشێر بەڕێوەی دەبات]
في بلدتنا
يذهب ديك يأتي ديك
والطغيان هو الطغيان
يسقط حكم لينيني
يهجم حكم أمريكي
والمسحوق هو الإنسان

[ لە شارۆچکەکەمان، کەڵەشێرێک ئۆغر دەکات ویەکێکی تر بەدوایدا سەر دەردەکات، بەڵام جەور هەمان جەور، حوکمی لینینی دەڕوخێت، حوکمی ئەمریکی دەرگامان لێ دەگرێت، لە هەر بارێکدا ئادەمیزادە لەو نێوە دەهاڕدرێت]

عرەکە بە
دەنگی ئەفسوناوی نەزار قەبانی :

جا دەستاودەست پێکردنی دەسەڵات چۆن دەکرێت لە عەقڵیەتی حزب گەلێک کە خۆیان بە خاوەنی مێژووی گەلێك بزانن سەرەڕای هەموو ئەو نەهامەتیانەی بەسەر ئەم میللەتەیان

هێناوه‌؟!
ده‌ستاوده‌ست پێكردنی ده‌سه‌ڵات چۆن ده‌كرێت له‌ عه‌قڵیه‌تێك پێی وا بێت كه‌ له‌ به‌رزه‌كی ده‌سه‌ڵات دابه‌زی جارێكی تر ناهێڵن سه‌ركه‌وێته‌وه‌؟ !
ده‌ستاوده‌ست پێكردنی ده‌سه‌ڵات چۆن مومكینه‌ بكرێت كه‌ نه‌ سوپا و نه‌ پۆلیس و نه‌ ده‌زگا موخابه‌راتیه‌كان هی نه‌ته‌وه‌ نه‌بن وسه‌ر به‌ حزب بن؟!
ده‌ستاوده‌ست پێكردنی ده‌سه‌ڵات چۆن ده‌كرێت هێشتا كار بۆ ئه‌و فه‌رهه‌نگه‌ نه‌كرابێت، دوو حزبه‌كه‌ی ده‌سه‌ڵات به‌و په‌ڕی دردۆنگیه‌وه‌ ده‌ڕوانێته‌ حزبه‌كانی تر و هه‌موو هه‌وڵ و تێكۆشانی بۆ ده‌سته‌مۆ كردنی نه‌یاره‌كانی ده‌خاته‌ گه‌ڕ، ئه‌گه‌ر توانی په‌لكێشی بكات به‌ خۆشی وترشی حزبه‌كه‌ له‌ به‌رچاوی جه‌ماوه‌ر ده‌ڕوخێنێت ولاوازی ده‌كات و ئینجا تڕۆی ده‌كات. ئه‌وه‌ وه‌نه‌بێت حزبه‌كانی تریش هه‌مان نه‌خۆشیان نه‌بێت به‌ڵام له‌ چه‌ند ورده‌كاریه‌كدا لێك جیاوازن.

ده‌ستاوده‌ست پێكردنی ده‌سه‌ڵات ده‌كرا ببوایه‌ واقیعێک ئه‌گه‌ر كاری بۆ كرابایه‌ له‌و ڕۆژه‌وه‌ كه‌ ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ له‌ كوردستانی باشوردا دامه‌زراوه‌ ئه‌گه‌ر له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتی فه‌رهه‌نگی حزبی ڕۆژهه‌ڵاتی ڕزگارتان بوایه‌، ئه‌گه‌ر له‌ جوغزی به‌ پیرۆز كردنی سه‌ركرده‌ وبنه‌ماڵه‌ وخێڵ بتانتوانیبا كه‌مێک ده‌رچن، ئه‌گه‌ر ته‌نها بۆ جارێک گه‌نده‌ڵێک یان خاینێكتان له‌ ناو خۆتاندا سزا بدایه‌.
كه‌وا بوو كه‌ڵه‌شێره‌كه‌ی قه‌بانی به‌ هه‌موو مواسه‌فاتیه‌وه‌ و سه‌ره‌ڕای مواسه‌فاتی تریش كه‌ تایبه‌ته‌ به‌ كه‌ڵه‌شێری خۆماڵی ناتوانێت ده‌ستاوده‌ست پێكردنی ده‌سه‌ڵات بكات، مه‌گه‌ر به‌ ڕوكه‌شانه‌ نه‌بێت، به‌ڕای من له‌ هه‌ر هه‌ڵبژاردنێك ئه‌گه‌ر هه‌موو جیهانیش تێیدا چاودێر بێت تیایدا هه‌ردوو حزبه‌كه‌ دۆڕاندیان له‌ جیاتی به‌ ده‌ست دانه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵات گه‌وره‌ترین كاره‌ساتی شه‌ڕی ناوخۆی لێده‌كه‌وێته‌وه‌ ئه‌گه‌ر به‌ هه‌مان عه‌قڵیه‌ت بمێننه‌وه‌ ولۆسه‌رێك په‌یدا نه‌بێت له‌ ناویاندا!.
محه‌مه‌د هه‌ریری

٢٠١٢/١/٣٠

## گەندەڵی انعمت علیهم و گەندەڵی مغضوب علیهم!

هەواڵی گرتن ودەست بەسەر کردنی قایمقامی سلێمانی، زانا محەمەد ساڵح بە هۆی گەندەڵی و "بەرتیل وەرگرتن" دوا نەکتەی دەسەڵاتی کوردی بوو لە قەڵەمرەوی سلێمانیدا. لەناو جەنگڵستانی گەندەڵیەوە لە نوکتەش سەیرترە کە یەکێک بەناوی گەندەڵی بگیرێت وپەڕوباڵی بکرێت، هەواڵەکە لەوە دەچێت کە یاریزانێکی تۆپی پێ فاوڵی لێبگیرێت چونکە بەپێ شوتی لە تۆپەکە هەڵدا بێت !چونکە هەموو دەزانین خۆی یاری تۆپی پێیە بۆ دەبێت تەنها یەکێك سزا بدرێت لەسەر بەکارهێنانی قاچی لە یاریەکەدا لە کاتێکدا هەموو ئەوانەی ناو یاریگایەکە قاچیان بەکار دەهێنن وەک ئەو!

ئەوە خەبەر نییە بڵێی شێرێک لە جەنگڵدا ئاسکێکی ڕاوکرد ولەسەر گۆشتی ئاژەڵە بەستەزمانەکانەوە دەژێت، ئەوە کاتێك دەبێتە خەبەر ئەگەر بڵێیت شێرێك ڕوەکییە وبەپێچەوانەی هاوڕەگەزەکانی هەرگیز بەلای گۆشتی حەرامی ئاژەڵە بەستەزمانەکانەوە دا ناچێت.
گەندەڵی نەك مایەی شەرمەزاری نییە لەو جەنگڵستانەی گەندەڵیدا، وبەڵکو بە دانپێداهێنانی سەرۆکەکانمان بۆتە کلتور و فۆلکلۆر!! و کوڕ ئەو کوڕەیە تا بۆی بکرێت هەڵەکان بقۆزێتەوە وتا دەتوانی پارە ومولکی گەندەڵی بۆ خۆی گڵداتەوە... نەک گەندەڵی ڕێگە پێدراوە لە سایەی ئەو کلتورە گەندەڵەدا بەڵکو فایلداری بەعسیش بە هەر ئاساییە مادام مل کەچ وپەیوەستی بە حزبایەتی وسەرۆکایەتی حزبەکەت... کورە سەرۆک جاشیش بویت هەر ئاساییە، با بەژداریت کردبێت لە ئەنفالکردنی خەڵکیش هەر ئاسایی یە، ئەوەندەت بەسە دڵسۆزبیت بۆ حزبەکان وسەرکردە قارەمانەکان، گرنگ ئەوەیە ئەگەر حزب شەڕی کرد ئامادە بیت ئەنفال بۆ ئەویش بکەیت!

با ئەمن وراپۆرت نووسی ڕژێمی بەعسی پێشوش بیت وچەندین کەست گەیاندبێتە پەتی قەنارەش، گرنگ ئەوەیە ڕاپۆرتەکانی ئێستات لەبەرژەوەندی باڵای حزب ودەسەڵاتدا بێت!!
هیچ کەسی حزبی دڵسۆزتان دی بدرێتە دادگا بە تۆمەتی گەندەڵی ؟!
هیچ کەسی دڵسۆزبە حزب وسەرکردەکانتان دی بدرێتە دادگا بە تۆمەتی خیانەتی نیشتیمانی؟ !

لەسایەی پێشکەوتنی وەلای حزبی وکەسێتی بەسەر وەلای نیشتیمانی شتێك نییە بەناوی خیانەت، ئاشکرا کردنی خیانەتی ئەم و ئەو تەنها لە بابی زانینی شتێکەوەیە ]باب العلم بشئ[ دەنا کەست دیت بدرێتە دادگا لەسەر دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ موخابەراتی دوژمن؟! خیانەتەکان تەنها سودیکیان هەیە بۆ دەسەڵاتی گەندەڵ کلتور، ئەویش لە کاتی شەرەکانی ڕاگەیاندندا بەڵگەنامەکان بخرێنە بەر دیدی خوێنەرە ئازیزەکان، وکە پێکیش هاتنەوە وەک

بڵێی هیچ له گۆڕێدا نییه، هەر براکەی جارانین.! به کورتی ئەوانه گەندەڵی گروپی [انعمت عليهم]ن واته ئەوانەی لێیان ڕازین و بەهرەوەر کردوان ونیعمەت پێدراوانن. گروپی گەندەڵی دووەم، گەندەڵی گروپی [المغضوب عليهم]ن واته ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە.
کەوابوو ناونیشانی چیرۆکەکه له بنەڕەتدا به هەڵه دانراوە، کەیسەکه گەندەڵی و "بەرتیل وەرگرتن" نییه ، بەڵکو سیاسییه وله ئەنجامی کەوتنه بەر خەشم وقینی وەلی نیعمەتەکەیه، له ئەنجامی ورووژاندنی بابەتێکی نارەحەته به بەرپرسه باڵاکانی حزبەوە، وله ئەنجامی تێکدانی ڕۆڵی دیارکراو ودەرچونه له دەقدا [خروج عن النص] شەرت نییه له دڵسۆزیەوەش ئەو کارەت کردبێت.

لەو جەنگەڵستانەی گەندەڵیدا تۆ تەنها ئەو کاته بەدیار دەکەوێت گەندەڵیت کاتێ قسه وجوله وڕەفتارت پێچەوانەی کرد لەگەڵ بەرژەوەندی باڵای حزب وسەرکردەکانی، تۆ تەنها ئەو کاته خاین وخۆفرۆشی که دژی بەرژەوەندی باڵای حزب وسەرکردەکانی وەستایتەوە، وەك چیرۆکەکانی هەزار ویەک شەوە کاتێ کەنیشکێکی جوان دەبوە وەحش ودێو ئەگەر تیشکی خۆری پێکەوتبا.
٢٠١٢/٤/١٥
محەمەد هەریری

## پارتی بەرپرسی یەکەمی کارەساتەکانی ئێزیدی و دۆڕاندنەکانە

پیاوێکی ئێزدی ئابلۆقەدراو لە چیای شەنگال ڕاستەوخۆ بە ڕووداو دەڵێت: کەس لێرە پارێزگاری لە ئێمە ناکات، تەنها چەند گنجێکی خۆمان نەبێت چەکی خۆیان پێیە، و دەڵێت زۆر عەیبە پارتی ئێمەی فرۆشت هەموو چەکی قورس وسوکیان بەجێهێشت وئێمەیان تەسلیم بەو جانەوەرانە کرد، کەچی فازڵ میرانی دەڵێت: پارتی ٧٥٠ چەکداریان پارێزگاری لە ئاوارە یەزیدیەکان دەکات لەسەر چیای شەنگال! دەبێت کامیان زیاتر شایەنی باوەڕ پێکردن بن؟! شاهێد حاڵی سەر چیاکە یان کابرایەکی سمێڵ قەترانی بەر سپلیتەکان و نقووم بووی ناو نازو نیعمەتەکان؟!

بەڕاستی ئەدای پارتی لەو شەڕە گەورەیە ناگاتە ئاستی میلیشیایەکی سۆماڵ یش، ناکرێت چاوپۆشی لەو هەموو شکستە و هەڵاتنەیان بکرێت، بەڕای من ئەو کارەساتەی لە شەنگاڵ ڕوویدا، بەرلە هەرکەسێك پارتی لێی بەرپرسیارە، کە زۆر دەمیکە ئەو ناوچانەی بۆ خۆی پاوان کردوە، وهەمووی بە خۆشی و ناخۆشی کردۆتە پارتی، نەشی توانیوە ئاستی هوشیاری نەتەوەییش لەو ناوچانە بستێك بەرزکاتەوە.. سەرۆك بارزانی زۆرجار لە وتارەکانی ئەوپەڕی شانازی بە پێشمەرگە دەکات، هەموومان وابووین، بەڵام ئەو پێشمەرگانە ماون کە کورد وەك کەسانێکی پیرۆز و مایەی شانازی سەیریان بکات؟! کوا ئەو پێشمەرگانەی بە دوو سێ کەس شەڕی فەوجێکیان دەکرد؟ کوا ئەوانە پێشمەرگەن کە داعشە خوێڕیەکانی خەڵکی سوریا و تونس و جەزائیر و سعودیە بە دوو سێ هەمەرەوە دێن یەك شار داگیر دەکەن، و ئەوانیش ڕادەکەن بێ تەقەکردن؟!

کورد چی دەمێنێتەوە ئەگەر ئازایەتیەکەشی نەما، کە لە سەرەبەیانی مێژووەوە باسی دەکرێت؟ لە گریکەکانەوە تا ابن رشد، کە لە کتێبیکیدا وەك نمونەی ئازایەتی باسی کورد دەکات! من باوەڕ ناکەم بارزانیش شانازی بەو پێشمەرگە هەڵاتوانەی شەنگاڵ و مەخمور و گوێڕ و بەنداوی موسڵ و کوێ و کوێ بکات، بێگومان بارزانی سەرۆك و سەرۆك وەزیرانیش کە دوو بەرپرسی یەکەم و دووەمی ئەو وڵاتەن، بەرپرسن بە پلە یەك لەو پاشاگەردانیانەی سەربازیەی کە لە هەرێم هەیە، لەو ناپرۆفیشناڵەی هێزەکانی پێشمەرگە، و لەو بێ ورەیی و ڕاکە ڕاکەی پێشمەرگە .

پێشان دەمانوت کورد بۆیە لەگەڵ ڕژێمەکان شەڕی تەواوی پێناکرێت، چونکە پشتیوانی هێزی ئاسمانی نیە، و وەك ئەوان تەیارە و هەلیکۆپتەریان نیە، بەڵام دەرکەوت، لە شەڕ بەرامبەر چەند چەتەیەکی سعودی و سوری و ئەفغانی و تونسی وکێ و کێ، بەبێ ئەوەی

خاوه‌نی خاك بن ، بێ ئه‌وه‌ی خاوه‌نی فڕۆكه‌ و هه‌لیكۆپته‌ر بن، به‌ دووسێ هه‌مه‌ره‌وه‌ دێن یه‌ك ناحیه‌ی ته‌واو ده‌گرن، پێشمه‌رگه‌ش زۆر بێ شه‌رمانه‌ له‌به‌ریان ڕاده‌كه‌ن و خه‌ڵكی به‌ری و بێ ئاگاش ته‌سلیمی ده‌ستی ئه‌و بێ شه‌ره‌ف و وه‌حشیانه‌ی داعش ده‌كه‌ن! شه‌ره‌ف و ناموس و ڕه‌وشتیان له‌به‌ر هه‌ڵاتن به‌جێ ده‌هێڵن! عیسا به‌ره‌كاتی په‌یامنێری ڕووداو كه‌ له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی یه‌زیدی له‌ چیای شه‌نگاڵ بوو، ده‌یگووت: داعش هێنده‌ ترسنۆك وبێ غیره‌ت بوون، تا خه‌ڵكی سڤیل به‌ چه‌كه‌ سوكه‌كانیان توانیان به‌و چه‌ند گولله‌ كه‌مه‌ی پێیان بوو مقاوه‌مه‌ بكه‌ن، یه‌كیان نه‌ده‌وێران بستێك بێنه‌ پێش، به‌ڵام له‌به‌ر بێ چه‌ک وتفاقی هاتنه‌ ناو شه‌نگاڵ! ئه‌ی بۆ ده‌بێت پێشمه‌رگه‌ وا ڕاكات؟ !

سه‌رۆك بارزانی ده‌ڵێت، ئێمه‌ شه‌ڕی ده‌وڵه‌تێكی تیرۆرستی ده‌كه‌ین كه‌ چه‌كیكی زۆریان پییه‌!! جارێ كه‌س دانی به‌و ده‌وڵه‌ته‌ نه‌هێناوه‌، بارزانی ناوی ده‌هێنێت به‌ ده‌وڵه‌ت، ته‌نها بۆ پاكانه‌كردن بۆ ئه‌و دۆڕانانه‌ی پێشمه‌رگه‌ . ده‌بێت چاك بزانن ئه‌گه‌ر ئه‌و جاره‌ش خوا ڕه‌حمی به‌ كورد كرد و دڵی ئۆبامای موته‌ره‌دید و ڕاڕای نه‌رم كرد كه‌ به‌ هێزی ئاسمانی یارمه‌تی كورد بدات، و ئه‌گه‌ر ئه‌و پشتیوانیه‌ نه‌با و ئه‌گه‌ر شه‌ڕڤانان و گه‌ریلای په‌كه‌كه‌ و یه‌په‌گه‌ نه‌با، ئێستا داعش له‌ناو هه‌ولێر و سلێمانی و دهۆك ئاڵای ڕه‌شی بۆگه‌نیان هه‌ڵدا بوو، به‌ كۆمه‌ڵ خه‌ڵكیان ئه‌نفال و سه‌ربڕاو ده‌كرد.

ده‌زانم ئه‌وجاره‌ش ڕزگارتان ده‌بێت به‌ فه‌زڵی پشتیوانی ئه‌مریكا و هاوپه‌یمانانی، به‌ڵام ده‌بێت له‌وه‌ به‌دواوه‌ بیرێكی جیدی له‌ حاڵی خۆتان و سوپا و پێشمه‌رگه‌ بكه‌نه‌وه‌، هه‌رچه‌نده‌ سووربوونی ئێوه‌ له‌سه‌ر هه‌ڵه‌كانتان هیچ ڕاده‌یه‌كی كه‌می هیواشی بۆ نه‌هێشتوینه‌وه‌ كه‌ به‌خۆدا ده‌چنه‌وه‌ و هه‌ڵه‌كانتان ڕاست ده‌كه‌نه‌وه‌.

٢٠١٤/٨/١٠

## بروسکەیەکی تری فەخامەتی رەئیس لە وەقتی زایەعدا!

لە وەتی بەهاری گەلانی عەرەبی وناوچەکە دەستی پێکردوە فەخامەتی رەئیس مام جەلال زۆر ماندوە بە ناردنی پشتگیری و بروسکەکانی بۆ جەلادە خوێنرێژەکان ودیکتاتۆرەکانی... کێ باوەر دەکات ئەو پیاوە رۆژێک لە رۆژان شۆرشگێر بوبێت ولە دژی رژێمە رەفتار فاشیەکەی سەدام جەنگا بێت؟! کێ باوەڕ دەکات ئەو سەرۆکە کوردە ومیللەتەکەی کە دەیان نالآند لە دەست جەور وستەمی دیکتاتۆرەکان وفەرامۆش کردنی جیهان بۆ ئەو جەور وستەمە، ئەمرۆ بەو هەموو بێ زەوقیە بروسکەی سەرەخۆشی بۆ دکتاتۆرێکی وەک قەزافی و بەشار ئەسەد و بوشرا ئەسەد بنێرێت؟!!

ئێستا دەزانم ئێمە چەندە هەڵەین کاتێ رقمان لە ئوردنیەک وفەلەستینیەک ومەغریبیەک ویەمەنیەک ویا هەر عەرەبێك دەبێتەوە کە ستایشی سەدام حوسێن دەکەن ورەحمەتی بۆ دەنێرن!!
یەمەنیەکی نزیک ماڵم چونکە لە دوکانەکەی وێنەی سەدامی هەڵواسیوە کە دەیبینم وەک شتیکی قێزەون هێلێنجم دێ، وهەرچەندە چەند جارێك سەلامیشم لێدەکات بەڵام بەس دەمم دەجوڵێنم ووەڵامی نادەمەوە.

ئاخر هەر نەبێت سەدام چاکە وخێرێکی هەبوە بەسەر ئەو عەرەبانە وهەڵوێستی عروبی وبوێرانەشی هەبوە وبەشێکی پارەی عێراقی بۆ ئەو چالاکیە عروبیانە خەرج دەکرد ودەیان گەنجی عەرەبی لە زانکۆکانی عێراق وەردەگرت بە خۆرایی، بەڵام پێم ناڵێی رژێمی بۆگەنی تایفی وعونسری بەعسی سوری ئەسەدی چی بۆ کورد کردوە وچی لە دژی کورد نەکردوە تا مام جەلال هاوخەمی خۆی بۆ دەربڕێت؟!

ئەگەر مالیکی لەبەر تایفەچێتی وئێران چیەتی پشتگیری ئەو رژێمە دەکات کە بە قسەی خۆیان دەستێکی باڵای هەبوو لە کارە تیرۆریستیەکانی عێراق، بەڵام هەر نەبا فەخامەتی رەئیس لەبەر عێراقچیەتی وای نەکردبا وبیسەلمەندابا کە عێراقیەکی دلسۆزە ووەفای بۆ خوێنی هەزارەکانی عێراق هەیە کە بە دەستی ئینتیحاریەکانی لە سوریاوە هاتوو دەرژێنرا!

دوایی ئەو پیاوە عەرەبی زانە دەڵێی هەرگیز گوێی لە فەرموده وحیکمەتی [فليقل خيرا او يصمت] یان خێر بڵێ یان بێدەنگ بە، نەبوە !!!

لە کاتێکدا قەزافی گۆڕ بەگۆڕ سەدان وهەزاران خەڵکی مەدەنی وبێ گوناهی لیبیای دەکوشت مام جەلال یان فەخامەتی رەئیس بروسکەی پشتگیری لە جیاتی بۆ گەلانی لیبیا بنێرێت بۆ قەزافی دەنارد تا بڵێن بە وەفایە چونکە یەک دوو لێدوانی سەرشێتانەی داوە بە پێچەوانەی خەڵکی تر بۆ کورد.

یان بروسکەی بۆ موبارەک دەنارد چەند رۆژێک پێش ڕوخانی لە کاتێکدا هەموو جیهان دەستی لە مانەوەی موبارەک شت بوو. نازانم موبارەک چی کردبوو بۆ کورد تا فەخامەتی رەئیس پشتگیری لێبکات لەدژی جوامێرترین شۆڕشی جیهانی ئیسلام وعەرەبدا؟ ! فەخامەتی رەئیس دەیتوانی پرنسیپی [فليقل خيرا او يصمت] پیادە کردبا وکەس گلەیی لێنەدەکرد لە بەرامبەر نەناردنی بروسکە پڕ لە مەراییەکانی چونکە دەزانن ئەو فەوزایەی عێراقی تێکەوتوە لەسایەی مالیکی ولەسایەی ئەودا زۆر گەورەترە لەوەی کەس ئەو وعێراقیشی بەبیر دابێت چ جای ئەوەی گلەییان لێبکات، هەتا بەو دواییە کە عێراق باسی ناوبژیوانی کرد لە نێوان ڕژێمی سوریا وئۆپۆزسیۆن بە فیتی ئێران خەڵکی سوریا وعەرەب بە گشتی گاڵتەیان بە موبادەرەکە دەکرد، چونکە عێراق خۆی پێویستی بە سەدان موبادەرە هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشە موزمینەکانی.

ئێستاش بەبێ وەرگرتنی وانەیەک لە ڕوخانی بن عەلی وموبارەک و قەزافی وعلی عبد الله صالح، جارێکی تر فەخامەتی رەئیس بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ لەبەرەی گەلانی خەباتکەر باری کردوە بۆ بەرەی فەخامەتەکان وعالی مەقامەکان پاش ئەو زەبرە جەرگبڕەی سوپای ئازاد کە سێ لە گەورەترین پیاوانی ئەسەدیان رەوانەی دۆزەخ کرد ولە سەرووی هەموویانەوە ئاسیف شەوکەتی مێردی بوشرا ئەسەدی خوشکی بەشار ئەسەد، بروسکەیەکی پڕ لە میهر وپەژارە دەنێرێت بۆ ئەو دڕندانەی ڕۆژانە منداڵی فریشتەی بێ گوناهی سوریاش بە چەقۆ لەت وپەت دەکەن ودەست لە هیچ دڕندایەتیەک ناپێرزن وسەدان قەسابخانەیان ئەنجامداوە کە ڤیدیۆکانی بە کلیکێك دەست دەکەوێت ومن دەمێکە غیرەت ناکەم تەماشایان کەم لەبەر فەزاعەتی. ئاسیف شەوکەت لە قەسابخانەکەی حەمای یەکەمی هەشتاکانیش دەستێکی باڵای هەبوە لە کوشتنی ژن ومناڵانی ئەو کاتە ئەو تاوانانەی ئەوێش بوو ئەو پایەی پێدا نزیک ببی ئەو کاتە ئەو تاوانانەی ئەوێش بوو ئەو پایەی پێدا نزیک ببێتەوە لە خانەوادەی ئەسەد تا ئەو ڕادەیەی کچە

دکتۆرە تەزویرەکەیان [بوشرا ئەسەد] ی پێ ڕەوا ببینن! بەداخەوە فەخامەتی رەئیس بروسکەی ئەو جارەشت لە کاتی زایەع بوو، دەزانم هێندە خەمی ئەوانت نیە بمرن یا نەمرن بەڵام خوا قاسم سلێمانی حاکمی فیعلی عێراق بگرێت کە ئەوەی پێکردی.

رۆژی بڵاوبونەوە

١٩ تەمموز ٢٠١٣

## فەرهاد پیرباڵ : بەهلولەکەی دەسەڵاتی کوردی

**بەهلول کەسایەتیەکی مێژوویی بەناوبانگە ناوی وەهەب کوڕی عەمرۆیە، لە سەردەمی هارون ڕەشید ژیاوە ١٤٨ هیجری بەرامبەر ٧٦٥ میلادی. هەموو دەسەڵاتێکی ئیستیبدادی و تاکڕەو لە مێژوودا بەهلولی خۆی هەبوە ودەبێ کە کاری بە پێکەنین هێنانی پیاوانی دەسەڵاتە ومکیاژ کردنی ڕوخساری دزێویەتی بۆ شیرین کردنی لەبەر چاوی خەڵک ولە بیربردنەوەی کارەساتەکانیەتی کە بەسەر ژیان وقەدەری میللەت ونەتەوەی دەهێنیت.**

هاڕونە ڕەشید سەرەڕای مشتومڕ دەربارەی شێوازی کەسایەتی لەنێوان خەلیفەیەکی ستەمکار ودادپەروەردا بەڵام لە ستەمکاری باوەڕ ناکەم شان لەشانی دەسەڵاتی کوردی وخۆماڵی بدات، ئەو ئیمپڕاتۆریەتەی هاڕونەڕەشید دایمەزراند هێندە گەشەکردوو وزانست پەروەر وبەهێز بووئەو کاتە هەموو جیهان لە ژێر کاریگەری ئەودا بوون. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێن کاری بەهلول لەو دەوڵەتە هەر بە پێکەنین هێنانی هاروونە ڕەشید نەبوو، بەڵکو سوک کردنی هەژموونی ئیستبداد بوو لەسەر شانی خەڵک، بەڵکو دەڵێن بەهلول لە ترسی دەسەڵات خۆی بە شێت نیشان دەدا چونکە فەقیهێکی گەورە بوە وپرسیاری فەتوای کوشتنی ئیمام موسای کازمی شیعەکانی لێکردوە لەترسی بەرپرسیارەتی ئەوە خۆی شێت کردوە، بەڵام هەردەم لەبەرەی خەڵک بوە و ڕەخنەی ڕەمزی توندی لە دەسەڵات گرتوە. بۆ نمونە جارێکیان لە ترسی چاودێری سەرۆکی پۆلیسەکانی خەلیفە خۆی دەکات بە دوکانێك بۆ ماسی کڕین، ماسیەک هەڵدەگرێت وتەماشای کلکی ماسیەکە دەکات، سەرۆکی پۆلیسەکانی خەلیفە لەوێ پێی دەڵێت؛ بەهلول خەڵک ماسی بکڕێت لە سەریەوە دەڕوانێت نەک کلکی! ئەویش دەڵێت؛ سەری دەمێکە گەنیوە، گوتم بزانم گەندەڵیەکە گەیشتۆتە کلکی!!!

بەهلولی کوردی لە سەرەتادا بە زمانێکی داشۆڕەوە هاتەوە لە فەرەنسا دەستی کردە ڕەخنەی توند وتیژ لە دەسەڵاتداران، زۆر کەس پێیوا بوو دەبێتە میرابۆی شۆڕشی خەڵک بەسەر دەسەڵاتی سوپەر گەندەڵ. ڕەخنەکانی سەرەڕای وشە بێ پەردە وڕیزپەڕەکانی گوزارشی لە ڕۆحی شۆڕشی فەڕەنسی وفەیلەسوفەکانی ئازادی وەک ژان جاک ڕۆسۆ دەکرد، بەڵام لە بەرامبەر باجەکانی ئازادیخواز بوون، ئەو باجەی کە هەموو ئازادیخوازێک دەیدات بەرامبەر هەڵوێستەکانی، بەهاری ئازادی فەرهاد پیرباڵ زۆر کورت بوو وەک بەهارە بەستەڵەکەکانی ئەوروپا وئەسکەندەنافیا.

کەس داوای لە پیربال نەکردوە ئالای شۆرشی خوێناوی هەڵگرێت، بەڵام کەسیش چاوەڕوانی ئەوەی لێنەدەکرد لە ئەوپەڕی ڕەخنەگریەوە بچێتە ئەوپەڕی ستایشکەری ئەو دەسەڵاتە کە ڕۆحی نەتەوەیی کوردی وێران وداڕزاندوە بە ڕەفتارە گەندەڵەکانی دوور لە هەموو دڵسۆزیەک بۆ نەتەوە و نیشتیمان ومێژووی خوێناوی دوور ودرێژی ئەو مللەتەی لەوەتی هەیە هەلێکی وا زێڕینی دەست نەکەوتوە بۆ بنیاتنانی خۆیی وپتەوکردنی خەونی هەموو کوردێك لە بەشە جیا جیاکانی کوردستان.

فەرهاد پیربال بەڕادەیەک چارەنووسی خۆی بەستوتەوە بەو دەسەڵاتە، لە کاتێکدا دەم بۆ هەموو تابۆ وموقەدەسێک وداب ونەریتێک دەبات کەچی هەتا لە کاتی مەستی وسەرخۆشبونیشیدا ستایش ودروود وسەلام دەنێرێت بۆ دەسەڵاتداران!!!

دیارە دەسەڵاتی کوردیش حەزی لەو ڕۆڵەیە کە پیربال دەیگێڕێت، هەموو دەرگا قفڵدراوەکانی بۆ دەکاتەوە، بە بەردەوامی داوەتی دەکات بۆ کۆڕ وسیمنار وبەرنامەی تەلەفزیۆنی، لەهەمووی خۆشتر پێشانگایەکی شێوەکاری بۆ دەکاتەوە وتابلۆکانی بە هەزاران دۆلار دەکڕێتەوە لە ڕێگای پیاو وژنە تێرەکانی ناو نازونیعمەتی گەندەڵی خۆی!!

پێم خۆشە هونەری بەرز بەرز بنرخێنرێت، بەڵام بەشێوەیەکی سروشتی لە ڕەفتاری گەلەوە هەڵقوڵێت نەك بەشێوەیەکی ساختە ونمایشکارانە، دەبا دەسەڵات لە فەرهاد پیربال ڕازی نەبێت بزانین کێ هەزار دۆلاریش بە تابلۆکانی دەدات نەک پەنجا وشەست هەزار دۆلار؟

بەهلولی عەرەبی وبەهلولی کوردی هەردووکیان خۆیان شێت کردوە، بەڵام بەهلولی عەرەبی لە دژی ستەم ودەسەڵات وایکردوە، ولە پەنا شێت بووندا دەیان کاری چاکی کردوە لە بەرگری کردن لە خەڵك، لە کاتێکدا بەهلولی کوردی لە ئاست هەموو کارەسات وگەندەڵیەکانی دەسەڵات بێ دەنگە، بەبێ دەنگیش ناوەستێت ستایشیشی دەکات!! ئەو دەسەڵاتە بوو کە فەرهاد پیربال ڕەخنەی توندی لێدەگرت هێشتا نیوەی گەندەڵیەکانی دەرنەکەوتبوون، دەبێت ئەو دەسەڵاتە کەڕە گوێی لە کام ڕەخنەی پیربال گرتبێت وخۆی چاککردبێتەوە تا فەرهاد وا لێی ڕازیبێت ولە مەستترین حاڵەتیدا درود وستایشی بۆ بنێرێت؟!

لەندەن

٢٠١٣/٣/٩

## كه‌سایه‌تی به‌رزی سه‌لاحه‌دینی ئه‌یوبی

به‌شی یه‌كه‌م

كه‌سانێك هه‌ن وه‌ك خۆر وان ڕووناكی به‌سه‌ر هه‌موو كه‌سێك بڵاوده‌كه‌نه‌وه‌، سه‌ر به‌ هه‌ر بیرێك و ئایدیایه‌ك بن ڕاستی وه‌ك خۆی باس ده‌كه‌ن، هه‌رچه‌نده‌ ئه‌و جۆره‌ مرۆڤانه‌ ژماره‌یان له‌چاو ئه‌وانیتری لایه‌نگیر وموته‌حه‌یز زۆر كه‌متره‌ به‌ڵام هه‌ر هه‌ن. زۆر كه‌م واده‌بێت ئیسلامیه‌ك دانی خێر به‌ سێكیولارێك یان كۆمه‌نستێك دابنێت، به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ش كه‌مجار كۆمه‌نستێك ده‌بینیت كه‌سێكی یان شتێكی ئیسلامی پێ باش بێت، یان باسی به‌ژداریه‌كی ژیاری ئیسلام بكات. به‌ڵام كه‌سانێك هه‌ن په‌یوه‌ست نابن به‌ هیچ ده‌مارگرژیه‌كی دینی وتایفی و نه‌ته‌وایه‌تی له‌ گووتنی هه‌قیقه‌ت. بیرمه‌ندی گه‌وره‌ی عێراقی كۆمه‌نیست هادی العلوي ١٩٣٢ -١٩٩٨ ، یه‌كێكه‌ له‌و بیرمه‌نده‌ پاك و نه‌زیهو ڕاستگۆیانه‌ی كه‌ ئه‌وه‌ی ناسیبێت شایه‌دی ڕاستگۆیی و مرۆیی ده‌دا، مه‌رج نییه‌ هه‌موو قسه‌كانی بسه‌لمێنین، به‌ تایبه‌تی ده‌رباره‌ی دۆزی كورد، به‌ڵام زۆر ڕاستگۆیانه‌ ڕای خۆی ده‌رده‌بڕێت، كه‌سیش نیه‌ هه‌ڵوێسته‌ مرۆییه‌كه‌ی له‌پاش لێدانی هه‌ڵه‌بجه‌ نه‌زانێت كاتێ بریاری به‌رائه‌تی خۆی دا له‌ ناسنامه‌كه‌ی وده‌ڵێت: " ئه‌ی مناڵی كوردی سوتاو به‌ گاز له‌ گونده‌ بچوكه‌كه‌ی له‌سه‌ر جێگاكه‌ی، یان له‌ گۆڕه‌پانی یاری، ئه‌وه‌ به‌ریبوونی خۆمه‌ له‌ خوێنی تۆ پێشكه‌شی ده‌كه‌م....به‌شه‌رمه‌وه‌ پێشكه‌شی تۆی ده‌كه‌م و هه‌ستی شه‌رمه‌زاری سه‌رتاپای داگیركردووم له‌ به‌رامبه‌ر خه‌ڵكدا، كه‌ من هه‌مان ناسنامه‌ی ئه‌و فڕۆكه‌وانه‌ هه‌ڵده‌گرم، كه‌ له‌سه‌ر تۆ خۆی ئازاكرد. خۆزگه‌ خه‌ڵك ڕزگاریان كردبام له‌و ناسنامه‌یه‌ هه‌تا به‌رائه‌تێكی هه‌قیقیم گیركه‌وتبا له‌ خوێنه‌ به‌ نرخه‌كه‌ت، منی كۆست كه‌وتوو به‌ تۆ و گریاو بۆتۆ له‌ تاریكایی شه‌وه‌ ده‌رێژه‌كانم. له‌ زه‌مه‌نی ده‌سه‌ڵاتی گورگه‌ مرۆییه‌كان، هیچمان ده‌ست نه‌ماوه‌ له‌ گریان زیاتر. له‌منی قبوڵ كه‌ هه‌ی غه‌در لێكراو، ئه‌وه‌ به‌رائه‌تی منه‌ له‌ ناسنامه‌كه‌م" هادی العلوي پێیوایه‌ كورد گه‌لێكه‌ به‌ژداریه‌كی سه‌ره‌كی كردوه‌ له‌ شارستانیه‌تی ئیسلام وپێشی وایه‌: "له‌ناو كوردا مه‌زنترین سه‌ركرده‌ی ئیسلامی له‌ پاش حه‌زره‌تی [محمد] و هاوه‌ڵانی ده‌ركه‌وتووه‌ كه‌ سه‌ڵاحه‌دینه‌، كه‌ ئیبن كه‌سیر له‌ كتێبی البداية و النهاية ده‌ڵێت: " ڕه‌چه‌ڵه‌كی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ "شه‌ڕافه‌تمه‌ندرین گه‌لانی كوردی" اشرف شعوب الاكراد! نازانم ابن كثير ئه‌و تێرمه‌ی به‌ هه‌ڵه‌ به‌كارهێناوه‌ یان به‌ڕاستی پێیان وابوه‌ كورد كۆمه‌ڵه‌ گه‌لێكن له‌ناو نه‌ته‌وه‌یه‌كدا؟!

هادی العلوي له‌ كتێبی [الشخصيات غير قلقة في الاسلام ل ٢٣٩-٢٤٤] به‌شێوه‌یه‌ك باسی سه‌ڵاحه‌دینی ئه‌یوبی ده‌كات، كه‌ جێگای شانازیه‌ كه‌سێكی قاڵبووی ناو فه‌رهه‌نگی دینی ومه‌زهه‌بی شیعی له‌ به‌شی یه‌كه‌می ژیانیدا و دوایی كه‌سیكی شیوعی كۆمه‌نست به‌و هه‌موو ئینسافه‌ باسی سه‌ڵاحه‌دین بكات كه‌ پێیوایه‌ مه‌زنترین سه‌ركرده‌ی ئیسلامه‌ له‌ پاش حه‌زره‌تی

محمد. ئەمرۆ سەلاحەدین ئیبتلا بووە بە دەست حیقد وبێ ئەمەکی بەشێك لە نەزانانی نەتەوەی خۆی گوایە هیچی بۆ کورد نەکردوە، وهەروەها بەدەستی شیعە چونکە کۆتایی بە دەوڵەتە ڕزیوەکەی فاتیمیەکان هێناوە زۆر بە سیاسەت و ئاشتیانە، کە گومانم نیە ئەگەر شیعەکان دەسەلاتیان بەسەر سەلاحەدین شکابایە تەفروتونایان دەکرد، سەلاحەدین هێندە ئینسان بوو هەتا دوا رۆژی ژیانی خەلیفەی فاتیمی عاضد بە ڕێز وحورمەت هەڵسوکەوتی لەگەل دەکرد، کە خەلیفە مرد ئەسەفی بۆ کێشا و گووتی بمزانیبا بە لادانی ناوی لە وتاری هەینی تووشی خەم دەبیت و وا زوو دەمرێت نەمدەکرد!!! کەی سونییەکی سەرسەخت وا بە میهرەبانی دەدوێت بەرامبەر خەلیفەیەکی شیعی؟! ئەو لایەنە کوردیەکەیەتی دەدوێت! هادی العلوي دەربارەی دەڵێت:

"ئەگەر بەسەرحوکمی ڕاشدیەکان تێپەڕین بە کە تێکهەڵکێشراو بوو بە پرنسیپی بزاڤی مێژوویی باڵاچوو، صلاح الدین لە نێو ئەو فەرمانڕەوایە بە ژمارە کەمانەیە کە خاوەن شەعبیەتێکی بێ وێنە بوون و خەڵك خۆشیان دەویست، هەرچەندە خەڵکەکە لەوە ڕاهاتبوون کە ڕقیان لە دەسەلاتدار و فەرمانڕەوایان بێتەوە و هیواخوازی لەناوچوونیان بکەن. ئەوەش تەنها ناگەڕێتەوە بۆ قارەمانیەتی ئەو لە بەرهەڵستکاری داگیرکردنی ئەوروپاییدا، چونکە دەسەلاتدارانێك بەرلەو و لەپاش ئەویش ئەو ئەرکەیان ئەنجامدا بوو، کەچی ئەو پایەیان نەبوو لە دڵی خەڵك .زاهر بیبەرس وەك ئەو قارەمان بوو، هوشیاری گەلی نەمری کرد لە ڕێگای ئەفسانەیەک بەناوی خۆی. بەلام خەڵك وەك سەرکردەیەکی قارەمان خۆشیان دەویست.

لە ڕاستیدا دەکرێت بەراوردی سەلاحەدین بە نورەدین [زەنكی] شەهید بکرێت، کە گەل ئەو نازناوەی پێدا، هەرچەندە لەسەر پێخەف و جێگای خۆشی مرد .لەوانەیە ئەزموونی نورەدین قووڵتر بێت. پسپۆڕی بەتوانای کتێب ئیبراهیم زەیبەق پێیڕاگەیاندم لە پاش توێژینەوەیەکی تێروتەسەل دەربارەی سەلاحەدین لە ڕێگای ساغکردنەوەی کتێبی ابو شامە کە دوایی باسی دەکەین لێرەدا ئەوەی پەیوەستە بە سەلاحەدین پوختی دەرکەینەوە و دەڵێین: ئەو لە کەسایەتی سیاسی وعەسکەری، گوزارشی لە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگای کوردی دەکرد وەك ئێمەی عێراقی دەیناسین لە ئەنجامی بەرخوردی ڕۆژانەمان لەگەڵ ئەو گەلە چیایە".

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام زیاتر ئەو تەوفوقە فیکریە من بوو لەگەڵ هادی العلوي، دەربارەی کەسایەتی سەلاحەدین کە لە وتارێکمدا بە ناوی [خەسڵەتە کوردیەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی] باسم کردوە، لێرە هادی العلوي پێیوایە سەلاحەدین چونکە لەسەر فیترەت و سروشتی کوردی خۆی مابوەوە وسەرەڕای هەرسکردنی فەرهەنگی ئیسلامی و عەرەبی وگرتنی گەورەترین دەسەلات لە دەستی، وبایەخدان بە حەدیس، بەلام توانی سروشتی کوردیانە و

سەرڕاستانەی کوردی خۆی بپارێزێت، دەقە حەدیسە نێگەتیڤەکانیش کاری لێنەکەن، بەرەو دەمارگرژی و توندوتیژی ببات .بۆیە سەلاحەدین لەگەڵ ئەهلی تەسەوف و مەزاهیبەکانی تریش زۆر نزیك بوو، بەڵکو لەوپەڕی هێزەوە هێزەوە زۆر بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ خەلیفەی فاتیمی عاضد دەکرد ودەیتوانی بە کودەتایەکی خوێناوی لایبەرێت، بەڵام سیاسەتی هێمنانەی قۆناغ دوای قۆناغی لەگەڵ بەکارهینا، هەتا کاتێ ناوی عاضدی لە وتاری هەینی نەهێشت، کە پاش چەند ڕۆژێك مرد، پەشیمانی دایگرت و گووتی بمزانیبا وا پێی دەمرێت ناوم لە وتاری هەینی نەدەسڕیەوە!!! ئینجا ڕەوشتی بەرزی و لێبوردەیی لەگەڵ مەسیحیەکان و خاچ پەرستەکان وێنەی نەبووە لە هەموو مێژووی ئیسلام دا.

هادی العلوي لەو بارەیەوە دەلێت: ئەو هێشتا نزیك بوو لە ژینگە کوردیە ڕەسەنەکەی، باپیرەی ڕاستەوخۆی ناویکی کوردی هەڵگرتبوو و هەروەها مامیشی کەناوی شێرکۆ بوو، ئەو ناوەش تا ئێستاش باوە لە نێو کوردان. هێشتا کاتیکی وا زۆری پێنەچوو بوو لە جیابوونەوەی لە ژینگەی ڕەسەنی خۆی بەشی ئەوە بکات پێکهاتە بەهایەکانی لەبیر بچێتەوە تا ڕادەی گۆڕان بۆ کەسایەتیەکی ڕەق و وشکی شارنشینی تواوە لەناو جەوی شارە گەورەکاندا. ئەو کلتوری عەرەبی بەدەست هێنابوو لە چوارچێوەی ئیسلامیەکەیدا. ودیوانی الحماسة ی سەرلەبەر لەبەر بوو. مێژوو نووسانیشی لە ڕیزی ئەهلی حەدیسی حسێب دەکەن. ئەو زۆر دیندار بوو هەتا نوێژی بە کۆمەڵی کرد کاتێك لەسەر پێخەفی مەرگ بوو لە دوا نەخۆشیدا .لەکاتی گەرمەی شەڕ وتێکەڵچووندا داوای لە یاوەرانی دەکرد بەشەکانی فەرموودەی پێغەمبەری بۆ بخوێننەوە. فەقیهێك دەقێکی عەقیدەی سونی بۆ نوسیەوە، لەبەری کرد و داوای لە منداڵەکانی کرد لەبەری کەن، بەڵام لە نێو ئەو هەمووانە ویژدانێکی کوردی پاراست کە کاریگەریەکی بەرچاوی هەبوو لە ژیانی سیاسی و عەسکەرییدا.

تەنها سەرنجێکی ترم لەسەر ئەو دەقەی هادی العلوي ئەوەیە سەلاحەدین ئەگەرچی بایەخێکی زۆریشی بە حەدیس دابوو وەك دینداریک، بەڵام زۆر دوور بوو لە میزاجی توندوتیژی ئەهلی حەدیس و سەلەفیەت بە گشتی کە لێبوردەییان لەگەڵ موسڵمانانی مەزهەبەکانی تریش نیە، نەك غەیرە دینان، هەتا لە کاتی جەنگەکانیدا زانایانی سۆفیەتی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ پرس وڕا پێکردن و بەرزکردنەوەی ورەی جەنگاوەرانی.

دەربارەی دینداری گەل دۆستی و دینداری سیاسەتبازی دەڵێت: " لەو ئەزموونەدا دیاردەیەکی دەگمەن خۆی دەنوێنێت لە سنوری ئایینی و سوڵتانیدا پێکەوە. ئەوەی هاوبەشە لە نێوان فەرمانڕەوا دیندارەکان مەیلی هێزی خوێناویە وەك بەرهەمی توندوتیژی ئایدیۆلۆژیا کاتێك لە دەسەلات دەبن، کە دینداری سیاسەتبازی دادەبڕێنێت لە دینداری شەعبی، مەبەستم لە دینداری خەڵکی عەوام ڕەشۆکییە کە بەرژەوەندیە سیاسی و ئابووریەکان نایانجوڵێنێت. کاریگەری

دینداری لە دەسەڵات پێچەوانەی کاریگەری دینداریيە لە خەڵکی ئاسایی، سەڵاحەدین لە دینداریدا نزیکتر بوو لە دینداری مرۆڤێکی ئاسایی تا دینداری سوڵتانێك، ئەوەش خۆی بەرجەستە دەکرد لە جەنگەکانی و ڕەفتاری ناوخۆییدا .لێرەدا لە سەردەمی ئەودا هیچ شارێکی ئازادکراو لە ژێر چنگی فەرەنگیەکان ئیستباحە نەکراوە، وەك چۆن ئیسپانەکان بەو شارانەیان دەکرد کە لە ئەندەلوس دا لە ژێر ڕکێڤی موسڵمانانیان دەهێنایە دەرەوە، یان کاتێك فەرەنگیەکان شارێکی ئیسلامیان داگیر دەکرد.

سەڵاحەدین پاپەندبوونێکی توندی بە یاساکانی جەنگی ئەو سەردەمە نیشان دەدا. لە کاتێکدا فەرەنگیەکان دێوەزمەکی ترسناك بوون لە دڵی خەڵکی شارە داگیرکراوەکان، بەڵام سەڵاحەدین و سەربازانی هێندە مایەی ترسناکی نەبوون لەلای خەلکە فەرەنگیەکان، ئەوەندەی وەك جەنگاوەرانی بەتوانا هەیبەتدار بوون .هادی العلوي پێیوایە سەڵاحەدین هەیبەتدار بوو، بەڵام ترسناك نەبوو لای خەڵک لە ستەمی بترسێن، ودەڵێت: "لە پەیوەندیدا لەگەڵ گەلدا سەڵاحەدین وەك عومەری کوڕی خەتاب ، هەیبەتدار بوو، بەڵام ترسناك نەبوو، بەو جۆرە بوو لە ژیانی تایبەتی لەناو کۆشکیدا وهەروەها لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەست وپێوەندەکانیدا کە ئەمین بوون لە نەزەواتەکانی. ئەوەش حالەتێکی تایبەتە لە ڕەفتاری خەلیفە و سوڵتانەکان لە سەرەتای دەستپێکی خەلافەتی عەباسییەوە. هیچ لە دەست وپێوەندەکانی و وەزیرەکانی و سەرکردەکانی دووچاری سزایەکی هەڕەمەکی زادەی چەمووشی ئیستیبدادی نەهاتوون.

توندترین سزا لەکار لادان بوو، هەروەك وای کرد لەگەڵ وەکیلی خەزانەیدا لەبەر بنتیاتنانی کۆشکێك." ..." سەڵاحەدین لە ژیینامەیدا هەروەها لە سیاسەتیدا نمونەی سوڵتانێك بوو کە خەڵك لێی نەدەترسا، چونکە ترسناك نەبوو، ڕیزیان لێدەگرت و خۆشیان دەویست چونکە تاڵانی نەدەکردن، وژیانێکی ناوەندی و ئەستۆ پاکانە دەژیا دوور لە گەندەڵی کۆشك وتەلارەکان .کۆی ئەوەش ئاکاری پیاوێکی کوردی ئاسایی بوو. بەڵام گرنگیەکەی لەوەدایە کە توانی ئەو ئاکارانر بپارێزێت لە کاتێکدا سوڵتان و دیندار بوو".

**کەسایەتی بەرزی سەڵاحەدینی ئەیوبی**

**بەشی دووەم**

هادی العلوي پێیوایە سەڵاحەدین لە ژیانیدا دوو هەڵەی گەورە کردوە وەك دەڵێت:
-لە سێدارەدانی عمارة اليمني شاعير -لە سێدارەدانی فەیلەسوف شهاب الدين السهروردي!

لە ڕاستیدا ئەوەی زیاتر باسی دەکرێت کوشتنی سەهرەوەردی یە، با گوێی بۆ بگرین ودوایی سەرنجەکانمان دەخەینەڕوو: "لێرەدا سەڵاحەدین دووهەڵەی لەسەر تۆمار دەکرێت، یەکێکیان لە سێدارەدانی عمارة اليمني شاعیرە پاش تێوەگلانی لە پلانێك بۆ گەڕاندنەوەی خەلافەتی فاتیمی و ڕوخاندنی سەڵاحەدین . هەرچەندە تاوانی ناوبراو لە نێو تاوانە گەورەکان دەژمێردرێت لە سەردەمی جەنگدا، دەبوایە سەڵاحەدین دوودڵی کردبا لەبەردەم شاعیرێکی گەورەدا و بە زیندانیکردنی بەسی کردبا.. دووەم لە سێدارەدانی فەیلەسوف شهاب الدين السهروردي بوو. ئەوەش لە ئەنجامی سکاڵانامەیەکی پیاوانی ئایینی حەلەب ڕوویدا کە کوفری ئەویان دەسەلماند و داوای موستەهەقی کوشتنیان دەکرد. پیاوانی دینیش دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو لە سەردەمی ئەمیرە جەنگەکانی تورك، هەروەها نورەدین و سەڵاحەدین پشتیان بە پیاوانی ئایینی دەبەست لە پێناو هاندانی خەڵك وگۆشکردنیان لە دژی فەرەنگیەکان ، بە حوکمی مۆرکی ئایینی جەنگی خاچداران. لە بەدبەختی دایە کە تاقە فەرمانێکی لە سێدارەدان جێبەجێ کرابێت لە مێژووی ئیسلامیدا لە دژی فەیلەسوفێك لەسەردەستی ئەو کوردە دادپەروەرەدا بووە".

سەرەڕای ئەوەش هادی العلوي پێیوایە سەڵاحەدین زۆر ئەستۆپاك بوو و دژی گەندەلی بوو و ڕیزی جیاوازیەکانی دەگرت و پشتگیری ڕەخنەی هەقیقی دەکرد لە گەندەڵی وهەر خۆشی لە پشت هاندانی ڕەخنەگرێکی سەرسەختی وەك الوهرانی دەکرد، کە هەتا کەس وکاری سەڵاحەدینیشی نەدەپاراست لە ڕەخنە توندەکانی، ولەو بارەیەوە دەڵێت: "لە سەردەمی سەڵاحەدین چەندین ڕۆشنبیر و ئەدیبی پایەبەرز پێگەیشتن کە لە سایەی پاراستن و هاندانی ئەو چالاك بوون، لە نێو پزیشکەکانی موسای کوڕی مەیمون بوو، کە گەورەترین فەیلەسوفی جولەکە بوو لە سەردەمی ئیسلامیدا. موسای کوڕی مەیمون خەڵکی ئەندەلوس بوو، بە ناچاری لەوێ ببوە موسڵمان بۆ ڕزگار بوون لە گێچەڵ پێکردن، کاتێ هاتە قاهیرە لە سەردەمی سەڵاحەدین گەڕایەوە بۆ دینی خۆی! ....لە هەلکەوتوو و بلیمەتەکانی سەردەمی الوهرانی خاوەنی مەقامات - جۆرێکە لە ئەدەبی نووسین- بوو. لە سایەی پاراستنی سەڵاحەدین ئەدەبێکی ڕەخنەیی دەنووسی لەسەر دەسەڵاتدارانی دەوڵەت ولە براکانی

سەڵاحەدین خۆی دەستی پێکرد، و گەندەڵی کارگێڕی ریسوا دەکرد و سەرکۆنەی فەقیە و قازیەکان و ئەدیب و شاعیران و سۆفیەکان و پزیشکانی دەکرد.

لەوانەیە هەرخۆی ئاراستەی کردبێت بۆ ئەو ئەرکە، وەك هەوڵێك بۆ جەنگان لەدژی گەندەڵی پاش ئەوەی نەیتوانی بە دەسەڵات وهێز ڕێی پێ بگرێت. ئەوەش ڕەخنەیەکە کە لە شا المعظم ی برای سەڵاحەدین ی گرتوە: " "ثم أن الملك المعظم – أدام الله أيامه – كما تعلم، ينهب الأيام نهبا، ويقطع الأوقات الى اللذات وثبا، أنفق بعد وصوله الى ديار مصر نحواً من مائة وسبعين ألف دينار، كأنما وقعت في بئر، فلم يظهر لها حس ولا خبر، إلا على المساخر والقوادين"..

شا موعەزەم -خوا دەوامی بدات- وەك دەزانی ڕۆژگار بەتاڵان دەبات، کاتەکان بە بازدان دەبڕێت بۆ گەیشتن بە لەزەتەکان، پاش گەیشتنی بە وڵاتی میسر سەد وحەفتا هەزار دیناری خەرج کرد، وەك بڵێی ئەو پارەیە کەوتبێتە بیرەوە، هیچ دەنگ و هەواڵی نەبیسترا، تەنها لەسەر قەشمەر و گەوادان"... دیاردە فەرهەنگیەکانی سەردەمی سەڵاحەدین کە زیاتر لە بیست ساڵی خایاند پێویستیان بە توێژینەوەی تایبەت هەیە هیوادارم کەسانێکی بۆ پەیدا بێت لە مێژوونووسانی نەوەی نوێ پیی هەڵستێ. ئەو سەردەمەی الوهراني هێنایە کایەوە و موسای کوڕی مەیمونی تێیدا لە دایك بوو، شایەنی بایەخ پێدانە".

الوهراني هێندە بلیمەت بوو لە نوسینیکیدا باسی خەونی دیتنی ئاخیرەت دەکات دەڵێی ئەمرۆ بۆ کوردستان گوتراوە کاتێ باسی فریشتەی ڕوحکێشان عزرائیل دەکات کە چۆن شافاعەتی بۆ پزیشکان دەکرد و بایەخی پیدەدان و میهرەبانی بۆ دەنواندن چونکە ئەو دکتۆرانە ئەرکی عزرائیلیان ئاسان دەکرد لە دنیادا کاتی روحی خەڵکی دەکێشا، لە ڕەخنەیەکی پەنهانی لە ئەنجامی نەزانی و هەڵە و چاوبرسێتیان!!.

دەربارەی کەسانێکی سۆفی و پیاوانی ئایینی دەڵێت: " ڕایان کرد لە ماندووبوونی پیشە و کارەکان بۆ گۆشە و مزگەوتەکان و مەزارگاکان بە بیانووی عیبادەت و گۆشەگیری لە خەڵك ، کارو پێشەیان خواردن و نووستنە هەتا دەمرن..ئەوانە وەك کولەکەی باخچەن ئاو دەخۆنەوە وجێگاکەش تەسك دەکەنەوە"

بە نسبەت لە سێدارەدانی عمارة اليمني شاعیر، ئەو شاعیرە بە حیساب سونیەکی شافیعی بووە هەر خەریکی کاسبی بوە لای ئەو وەزیر وئەم وەزیر، چڵکاو خۆرێکی ناوداری خەلیفە فاتیمیەکان بوو، وەك زۆر لە نووسەر و ڕۆشنبیری بەناو سونی ژێر کاریگەری شیعە کە وڵاتێك نەماوە چەند دانەیەکی وای تێدا نەبیت بە کوردستانیشەوە. کاتێ سەڵاحەدین حوکمی

گرته دەست، هیچ لایەکی له شاعیرانی دەربار نەکردەوە و خەریکی کاری زۆر گەورەتر بوو لەوەی گوێ بگرێت بۆ شاعیریکی مەراییکەر تا شیعری بەباڵادا هەڵدات، بۆیە شاعیری ناوبراو چەندین شیعری گووت له دژی سەڵاحەدین و هاندانی خەڵك له دژی ڕاپەڕین ودوایی بەژداری کردنی ڕاستەوخۆی له پیلانی کوشتنی سەڵاحەدین دا! سەڵاحەدین تا جموجۆڵی شاعیر له سنوری شیعره توندەکانی بوو که پڕاوپڕ بوون له سوکایەتی و تۆمەت هەلبەستن لەدژی سەڵاحەدین، هیچ توخنی نەکەوت، بەڵام که کارەکه گەیشته پلانی کرداری لەگەڵ حەشاشه تیرۆرستەکان و خاچ پەرستەکان، هیچی تر نەیتوانی چاوپۆشی لێبکات وەك هادی العلوي دەڵێت ئەوه خیانەتی مەزن بوو.

هەقیقەتی فەلسەفی سەهرەوەردی سەهرەوەردی ناوی یحیی بن حبش بن أميرك ی، ناسراو به شهاب الدين السهروردي بوو، له ٥٤٩ هیجری له دایك بووه له سەهرەوەرد، ودەڵێن له ساڵی ٥٨٧ هیجری کوژراوە، هەرچەنده ساڵی مردنی جیاوازی لەسەر هەیه. خەڵکانێکی زۆر به ئاگایی وبێ ئاگایی له مەسەلەی له سێدارەدانی سەهرەوەردی لەلایەن سەڵاحەدین بێ ئەوەی لەو بابەته وردبنەوە، هەندێکیان تەنها لەبەر قینی مەزهەبی و هەندێکی تر لەبەر هەرزەکاری فیکری ونەزانی و کەسانیکی تریش لەبەر هۆکاری ئایدیۆلۆژی و دەمارگرژی نەتەوەیی تۆمەتی ستەمکاری دەدەنه پاڵ کەسایەتیەکی دادپەروەر و بێفیز و خۆشەویستی خەڵک وجەماوەری وەك سەڵاحەدین، که بەڕای هادي العلوي له جوامێریدا وێنەی نەبووه له پاش حەزرەتی محەمەد.

سەهرەوەردی له خەیاڵی ئەو کەسانه فەیلەسوفێکی گەورەی بێ گوناه و بەری و ئاسایی مێژوو بووه، زانایان و خەڵک و دەسەڵاتی سەڵاحەدین له هیچ و خۆڕایی ئەو کەڵه فەیلەسوفەیان کوشت !سەڵاحەدین ێك که بۆ ژنه خاچپەرستێك بگرییێت چونکه شیرەخۆرەکەی لێی ڕفێندرابوو، وەك ابن شدادی مێژوو نووس به زیندوویی تۆماری کردوه له کتێبی ] النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية] دەڵێت: " که ژنەکه گریانو فیغانی بوو، سەڵاحەدین دڵی پێ سوتاوه و چاوەکانی ئاویان تێ تزا وفەرمانی کرد به دۆزینەوەی منداڵەکه دەسبەجێ، دوایی دیتیان منداڵەکه فرۆشرابوو به کەسێك و لێیان کڕیەوه و دایانەوه دەستی دایکی و بەسواری ئەسپ و به پاسەوانی سەربازەکانی خۆی گەیاندیه ناو کەسوکاری !

بەزەیی بێ سنووری هێنده مەزن بوو جەنگاوەره خاچ پەرستەکانیشی گرتبۆوە، تاڕادەی ئەوەی شیعه قیندارەکان تۆمەتی مەیلداری به مەسیحیەتی دەدەنەپاڵ لەبەر لێبوردەیی و تۆلەرانس وتەساموحی لەگەڵ جەنگاوەره خاچپەرستەکان، نه مەدەنیەکان!! دەیانەوێت هەر شارێکی گرتبا وەك داعشی کردبا تا لێی ڕازیبن!! شوهرەتی جوامێری سەڵاحەدین هێنده دەنگی دابوەوه له ئەوروپای کۆنی سەردەمی کڵێساش، تارادەی ئەوەی خەڵکانێکی مەسیحی

ڕه‌چه‌ڵه‌كیان ده‌گه‌ڕانده‌یه‌وه بۆ خانه‌واده‌یه‌كی میرزاده‌ی مه‌سیحی، به‌ڵكو له‌ فه‌ره‌نسا تا ئه‌مڕۆش ناو له‌ منداڵه‌كانیان ده‌نێن سه‌لاحه‌دین ! Saladin وه‌ك دكتۆر لویس بوزێ ده‌ڵێت له‌ ڕۆژنامه‌ی لوفیگارۆ Figaro له‌ ٢٢ تشرینی دووه‌می ١٩٩٣ له‌ ڕاگه‌یاندنی مه‌رگنامه‌یه‌ك ناوی ئه‌و كه‌سه‌ی وا بڵاوكردبووه‌وه‌ !Marie Bernard Saladin وه‌ك له‌ كتێبی (صلاح الدين الأيوبي بين العباسيين والفاطميين والصليبيين) سيد حسن الأمين دا هاتووه‌ سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی ته‌رخان كراوه‌ بۆ ناوزڕاندنی سه‌لاحه‌دینی مه‌زن.

سه‌لاحه‌دین به‌و هه‌موو لێبورده‌یی و شكۆوه‌ ماقوڵه‌ فه‌رمان بكات به‌ كوشتنی فه‌یله‌سوفێكی موسڵمان؟ !ئه‌گه‌ر هۆكارێكی تر له‌ پشت ئه‌و سزایه‌ نه‌بێت؟! به‌ نسبه‌ت سه‌هره‌وه‌ردی یش، ئه‌و كه‌سێكی تابڵێی سه‌رچڵ و هه‌ڵه‌شه‌ بوو به‌ شه‌هاده‌ی نزیكترین كه‌س و دۆستی خۆی، فخرالدين الماردينی كه‌ ده‌رباره‌ی وتویه‌تی: ئه‌و لاوه‌ چه‌نده‌ زیره‌ك و زمان پاراوه‌! كه‌سم وه‌ك ئه‌و نه‌دیوه‌ له‌و سه‌رده‌مه‌دا. به‌ڵام من لیی ده‌ترسم له‌به‌ر زۆر هه‌ڵه‌شه‌یی و بێ باكی و كه‌م ته‌حه‌فوزكردنیدا، كه‌ ببێته‌ هۆی له‌ناوچوونی ".هه‌روه‌ها ماردینی ئاماژه‌ ده‌كات به‌ گوێنه‌دانی به‌ هیچ ئیعتاباراتێكی كۆمه‌لایه‌تی، بۆیه‌ نامۆ ده‌رده‌كه‌وت به‌ ده‌ورووبه‌ره‌كه‌ی سه‌ره‌ڕای قسه‌ قوول و سه‌یره‌كانی ابن تغري بردي ده‌ڵێت: "سه‌روشكلی زۆر پیس وپه‌ڵۆس بوه‌، نه‌خۆی ده‌شۆرد ونه‌ جله‌كانی، ونه‌ نینۆكی ده‌كر ونه‌ قژی كورت ده‌كرده‌وه‌!" وابن خلدون یش ده‌رباره‌ی ده‌ڵیت زانستی گه‌وره‌تر بوو له‌ عه‌قڵی، وه‌ك خيرالدين الزركلي له‌ الاعلام دا ئاماژه‌ی پێده‌كات!.

له‌ دوا به‌شی ئه‌و بابه‌ته‌ باسی هه‌قیقه‌تی هۆكاری كوشتنی سه‌هره‌وه‌ردی ده‌كه‌ین كه‌ ئایه‌ له‌به‌ر جیاوازی ڕاو فه‌لسه‌فه‌ بوو یان هۆكارێكی سیاسی ل دواوه‌ بوو؟!

## کەسایەتی بەرزی سەڵاحەدینی ئەیوبی

### سەڵاحەدین و کوشتنی سەهرەوەردی

بەشی سێیەم

چیرۆکی سەهرەوەردی لە سەرچاوەکان لەوەوە دەست پێدەکات کاتێ بە پەیامێکی تایبەتەوە بەرەو دیاربەکر و ئەنادۆڵ و سوریا دەچێت، بەر لەوەی بچێتە حەلەب و لەلایەن پاشای ئەوێ شا زاهری کوڕی سەڵاحەدین [الملك الظاهر أبو المنصور غياث الدين غازي، ( 568هـ - 613)] میوانداری بکرێت، ناوبانگی وای دەرنەکردبوو، ئەگەرچی بۆ هەرکوێ ڕۆیشتبا سەرنجی خەڵکی بۆخۆی ڕادەکێشا بە زیرەکی و شیعرە ناسکەکانی وبیرە فەلسەفیە نامۆکانی، کە لە حەلەب گیرسایەوە و بووە مایەی بایەخ پێدانی کوڕی سەڵاحەدین، کە لیی دەگێڕنەوە زۆر حەزی لە دۆستایەتی ئەهلی تەسەوف و عیرفان بووە وەك هەر کوردێك کە بە گشتی تا ئەمڕۆش زیاتر حەزیان بە مەسلەکی ئەهلی تەسەوفە لەناو گروپە ئاینیەکانی ئیسلامدا.

ولەبەر ئەوەی سەهرەوەردی بڕیاری دابوو هەموو نهێنیەکانی دەعوە وبیروڕاکانی بە ئاشکرا بە گوێی خەڵکی دادات بە ئاشکرا، پیاوانی دینی حەلەب سکاڵایان لەدەست دەکرد وداوای دوورخستنەوە وسزادانیان دا لە شازاهیری ئەیوبی، کوڕەکەی سەڵاحەدین سکاڵاکانی پشتگوێ دەخست، بۆیە ئەوان سکاڵاکانیان گەیاندە خودی سەڵاحەدین، تێیدا نووسیبویان: ئەگەر وابروات سەهرەوەردی عەقڵی شا تێك دەدات، ئەگەریش ئازاد بکرێت عەقڵی خەڵکی گشتی تێك دەدات! ئەوەش تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستە چونکە بانگخوازانی ئەو قوتابخانەیەی سەهرەوەردی پێگەیاندبوو، لە ڕووی عەقڵیەوە زۆر زیرەك بوون کەسانێکی وەك ابن سینا و اخوان الصفای پێگەیاندبوو، دەکرێت بڵێین جگە لە بیروباوەڕە دینیە شیعیەکانیان، بایەخیکی زۆر و زەوەندیان بە زانستە عەقڵیەکان و فەلسەفیەکان دەدا، وتاریان کاریگەری لەسەر نوخبەی ڕۆشنبیر وخەڵکی گشتیش بەجێ دەهێشت. هەرچەندە مەودایەکی گەورە هەبوو لە هەڤدژی نێوان ئەو بیروباوەڕە فەلسەفیانە و بیروباوەڕە مەزهەبیە دینیەکانیان و ئەو دەرەنجامە تەسکانەی کە هەوڵیان بۆ دەدا لەڕێگای فەلسەفەوە.

کە سکاڵای زانا سونیەکان و خەڵک زۆر بوو لەسەر بە ئاشکرا تەبشیر کردنی سەهرەوەردی بە بیروراکانی، خەڵک کە دیتیان کورەکەی سەڵاحەدین هیچ ڕێکارێك ناگرێتەبەر لەدژی سەهرەوەردی، بە ناچاری نامەیەکی زۆریان بۆ سەڵاحەدین نووسی، سەڵاحەدین یش، وەك سەرکردەیەك پاراستنی بەرەی ناوخۆی لە دەست ئەو زانایانە بوو کە

ڕۆڵی میدیا و ئامادەباش کردنی خەڵک یان دەگێڕا، بۆیە کاتی ئەوەی نەبوو دانیشێ گوێ لە فەلسەفە و بیروڕاکانی فەلسەفی سەهرەوەردی بگرێت، ئەوە نە کاری ئەو پیاوە سەربازیە گەورەیە بوو، نە خۆشی سەری لەو ڕەموز و غموزانەی فەلسەفە دەردەچوو، بۆیە کارەکەی خستە ئەستۆی زانایانی دینی چونکە تۆمەتەکەس هەر دینی بوو، بۆیە داوای کرد لە زانا ئاینیەکان لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەن .

بەناوبانگترین بەشی ئەو گفتوگۆیە کە لە سەرچاوەکان گێڕدراوەتەوە لە دادگایی کردنی سەهرەوەردی دەڵێت: "قازی گەورەی دیمەشق کە دادگایی سەهرەوەردی کرد کتێبەکانی ئەو فەیلەسوفە خوێندۆتەوە، تەنها ڕستەیەك هەڵوەستەی پێکرد، کە سەهرەوەردی لە کتێبیکیدا نووسیبووی: [خودا دەتوانێت یغەمبەرێك دروست بکات]، بە سەهرەوەردی گووت:

-تۆ دەڵێیت خودا دەتوانێت پێغەمبەرێك دروست بکات، ئەوەش ئەستەمە چونکە هیچ پێغەمبەرێك لە پاش محەمەد نییە.

-سەهرەوەردی گووتی: سنوور نیە بۆ هێزی خوا، ئەوەی توانای بەسەر هەموو شتێکەوە هەبیت ئەگەر شتێکی ویست لێی عاسێ نابێت.

-قازیەکە وەڵامی دایەوە: خودا توانای هەموو شتێکی هەیە جگە لە دروستکردنی پێغەمبەرێکی تر، موستەحیلە.

-سەهرەوەردی گووتی: ئایە دروستکردنی بە ڕەهایی موستەحیلە یان نا؟

بێگومان قازی حەلەب یش باوەڕی بەوە هەبوو خوا هەموو کارێکی پێدەکرێت، بەڵام لە چڕبوونەوە لەسەر ئەو پرسە دیارە مەرامێکی تایبەتی هەبوو، چونکە ئەو و پیاوە دینیەکانی تری حەلەب دڵنیا بوون لە باتینیەتی سەهرەوەردی، وباتینیەکانیش ڕوئیای تایبەتیان هەیە بەرامبەر پێغەمبەرایەتی کە لای ئەوان بە هاتنی حەزرەتی محمد کۆتایی نەهاتووە! و بە ئاشکرا لە کتێبەکانیان بانگەشە بۆ پێغەمبەرایەتی محمدی کوڕی ئیسماعیل دەکەن کە ناوزەدی دەکەن بە الناطق السابع [قسەکەری حەوتەم] و پێغەمبەر محمدیش لایان ناطق السادسە!

ابو ایوب السجستانی کە ئەویش پێیدەڵێن فەیلەسوفی گەورەی ئیسماعیلی لە کتێبی اثبات النبوات دەڵێت:" ئەوەی لە سنوری ئیبراهیم ڕاوەستا و باوەڕی پێ هێنا وبڕوای بە بانگەوازی ئەو کرد، وتێنەپەڕاند بۆ سنوری موسا، ئەوە جیاوازی کردوە لە نێوان ئەو و

موسا، كه‌ سنوری ئه‌و وئه‌ویان به‌یه‌ك گه‌یشتوون، ئه‌وه‌ی له‌ سنوری موسا ڕاوه‌ستا و باوه‌ڕی پێ هێنا وبروای به‌ بانگه‌وازی ئه‌و كرد، وتێنه‌په‌ڕاند بۆ سنوری عیسا، ئه‌وه‌ جیاوازی كردوه‌ له‌ نێوان ئه‌و و عیسا، كه‌ خوا سنوری ئه‌و وئه‌ویان به‌یه‌ك گه‌یاندوه‌، ئه‌وه‌ی له‌ سنوری عیسا ڕاوه‌ستا و باوه‌ڕی پێ هێنا وبروای به‌ بانگه‌وازی ئه‌و كرد، وتێنه‌په‌ڕاند بۆ سنوری محمد صلى الله عليه و اله، ، ئه‌وه‌ جیاوازی كردوه‌ له‌ نێوان ئه‌و و موسا، كه‌ خودا سنوری ئه‌و وئه‌ویان به‌یه‌ك گه‌یشتوون، ئه‌وه‌ی له‌ سنوری محمد صلى الله عليه و على اله وه‌ستا و باوه‌ڕی پێ هێنا وبروای به‌ بانگه‌وازی ئه‌و كرد، وتێنه‌په‌ڕاند بۆ سنوری القائم [واته‌ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ئیسماعیلیه‌كان]، ئه‌وه‌ جیاوازی كردوه‌ له‌ نێوان ئه‌و و خاوه‌نی قیامه‌ت [!!!]، كه‌ خودا سنوری ئه‌و وئه‌ویانی به‌یه‌ك گه‌یاندوون!"

" إن من وقف على حد إبراهيم وآمن به وصدقه في دعواه ولم يعبره إلى حد موسى فقد فرق بينه وبين موسى والذي أوصل حده بحده ومن وقف على حد موسى وآمن به وصدقه ولم يعبر إلى حد عيسى فقد فرق بينه وبين عيسى والذي أوصل الله حده به ومن وقف على حد عيسى وأمن به وصدقه ولم يعبره إلى محمد صلى الله عليه و على اله فقد فرق بينه وبين محمد، و الذي أوصل الله حده بحده، و من وقف على محمد صلى الله عليه و على اله، وآمن به وصدقه ولم يعبره على حد القائم كما قال: بعثت أنا والساعة كهاتين فقد فرق بينه وبين صاحب القيامة والذي أوصل الله حده بحده ". كتاب اثبات النبوات، للفيلسوف الاسماعيلي ابو يعقوب اسحق السجستاني، حققه وقدم له تامر عارف، الطبعة الثانية، دار المشرق، بيروت - لبنان، ص ٤٢-٤٣.

نه‌ك هه‌رهێنده‌ له‌ هه‌ندێك كتێبی تری ئیسماعیلیه‌كاندا هاتووه‌ كه‌ باوه‌ڕیان وایه‌ پێغه‌مبه‌رایه‌تی پایه‌كی به‌شه‌ریه‌ و خه‌دیجه‌ی خێزانی پیغه‌مبه‌ر ، محمدی كردۆته‌ پێغه‌مبه‌ر!! قال ابراهيم بن الحسين الحامدي له‌ یه‌كێك له‌ له‌ نهێنیترین كتێبی بانگه‌وازی ئیسماعیلیه‌كان، كنز الولد، ده‌ڵێت: "فرفعت (خديجة منزلته) كما ذكرنا بأمر ولي الأمر, وسلّمت إليه رتبة النبوة والرسالة, وهو ما روي أنّ خديجة أسلمت يوم الاثنين وقت الظهر, وهو اليوم الذي بُعث فيه, والوقت الذي قام به مرسلاً" كنز الولد، دار الاندلس، عني بتحقيقه د. مصطفى غالب.

پاش ئه‌وه‌ی بۆ پیاوانی دینی حه‌له‌ب ئیسماعیلیه‌تی سه‌هره‌وه‌ردی ڕونبوه‌وه‌ و خۆشی بێ باكانه‌ قسه‌ی ده‌كرد له‌ كۆره‌كان، قازی حوكمی مه‌رگی به‌سه‌ردا پاش ئه‌و وتووێژه‌، به‌ڵام هه‌تا مه‌سه‌له‌ی كوشتنیشی زۆر باسی له‌سه‌ره‌ هه‌ندێك ده‌ڵێن به‌ "خنكاوی مرد، وهه‌ندێكی تر ده‌ڵێن به‌ شمشێر كوژرا و به‌هێزترینی ئه‌و ڕایانه‌ش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ده‌ڵێت خۆی مانی گرت له‌ خواردن وخواردنه‌وه‌ تامردن" شخصيات قلقة في الاسلام، ص ١٣٢

کەسانێکی زۆر بی ئاگایانە لەسەر ئەو مەسەلەیە سەلاحەدین تۆمەتبار دەکەن بە دژایەتی فەلسەفە بە سەرسەختی، کەچی سەلاحەدین وەک باسمان کرد، هەر ئاگاشی لە فەلسەفە و باسەکانی نەبوو، ڕاستە هەموو مەزاهیبە ئیسلامیەکان لە دژایەتی فەلسەفە و تاڕادەیەکیش زانستی کەلام و مەنتق، کەوتبونەتە ژێر کاریگەری حەنبەلیە سەلەفیەکان و ئەهلی حەدیس، سەلاحەدین کە شافیعی و ئەشعەری بوو لە ڕووی مەزهەبیشەوە نەرمکێشتر بوون لە مەزهەبەکانی تر بەرامبەر فەلسەفە و زانستی کەلام و مەنتق ، ئینجا سەلاحەدین تەنها داوای دادگایی کردنی کرد، ئەوەی حوکمی مەرگی بەسەردا قازی دیمەشق بوو، کە ئەو کاتە قازیەکان پایەی خۆیان هەبوو وەک کارمەندە دینیەکانی دەوڵەتی ئەو سەردەمە نەبوون. بێگومان هۆی کوشتن وسزادانی سەهرەوەدی فەلسەفە و کوفر نەبوو، هەرچەندە دەکرێت ئەوەش لە دژی بەکار هێنرابێت، بەڵام لە ڕاستیدا هۆکارێکی سیاسی لەدواوە بوو وەك لە ئاماژە مێژوویەکان دەردەکەوێت، کە ئەو سەر بە ترسناکترین هێزی نەیاری چەکداری ئیسماعیلیەکانی قەڵای ئەلەموت بوو.

## چاره‌نوسی كورد له‌ نێوان به‌رداشی شیعه‌ و سونـه‌دا

- **مێژوێكی به‌رده‌وام وباگراوندێكی عه‌قیدی**

زۆر جار و له‌ جۆره‌ها بۆنه‌ی ئایینی و سیاسی و كۆمه‌ڵایه‌تی قسه‌گه‌لێكی سافیلكه‌مان گوێ لێده‌بێت له‌ نه‌زان وزانا ودانا كه‌ باسی برایه‌تی شیعه‌ وسونه‌ ده‌كه‌ن: "هه‌موومان براین، هه‌مومان موسڵمانین، یه‌ك خوامان هه‌یه‌، یه‌ك كتێبمان هه‌یه‌، یه‌ك پێغه‌مبه‌ر، یه‌ك كه‌عبه‌، هه‌تا كۆتایی یه‌كه‌كان، بۆ ده‌بێت دژایه‌تی یه‌كتر بكه‌ین، زایۆنیزم و سه‌ڵیبیه‌تی جیهانی دژی هه‌ردوو لامانه‌ به‌بێ جیاوازی..."

"ئیسرائیل به‌هه‌مان شێواز و دڵه‌ڕاوكێ به‌رخورد ده‌كات له‌ ته‌ك موشه‌كه‌ شیعیه‌كانی ئێران و موشه‌كه‌ سونیه‌كانی پاكستان، به‌ڵام هێشتا چاومان ده‌نوقێنین ومه‌ترسیه‌كان وه‌ك خۆی نابینین" [شێخ یوسف القرضاوی له‌ هه‌ڵوێسته‌كانی به‌رابیدا]

مـحـمـد سـلـيـم الـعـوا له‌ كتێبی (الـعـلاقـة بـيـن الـسُنـة وألـشـيـعة) ئه‌و بیرمه‌نده‌ گه‌وره‌یه‌ به‌جۆرێك قسه‌ ده‌كات به‌ قه‌د منداڵێكی سه‌له‌فی ئاگاداری فیكری شیعی نییه‌، وقسه‌كانی هه‌مووی له‌ ده‌وری ته‌مه‌نیات وئاوات خواستن ده‌خولێته‌وه‌...

به‌ر له‌وانه‌ش سه‌ده‌ها شێخی سونی وشیعی كۆبونه‌ته‌وه‌ له‌ چوارچێوه‌ی ده‌سته‌ی نزیكخستنه‌وه‌ی مه‌زهه‌به‌كان وده‌یه‌ها لێدوانی جوان ومیانڕه‌وی لێكه‌وتۆته‌وه‌ وه‌ك فه‌تواكه‌ی شێخی ئه‌زهه‌ر محمود شلتوت به‌ جایزبوونی ئه‌نجامدانی عیباده‌ت له‌سه‌ر فیقهی جه‌عفه‌ری وجه‌ندین هه‌وڵی تری له‌بارچوو!!

وه‌ك هه‌ڵوێستی كه‌سێتی خۆم منیش هیوادارم ڕۆژێك بێت ئه‌و دوو تایفه‌یه‌ به‌ عه‌قڵیه‌تی ئه‌و لێدوانانه‌ بڕۆن به‌ڕێوه‌ ویه‌كتری ته‌كفیر نه‌كه‌ن، نه‌كوژن وجوێن وناتۆره‌ له‌یه‌ك نه‌نێن، یادی بۆنه‌ی كوشتنی حه‌زره‌تی عومه‌ر نه‌كه‌نه‌وه‌، یان به‌و دواییه‌ یادی چونه‌ ناو دۆزه‌خیش بۆ حه‌زره‌تی عائیشه‌ی خێزانی پێغه‌مبه‌ر نه‌كه‌نه‌وه‌ كه‌ به‌و په‌ڕی ده‌به‌نگی وگێلیه‌وه‌ له‌سه‌ر كێكی یادكردنه‌وه‌كه‌ نوسیبویان [عائشه في النار!!!] به‌ڵام هیوا شتێكه‌ و واقیع شتێكی تره‌... به‌ڵام وه‌ك نوسه‌ری ڕوناكبیری شیعه‌ ئه‌حمه‌د الكاتب له‌ سه‌ردێری [دور الصفويين في تأجيج الفتنة ]ده‌ڵێت: "به‌داخه‌وه‌ كه‌ ده‌وڵه‌تی سه‌فه‌وی كه‌ ده‌ستی گرت به‌سه‌ر وڵاتی فارس ل ه‌ سه‌ده‌ی ١٠ هجریدا وبه‌دواوه‌... هه‌ڵمه‌تێكی بێ سنوری له‌دژی ئه‌هلی سونه‌ت به‌رپا كرد،

وبیدعەی جوێن ونەفرەتکردنی خەلیفەکانی ڕاشدینی داهێنا ، دەوڵەتێکی دیکتاتۆری وای دامەزراند دورترین شت بوو لە سیاسەتی ئەهلی بەیت یان عەدالەتی ئیسلامدا، هەرچەندە خۆی دادەپۆشی بە توێکڵی شێوێندراوی تەشەیوع، زۆر دوور لە ڕوحی شیعایەتی یەکەم... لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوڵەتی سەفەوی لەگەڵ مێژوودا ڕۆیشت، بەڵام شوێن پەنجەی شومی لەسەر پەیوەندی برایانەی سونە وشیعەدا بەجێ هێشتوە، لە دوای خۆیدا کلتورێکی فەرهەنگی بۆگەنی پڕ لە ڕق وکینەی بۆ جێهێشتین."[1] بەڵام لەگەڵ ئەم قسە جوانانەش کە نوسەری ئەو دێرانە دەیکات، هەرکە ناوی دێت لەلایەن شیعەکانەوە هێندە جوێنی پێدەدەن و تۆمەتی بۆ دەبەخشنەوە دەڵێی باسی یەزیدی کوری موعاویە دەکەن!

من دەمێکە گەیشتومەتە ئەو قەناعەتەی کە ئەو کێشەیە تایفیە لە شەڕی جەمەل وصفینەوە ئەگەر نەڵێین لە ژێر کەپرەکەی سەقیفەی بەنی ساعدەوە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر [سەلامی خوای لێ بێت] دەستی پێکردوە کە لە سەرەتادا کێشەکە تەنها سیاسی بوو ناکۆکی بوو لەسەر ئیمامەت وخەلافەت ، هەرچەندە بەو قوڵییە نەبوو لە نێوان ئەوانەی کە پێیان دەگوتن [شیعەی عەلی] واتە گرووهی عەلی کە لەو کاتەدا کەمینە بوو و لە نێوان زۆربەی هەرە زۆری صەحابەکان وخەڵکانی تر کە حەزرەتی ئەبوبەکریان هەڵبژارد بۆ خەلافەت ولە دوایشدا حەزرەتی عومەر... حەزرەتی عەلی لە ڕۆژگاری ئەو دوو خەلیفەیەدا ڕاستە بۆ ماوەیەکی کورت بەیعەتی بە حەزرەتی ئەبوبەکر نەدا بەڵام نەك لەبەر ئەوەی خۆی پێ شایستەتر بوو بەڵکو لە کۆی ڕوداوەکان دەردەکەوێت کە توڕەبوونی ئەو لەبەر لەوێ نەبوونی ئەو بوە چونکە سەرقاڵی کاری ناشتنی پێغەمبەر [سەلامی خوای لێ بێت] بووە وپرسی پێ نەکراوە... دوایی هاتە ناو دەزگای خەلافەت وبوە ڕاوێژکاری یەکەمی حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر تا ڕادەی ئەو قسەیە بەناوبانگەی حەزرەتی عومەر کە دەڵێت: " لولا علي لهلك عمر" کە زیاتر گوزارش لە تەقدیری عومەر بۆ ڕۆڵی گەورەی حەزرەتی عەلی دەکات، کەچی لە جیاتی شیعەکان ئەو قسەیە بە یەکێك لە کارە چاکەکانی عومەر بدەنە قەڵەم، دێن سەد تەئویلی خراپ ونا مەنتیقی بۆ دەکەن لە یەکێکیاندا دەڵێن:" ئەوەتا عومەر دان بە نەزانی خۆی دادەهێنێ، ودەڵێت ئەگەر عەلی نەبوایە عومەر تیا

---

[1] السنة والشيعة.. وحـــدة الـــدين، خلاف التاريخ والسياسة. أحمد الكاتب/لندن

دەچوو، ئەی کەوابوو بۆ خەلافەتی لەو زەوت کردبوو؟؟!!" ئەوە چاکترینی تەئویلە خراپەکانە.

- **گۆڕینی ناکۆکیە سیاسیەکە بۆ ناکۆکی عەقیدەیی**

گەورەترین قۆناغی کێشەی شیعە وسونە لەو کاتە دەست پێدەکات کە شیعەگەرێتی گەورەترین وەرچەرخانی بە خۆیەوە دیت کاتی لە ناکۆکیەکی سیاسی پەیوەست بە ئیمامەت وخەلافەت گۆڕا بۆ ناکۆکیەکی عەقائیدی توندوتۆڵ وبەرنامە بۆ داڕێژراو...

لە کاتێکدا کێشەی شیعە و سونە وەک گوتمان تەنها پەیوەست بوو بە لایەنە سیاسەکەی واتە مەسەلەی خیلافەت وکێ شایستەترە ببێتە خەلیفە هەرچەندە شیعەی بەرایی تەنها لا یەنگیری حەزرەتی عەلی بوون بۆ بوونە خەلیفە، بەڵام هێشتا ئەو مەسەلەیە نە ببوە مەسەلەی کوفر وئیمان، نە تیۆری بۆ داڕێژرا بوو لە جۆری تیۆری دوازدە ئیمامی و ویلایەتی فەقیهـ ونە هیچی تر...بەڵام لە پاش شەهید بوونی حەزرەتی حوسێن بیروباوەڕێکی زۆری غەوارە ودەخیل ونامۆ بە ئیسلام دزەی کردە ناو مەزهەبی شیعە لە ڕێگای کەسانێکی دڵسۆزی ساویلکە و هەروەها غەرەزداریشەوە تا ئەو ڕادەیەی شیعەگەرێتیان لە ڕەگ وڕیشەوە گۆڕی، بەڵکو لە ڕووی وردەکاری عەقایدیەوە بوە نوسخەیەکی نوێ لە ئیسلام کە پەیوەندی پێیەوە زۆر لاوازە. وەنەبێ زەخمی ئەو کێشەیە کاریگەری لەسەر لایەنی سونیش بەجێنەهێشتبێ، بەڵام بەو ڕادەیەی کاریگەری سەر شیعە نەبوو، بەڵکو زیاتر کاریگەریەکی کاتی بوو، بۆ نموونە نەفرەت کردنی حەزرەتی عەلی لەسەر مینبەرەکان لە سەردەمی ئەمەویەکان ببوە نەریتێکی دەسەڵاتداران، وهەتا بەڵگە لەسەر ئەو حاڵەتەی نەفرەت کردنە لەسەر دەمی خودی معاویە لە صحیحی موسلیم ئاماژەی پێکراوە، بەڵام هەر لە سەردەمی ئومەویەکان خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەو دیاردەیەی لەناو برد.

تێگەیشتی ئەو ناکۆکیە مێژووییەی نێوان شیعە وسونە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ زۆر گرنگە لە تێگەیشتن لە وردبینیە سایکۆلۆژەکانی ئەو کێشەیە وچۆنیەتی تێوەنەگلان ودوورخستنەوەی زیانەکانی ئەو کێشەیە بۆ کەمترین ڕادەی، چونکە لە ڕەفتاری سەرانی کورد دەردەکەوێت کە هچ لە هەستیاری ئەو کێشەیە تێناگەن، بەڵکو حزبێکی گەورەی وەك یەکێتی لەناوچەکانیدا هێندە بە پەرۆشەوە بەتەک خورافیاتەکانی مەزهەبکە دێت، نیو هێندە بەتەک

کوردایه‌تی نایه‌ت، که‌ خه‌ریکه‌ نه‌زعه‌ی مه‌زهه‌بی هه‌موو کوردی فه‌یلی شیعه‌ له‌ کورد ده‌کات!!

ئه‌گه‌ر باسی ناکۆکیه‌کان بکه‌ین ده‌بێت له‌ ناکۆکه‌ عه‌قایدیه‌کانه‌وه‌ ده‌ست پێبکه‌ین که‌ هه‌موو به‌نده‌کانی عه‌قیده‌ ده‌گرێته‌وه‌ له‌ خواوه‌، له‌ ڕێگادا قورئان و حه‌دیس ومه‌هدی وعه‌داله‌تی سه‌حابه‌ وتاده‌گاته‌ بچوکترین به‌ندیدا.

بۆ نموونه‌ ئه‌گه‌ر له‌ خواوه‌ ده‌ست پێبکه‌ین شیعه‌ حاڵه‌تی به‌داء [البداء] بۆ خوا بڕیار ده‌ده‌ن که‌ به‌مانای به‌ [هه‌ڵه‌داچوون وپه‌شیمان بوونه‌وه‌ پاش ئه‌وه‌ی بۆی ده‌رده‌که‌وێت] که‌ ئه‌وه‌ی بڕیاری دابوو له‌سه‌ری وانه‌بوو. وه‌ک نموونه‌ ده‌رده‌که‌وێت که‌ عه‌قیده‌ی ئیمامه‌تی دوازده‌ ئیمامی هه‌تا پاش مه‌رگی حه‌سه‌ن العسکری دانه‌مه‌زرابوو، شیعه‌کان دوای هه‌ر یه‌کێك ده‌که‌وتن له‌ ناودارانی ئه‌هل البیت به‌بێ ئه‌وه‌ی لیستێکی دوازده‌ که‌سیان هه‌بێت، بۆیه‌ له‌ پاش مردنی العسکری بۆ چه‌نده‌ها گروپ دابه‌ش بوون و دیارترینیان ئیسماعیلیه‌کان و ئیمامیه‌کان بوون که‌ له‌ دواییدا ده‌بنه‌ دوازده‌ ئیمامیه‌کان.

وشه‌ی [البداء] به‌مانای بۆ به‌دیارکه‌وتن له‌ پاش شاردنه‌وه‌ی لێت له‌ قرئاندا ته‌نها بۆ حاله‌تێک دا هاتوه‌ که‌ به‌سه‌ر ئاده‌میزادان جێبه‌جێ ده‌بێت وه‌ك: [ولو أن للذين ظلموا ما في الأرض جميعا ومثله معه لافتدوا به من سوء العذاب يوم القيامة وبدا لهم من الله ما لم يكونوا يحتسبون( 47 )] الزمر [خۆ ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی ئه‌وانه‌ی که‌سته‌میان کردووه‌، خاوه‌نی هه‌ر هه‌موو زه‌وی بن، ئه‌وه‌نده‌ی تریشی له‌گه‌ڵ بێت، ئه‌وه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا هه‌ر هه‌مووی ده‌که‌نه‌ قوربانی خۆیان و هه‌مووی ده‌به‌خشن له‌ پێناوی ڕزگاریی خۆیاندا کاتێک که‌ ده‌بینن سزاو ئازاری دۆزه‌خ زۆرسه‌خته‌ و له‌لایه‌ن خواوه‌ سزاو ئازار و ئه‌شکه‌نجه‌ی وایان بۆ ده‌رده‌که‌وێت که‌ هه‌رگیز به‌ ته‌مای نه‌بوون.]

یان دروست بوونی ڕایه‌کی نوێ وه‌ك : [ثم بدا لهم بعد ما رأوا الايات ليسجننه حتى حين] یوسف [پاشان، له‌ دوای ئه‌وه‌ی که‌ به‌ڵگه‌ی زۆریان بینی له‌سه‌ر یوسف، بۆیان ده‌رکه‌وت و وایان به‌ چاك زانی تا ماوه‌یه‌ك هه‌ر به‌ندی بکه‌ن.]

به‌ هه‌ردوو ماناکه‌شی به‌مانای نه‌زانی به‌رایی دێت واته‌ به‌ر له‌ به‌دیارکه‌وتن ودروست بوونی ڕای نوێ نه‌زانی هه‌بوو.

شیعه نەك بەشەرمەوه باسی ئەو بیدائه ناكەن ، بەڵكو وەک هەر توخمێكی گرنگی تری عەقایدەكانیان سەیری دەكەن و گەورەترین پاداشتی ئەفسانەییان بۆ داتاشیوه وەك ئەو حەدیسەی "أصول الكافي" : (عن زرارة بن أعين عن أحدهما عليهما السلام قال: ما عبد الله بشيء مثل البداء، وفي رواية ابن أبي عمير عن هشام ابن سالم عن أبي عبدالله عليه السلام: ما عظم الله بمثل البداء).[خودا بەهیچ نەپەرستراوە گەورەتر لە البداء، خوا بە هیچ تەعظیم و مەزن نەكراوە وەك البداء]

ئەوە لەكاتێكدا خودا لو قورئاندا لە وەسفی خۆیدا دەڵێت: (وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها إلا هو ويعلم ما في البر والبحر وما تسقط من ورقة إلا يعلمها ولا حبة في ظلمات الأرض ولا رطب ولا يابس إلا في كتاب مبين) [كلیلی هەموو شاراوەكان و زانینی هەموو نهێنیەكان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، كەس نایانزانێت جگە لەو زاتە هەرچی لەسەر وشكانیە (لە گیاندارو بێ گیان و گیاو دارو زیندەوەرانی وردو درشت لەسەر زەوی و لە توێی خاكدا) خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاكانیشدا هەیە (لە زیندەوەری هەمەجۆرو ماسی سەیرو سەمەرە) ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەک ناكەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت، هەروەها دەنكێک یان تۆوێک لە تاریكایەكانی زەویدا نیە، ئەو دەنكە چ شێدار بێت یان وشک بێت، هیچ شتێک نیە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ) دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتیدا تۆمار نەكرابێت.]

ئەوە گەورەترین جیا كەرەوەی عەقایدیە كە دەرهەق بە زاتی خودا دێتە پێشەوە لە نێوان سونە و شیعە دا...

دووەم قورئان، سەدەها ڕیوایەتی شیعی جەخت لەسەر دەستێوەردانی قورئان دەكەنەوە حەز ناكەم بیانهێنمەوە چونكە زۆر لەوە بێ ئەرزشترن كە گرنگیان پێ بدرێت، هەتا خودی شیعە ئاساییەكان شەرمەزاری دەیانگرێت كە پێیان دەوترێ، بەڵام لە ڕاست زاناكانیان بێدەنگی دەنوێنن.

ئەو قورئانەی بەردەستیشمان بە تەواوی شێوێندراوە بە تەفسیری پەنهانی ودوور لە واقیعەوە...بەڵكو دیاردەی گرنگی نەدان بە قورئان هەتا لە حەوزە عیلمیەكانی شیعەش باوە بە دان پێدانانی خودی رەهبەر خامینەئی...

کەوابوو لەسەر قورئانیش ڕێک ناکەون لەبەر جێگرتنەوەی تەفسیرەکانی قورئان یان ریوایەتی وا کە باسی قورئانی تر دەکەن وەک [مصحف فاطمة] کە لە موعتەبەرترین کتێبی حەدیسی شیعی باسی کراوە.

لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر بەپێی ڕیوایەتی شیعی هەموویان هەڵگەڕاونەتەوە لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەر تەنها سێ یان حەوت کەس نەبێت لەوپەڕی!!

بەنسبەت کەعبەوەش، گومانم نییە کە کەربەلا لای شیعە لەو کەعبەیە پیرۆزترە کە لە ژێر دەستی وەهابیەکاندایە!!

ئەوە باسی مەهدی مونتەزیر هەر مەکە، لای سونەکان پیاوێکە لە نەسلی پێغەمبەرە وبە ئاسایی لە دایک دەبێت وحوکمی قورئان وئیسلام دەگەڕێنێتەوە جیهان پڕدەکات لە داد وعەدل پاش ئەوەی پڕاوپڕ دەبێت لە جەور وستەم، کەچی مەهدی یەکەی شیعە ئەوە زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵە لە ئەشکەوتەکەی یان چاڵەکەی سامەرا چاوەڕی دەکات وکوڕی حەسەن العسکری یە وبەڵام دایکی ناوی نەرجسە لە نەوەی [شمعون الصفا] یە کە حەواریەکی حەزرەتی مەسیح بوو وکچی قەیسەری ڕۆم بوو لە سەردەمی حەسەن العسکری دا، ئینجا بەشی هەرە گەورەی گەڕانەوەکەی تەرخان دەکات بۆ رق وقینە وتۆلە سەندنەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر [د.خ] کە گوایە هەقی ئیلاهی عەلی یان خواردوە لە بوونە خەلیفە وئیمامی موسڵمانان!! یەکەم کەسانێکیش کە لە قەبر دەریان دەهێنێت حەزرەتی ئەبوبەکر وعومەر ودایکی موسڵمانان عائیشەیە، کە لە سێدارەیان دەدات بە مردوویی!!

لای سونەکان مەهدی نە بەشێکە لە عەقیدە نە ئەو گرنگیەی هەیە وکەسیش بە شەو ورۆژ چاوەڕێی ناکات دەرکەوێت وهیچ کارێکیانیش نەوەستاندوە تا دێت وەک نوێژی هەینی وجیهاد وهەر کارێکی تر، کەچی مەهدی یەکەی شیعە بەشێکی هەرە گرنگی عەقیدەیە شەو رۆژ دوعای [عجل الله فرجه] واتە خوا هەرچی زوو ە ئازادی بکات، بۆ دەکەن

بێگومان خاڵی جیاوازی تریش هەیە بەڵام بەوەندە بەس دەکەین چونکە سەروزیادن کە بیسەلمێنن جیاوازی نێوان شیعە وسونە وەک جیاوازی نێوان دوو ئایینە نەک دوو مەزهەب...

هەر لەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی شیعی ئێرانیش ئەو دەوڵەتە زۆر دڵسۆزانە کاردەکات بۆ بڵاوکردنەوە ودەعوت کردن بۆ مەزهەبە وهەموو سەروەت وسامانی ئەو وڵاتە دەوڵەمەندەی خستۆتە ڕاژەی شیعەگەرایەتی، هەر دوێنی حسن نصر الله گوتی:"ئێمە پێویستیمان بە بازرگانی کردن نییە بە مادە هۆشبەرەکان، پارەی ئێرانمان وای کردوە حەوجەی ئەو کارانە نەبین"

لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەدا تاڕادەیەک دەولەتی عەرەبی سعودی وەستاوەتەوە و بەربەرەکانێی دەعوەی شیعەگەرایەتی کردوە بە دەعوەی سەلەفیەت کە دەڵێی تەنها دامەزراوە بۆ بەربەرەکانیکردنی شیعەگەرایەتی...

- **هەناردە کردنی شۆڕش ونانەوەی تەنگژەی حوجەتی**

لە ئەنجامی ئەو هەموو جیاوازیە عەقیدەییەی کە هەیە لە نێوان شیعە و سونە وەک دوو مەزهەب و لە ئەنجامی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی شیعی ئێران، ئەو دەوڵەتە کە بەداخەوە لەسەرەتاکانیدا ویستی تەنها ڕووی شیعەگەرایەتی عەلەوی نیشان بدات بە پێی دابەشکردنەکەی بیرمەندی گەورەی ئیران عەلی شەریعەتی[ مەبەست لە شیعەگەرایەتی عەلەوی، ئەو شیعایەتییە یە کە بەر لە هاتنی دەوڵەتی سەفەوی هەبوو، بەبێ جوێندان ونەفرەتکردن لە سەحابە، وبەبێ جیاوازی عەقایدی وتەکفیر کردنی یەکتر]، خەڵکێکی زۆر لە نێو سونەشدا تا ئاستی گەورە بیرمەندانی سونیش پشتگیریان لەو شۆڕشە کرد، بەڵام پاش ماوەیەک خەڵکێکی زۆری سونی لەو شۆڕشە تەکینەوە کە ڕووە مەزهەبیەکەیان بە ئاشکرا بۆ بەدیارکەوت، هێندەشی پێ نەچوو کورد لە ئێراندا زۆر زوو بۆیان دەرکەوت کە ئەو کۆماری ئیسلامییە تەنها زیندوو کردنەوەی دەوڵەتی سەفەوییە بە هەموو حیقد وقینە وهەڵمەتی مەزهەبیەوە!

هەوڵدانی ئێران بۆ نانەوەی تەنگژە لە سەرتاسەری جیهان، تەئکید لەسەر ڕاستیەک دەکاتەوە کە ئەو دەوڵەتە لەوەتی هەیە بە پەیڕەوانی ڕێبازی [حوجەتیەکان] بەڕێوە دەچێت، مەبەست لە **حوجەتیش کە لە وشەی [الحجة] هاتوە ئاماژەیە بە ئیمام مەهدی، ئەوەش بزوتنەوەیەکە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو دامەزرا، لەلایەن آیة الله الشیخ محمود الحلبی دامەزا.**

**حوجەتیش : ئەو تیۆرەیە کە باوەڕی بەوەیە بڵاوبوونەوەی شەڕ وگەندەڵی و جەور وستەم چاکترین ڕێگایە بۆ بەدیارکەوتنی مەهدی مونتەزیر[2] . شێوازی ئەحمەد نەژاد لە دواندنی مەهدی ولێدوانەکانی هەتا لەناو کۆڕی نەتەوە یەکگرتوەکان مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو قەناعەتە کە خودی ئەحمەدی نەژادیش حوجەتیە، نەژاد لە نامەیەکدا بۆ خەزوری کورەکەی دەنوسێت: " ئێمە لە سەردەمی بەدیارکەوتنداین ــواتە بەدیارکەوتنی مەهدی ــ تۆش عاشقی ئیمامی زەمانی وباوەڕت پێی هەیە" هەر لەپاش هەڵبژاردنەوەی لە ٢٠٠٥ نەژاد گوتی:" ئیمانداران بە تەعالیمە ئیسلامیەکان هەموو کارێک دەکەن پێیان بکرێت بۆ خێراکردنی بەدیارکەوتنی مەهدی"!! هەتا خەڵکی ئێران بە گاڵتە دەڵێن نەژاد لە دانیشتنەکانیدا کورسیەکی بەتاڵ بۆ ئیمامی زەمان دادەنێت، ولە نان خواردنەکانیشیدا دەفرێکی [قاپێکی] بەتاڵ بۆ ئیمامی زەمان دادەنێت!**

ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووی شیعەگەرایەتی سەفەوی بۆ خەڵک دەردەکەوت لە ڕێگای بە شیعەکردنی خوێندکارە سونییە سەرسام بوەکان بە شۆڕشی ئیسلامی کە دەچوونە ئێران یان بانگهێشت دەکران بۆ خوێندن لەوێ، یان لە ڕێگای ئەو هەموو کتێبانەی کە باسی لە کەسانێك دەکرد مەزهەبی خۆیان دەگۆڕی لە سونییەوە بۆ شیعە پاش ئەوەی بۆیان دەدەکەوت کە سونەگەرێتی یانی گومڕایی وەک کتێبگەلێکی وەك [لاکون مع الصادقین، ثم اهتدیت، السیعة هم اهل السنة وهتد...!! لە نوسەرێکی عەرەبیم گوێ لێبوە دەڵێ کاتی خۆی بۆ کۆنگرەی یەکێتی ئیسلامی شیعە وسونە داوەت کرابوو کە سەدان نوسەر وبیرمەندی سونی و شیعی بەژداریان تێدا کردبوو، کەچی هەر لەبەردەمی هۆڵەکە کتێبی شەری مەزهەبی بە خۆڕایی وبەلاش دەدرایە خەڵک!!!

لەوانەیە خەڵك بڵێن کە خەتابار هەر ئێران نییە وسعودیەش خەتابارە کە هەمان شەڕی مەزهەبی دەکات لە دژی شیعەگەرایەتی، لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوانەی لە ڕۆژگاری حوکمی شای ئێراندا ژیاون چاک دەزانن کە جیهانی ئیسلامی نە ئەوەندە شەڕە مەزهەبیە ونە ئەوەندە حەساسیاتە تائیفیەی تێدا بوو، نە ئەوەندە کتێبی دژ یەک دەردەکرا، نە کەس ئاگاداری سەلەفیەت بوو، نە ئەو هەموو ڕۆژنامە و گۆڤار وکەناڵە ئاسمانیانە تەرخان کرا بوون بۆ شەڕی تایفی ومەزهەبی شیعە وسونە.

---

[2] **الحجتية: القتل والدمار والحروب سبيل لظهور المهدي**، المصدر : للكاتب الشيعي جعفر رجب، http://www.almhdi.com/viewnews23.html

دوایی دەوڵەتی سعودی وەک ئێران دەوڵەتێکی عەقایدی نییە ولەبەرەی ئیسلامی سیاسیدا نییە وناکۆکە بە هەموو گروپێکی ئیسلامی سیاسی، کەچی ئێران خۆی بەخاوەنی شۆڕشی ئیسلامی دەزانی دەبوایە ئەگەر شەڕی مەزهەبیشی پێفرۆشرابایە وەڵامی نەدابایەوە، نەک خۆی دەست پێشخەر بێت...

شیعەگەرایەتی ئەمڕۆ بەداخەوە لە چەندین شوێنی گرنگ وهەستیار چەقی گرژی دروست کردوە سەرەڕای خودی ئێران لە لوبنان لە سوریا کە لەو ڕۆژگارە خەریکە شەرەکە دەبێتە شەڕی مەزهەبی شیعە وسونە، کاتێ میلیشیاکانی حزب الله شیعی وهەزاران پاسداری ئێران بە سەرۆکایەتی ئاغای سلێمانی بەژداری دەکەن لە سەرکوتکردنەوەی خەڵکی سونی سوریا. لە لوبنان حزب الله شیعی دەوڵەتێکە لە نێو دەوڵەتدا وهیچ مانایەکی بۆ دەولەت بوونی لوبنان نەهێشتۆتەوە. لە پاکستان زەبر وەشاندنی مەزهەبی شیعە وسونە لە یەک گەیشتۆتە سنوری بێهودەیی وعەبەسیەت کە تێیدا حورمەتی مزگەوتەکانی یەکتریش ناپارێزن. لە بەحرەین شۆڕشێکی مەزهەبی بەرپاکرا لە ژێر پەردەی بەهاری عەرەبی بەڵام خەڵک هەر زوو پێیان زانی. من لە لەندەن لەناو خەڵك لە هاید پارک کاتێ کابرایەکی شیعەی بەحرەینی قسەی بۆ خەڵک دەکرد وباسی مەزلومیەتی شیعەی بەحرەینی دەکرد، پێیم گووت: من لەگەڵ مافی خەڵکی زۆربەی بەحرەینم کە شیعەن، بەڵام تۆ دەتوانی ئیدانەی ئەو قەتلوعامەی خەڵکی سوریا بکەیت لە دژی بەشاری عەلەوی؟!! بێگومان نەیتوانی هەر ورتە ورتی دەکرد وڕایدەکرد لە وەڵامدا!

لە یەمەن حوسیەکان خەریکە گڕ لە سەرتاسەری یەمەن بەردەدەن بە پاڵپشتی ڕاشکاوی ئێران، هەرچەندە یەمەن شیعەی زەیدین وزۆر میانڕەون زۆر جار کە سەرنجی بیروڕاکانیان دەدەم دەڵێم دەڵێی هەموو لایەنە چاکەکانی شیعە و سونەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، بەڵام عەقڵیەتی سەفەوی ئێرانی ڕقی لەو تەباییەیە ئەوەتە تیۆری گەڕانەوە بۆ ئەسڵ لەگەڵ زەیدیەکانیش بەکار دەهێنێت وەك چۆن لەگەڵ عەلەویەکان بەکاری دەهێنێت وخەریکە زەیدیەکانی یەمەن دەکاتە دوازدە ئیمامی کە ئەوەش کارەساتێکە بۆ ئیسلام و خودی شیعەگەرێتیش، چونکە دەکرا بە پێچەوانەوە دوازدە ئیمامی یەکان سودیان لە فیقهی زەیدیەکان وەرگرتبا، بەڵام ڕووی پارە وهەژاری ڕەش بێت کە ئەمڕۆ پارەداری نابینا بێپارەی چاو ساغ دەبات بەڕێوە....

کێشەکە گواستراوەتەوە هەندێك وڵات کە تا دوێنێ یەك تاقە شیعەیشی تێدا نەبوو وەک میسر کە تەنها سەردەمانێك دەوڵەتێکی شیعی فاتیمی [٩٠٩ – ١١٧١ میلادی] تێیدا حوکمی دەکرد بەسەر زۆربە سونیەکەی خەڵکی میسر وەک سوریای ئەمڕۆ، کە لە کۆتاییدا سەلاحەدینی ئەیوبی ئەو دەوڵەتەی لەناوبرد تا ئەمڕۆش شیعەکان جوێن و نەفرەت لە سەلاحەدینی ئەیوبی دەکەن چونکە دەوڵەتە گەندەڵەکەی فاتیمیەکانی ڕوخاندوە... ساڵی پار ڕۆژنامەی [المصریون] لە ٢٠١١/١٢/١٣ ڕاپۆرتێکی ترسناکی بڵاوکردەوە دەربارەی دەعوەی شیعەگەرایەتی لە قوتابخانەکانی میسر لە ئەنجامی سکاڵای دایکان وباوکان کە منداڵەکانیان فێری چەمکە شیعیەکان دەکەن!

لە مەغریب لەبەر هەژاری توانیویانە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک بکەنە شیعی تا ڕادەی ئەوەی دەوڵەت لەبەر ڕەخنەی زاناکان وخەڵک سەفارەتی ئیرانی داخست... لە تونس گومان هەیە هەتا راشد غەنوشی تەشەیوعی کردبێت لەبەر ئەو هەمو مەدح وسەنایەی ئێران دەکات هەتا یەکێک لە سەرکردەکانی نەهزە [موبارەك بەعداش] کاتێ دەبێتە شیعی دەڵێت: کە هەواڵی وەرگەڕانی بۆ شیعە دەگەیەنێتە سەرکردەکانی نەهزە، راشد غەنوشی گوایە پێیدەڵێت: پیرۆزە، دەڵێ پێیم گوت دەربارەی سێ شت پرسیارت لێدەکەم ئەگەر وەڵامت دامەوە واز لە شیعایەتیدەهێنم!

غەنوشی گوتی: پرسیارەکانتم ناوێ، چونکە ئێمە باری شیعە نابەین لە وتوێژ وگفتوگۆدا، ئەوانە حزبیکن بیروباوەریان لەسەر بنچینەیەکی توند دامەزراندوە لە کۆنەوە لە سەردەمی حەزرەتی عەلیدا!!! هەرچەندە گومانم لەڕاستی ئەو قسەیە هەیە، ئەوە ئەگەر ڕاست بێت کارەساتە، تونس بکەوێتە دەست کەسێکی وا نەشارەزا.!

وجەزائیر ومۆریتانیا و نەیجێریاش بە ڕادەی جیاواز کێشەی مەزهەبی شیعە وسونەی تێدا دروست بوە، هەرچەندە شیعە لەو وڵاتانە ١% دانیشتوانیش نابن!!

لە تورکیا هەرچەندە ئامارێکی زانستی نییە بەڵام تەقدیراتەکان باسی نزیکەی ٤ – ١٠ ملیۆن عەلەوی دەکات کە ناسراون بە زۆر دووری لە دین، هەتا مزگەوتیشیان نییە وبەشێکی زۆریشیان کوردن، دەمێکە ئێران لەسەر ئەو تایفەیە ئیش دەکات هەرچەندە شیعەی بەرایی ئیمامی ئەو عەلەوییانەی بە کافر دەزانی، چونکە بەڕاشکاوی عەلی بە خوا دادەنێن لە بیروباوەڕ ودەقەکانیاندا، بەڵام لای شیعە چاکترە عەلی بەخوا دابنێیت بەڵام سونی

نەبیت وپێت وابێت ئەبوبوکر وعومەر وعوسمان لە پێش عەلیدا دێن بە پێی زنجیرەی سونی!! هەروەها شیعەی جەعفەری باوەڕی بە تیۆری گەڕانەوەی لق هەیە بۆ ئەسڵ، واتە خۆی وەك شیعەی جەعفەری پێ ئەسڵە و عەلەویەکانی پێ لقە وهەوڵی گەڕانەوەیان دەدات بۆ ئەسڵەکە، لە جیاتی تەکفیر کردن و نەفرەت کردنیان، ئەوەش بێگومان زیرەکیان دەردەخات، ئەوە نییە سەلەفیەکان خۆمان خەریکە هەموو ئۆمەتی سونی وشیعی پێکەوە تەکفیر دەکەن!!

عەلەویەکانی نێو موخابەراتی تورکیا لەو دواییە سەرۆکێکی سوپای ئازادی سوریای [محمد حسین هرموش] ی تەسلیم کردەوە بە ڕژێمی سوریای عەلەوی!

لە سوریاش هەرچندە عەلەویەکان کەمینەن ڕێژەیان لە چاکترین تەقدیردا ناگاتە ١٠% بەڵام لە ڕێگای سوپا وکودەتای سەربازی دەستیان بەسەر چارەنوسی ئەو وڵاتە داگرتوە بۆ زیاتر لە ٤٠ ساڵ ودەرگاکانیشیان بەو دواییە لەسەر پشت کردۆتەوە بۆ چالاکی تەبشیری ودەعەوی شیعەگەرایەتی وپارە وپولێکی زۆریشی تێدا هەڵدەرێژن، بەڕای من یەک لە سەرەکیترین هۆکاری شۆڕشی سوریا کە لە شاری دەرعا سەری هەڵدا، وەڵامدانەوەی ئەهلی سونەی ئەوێیە لە دژی بەرفراوترین هەڵمەتی شیعەگەرایەتی کە لە دەرعا بەڕێوە دەچێت وبە یارمەتی وموبارەکەی ڕژێمی بەعسی عەلمانی عەلەوی نەتەوەیی وعروبی!! ئەوەی قەبارە وکاریگەری هەڵمەتی شیعەگەرایەتی بزانێت، سەری سوڕنامێنێت بۆچی خەڵکی سوریا بەو شێوەیە خۆکوژییە سورن لەسەر ڕوخانی بەشار ئەسەد، کە لە باوکی حافز ئەسەد بە پەرۆشترە بۆ گرتنە باوەشی جموجۆڵی شیعەگەرایەتی!! لەسەردەمی بەشاردا مەواکیبی حوسەینی شیعە عێراقی ولوبنانی وکەمینەیەکی شیعی سوری کە ڕێژەیان ٠،٤% خەڵکی سوریایە بەناو دیمەشق وبەبەردەم مزگەوتی ئومەوی مێژوویی وبەناوبانگدا تێدەپەڕی بەو پەڕی ئیستفزازەوە وبە نەفرەت کردن نەک لە یەزید و موعاویە، بەڵکو نەفرەت کردن لە حەزرەتی ئەبوبەکر وعومەر وعائیشە وحەفسە بە پاراستنی موخابەرات وهێزە ئەمنیە عەلەویەکان!! ئەو ڕەهەندە بابەتیکە پێویستی بە باسێکی سەربەخۆ هەیە بە نیازم لە ئایندەدا لەسەری بنوسم[3]

---

[3] چاکترین بابەت کە لەو بارە نوسرا بێت کتێبێکە بە ناوی:
البعث الشيعي في سورية (1919-2007) لە نوسینی [المعهد الدولي للدراسات السورية] لەو لینکە دەتوانی کتێبەکە بخوێنیتەوە:
http://www.forsyria.org/newsletterpdf/ShiiasmInSyria_1.pdf

- **كاردانەوەی سونی**

له‌ بەرانبەر ئەو هەڵمەتە بەهێزەی شیعەدا، جیهانی سونی كە زیاتر خۆی له‌ دوو دەزگادا دەبینێتەوە، یەكەمیان: ئەزهەر كە نوێنەری ئیسلامێكی میانڕەوی سونی دەكات ودوەمیان باڵە توندەكەی سەلەفیەتی سونی كە سعودیە سەرپەرشتی دەكات، لەبەر ئەوەی تەنها بە كاردانەوە كاردەكەن هەست بە بێ سەروبەریەك دەكەیت له‌ چالاكیەكانی.

جارێ ئەزهەر تا لەژێر دەستی عبدالناصر وسادات وموبارەكدا بوو، بە بچوكترین ڕۆلی خۆی هەلنەدەستا، بەڵام لەوەتی شێخ احمد طیب بۆتە شێخی ئەزهەر ئەو پیاوە بەڕاستی سەلماندویەتی كە زۆر وردبین ومیانڕەو وبیرمەندێكە له‌ ڕیزی یەكەمدا، كاتێ هەستی بە چالاكیە نامۆكانی ئێران كرد له‌ میسر له‌ ژێر پەردەی خۆشەویستی ئەهلی بەیت وزنجیر له‌ خۆدان له‌ مزگەوتی حوسێن له‌ قاهیرە وچالاكیەكانی ناو قوتابخانەكان وەك ئاماژەمان پێكرد، بەیانێكی زۆر بەهێزی دەركرد له‌ دیسەمبەری ٢٠١١ له‌ دژی چالاكی شیعەگەرایەتی وگوتی میسریەكان له‌ ژێر سایەی مەزهەبی سونیدا هەموو دەسكەوتە مێژوییەكانیان هێناوەتە دی له‌ پاراستنی جیهانی ئیسلامدا كاتێ سەركەوتن بەسەر تەتارەكان، ودەركردنی خاچ پەرستەكان له‌ خاكی پیرۆز بە سەركردایەتی سەلاحەدینی ئەیوبی قارەمان....دوپاتی كردەوە كە دژی هەر هەوڵێكی شیعەگەرایەتی دەوەستن له‌ میسر.

ئەوەی كە بە چڕی بەربەرەكانێی شیعەگەرایەتی دەكات سەلەفیەكانی سعودیەن لەوانەی له‌ دەزگا ئاینیە حكومیەكان و غەیرە حكومیان... ئەو وڵاتە له‌ ترسی پەل هاوێشتنی ئێران بۆ كەنداو له‌ ڕێگای كەمایەتیە شیعەكانی كەنداو و له‌ سنوری عێراقدا كە ئەمڕۆ بە ئیمتیاز شیعییە، شەڕێكی مەزهەبی توندی شیعەگەرایەتی دەكات بە چاپكردنی كتێب ودامەزراندنی كەنالی ئاسمانی وگۆڤار ونامیلكە وشتی تریش، بەڵام وەك ئاماژەمان پێكرد چونكە دەوڵەتی سعودی وەك ئێران دەوڵەتێكی عەقایدی نییە ولەبەرەی ئیسلامی سیاسیدا نییە ودژی هەموو گروپێكی ئیسلامی سیاسییە، بۆیە ئەگەر خەڵكەكە له‌ سروشتی خۆیدا سونی نەبان وفیكری ئێرانی شیعیش هێندە نا مەنتیقی نە بوایە كە تەنها بریتیە له‌ بەشینەوەی جوێن وحیقد بەسەر ئەم وئەو، ئەوە لەوانە بوو سەركەوتن بۆ شیعەگەرایەتی بوایە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو پارە وسامانەی كە سەرفیشی دەكەن بەرهەمێكی ئەوتۆیان دەست نەكەوتوە،

هەرچەندە وەک هەمیشە عادەتیانە شت زۆر گەورە دەکەن و ئیدئعای ئەوە دەکەن کە خەڵکێکی بێشوماریان کردۆتە شیعی لە نێو ئەهلی سونەدا!!

## • عروبەتی سونەکان و میللەتگەرایی شیعەکان

زۆر جار گوێمان لێ دەبێت کە تەیاری عروبەت لە ناو شیعەدا لاوازە، بەڵام هەمان تەیار لە ناو سونەدا بە هێزە، بەڵام بە وردبونەوەیەک دەردەکەوێت کە ئەو مەقولەیە بێ کەموکورتی نییە..

بە نسبەت نا عروبەتی ڕەوتی شیعەگەرایەتی تا ڕادەیەك ڕاستە هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ بەژداری کەسانێکی نا عەرەب بەتایبەتی لە فارسەکان وعەجەمەکان لە دامەزراندنی پێگەکانی ئەو مەزهەبە، هەروەها لەبەر لەباوەش کردنی خەڵکی فارس بۆ دەعوەی ئەهلی بەیت کە هەتا عەباسیەکانیش لەسەر شان وپیلی ناعەرەبەکانی وەک کورد وفارس هاتنە سەر سەکۆی خیلافەت...بێگومان کاریگەری فارسی بەسەر جیهان بینی شیعیدا ناکرێت نکوڵی لێ بکرێت تا ڕادەی ئەوەی هەندێک حەدیسیان بەدەوی ئیمامەکانیان دروست کردوە کە گوایە خودی مەهدی لەوەچەی یەزدجەردی فارسەکانە.

عەلامە النوری الطبرسی لە کتێبی [النجم الثاقب فی احوال الامام الحجة الغائب] شتێکی زۆر سەیر باس دەکات، دەڵێت یەک لە نازناوەکانی ئیمامی زەمان نازناوی پاشای یان ڕزگارکەری مەجوسە [خسرو مجوس] ١/ ١٨٥.!!![4]

لە [بحار الانوار] المجلسی ئەو بیرۆکەیە ڕوندەکاتەوە کە ڕیوایەت دەکات لە نوشجان کوری البودمردان دەڵێ: کاتێ فارس دۆڕا لە شەڕی قادسیە و هەواڵەکە گەیشتە [یزدجرد کوری شەهریار].. ڕای کرد ولە دەرکی دیوانەکەی گوتی: السلام علیک ئەی دیوان، ئەوە من بەجێت دەهێڵم، بەڵام یان بەخۆم دەگەڕێمەوە بۆت یا پیاوێك لە وەچەکانم دێتەوە بۆت هێشتا سەردەم وزەمانی نەهاتوە...سلێمان دەیلەمی دەڵێت: چومە خزمەت ئەبو عبدالله پرسیارم لێیکرد: مەبەستی چییە لە [یا پیاوێك لە وەچەکانم دێتەوە بۆت]؟ گوتی: ئەوە صاحێبی زەمانە

[4] **النجم الثاقب فى احوال الامام الحجة الغائب،** ((السابع والأربعون: " خسرو". وقد ذكر في (الذخيرة) و (التذكرة) وذكر في كتاب جاويدان أن اسمه (خسرو مجوس).)) ١/ ١٨٥.

له شەشەم وەچەی منه که له پشتی یزدجەرد کەوتۆتەوە وکوری ئەوە. [بحار الانوار ٥١/ ١٦٣ -١٦٤] کەوابوو کوڕی پاشای فارس دەگەڕێتەوە بۆ تۆڵەی باوکانی له عەرەبدا!!!

هەر له کتێبی [الغیبة] ی محمد بن ابراهیم النعمانی، ص ٢٣٤، عن ابی عبدالله علیه السلام قال: [اذا خرج القائم لم یکن بینه وبین العرب و قریش الا السیف،،،] واته که مەهدی هات تەنها شمشێری له نێوان خۆیی وعەرەب وقورەیش له نێواندایه!!

بیرمەندێکی گەورەی ئێرانی صادق زیبا کلام، له دوو چاوپێکەوتندا لەگەڵ هەفتەنامەی «صبح آزادي» که بەو دواییه کردویەتی دەڵێت: وێنەی عەرەب له یادەوەری نەتەوەیی و ئایینی دا هەمان شته وهەمان نێگەتیڤە، "وابزانم زۆر له ئێمەمانان ڕقی له عەرەبه له دیندار و عەلمانیەکاندا" له یادەوەری دینداری فارسدا عەرەب بریتیه: "له سونی ، ناسیبی، ئەمەوی، عەباسی، ئەعرابی، مونافیق، دوژمنی ئەهلی بەیت، وەهابی ، تیرۆریست، بەعسی، صەدامی...!"

له یادەوەری نەتەوەیی فارسیدا عەرەب بریتییه: " پێخواس، پیس، چەپەڵ، دزێو، ڕەش پێست، تینوی خوێن، دڵ ڕەق، دڕنده، بێزراو، ئەهریمەن، دز، مارمیلکه خۆر، داگیرکەر، کچ زیندەبەچاڵ کەر،.."

زیبا کلام: " لەوە دەچێت که ئێمه وەک ئێرانی نوشوسته مێژوییەکانمان له قادسیه بەر له ١٤٠٠ ساڵ لەبیرنەکردوە"!![5]

عروبەت وناعروبەتی سونه و شیعه لەو چوارچێوەیه دەبێت بخوێندرێتەوە، نەك شیعه وەک مەزهەبێکی ئینسانی و مرۆدۆست وێنا بکرێت، هەموو دەزانین که لای شیعه بەپێی ڕیوایەتەکانیان مەکروهە تیکەڵاوی لەگەڵ کورد بکرێت وژن وژن خوازیان لێنەکرێت [باب کراهة معاملة الاکراد ومخالطتهم] ، هەروەها لەگەڵ پێست ڕەشەکانیش، له هەموی

---

[5] الشرق الاوسط فی ٢٠١١/١٢/١٩. صورة العربي في المخيال الفارسي، محمد جميح.

نامرۆیانەتر ڕیوایەتەکان دەڵێن نابێت مامەلە لەگەڵ دەردەدار وکەمئەندامەکان مەکەن چونکە گەورەتین ستەمە [باب كراهة معاملة ذوي العاهات]![6]

چونکە شیعەی عەرەب پەڕاوێزخراون ولەژێر کاریگەری شیعەی فارسەکاندان ولە ژێر کاریگەری ئەو ڕیوایەتانە دان، سەرەڕای کاریگەری رەوتی عروبەتی نەتەوەیی عەرەب کە سەدام گوزاریشی لێدەکرد، ناعروبەتی شیعەی عێراق هیچ مسۆگەریەک نییە بۆ مرۆڤایەتی ڕێبازیان، چونکە تەنها عەرەب فاشیەتی عروبی دروست ناکات، شۆڤێنیەتی مەزهەبی وفارسیش لەئارادایە، ئەوە نییە کوردە فەیلییەکان بە ملیۆن لە بەغدا و خوارووی عێراقن کەچی دەنگێکیان ناچێتە گیرفانی کوردەوە، چونکە وەک چۆن عەرەبی شیعە وەلایان بۆ مەزهەبە زیاتر هەرواش کوردی شیعە وەلایان بۆ مەزهەبە زیاتر لە نەتەوەکەی خۆیان.

هەر بۆیە ئەگەر بڕوانینە مێژووی دوور دەبینین کورد لە ئێران مەینەتیەکی زۆری دیوە لەسەر دەستی سەفەویەکان کە هەوڵێکی زۆر دۆزەخیانەی دا بۆ بە شیعەکردنی کورد وئەوانەشی ڕەتیان کردەوە بە کوشتن وتاڵانکردن و نەفی کردن تێیان کەوتن، کوردەکانی

---

[6] لە کتێبی تفصيل وسائل الشيعة إلى تحصيل مسائل الشّريعة - ج ١٧، الشيخ محمد بن الحسن الحرّ العاملي، دوو باب بەدوای یەک هاتوە:

٢٢ ـ باب كراهة معاملة ذوي العاهات
[ ٢٢٨٧٦ ] ١ ـ محمد بن يعقوب ، عن أحمد بن عبدالله ، عن أحمد بن أبي عبدالله ، عن غير واحد من أصحابه ، عن على بن أسباط ، عن حسين ابن خارجة ، عن ميسر بن عبد العزيز قال : قال أبو عبدالله 7 : لا تعامل ذا عاهة فإنهم أظلم شيء.
[ ٢٢٨٧٧ ] ٢ ـ وعن عدة من أصحابنا ، عن أحمد بن محمد رفعه قال : قال أبو عبدالله 7 : احذروا معاملة ذوى العاهات فإنهم أظلم شيء.
ورواه الصدوق مرسلا (١).
ورواه في ( العلل ) عن محمد بن الحسن ، عن محمد بن يحيى ، عن محمد بن أحمد بن يحيى ، عن أحمد بن محمد مثله (٢).
[ ٢٢٨٧٨ ] ٣ ـ وعنهم ، عن أحمد بن محمد بن خالد ، عن عدة من أصحابنا ، عن علي بن أسباط ، عن حسين بن خارجة ، عن ميسر بن عبد العزيز قال : قال لي أبو عبدالله: لا تعاملوا ذا عاهة فإنهم أظلم شيء.
٢٣ ـ باب كراهة معاملة الاكراد ومخالطتهم
[ ٢٢٨٧٩ ] ١ ـ محمد بن يعقوب ، عن محمد بن يحيى وغيره ، عن أحمد بن محمد ، عن علي بن الحكم ، عمن حدثه ، عن أبي الربيع الشامي قال : سألت أبا عبدالله ، فقلت : ان عندنا قوما من الاكراد وإنهم لا يزالون يجيئون بالبيع فنخالطهم ونبايعهم ، فقال : يا أبا الربيع لا تخالطوهم ، فإن الاكراد حي من أحياء الجن ، كشف الله عنهم الغطاء فلا تخالطوهم.
ورواه الشيخ بإسناده عن أحمد بن محمد بن عيسى مثله (١).
[ ٢٢٨٨٠ ] ٢ ـ محمد بن علي بن الحسين بإسناده عن أبي الربيع الشامي ، عن أبي عبدالله 7: أنه قال : لا تخالط الاكراد فإن الاكراد حي من الجن كشف الله عنهم الغطاء.
وفي ( العلل ) عن محمد بن الحسن ، عن الحسن بن متيل ، عن محمد بن الحسن (١) ، عن جعفر بن بشير ، عن حفص ، عمن حدثه ، عن

خوراسانیش نمونەی زیندون لەو هەڵمەتە سەفەوییەدا. ئەمڕۆش هەموومان ئاگادارین بە وەزعی کورد لە ئێراندا، هەرچەندە ئێران عروبی نییە، بەڵام ترسناکی مەزهەبیەتی سەفەوی کەمتر نییە لە عروبەتی فاشی.

مەینەتی کورد لەسەر دەستی بەعس بە هیچ جۆرێک ناکرێت یەکسان بکرێت بە دەستی سونە، چونکە بەعسیەکان کەسانێکی فاشی رەفتار و دوورە دین بوون، بەڵام شیعەکان لەبەر سایکۆلۆژیەتی قورس بوویان بە چەوسانەوەی بێ پسانەوەی خەلافەتی سونی هەموو سونیەک ئەگەر فڕیشی بەسەر دین ومەزهەب نەبێت پێیان سونییە، هەتا صەدامیش بەو شێوەیە دەخوێننەوە، هەتا کاتێ عەرەبە سونیەکان دەکوژن لە بەغدا وشوێنی تر لەسەر لاشەکان دەنوسن، لەپێناو تۆڵەکانی حوسێندا! [یا لثارات الحسین].

فەرمانڕەواکانی عێراقی ئێستا کە شیعەن سەد قات زیاتر لە صەدام گوزارش لە مەزهەبیەتی شیعەگەرایەتی خۆیان دەکەن، بەو سیاسەتە دەستی پێکردنە و کێشەنانەوە وبردنەوەی کات بۆی هەیە ئەگەر بۆیان بلوێت دەست لە هیچ نەپارێزن بەتایبەتی وێنەی کورد لە یادەوەری شیعە زۆر چاکتر نییە لە وێنەی عەرەب...

ئەگەر رۆژگارێک ستەمی سیاسی کۆمانیکردبێتەوە ئەوە بە هیچ جۆرێک مانای هەتا سەرچوونی ئەو هاوپەیمانیەتە نییە. ئەگەر ئێران هەڵوێستی بە تەواوی گۆڕی لە کوردستانی عێراق، ئەو کاتە دەزانین کە شیعەی عێراق چەند ساحێبی پەیمانی خۆیان دەبن، دوایی کوردستان هاوتەماس و هاوسنورە لەگەڵ ناوچە عەرەبیە سونیەکان بۆیە کێشەکانمان زیاتر لەگەڵ ئەوانە، گومانم نییە ئەگەر هاوسنوری کەربەلا باین ڕوێکی خراپتری شیعەمان دەدیت.

سەبارەت بەو فەتوایانەی کە گوایە زانایانی شیعە داویانە لە بەرژەوەندی کورد، مرۆڤ ناتوانێت ناکەس بەچەبێ ولە سفری بدات، بەڵام پێویستە بەشێوەیەکی بابەتی بخوێندرێتەوە، بەڕای ئێمە ئەو فەتوایانە دەگەڕێنەوە بۆ چەند هۆکارێک، یەکەم: سروشتی دەزگای ئایینی شیعی ئازادترە لەبەر ئەو پارەوپولەی کە لەخەڵکی وەردەگرن بەناوی زەکات وخومسەوە، پێویستیان بە موچەی دەسەڵاتداران نابێت. دوەم: سەدام دوژمنی هاوبەشمان بوە وەک کورد و شیعە، سێیەم: فەتواکە لەسەر ئاستێکی ڕەسمی وبەرفراوان دەرنەچوە تا هەموو خەڵکی شیعە پێیەوە پەیوەست بن، بەڵکو فەتواکان لە چوارچێوەیەکی تەسکدا بوە، بەڕای من

کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوە لە ڕەوتی ڕوداوەکان، چونکە هەمومان دەزانین کە شیعە زیاتر لە ٧٠% هێزی سەربازی عێراقی پێکدەهێنا، شەریش هەر بەردەوام بوە لە دژی کورد لەلایەن سوپای عێراق. ئینجا بۆ نمونە ئەگەر فەرمانڕەوای عێراق شیعە بایە و عێراقی ئینگلیزی ڕادەستی شیعەکان بکرابایە، ئایە ئەو فەتوایانەی زایانی شیعە لە بەرژەوەندی کورددا دەردەچو؟! من پێموانیە، ئەی بۆ فەتوایەکی زانا شیعەکان لە ئێران دەرنەچو بۆ حەڕامکردنی شەری کوردەکان؟ ، سوریاش چاکترین نمونەیە کە گەلێکن ڕاپەڕیون لە دژی حوکمێک کە خۆی بە بەعسی وەسف دەکات، بەس چونکە حاکمەکە نوسەیریەکی عەلەوییە کە شیعەی تەواویش نین کەچی هەموو عیراقی شیعی بە پارەو ماڵ وپیاو پشتگیری لەو ڕژێمە دەکەن کە تا دوێنی بە سەدان وهەزاران خۆکوژی بۆ ناو بازاڕەکانی شیعە دەنارد، ئەوە بۆ بە قودرەتی قادر بەعسی عێراق کافر بوو لە فەتواکانی شیعەدا، کەچی بەعسی سوری بونە دۆستانی ئەهلی بەیت؟!

بە نسبەت سونەکانیش، ڕاستە لە شێوەی فەتوا فەتوایەکی وامان نەبیستوە لە زانایانی سونە دەرهەق بە کورد، ئەوەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی دەزگای ئایینی سونی کە هەردەم گوزارش لە بیروڕای رەسمی دەوڵەت دەکات، بۆ نمونە زانایەکی گەورەی وەک [محمد سعيد رمضان البوطی] کە کوردیشە بۆ توانیویەتی قسەیەکی چاک بۆ کورد بکات چ جای فەتوایەک بدات لەدژی ئەو هەموو ستەمەی لە کوردانی سوریا دەکرێت؟! ئەو زانای بەڵاتی ئەسەدە، ئێستاش لەگەڵ ئەو هەموو کوشتارەی سوپای ئەسەد لە دژی خەڵکی بێتاوانی سوریە، نەك قسەیەکی چاک بۆ خەڵکەکە ناکات، بەڵکو خوێ دەکاتە برین وزامەکانی خەڵکی قوربانی لە بەرژەوەندی جەلاددا!! بەڵام لەسەر ئاستی بیروڕای تاکەکەسی، ئەوە ناکرێت نکولی بکرێت کە بیروڕای چاک هەیە لەسەر کورد وکێشەی کورد لێرەو لەوێ، من نامەوێ پاکانە بۆ سونەکان بکەم، چونکە خۆم لەبەر چاوی قیاداتی ئیخوانی میسری و سوری وتەیەکی شۆکهێنەرم خوێندەوە لەو بارەیەوە تا سەر ئێسقان ڕەخنەم لێگرتن هەتا شێخ عەلی قەرەداغی پێیناخۆش بوو ویەک دوو جار دەیویست قسەم پێ ببڕیت، بەڵام ماوەیم نەدا، دوایی هەر خۆیان دانیان بە گرنگی ڕاپۆرتەکەم نا وگوتیان کە ئەوان زۆر بێ ئاگان لەو وردەکاریانەی دۆزی کوردا!

شتێکی تری گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە عێراقی ئینگلیزی لە ١٩٢٣ -٢٠٠٣ هەرگیز هەلومەرجی دروستبوونی بەراورد ناکرێت لەگەڵ عێراقی ئەمریکی، هەلومەرجی کورد لە

پێش دروست بوونی عێراقی ئینگلیزی زۆر لاوازتر بوو، نەسەرکردەکانی پێشوازی دەکران لە هیچ شوێنێک، نەکەس دەیزانی کوردستان چیە، نە سەردەمی شۆڕشی زانیاری ومافی مرۆڤ بوو، ئەو بارودۆخە هەرگیز ناکرێت بەراورد بکرێت بە هەل ومەرجی کورد لەکاتی دروستبوونی عێراقی ئەمریکی دا کە کورد خۆی عەراب وباوکی دامەزرێنەری بوون ... کورد بەر لە دروستبوونی عێراقی ئەمریکی دا دەریایەک خوێنی دابوو، خاوەن قەوارەیەکی نیمچە سەربەخۆ بوو، بە ڕەوتی عەلمانیەتیان بەچاوێکی چاکتر سەیر دەکران لە ڕەوتە مەزهەبیەکانی حزبە شیعیەکان، سەرکردەکانی لە هەموو جیهان پێشوازیان لێدەکرا، لە هەموو بارەیەکەوە لە پێش شیعەدا بوون، ئەوە شیعەن قەرزاری هەولە نا مەنتیقیەکانی کوردن لە زیندوکردنەوەی قەوارەی دەوڵەت و بەهێزکردنی لەسەر حیسابی خودی کورد، ئەوەشی کورد بەدەستی هێناوە بە بەخشین وشاباشی شیعەکان نەبوە، بەڵکو ئەوە بێدەسەڵاتی و خەریک بوونی شیعەیە بە شەڕی تایفی لەگەڵ سونە وڕێکخراوی قاعیدەیە وای کردوە بەشێوەیەکی کاتی کورد دور بێت لە هەڕەشەکانی فەرمانڕەوایە شیعیەکان، زهنیەتی شیعی سەفەوی، زهنیەتێکی تەنگژەدارە و نەخۆشە بە ڕابردوو، ئەگەر بیەێت مەلەفی دوژمنایەتیت بۆ دروست بکات بە ڕۆژێك دەتکاتە یەزیدی کوڕی موعاویەی ئەبو سوفیان!

- **کورد لە کوێ بێت لەو هەرایەی شیعە وسونەدا؟**

ڕاستیەکەی بە نسبەت کوردستانیش وەک گوتمان کوردستان لە بەشی ئێران وعێراق بەر لە هەر کەسێک هەقیقەتی شیعەگەرایەتیان بۆ دەرکەوتوە ورەفزیان کردوە، هەرچەندە ئێران لەسەر ئاستی سیاسی توانیویەتی جێپەنجەی بە هێزی هەبێت لە نیو هەموو حزبە کوردیەکان بە عەلمانی و ئیسلامیەوە، ئەمڕۆ ئێران لە ڕێگای حزبەکانی کوردستان دەستی دەگاتە بە هەموو پنتێک لەو کوردستانە، ئەوەش بێگومان کاری کەسانێکی سەخت دەکرد ئەگەر خەڵکی کورد وەڵامدانەوەیان هەبوایە بۆ بانگەوازی شیعەگەرایەتی، بەڵام لە خۆش بەختیدا خەڵک خۆی بە سروشت ئەو مەزهەبەیان پێ قبوڵ نیە، کە هەردەم خەریکی کیشانی تلیاکی ڕابردوە ونانەوەی جەوی ئەزمەیە.

کورد ئەزموونی براکانی خۆی لەبەر چاوە لە ئێران ودەزانێت کە بچوکترین مافیان پێ ڕەوا نابینن، وناوچەکانی کورد هێندە پەراوێز خراوە هەر دەڵێی بەشێک نییە لە شارەکانی ئێرانی شیعی وەک تەهران وشیراز و کەرەج و ئەسفەهان، بۆیە زەحمەتە ئەو هەمو هەقیقەتەی بەسەردا تێپەڕێت...بەڵام لەسەر ئاستی سیاسەت کورد هێندە خۆی نزیک کردۆتەوە لە

شیعەکان تا ئەو ڕادەیەی کەسانێکی سونی گومان دەخەنە سونی بوون وموسڵمان بوونی کورد، هەرچەندە کورد قەرزارباری ئەوان نییە، بەڵام ئەگەر بەرژەوەندی کورد لەو هاوپەیمانیەتیە دایە لەگەڵ شیعەکانی عێراق با هەوڵدات ئەوپەڕی سودی لێوەرگرێت، بەڵام لەسەر حیسابی سونەکانی عەرەب نەبێت، هەوڵی لێکتر گەیشتنی زۆرتر بدات لەگەڵ سونەکان، چونکە بەیانی ئەگەر ئەو کێشەیە گەورەیەی شیعە وسونە بەرەو شەڕێکی ئەقلیمی بڕوات لە نێوان ئێران وحزب الله و حماس وهەندی لایەنی ئیسلامی ترو شیعەکانی عیراق لەلایەک و ولاتانی کەنداو بەسەرۆکایەتی سعودیەو وڵاتە عەرەبیە سونەکان و سونەکانی عیراق وتورکیا بەپشتیوانی رۆژئاوا و ئیسرائیل وئەمریکا لەلایەکی تر، ڕاستە ئێران پارویێکی چەور وئاسان نییە، بەڵام تۆقینی ئیسرائیل لە لێدوانەکانی ئێران لە دژیدا و لە بەرنامەی ئەتۆمی ئێراندا، سەرەڕای پەڕوباڵکردنی ئێران لە سوریادا کە خەریکە ئەو هاوپەیمانە لەدەست دەدات ودەگەڕێتەوە باوەشی سونە، کە ئەوەش ڕوخانی حەتمی حزب الله بەدوادا دێت، وامان لێدەکات بڵێین کە تەرازوی هێز بەلای بەرەی دوەمدایە واتە بەرەی رۆژئاوا و ئیسرائیل وئەمریکا و سعودیەو وڵاتە عەرەبیە سونەکان دایە، چونکە وەک لەسەرەتادا ئاماژەمان پێکرد کە ئەو باگراوەندە تاڵەی ئێرانی شیعی دروستی کردوە لەوەتی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە هەموو پنتێکی جیهاندا، یارمەتی نادات لە بە تەنگەوەچوونی کەس بۆی!

لەوەش زیاتر هەر دەوڵەتێک بیەوێت بەهێز بێت، پێویستە باری ناوەوەی پتەو وبەهێز بێت، مەبەستم لە هێز ئەوە نییە کە ملیۆنێك پاسدار [یان جەندرمە] ڕەوانەی کوردستان وبەلوچستان وئەحواز [یان دیاربەکر وباتمان] بکەیت، هێزی ناوەخۆ لە ئاشتی وتەبایی ناوەخۆوە دروست دەبێت، ئێران لەناوەوە زۆر حاڵی پەرێشانە، وڵاتێک مافی کورد و بەلوچ وعەرەب و سونە بە گشتی تێیدا دەستەبەر نەکرا بێت، وهەقی خەڵکە شیعەکەشی زەوت کرا بێت وەک دیتمان چۆن سەرکوت کران لە کاتێکدا کەسانێکی ناو چوارچێوە ئاینیە شیعیەکەی وەک میر حوسێن موسەوی کە سەردەمانێك سەرۆک وەزیران بوو بەر لەوەی ئەو پایەیە ئیلغا بکرێت، یان مەهدی کەروبی، کە عەمامە بەسەرێکی شیعەیە ولە هاوەڵە نزیکەکانی ئیمام خومەینیشە وچەندین پایەی گەورەی هەبوە لەو ڕژێمە بەو شێوەیە سەرکوت بکرێن، ناکرێت بە دەوڵەتێکی بەهێز و پتەو بدرێتە قەڵەم، بۆیە مەگەر **ئیمامی زەمان بە هانای بێت ئەگینا بێ گومان لەو کێشەیەدا ئێران دەکەوێت، تەنها ڕزگارکەرێک بۆ ئێران لە گۆڕانی ناوەوەدایە ولە هاتنی رژیمێکدایە ئازادی ومافە سەرەکیەکان بۆ هەموو خەڵک دەستەبەر**

**بكات وشیعه‌گه‌رێتی سه‌فه‌وی به‌ فه‌توا ویاسا ته‌عریم بكات وهیچیتر حوجه‌تیانه‌ كێشه‌ و ئاژاوه‌ ڕه‌وانه‌ی ده‌ره‌وه‌ نه‌كات ومیزانیه‌ی ده‌وڵه‌تی ئێران له‌ ڕه‌ش وڕووتی ئێران سه‌رف بكات له‌ جیاتی ئه‌وه‌ی سه‌رفی بكات له‌سه‌ر حزب الله‌ ی لوبنان و حزب الله‌ ی نێجێریا!!!**

**20/2/2012**

## له‌ كێشه‌ی نێوان شیعه‌ وسونه‌دا

له‌وه‌تی شیعه‌ وسونه‌ له‌ عێراق دا هه‌یه‌، ئه‌و كێشه‌یه‌ مه‌زهه‌بیه‌ به‌رده‌وامه‌، له‌وانه‌شه‌ ئه‌وه‌ ته‌نها ته‌وقی نه‌جاتی كورد بێت له‌ نێوان چه‌كووشی سونه‌ وسندانی شیعه‌. ڕاسته‌ كاتی خۆی صدام وڕژێمه‌كه‌ی هه‌ردوو لامانی ده‌چه‌وسانده‌وه‌، به‌ڵام له‌وه‌ ناچێت نه‌ سونه‌ی عه‌ره‌ب وه‌ك سونه‌ی جاران ما بن ونه‌ شیعه‌ی عه‌ره‌ب وه‌ك شیعه‌كانی سه‌رده‌می هاوخه‌باتی مابن.

كاسانێك له‌ نێوه‌نده‌ سیاسی ورۆژنامه‌گه‌رییه‌كان هێشتا له‌و زڕه‌ خه‌ونانه‌ به‌ ئاگا نه‌هاتوون وپێیان وایه‌ ده‌بێت ئێمه‌ی كورد هه‌موو هێلكه‌كانمان بخینه‌ سه‌به‌ته‌ی شیعه‌ گوایه‌ هاوخه‌باتمانن، به‌ڵام ئه‌و جۆره‌ بیركردنه‌وه‌یه‌ سافیلكه‌ییه‌كی زۆری پێوه‌ دیاره‌ ده‌گاته‌ ڕاده‌ی ساویلكه‌یی. به‌ڕای ئێمه‌ عكومه‌تی كوردستان له‌و باره‌یه‌وه‌ خوێندنه‌وه‌ی دروستتره‌ بۆ ڕووداوه‌كان كاتێ بێلایه‌نیه‌كی ئیجابی نیشان دا له‌و كێشه‌یه‌ی كه‌ ئێستا له‌ ئارادایه‌ له‌ نێوان شیعه‌ به‌ سه‌ركردایه‌تی مالیكی وله‌ژێر په‌رده‌ی حكومه‌ته‌ شڕوگه‌نده‌ڵه‌كه‌ی به‌غدا و نێوان سونه‌ به‌ نوێنه‌ری لیستی عێراقیه‌ وهێماكانی وه‌ك تاریق هاشمی وساڵح موتله‌گ وكه‌سانی تر.

ئه‌گه‌ر سونه‌ی عێراق ته‌نها له‌به‌ر مه‌وروسی ئایدیۆلۆژیا وفیكری نه‌ته‌وه‌په‌رستی عه‌ره‌بی هه‌ڵوێستی نێگه‌تیڤانه‌یان ده‌رهه‌ق به‌ كورد هه‌ بێت، ئه‌وه‌ وێنه‌ی كورد له‌ یاده‌وه‌ری جه‌معی شیعه‌ زۆر خراپتره‌، و ئه‌وه‌شی شیعه‌ ده‌جوڵێنێت كه‌ مه‌زهه‌به‌ زۆر ترسناكتره‌ له‌ وه‌ی كه‌ سونه‌ ده‌جوڵێنێت، ڕاسته‌ سونه‌ش قاعیده‌ی هه‌یه‌ به‌ڵام ئه‌گه‌ر قاعیده‌ له‌ چاكترین حاڵه‌تیدا بتوانێت سه‌دا دووی سونه‌ بجوڵێنی وهانیان بدات بۆ هه‌ر ده‌به‌نگییه‌ك یان كارێكی خۆكوژی ئه‌وه‌ مه‌راجیعی شیعه‌ ورمووزی ته‌لیسماوی مه‌زهه‌ب توانای جولاندنی سه‌دا نه‌وه‌تی هه‌یه‌ ٩٠% زۆر وردتر وكاریگه‌رانه‌ تر له‌ قاعیده‌. ده‌یان ده‌قی پیرۆزی مه‌زهه‌بی له‌ فیقهی شیعه‌دا هه‌یه‌ كه‌ كورد له‌ مرۆڤایه‌تیش داده‌بڕێنێ، ده‌قگه‌لێك ده‌گاته‌ ئاستی جینۆسایدی مه‌عنه‌وی، قوڕبه‌سه‌ری كورد ئه‌گه‌ر ڕۆژێك ئه‌و ده‌قانه‌ ته‌فعیل بكه‌ن.

ئه‌مڕۆ شیعه‌ له‌ عێراق هه‌وڵی لوشدانی هه‌موو عێراقیه‌تی ده‌نا ئه‌گه‌ر ده‌ستور هێنده‌ پیرۆز بێت لای ده‌سه‌ڵاتی شیعه‌ی عێراق كه‌ هه‌رده‌م كه‌ شتێكیان لێ عاسێ ده‌بێت په‌نای بۆ ده‌به‌ن، ئه‌ی بۆ دژایه‌تی داوای به‌ ئه‌قلیم بوونی پارێزگای سه‌لاحه‌دین و دیاله‌ به‌و شێوه‌یه‌ توندە ڕه‌ت ده‌كه‌نه‌وه‌ تا ڕاده‌ی ڕاونانی مه‌جلیسی پارێزگای دیالا وخودی پارێزگار بۆ كوردستان؟!!

ئه‌ی ئه‌و هه‌موو ده‌ستی پێکردنه له کێشه‌ی که‌رکوک وناوچه دابڕاوه‌کانی تر چی پیده‌گوترێت جگه له دووباره‌کردنه‌وه‌ی ته‌ماعی وچاوتێبڕینی شیعه له که‌رکوک به‌شێوه‌یه‌کی خراپتر له عه‌ره‌به به‌عسییه عروبه‌ییه‌کان!! بۆ ئه‌وانه‌ی له ئێراننن خۆ به‌عسی نین، ئه‌گه‌ر حکومه‌ته شۆفێنییه‌کانی به‌عس وتورک جاروبار موفاوه‌زاتیان ده‌کرد له‌گه‌ڵ کورده‌کان ئه‌گه‌ر بۆ چاوبه‌سته‌ی خه‌ڵکیش بێت به‌ڵام چاکتره له‌و ڕژێمه مه‌زهه‌بی وتایفیه‌ی ئه‌گه‌ر له‌و سه‌رده‌مه نه‌بوایه پێی ئاسایی بوو هه‌موو کورد وسونه‌ی ئێران وه‌ک ده‌وڵه‌تی به‌دناوی سه‌فه‌وی به‌زۆر بکاته شیعه یان قه‌ڵا چۆیان بکات!

ئه‌گه‌ر باڵی ڕاسته‌ی ئێران که سوریایه شکا به تینی شۆڕشی بوێر وغه‌در لێکراوی سوریا ئه‌وه زۆری پێناچێت ئێران به هۆکاری ناوه‌وه و ده‌ره‌وه هه‌مان چاره‌نووسی ده‌بێت، پێویسته کورد ئه‌و حساباتانه بکات ووێنه‌ی جمکی دووانه‌یی له‌گه‌ڵ شیعه‌ی عێراق له مێشکی خۆیی وکه‌سانی تر بسڕێته‌وه، چونکه قیاده‌ی شیعه‌ی عێراق مایه‌ی خه‌شم و قینی هه‌موو جیهانی سونییه له‌به‌ر ده‌مارگیری مه‌زهه‌بی وتایفیان، گومانم نییه پاش سه‌رکوت کردنی سونه‌ی عێراق به‌ته‌واوی وه‌ک به‌رازی یه‌کانه ملی پانیان به‌ره‌و کورد هه‌ڵده‌سوڕێنن. ئه‌وانه دۆستیان نییه له ده‌ره‌وه‌ی مه‌زهه‌ب، ئه‌گه‌ر هه‌شیان بێت دۆستایه‌تی توقییه یه [ڕواڵه‌تبازی] یه.

21/12/2011

## ناوی سمكۆ یان ناوی مار شه‌معون، كامه‌یان نه‌نگیه‌

ماوه‌یه‌كه‌ چه‌ندین مه‌سیحی له‌ كوردستان وده‌ره‌وه‌ی كوردستان هه‌رایه‌كی گه‌وره‌یان نایه‌ته‌وه‌ دژی ناونانی شه‌قامێك له‌ هه‌ولێر به‌ناوی سه‌ركرده‌ی مێژوویی كورد سمكۆی شكاك وبه‌ زمانێكی زۆر زبر وپڕ له‌ وشه‌ی ناشیرین قسه‌ به‌و سه‌ركرده‌یه‌ی كورد ده‌ڵێن گوایه‌ موجریم وتاوانبار ودرنده‌یه‌ چونكه‌ قه‌دیسێكی موباره‌كی وه‌ك مار شه‌معونی كاهینی ئاسوریه‌كانی كوشتوه‌!! داوا ده‌كه‌ن ناوی سمكۆی شكاك لاببرێت ومێژووی ئه‌و كه‌ڵه‌پیاوه‌ له‌ قوتابخانه‌كانیش نه‌خوێندرێت!!!

ئه‌وه‌ش له‌ ئه‌نجامی ئه‌و ته‌ساموحه‌ گێلانه‌یه‌ دێت كه‌ حكومه‌تی كوردی به‌رپای ده‌كات له‌ سیاسه‌ته‌كانی به‌رامبه‌ر كه‌مینه‌ ئایینی ونه‌ته‌وه‌كان وهینده‌ نازیان ده‌كێشن خه‌ریكه‌ هه‌ر كه‌مایه‌تیه‌ک كۆمارێك له‌سه‌ر خاكی كوردستانی فیدراڵی داده‌مه‌زرێنێت!! ئه‌و ته‌ساموحه‌ گێلانه‌یه‌ كه‌ ئه‌مڕۆ كه‌سانێكی مه‌سیحی له‌ جیاتی به‌ خۆداچونه‌وه‌یان وره‌خنه‌ گرتن له‌ سیاسه‌تی ئینتیحاری مار شه‌معون كه‌ بوه‌ دارده‌ستی روس وئینگلیز له‌ دژی گه‌لانی ناوچه‌كه‌ وپیكهێنانی جه‌ته‌ی جه‌كداری وا درنده‌ كه‌ به‌ عیقدیكی ئایینیه‌وه‌ كورد وموسلمانانیان ده‌كوشت له‌ جیاتی ئه‌وه‌ ئه‌مڕۆ به‌ به‌رچاوی كوردان سه‌دان جوێن ئاڕاسته‌ی یه‌كێك له‌ گه‌وره‌ترین سه‌ركرده‌ی كوردی وه‌ك سمكۆی شكاك ده‌كه‌ن، ئه‌و پیاوه‌ی مه‌زنه‌ی كه‌ مێژونوسی ناودار دكتۆر عوسمان عه‌لی به‌ ڕێوی سیاسه‌تی كوردی وڕێبه‌ری له‌ پراگتیزمیه‌تی حسێب ده‌كات .وتوانی گه‌وره‌ترین پلان له‌ دژی خاكی كوردستان هه‌ڵوه‌شێنێته‌وه‌. ئه‌و سه‌ركرده‌یه‌ی كه‌ یه‌كه‌مین حكومه‌تی كوردی پێش قازی محمد یش له‌ مێژوودا دروست كردوه‌ له‌ نێوان ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٢٦.

ئه‌و ته‌ساموحه‌ گێلانه‌یه‌ سه‌ركرده‌و نوسه‌ر وبیرمه‌ندی گه‌وره‌شی گرتۆته‌وه‌، كۆلكه‌ ڕۆشنبیره‌ نه‌ته‌وه‌په‌رست وئێتیسته‌كانیش وه‌ك تووتی قسه‌كانی ئه‌و سه‌ركرده‌ ونوسه‌ر وبیرمه‌ندانه‌ دووباره‌ ده‌كه‌نه‌وه‌، نازانن ئه‌و سه‌ركرده‌ وبیرمه‌نده‌ كوردانه‌ش وه‌ك تووتی هه‌موو بیروڕای نێگه‌تیڤی ئیستشراقی ڕووسی قه‌یسه‌ری وكۆمه‌نستی وڕۆژهه‌ڵاتناسی ئینگلیزی وخۆرئاوایی دووباره‌ ده‌كه‌نه‌وه‌ به‌بێ هیچ لێكۆڵینه‌وه‌یه‌ك وخۆماندوو كردن وگه‌ڕان به‌ دوای سه‌رچاوه‌ وڕاستیه‌كان.

جه‌لال تاڵه‌بانی ناسراوه‌ به‌ په‌سنكردنی بێگانه‌ به‌سه‌ر كورد تاره‌ده‌ی ئازادكردنی فرۆكه‌وانێكی عه‌ره‌بی عێراقی تاوانبار به‌ تاوانی كیمیابارانكردنی هه‌ڵه‌بجه‌، بۆیه‌ ئه‌و له‌ یه‌كه‌مینی ئه‌و كه‌سانه‌یه‌ كه‌ له‌ كتێبی [كردستان والحركة الكردية [چه‌ندین سیفه‌تی دزێوه‌ ده‌یداته‌ پاڵ سمكۆی شكاك له‌ ژێر كاریگه‌ری ناحه‌زانی كورد. قاسملۆی بیرمه‌ند وسه‌ركرده‌ش هه‌مان شت دوباره‌ ده‌كاته‌وه‌، ودكتۆر كه‌مال مه‌زهه‌ریش كه‌ كاری مێژووه‌ وه‌ك هه‌ر كه‌سێكی ناپسپۆر ئیدانه‌ی توندی سمكۆی شكاك ده‌كات بێ ئه‌وه‌ی هیچ زیاد بكاته‌ سه‌ر ئه‌وه‌ی وتراوه‌ له‌ بازنه‌ ئیستشراقیه‌كان ده‌رباره‌ی ئه‌و ڕوداوه‌. له‌ هه‌مووشیان كاره‌ساتتره‌ ئه‌و جه‌مال نه‌به‌زه‌یه‌ كه‌ كه‌سانێك پێی ده‌ڵێن پێغه‌مبه‌ری كوردایه‌تی كه‌ به‌ڕای من پێغه‌مبه‌ری فشه‌كه‌رایه‌تیه‌ له‌ [كوردستان وشۆڕشه‌كه‌ی] وه‌ك هه‌ر كۆلكه‌ ڕۆشنبیرێكی ماستاوكه‌ر بۆ مه‌سیحیه‌كان وهێزه‌ خۆرئاوایه‌كان سه‌ركۆنه‌ی سه‌ختی سمكۆی شكاك ده‌كات.!! هه‌تا كاك نه‌وشێروان مسته‌فاش پێیوایه‌ ئه‌و ئه‌گه‌ره‌ی كه‌ ده‌ڵێت والی ته‌وریز هانی سمكۆی داوه‌ بۆ كوشتنی مار شه‌معون له‌ به‌رامبه‌ر پاداشتد دواییش خۆی لینه‌كرد به‌ خاوه‌ن له‌ هه‌موو لیدانه‌وه‌كانی تر زیاتر ڕێی تێده‌چێت!!! [كورد وعه‌جه‌م، ل ٤١٤ [بێئه‌وه‌ی ئه‌و باكگراوه‌نده‌ گه‌وره‌یه‌ی تاوانه‌كانی ئاسوریه‌كان بخوێنێته‌وه‌ به‌رامبه‌ر كوردا وده‌یه‌وێت بڵێت كه‌ سمكۆ ته‌نها مورته‌زه‌قێك بوه‌ بۆ پاداشت مار شه‌معونی كوشتوه‌!!.

ئه‌وه‌ی له‌و بواره‌دا توانی شتێكی نوێ بخاته‌ سه‌ر ئه‌و بابه‌ته‌ وبه‌لكو تێكڕای مێژووی كورد مێژونوسی ناودار دكتۆر عوسمان عه‌لی یه‌ كه‌ له‌ كتێبه‌ به‌ نرخه‌كه‌ی به‌ ناوی ]الحركة الكردية المعاصرة، ل ٣٧٧] زۆر به‌وردی هۆی كوشتنی مار شه‌معون دیاری ده‌كات كه‌ له‌ كتێبی League of nations هاتوه‌:"له‌ سه‌رده‌می شه‌ری جیهانی یه‌كه‌م ئاسوریه‌كان و ئه‌رمه‌نه‌كان هه‌رچه‌نده‌ هاوڵاتی ده‌وڵه‌تی عوسمانی بوون، به‌ڵام هه‌ڵوێستێكی سیاسی وعه‌سكه‌ری یان نیشاندا بۆ پاڵپشتی كردنی هێزه‌ هاوپه‌یمانه‌كان له‌ دژی ده‌وڵه‌تی عوسمانی، هێزه‌ی به‌كرێگیراوی ئاسوریه‌كان به‌ سه‌ركردایه‌تی بوترس ئاغا به‌ژداری سوپای ڕوسیای كرد له‌ وێرانكردنی سه‌دان گوندی كوردی وسوتاندنی...كه‌ ئه‌وه‌ش بوه‌ هۆی كوشتن وسه‌رگه‌ردانی نزیكه‌ی یه‌ك ملیۆن كورد، كاتێك سوپای روسیاش له‌ كوردستان كشایه‌وه‌ چه‌كه‌كانی دایه‌ ده‌ستی مورته‌زه‌قه‌ ئاسوریه‌كان، هه‌روه‌ها كونسلخانه‌ی فه‌ره‌نسی له‌ ئه‌سته‌بۆل یارمه‌تیه‌كی زۆری دراو وچه‌كی دا به‌ هێزی ئاسوریه‌كان. هێزی ئاسوریه‌كان گه‌یشته‌ ئاستێكی زۆر گه‌وره‌ تا توانیان شاری ورمێ وده‌وروبه‌ری له‌ كوردستانی ئێران داگیر بكه‌ن .چه‌كداره‌ ئاسوریه‌كان ده‌ستدرێژیان كرده‌ سه‌ر سه‌دان ئافره‌تی كورد له‌ناو

شاری ورمێ، پاش ئەوەی ئامادەیەکانی هێزی ئاسوری تەواو بوون، نێوەندە ئاسوریەکان لە لەندەن وباریس، داوای دامەزراندنی قەوارەیەکی ئاسوریان دەکرد لەسەر خاکی کوردستان [ورمێ - هەکاری".]

سەیر لەوەدایە قەشەی کەنیسەی مارکیورکیس کەنیسەی سۆرش دەڵێت سمکۆ تاوانبارە، بەڵام دەربارەی مار شەمعون دەڵێت" :المرحوم باطريرك كنيسة المشرق الأشورية الشهيد مار بنيامين شمعون" وەک بڵێی مار شەمعون بەس خەریکی خواپەرستی بوبێت و سمکۆ لەناو دیردا کوشتبیتی !!بە پێی ئاینی مەسیحی [دع ما لله لله ودع ما لقيصر لقيصر] کەچی قەداسەتی بەتریاك مار شەمعون لە یەك کاتدا پیاوی دینی وسەرکردەی سیاسی وسوپاییش بوو، لە یەک کاتدا لەلایەن روسیا وبەریتانیا وفەرەنسا وئیتاڵیاش یارمەتی دەدرا، هێندە بوغرا ببوون لە خۆیان بە ئاشکرا داوای دامەزراندنی قەوارەیەکی ئاسوریان دەکرد لەسەر ئەو خاکەی کاتی خۆی کە ڕایان کرد پاش بە زەندیق کردنیان لەلایەن مجمع ئەفسوس لە سالی ٤٣١ کە ناویان ئەو کاتە نەستوری بوو، وەک شوێنکەوتوانی نەستوری بەتریارکی قوستەنتەنیە کە بە فەرمی تەکفیر کرا لەلایەن مەجمەعی افسوس. سمکۆی شکاك پاش دەستدریژیەکانیان بۆسەر خەڵکی سەدان گوندی کورد وکوردەکانی ورمێ بە هەستی بلیمەتی خۆی زانی کە ئەو مار شەمعونە پلانێکی ڕەشی نەگریسی لە دەستدایە بە پاڵپشتی هەموو وڵاتە هاوپەیمانەکان بۆ دابڕاندنی بەشێکی گرنگی کوردستان ولەناوبردنی ئەو وەك لە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ مستەفا یامولکیش ئاماژەی پێدەکات.

لەو ناوە ڕۆلی تیکدەرانەی نێردە تەبشیریەکان زۆر کاریگەر بوو لەسەر فوتیکردنە گیانی دەمارگیری دینی لەو ناوچەیە هەستیارە دەیەها قوتابخانە ونەخۆشخانە وچاپخانە وپەرستگایان کردەوە بۆ ئاسوریەکان وەک نەوشیروان دەڵیت: "میسیۆنەرەکان دەوریکی کاریگەریان هەبوو لە هاندانی ئاسوریەان لە دژی گەلە موسلمانەکانی دراوسێیان، بە تایبەتی دژی گەلی کورد کە نەخۆی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبوو، وە نەهیچ دەوڵەتێکی بێگانەش پشتیوانی لێدەکرد "کورد وعەجەم، ل٣٢٥. کاتێ بەدرخان داوای داوای لە مار شەمعون کرد هاریکاریان بن لە دژ تورکدا، لەژێر کایگەری میسیۆنەرەکانی ئینگلیز، مار شەمعون لە جیاتی هاریکاری داوای لە بابی عالی عوسمانی کرد سەرکوتیان بکەن، تا ئەو هاندانە شەڕیکی خویناوی لێکەوتەوە لە نیوان کورد و ئاسوری لە ١٨٤٢ -١٨٤٣.

هه‌زاران ئاسوری به‌ ده‌ستی حكومه‌تی ئیتحاد وته‌ره‌قی توركی كوژران وقه‌تلوعام كران له‌ ئه‌نجامی دانه‌پاڵی روسیا له‌ شه‌ری جیهانی یه‌كه‌م، پاش ئه‌وه‌ی مار شه‌معون داوای له‌ ئاسوریه‌كان كرد بچنه‌ ریزی سوپای روسیاوه‌. له‌ ئه‌نجامی كورتبینی سه‌ركردایه‌تی كه‌هنوتی ده‌ره‌به‌گانه‌ی مار شه‌معون هاموو ئاسوریه‌كان ناچاربوون به‌ كۆمه‌ڵ كۆچ بكه‌ن له‌ هه‌كاری به‌ره‌و سنوری ئیران، ئاسوریه‌كان وئه‌رمه‌نیه‌كان ببونه‌ پێشه‌نگی سوپای روسی ده‌ستیان له‌ هیچ تاونیک دژی ئاوایه‌كانی كورد نه‌ده‌پاراست. له‌ كاتی كۆچی به‌ كۆمه‌ڵی ئاسوریه‌كان له‌ هه‌كاری بۆ سه‌ر سنوری ئیرانی ژیر ده‌ستی سوپای روس له‌ ئابی ١٩١٥ "به‌ دریژایی ریگه‌ توشی شه‌ر وپێكادان بون. ئاسوریه‌كان له‌ كشانه‌وه‌دا درێخیان له‌ كوشتنی به‌ كۆمه‌ڵی كورد و تالآنی ئاژه‌ڵ ودارایی وكاول كردنی گونده‌كانیان نه‌كرد. شه‌ڕ ره‌نگی شه‌ریكی دینی خویناوی به‌ خۆیه‌وه‌ گرتبوو، هیچیان ده‌ستی له‌وی تر نه‌ ئه‌پاراست وهه‌ر گه‌له‌یان ئه‌یویست گه‌له‌كه‌ی تر له‌ ڕه‌گ وڕیشه‌ ده‌ربهێنێ." كورد وعه‌جه‌م، ل ٣٥٧.

كه‌وابوو مار شه‌معون وچه‌ته‌كانی ده‌بێ ئیدانه‌ بكرێن نه‌ك سمكۆی شكاك به‌ شه‌یتان بكرێت وناوی شه‌قامه‌كه‌ بگۆڕدریت له‌لایه‌ن به‌رپرسێكی شاره‌وانی كه‌ زۆر جاهیلانه‌ به‌ سایتێكی مه‌سیحی ده‌ڵێت: نه‌مدازانی ئه‌و پیاوه‌ واته‌ سمكۆ ده‌ستی سوره‌ به‌خوێنی ێتاوانان**!!** ده‌ستی سوره‌ به‌ خوێنی تاوانباران له‌سه‌رووی هه‌مویانه‌وه‌ مار شه‌معون وبوترس ئاغا كه‌ به‌ هه‌زاران كوردیان كوشتوه‌ وهه‌زاران ژنی كوردیان لاقه‌ كردوه‌، ڕاستیه‌كه‌ی ئه‌گه‌ر ئه‌و مه‌سیحیانه‌ بیانه‌وێت بابه‌تیانه‌ به‌خۆیان دابچنه‌وه‌ جارێكی تر نه‌بنه‌ دارده‌ستی هێزه‌كانی ده‌ره‌وه‌ وپه‌ند له‌ مێژوو وه‌رگرن ده‌بێت ئیدانه‌ی خۆفرۆشیه‌كانی مار شه‌معون بكه‌ن وهه‌موو ناو شه‌معونه‌كان بگۆڕن نه‌ك بیكه‌نه‌ شه‌هیدی به‌ڕ وبه‌حری كه‌ربه‌لا.

چوار شه‌ممه‌, 30 تشرینی یه‌كه‌م 2013 23:39

## یاخوا کورد قەت نەبیتە دەروێش

کورد لەبەر بێ قەوارەیی سیاسی ومێژوویی، حاڵەتێکی سایکۆلۆژی زۆر خراپی تێدا دروست بووە، کە هەردەم حەزی بە پاشکۆیەتی ئەم و ئەوەی بێگانەیە، لە خۆشیان زیاتر داکۆکیان لێدەکات. سەرکردەیەکی سەربازی پێشمەرگە بە خۆی بۆی گێرامەوە، کاتێ لە شەڕێکی قورسدا لەگەڵ سوپای بەعس و جاش و جەیشی شەعبی، هەستی کرد چەند شەڕکەرێکی حزبێکی مارکسی بە خشپەیی کێشابوویانەوە و وون ببوون، وگووتی چووم بە دوایان لە ئەشکەوتێکی بچوکدا مەجلیسیان گەرم کردبوو باسی پێویستی یارمەتی دانی نیکاراگوایان وشوێنیتریان دەکرد! گووتی ئەمنیش لێیان بە ژوور کەوتم وگووووتم: شەرم لە خۆتان بکەنەوە جارێ کە کوردن وەرن یارمەتی کوردە فەقیرەکە بدەن، ئینجا خوا کەریمە لۆ نیکاراگوای!

دیندارەکانیشمان هەروان بە توندرەو و میانڕەوەوە، توندڕەوەکان قسەی مەلایەکی عەرەب و تورک بە هەزار زانای کورد ناگۆڕنەوە، میانڕەوەکانیش وان، باس وخواز هەیە کوردێك دەیان ساڵە باسی کردوە، بەڵام لە ناکاو ناوێکی عەرەبی گوێ لێ دەبێت، کە هەمان باس دەکات پاش ئەو هەموو ماوەیەی کە کوردەکە باسی کردوە، کەچی سەرسامی عەرەبەکە دەبێت، وەك بڵێی پێشتر نەیبیستبێت!

ئەوەی وتارەکانی کامیار سابیر بخوێنێتەوە کە بەو دواییە لە داکۆکی کردنی کوێرانەی لە ئەرمەنەکان نووسی، باوەڕ ناکات ئەوە کوردێك بێت وا بەو ڕوحیەتە ئەرمەنیە قسە بکات! هەتا ئەرمەنیکیش بیخوێنێتەوە باوەڕ ناکات کوردێکی فریودراو و خۆ لێ گۆڕاو نووسیبێت! ئەو پیاوە کە دەماری چەپڕەوی کۆنی بە ناوی مرۆڤایەتیەوە زیندوو بوبوەوە، لەبەر قەبول نەکردنی هیچ گفتوگۆیەك سەدان کەسی ئەنفرێند و بلۆک کردوە، هەندێکیان کە بەژداری گفتوگۆکەشیان نەکردوە، هەندێکیشیان بەس لەبەر ئەوەی لایکێکیان بۆ نوسینێکی من کردوە ! هەندێکیان چونکە تەنکە ڕیشێکیان هەبووە، هەندێکیان کەسانێکی سێکیولار و لیبڕالیشن! لیی تێکچوە و تانکی قەلەمەکەی چاک وخراپی لە ژێر زنجیری خۆی وردوخاش کردوە!

دەشڵێت من ئەوانەم بلۆك کردوە "کە داکۆکیی لە فاشیزم لە راسیزم دەکەن، نکۆڵیی لە جینۆسایدی ئەرمەنەکان دەکەن و چەتە ئەرمەنەکان بە تاوانبار دەزانن و پاکانە بۆ سوڵتان عەبدولحەمید و ناسیۆنالیزمەکەی ئیتیحاد و تەرەقیی دەکەن!"

لەو ئێوارە کۆڕەی ڕۆژی ٢٠١٥ /٤/٢٨ کە بەژداربووین بە بۆنەی یادی سەد ساڵەی جێنۆسایدی ئەرمەنەکان و کۆمەڵکوژیەکەی قەڵادزە پێکەوە بەڕێوەچوو لەلایەن ڕێکخراوی

Universal Peace Federation-UK لە موداخەلەیەکی چەند خولەکیدا چەندین خاڵم وروژاند بۆ لایەنی ئەرمەنی، کە ئەوانەبوون: ئەگەر هاتوو کوردستانیش دانی بە جینۆسایدی ئەرمەنەکان. کرد، دوایی چ. ڕوودەدات؟! ڕاستە دەڵێن داوای نیوەی زیاتری کوردستانی باکوور دەکەن؟! ئینجا گووتم ئێوە بەرلەوەی داوای دان پێداهێنان لە خەڵکی تر بکەن ئەی نابێت چاو بە مێژووی خۆتاندا بخشێننەوە، نابێت بزانن کێ ئێوەی تێوەگلاند لەو جینۆسایدە، لە قەشە و سەرکردە دینیەکانتان؟! من ناڵێم تورك ودەوڵەتی عوسمانی بێ گوناهن، نەخێر زۆریش تاوانبارن، بەڵام سەرکردە دینیەکانی ئێوەش ڕۆڵی نێگەتیڤیان نەبوو؟! کە پاڵیان بە ئێوە نا بۆ ناو ئەو بارودۆخە مەترسیدارە؟!

دوایی دوو بە دوو بە ڕێوەبەر و قسەکەری سەرەکی ئەرمەنەکانم گووت: چۆن بێ دەنگن لە سەرکردە دینیەکانیان لە ناو دەوڵەتێکی زۆربەی موسلمان و ئیسلامی، قوربانی بە میللەتیکی کەمینە دەدەن و دەدەنە پاڵ دوژمنانی دەوڵەت؟! ئەی نازانن ئەوە دەبێتە بیانویەك بۆ دەسەڵاتی دینی وسیاسی بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە قێزەونەی کە کرا دژی ئەرمەنەکان؟!

پێیمگووت: باشە ئێوە کە باسی بەژداری کورد دەکەن لەو جینۆسایدە، نابێت بزانن کە ئەرمەنە چەکدارەکانی بەر لەشکری ڕووس چ تاوانگەلێکیان دژی کوردان ئەنجام داوە و تا تێبگەن لە کاردانەوەی بەشێك لە کورد؟!

لە خوا بەزیاد بێت ئەوەی گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد ئەرمەنێکی رەسەن بوو، و کامیارێکی دەروێشی کورد نەبوو دەنا هەزار تۆمەتی کامیارانی بۆ ڕێز دەکردم !خودا شاهێدە ئەو پیاوە ئەکادیمیەی زانکۆکانی بەریتانیا، و ئەرمەنێکی ڕەسەن وخەمخۆری دۆزی ئەرمەنە، بەوپەڕی سنگفراوانیەوە وەڵامی پرسیارەکانی دەمەوە لەسەر سنوری کوردستان و ئەرمەنستان، بەڵام بەوپەڕی سەماحەتەوە دانی بە هەڵەکانی خۆیان هێنا لە سەرکردە دینیەکانیان و لە دەستدرێژی کردنە سەر کورد، بە منی گووت: بەڕێزم بۆیە گفتوگۆ گرنگە هەبێت لە نێوانمان تا لە یەکتر فێربین، ئەم ئێوارەیە تۆ وات لە من کرد بە زۆر لە قەناعەتەکانم دابچمەوە سەبارەت بە دۆزی ئەرمەن.

ببینە وەڵام و هەڵوێستی ئەرمەنێکی ڕەسەن چۆنە، و جوێن و تەشهیرەکانی کامیار سابیری دەروێشی شیعاراتەکانیش چۆنە؟! تازە ترسم لیی نەماوە منیش بەر شاڵاوی بلۆکی کەوتووم.

خەندان03-05-2015

## كورد و ئەفسانەكانی كوشتارەكەی ئەرمەن

بەشی یەكەم

دەیەها ساڵە ڕۆشنبیری كورد بەو پەڕی نەزانیەوە مێژوی خۆی هەڕاج دەكات وپۆزش بۆ دوژمنانی دەهێنێتەوە، بێ ئەوەی لە وردەكاری مێژوو وئەو سەردەمە گەیشتبێت.

بە داخەوە بەشێكی زۆری ڕۆشنبیری كورد وادەزانن، خۆ نیشاندان وەك كەسانێكی پێشكەوتوخواز و سێكیولار بە نەفرەت كردنەوە دێت لە هەموو كلتور و مێژووی با وباپیرانمان، دەیانەوێت بە چاویلكەی ئەمڕۆی سەدەی بیست ویەك مێژووی سەدان ساڵی كورد بخوێننەوە! هەر بۆیەش دەیانبینیت لاوازترین وبێ ئەرزشترین خەڵكن لەناو كۆڕی ڕۆشنبیران. كەس بەقەد ئەو ڕۆشنبیرە كوردانە لە مێژوو دابڕاو و بێ بناغە و لەرزۆک نین لە بەراوردا لەگەڵ ڕۆشنبیرانی میللەتی تر، كە هەرگیز بە وا بە ئاسانی دژی مێژووی خۆیان نادوێن. چونكە حەزی بە دین نییە، دەیەوێت چواردە سەدە لە مێژووی میللەتەكەی نەفی بكات، زۆر بە سوكی سەیری ناودارانی و هەڵكەوتوانی دەكات، لەبەر خاتری پروپاگەندەی مەزهەبی شیعی و فیكری قەومی خەیاڵی ڕقی لە سەلاحەدینی ئەیوبیە، لەبەر پروپاگەندەی مەسیحی و بازنە ئیمپریالستەكان هەزاران نەفرەت دەبارێنێتە سەر سمكۆی شكاك، هەرچەندە ئەو كەڵە سەركردەیە بوە هۆی ڕزگاركردنی بەشێكی زۆری كوردستان لە پلانێكی ئاسوری وئیمپریالی! ڕقی لە خەلافەتی دەوڵەتی عوسمانیە، بۆیەهەموو تۆمەت واتە واتی ئەرمەنەكان لە دژی كوردەكانی نێو دەوڵەتی عوسمانیش پێ قبولە!

ئەوەی لەو وتارە گرنگە لای ئیمە باسی كۆمەڵكۆژیەكەی ئەرمەنە، كە سەد ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، كەچی كورد لەو ڕۆژگارە خەریكە زۆر گەرمتر لە جینۆسایدی ئەنفالی ٢٧ ساڵەی [١٩٨٨] خۆی یادی دەكاتەوە! ئەو بەپیرچوونە گەرمەش لە ژێر كاریگەری وەهمێكی مێژووییە، گوایە ئێمەی كوردی موسڵمانی دەمارگیر، هەر لە خۆڕایی لەبەر خاتری خەلیفەی موسڵمانانی عوسمانی كوشتاری ئەرمەنە مەسیحیە ئاشتیخواز و پەپولەكانمان كردوە شان بە شانی سوپای تورك! نازانن هەتا ئەو كوشتاریە لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانی نەبوە بەمانا هەقیقیەكەی چونكە سەردەمی حوكمی ئیتئحاد وتەرەقی بوو كە لە ساڵی ١٩٠٨ وە كودەتای كرد بەسەر خەلافەتی عوسمانی، حوكمێكی سەد دەرسەد جیای دامەزراند لە شوێنی كە سێكیولاریەتی فەرەنسی بوو!

-كارەساتەكانی كورد وئەوانەی خەڵك لێك ناچن!

بە نسبەت كوشتاری ئەرمەنەوە، لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤێك لە ئێمە دەبێت ئیدانەی ئەو كوشتارەی

ئەرمەن بكات و نوسەری ئەو دێرانەش بە توندترین شێوە ئیدانەی دەكات، بەڵام ئیدانە كردنی دەبێت بە شێوەیەكی هاوسەنگ و زانستیانە و واقیعیانە بكرێت، نەك بە ڕووحیەتی تاوانبارێكی پەشیمان بووەوە. ئەرمەنەكان دەیانەوێت بۆ خەڵك كەیسەكەیان وا وێنا بكەن، كە خەڵكێكی هەژار و بێ وەی، لەبەرئەوەی مەسێحی بوون، موسڵمانان فەتوای قڕكردنیان دەركردن، توانیتیان خەڵكێكی زۆر بەو ئەفسانەیە بهێننە باوەڕ، و هەتا ڕۆشنبیرە كوردە ڕۆژنامەوانیەكانیش باوەڕیان كردوە بەو ئەفسانەیە لەبەر تەنكی ئاستی فەرهەنگیان.

نەخێر وانیە ئەرمەنەكان وەك خەڵكی كوردستان و هەڵەبجە و ئەنفالستانی كوردستان نەبوون، بێ گوناه و بێ تاواندانی تاوانی دژە مرۆیی ئەو تاوانە كۆمەڵكۆژیەیان لە دژیدا بكرێت. كورد لەوەتی هەیە كۆمەڵكۆژیەكی دژی میللەتێكی تر نەكردوە، هیچ كوشتاریەكی گوندی تورک و فارس و عەرەبانی نەكردوە وەك دەستپێكەر وكەڵەگایی. لە عێراق بۆ نمونە كورد گوندێكی عێراقیەكانی كۆمەڵكوژ نەكردبوو، لەگەڵ دوژمنەكەی كە سوپای عێراق و عەشایرە عەرەبەكانی ڕژێم بوون زۆر بە بەزەیی تر بوون لەگەڵ خۆبەخۆ! ئەو غەدر و ستەم و نامرۆییەی لە شەڕی نێوان حزبە كوردیەكان ڕوویانداوە، چارەگی بەرامبەر دوژمن نەكراوە! لە هەموو جیهان بگەڕێیت، كەس بە قەد كورد ستەملێكراو و بەدبەخت نییە، دەیان و سەدان كوشتاری لە دژدا كراوە، بێ ئەوەی كوشتاری كردبێت، بۆیە گاڵتەم بەو لێكچواندنانەی كوشتاری كورد دێت بە هی خەلكیتر، چونكە خەڵكیتر وەك كورد بێ وەی نەبوون، بەڵكو لە ئەنجامی كاردانەوەی كارە دڕندەیەكانیانەوە تووشی كوشتاری بوون، نەك وەك كورد چۆلەكەیەكی دوژمنیشی لە ئاو نەكردبێت، بۆمبێكیشی لە شارێكی عەرەبی نە تەقاندبێت، گوندێكی دوژمنی ئیبادە نەكردبێت، كەچی وا بێ ڕەحمانە هەوڵی جینۆسایدكردنی بدرێت!

كەس وەك كورد وكارەساتەكانی موستەهەقی فرمیسكی مرۆڤایەتی نییە، كورد هابیل و ڕۆڵەی شەرعی كوڕە پاكەكەی ئادەمی قورئانە كە دەڵێت: ]لئن بسگت إلي يدك لتقتلني ما أنا بباسگ يدی إليك لٌقتلك إني أخاف الله رب العالمين[" ئەگەر تۆ دەست درێژكەیت بۆ كوشتنم، من دەسیت ناجوڵێنم بۆ كوشتنت، من لە خوای بوونەوەر دەترسم"

بۆیە بچوكایەتیە بۆ كورد كارەساتی هەڵەبجە بە كارەساتی هیرۆشیمای ژاپۆن بچوێنێت، ساویلكانە بە هەڵبجە بڵێ هەڵەبشیما! وادەزانی هەنگی لە كلۆرە داری دۆزیوەتەوە! كورد چی كردوە ئەو هەموو كارەساتەی بەسەر دەهێنن؟ چەند وڵاتی داگیر كردوە، چەند گەلی قڕ كردوە؟! چەند بۆمبی كیمیاوی وبایۆلۆژی لە میللەتانی تر داوە؟! كورد هەرگیز وەك ژاپۆنەكان، هێزێكی ئیمپریالی نامرۆ و بێ بەزەیی نەبوون، كە چەندین وڵاتی دەوروبەری خۆی بە چینەوەش داگیر كردبوو، سەدان هەزار،

بەڵکو ملیۆنەها قوربانی سڤیلی هەبوو، ژاپۆنەکان بەرلەوەی بە بۆمبی ئەتۆمی لێیان بدرێت، دڕندەترین تاقیکردنەوەی کیمیاوی و بایۆلۆژیان لەسەر خەڵکی سڤیل و دیلی جەنگ کردوە، لەلایەن یەکەی ٧٣١ لە سوپای یابان، بە دەستی هیرۆ ئیشی کە باوکی بۆمبی بایۆلۆژی دادەنرێت. سەدان هەزار ژنی ئەو میللەتانەی داگیریان دەکردن بۆ ڕابواردنی سوپا بەکاریان دەهێنان! ژمارەی قوربانیەکانی دەستی ژاپۆنیەکان بەس لە چین ٣٥ ملیۆن کەس بوو، ئەوە بێجگە لە قوربانیەکانی کۆریا و مەنشوریا و مەلایۆ و فلیپین و سەنغافورە وهتد ..

ژاپۆنیەکان زیاتر لە دوو هەزار جار چەکی کیمیاوی وبایۆلۆژیان بەکار هێناوە، لە یەك قەسابخانە ٣٠٠ هەزار کەسیان لە چین کوشتوە! کەوابوو شەرم نییە بۆ ئەو [ڕۆژمانە نووسانە] وەك فەرهاد پیرباڵ ناوی ناون، بەراورد بکەین لە نێوان هەلەبجە و هیرۆشیما؟! دڕندەیی ژاپۆنەنیەکان هێندە بێ سنوور بوو، لەوانەبوو هیچ نەیان وەستێنێت بۆمبی ئەتۆمی نەبیت! کەوابوو هەڵبشیمای چی؟ ! ژاپۆنیەکان حەدیان چیە بگەن بە بێ وەیی و پاکی و بێ زیانی کورد؟! حەدیان چیە وەك کورد لەوەتی هەن هەر دوژمن هەڵدەکشێنە ناو سنورەکانیان، هەر کوردە پاشەکشە دەکات بە شەرمەوە، غەیرەکان هەزار دومەڵ و کۆلۆنی شیرپەنجەییان لە خاکەکەی ڕواندوە، تا ڕادەی ئەوەی ڕێگای نیوان شارەکانیان بڕیوە!
27-04-2015خەندان

بەشی دووەم

-پەرۆشیەکی زێدەڕۆ لە ساویلکەییەکی لە ڕادەبەدەرەوە دێت پەرلەمانتارە موهەریجەکان! کورد نابێت هێندە ساویلکانە پەرۆشی کوشتارەکەی ئەرمەن بێت، وەك کەسانێك خەریکە بیکەنە دۆزی کورد، وەك ئەو چل پەرلەمانتارەی کوردی عێراق داوای دەرهێنانی بڕیاری بە جینۆسایدی کورد دەکەن! هەرنەبێت ئەرمەنیەکان خاوەن ئەرمێنیا یەکی سەربەخۆن، دەبا ئەوان کەرەمیان کردبا، هەڵەبجە وئەنفالیان بە جینۆساید ناساندبا! بزانە بیریشیان لێکردۆتەوە؟!

لێرەدا جیاوازی نێوان ڕۆشنبیری میللەتان و فشنبیر و "ڕۆژمانە نووسانی" کورد دەردەکەوێت! ئەخر هەی فەقیر حاڵینە ئەگەر ئەمریکا و دەیەها دەوڵەتی گەورە وبەهێز لە ترسی تێکچوونی پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیا نەوێرابن تا ئێستا باسی دان هێنان بکەن بە جینۆسایدی ئەرمەن و تورکیا دەتانەوێ کورد باسی بکات! ئەخر هەی نەزانینە نازانن لە حاڵەتی دان هێنان بەو جینۆسایدە، دان دەنێیت بە ئەرمەنستانی بوونی نیوەی کوردستانی باکوور بەپێی ئیدیعای نەتەوەپەرستە ئەرمەنەکان، کە ڕێژەیان لە چەند شارێکی کوردستان لە

١٨ %تێپەڕی نەداوە، تەنها لە وان دەگەیشتە ٣٠%؟! ئەخر هەی نەخوێندەوارینە نازانن دەبێت تا ماون سواڵ بکەین بۆ ئەوەی قەرەبووی زیانەکانی ئەرمەن بکەینەوە لە سایەی ئەو بە تاڵان بردنەی سەروەت وسامانمان!
ئاخر بۆ کە کوردێك لە تورکیا و دەرەوەش کارێکی باش دەکات، هەموو جیهان دەڵێن تورکێك کارێکی باشی کرد، کەچی کاتێ کارێکی وا خراپ ڕوودەدات کوردتان بەبیر دێتەوە، هەرچەندە کورد ئەو کەمەی بەژداریشی کردبێت، بە بڕیار و پلان داڕێژتنی دەسەڵاتی تورکیەوە بووە!

کورد لە ئەرمەن کەمتر قوربانی نەبوە بە دەستی ئەرمەنەکان، دەکرێت هاوسۆزیەك نیشانیان بدەیت، لەگەڵ هاندانی ئەوانیش ئاوڕ لە مێژووی خۆیان دەنەوە بە شێوەیەکی بابەتیانە.

ئەو کەمپەین و ئیمزا کۆکردنەوەی لەلایەن ڕۆشنبیر و سیاسیەکان دەکرێت بۆ مەسەلەی کوشتارەکەی ئەرمەن، زیاتر لەو لادێیە دەچێت کە لە شاردا فریو دەخوات، و هێندە فاسید دەبێت، تا کوڕی شار هەڵەیەک داوێن پیسیەك دەکات ئەو دە داوێن پیسی و هەڵە دەکات، بۆ ئەوەی گرێی هەست بە کەمکردنی قەرەبوو کاتەوە! کەسانێکی چەپڕەو و تازە لیبراڵ هێندە بەپەرۆشن بۆ  چەمکەکانی مافی مرۆڤ و جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ و شتی تر،لەبەر رابردووی ئایدیۆلۆژیە سەرکوتکەرەکانیان، هەرچەندە ئەوە شتێکی خراپ نییە، بەڵام نەك وەك لادێیەکە زیادەڕەوی تێدا بکەیت، بۆ سەلماندنی لێهاتووی خۆت لەو مەیدانە بتەوێت کورد تێوەگلێنی لە گۆبەندێك کە خوا دەزانێت چ دەرەنجامێکی تاڵی لێدەکەوێتەوە!

ئەگەر داواکردنی لێبوردن لە جینۆسایدکردنی گەلێك هێندە ئاسان با بۆ نەتەوەیەکی بێ قەوارەی سەربەخۆی وەك کورد، دەبوایە فەرەنسا بەر لە هەشتا ساڵ زیاتر داوای لێبوردنی لە جەزائیریکان کردبا، کە فەرەنسا لانکی دیموکراتیە!

ئەگەر هێندە ئاسان با دەبوایە ئینگلستان داوای لێبوردنی لە نیوەی جیهان کردبا و کە بە سەدان هەزار کەسی لە کۆلۆنیەکانی کوشتوە!

یا دەبوایە ئەمریکای زلهێز داوای لێبوردنی لەو ملیۆنەها هیندیە سوورانە کردبا، کە ئێستا تاک وتەرایان ماوەتەوە وەك کەل وپەلی مۆزەخانەیەك نیشانی جیهانیان دەدات!

سەیر لەودایە چل پەرلەمانتاریکی کورد بەوپەڕی ساویلکەیی و بێ سەوادی سیاسی خەریکی هەڵمەتێکن بۆ دەرکردنی بڕیارێك بۆ دانهێنان بە جینۆسایدی ئەرمەن  !نازانن لە کاتێکدا دەیان دەوڵەتی گەورەی دوور لە سنووری تورکیا،  بە ئەمریکاوە خۆی لەو باسە دەبوێرێت،

لە ترسی تێکچوونی پەیوەندیەکانیان لەگە تورکیا، کەچی کوردستانێکی بێ سەربەخۆ و تەنراو بە دوژمن وناحەزان، هاوسنووری تورکیا دەیەوێت ئەو دەوڵەتە سەخڵەتبکات لە کورد و زیانێکی زۆر لە خەلکی کوردستان بدات، ئەگەر ئابلۆقەی خستە سەر!

دەستی ئێران و سیاسەتی پاشکۆیەتی بە ئاشکرا پیوە دیارە، دەنا کوردستانێک خەریکە خەڵکەکەی لەبەر بێ موجەیی وشەڕی نەگریسی داعش کە یەخەی گرتوون، ئینتیحاری جەماعی بکەن، هەقی چیە بە کوشتارەکەی ئەرمەن و دەرهێنانی یاسایەک لە پەرلەمانی کوردستانی باشوور؟ !

سوارەی حەمیدی ج بوون؟
سەیر لەوەدایە کەسانێکی وەك کامیار سابیر و چەپرەوە هاوڕێکانی، لەبەر سەرقاڵ بوون بە زاراوەی قەبە قەبە وبێ ئاگا لە مێژووی کورد، دەڵێن سوارەی حەمیدیە جاش بوون، ناو لە هەر کەسێکیش دەنێن جاش کە وەک ئەوان بیر نەکەنەوە، ڕاستیەکەی من ناڵێم پێشمەرگە بوون، جونکە هێشتا کوردایەتی بە مانا هەقیقیەکەی سەری هەڵنەدابوو، بەڵام جاشیش نەبوون وەك جاشەکانی سەدام یان ئێران یان قورەچیەکانی تورکیا، ئەوەی پێی جاش نەبن، و بەو دەبەنگیەی ئەوان ڕازی نەبێت بە سوارەی حەمیدیە ناوی دەبەن!

ڕۆشنبیری کورد بەبێ خوێندنەوەی مێژوویی و هەل ومەرجی ئەوکاتەی کێشمەکێشی دەوڵەتی عوسمانی و ڕوسیای قەیسەری لەسەر سنوری ئەنادۆڵ و ویلایاتی شەرقی کە کوردستانی باکور دەگریتەوە، یەکسەر سوارەی حەمیدیە بە جاش لە قەڵەم دەدەن !ڕاستیەکەی بوونی سوارەی حەمیدیە لەو ناوچەیە ئەگەر عوسمانیەکان بۆ مەرامی سیاسی و عەسکەری خۆشیان دروستیان کردبێت، بەڵام بۆ پاراستنی کورد لەو ناوچەیەی سەر سنوری شەڕی ڕوسیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زۆر گرنگ بوو .بەڕای من هەڵەیە بڵێین سوارەی حەمیدیە جاش بوون، چونکە جاش وەك دەزانین هەردەم بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەکانی ڕزگاریخوازی کورد پێکهێنراوە، هێشتا هیچ بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی دروستیش نەبوبوون. سوارەی حەمیدیە کە سولتان عبدالحمید پێکی هینا لە ساڵی ١٨٩١ وەک لاسایی کردنەوەیەکی هێزی قوزاقەکانی ڕوسیا بوون، بۆ ئەوەی بەکاریان بهینیت لە جەنگی سەر سنوور ودەستدرێژیەکانی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنیەکان. ئەگەر کورد ئەو هێزەی نەباڵە هەل ومەرجی ئەو کاتە، بۆی هەبوو بەدەستی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنیەکان ئیبادە کرابان.

کورد هاوڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بوو ئەو کاتە، دەوڵەت بۆی هەبوو داوایان کات بۆ سەربازیش، ئێستا پێشمەرگە بە بەشێك لە هێزی بەرگری چەکداری عێراق حسێب دەکرێت، ئایە پێشمەرگە جاشی حکومەتی عێراقە؟! ئەوەتە ئەمڕۆ هەواڵێکمان خوێندەوە کە حەشدی

شەعبی دڕندە داوا دەکات پێشمەرگە ببێتە هێزێکی سەر بەو !لێرەدا نامەوێت بڵێم سوارەی حەمیدیە نمونەیی بوون لە ڕەفتارەکانیان، نەخێر زۆر هەڵە وستەمشیان دەکرد لە ئەرمەن و ئاسوری وکوردیش هەتا! بەڵام لەو هەل ومەرجەی ئەوکاتە نەبوونی هێزێکی چەکداری وەك سوارەی حەمیدیە کوردی دەکردە پاروەکی چەوری هێزەکانی ڕوسیا و ئەرمەنەکان. سوارەی حەمیدیە نەك جاش نەبوون، بەڵکو لە ئەنجامی دان نەهێنانی کورد بە دەسەڵاتی مەرکەزیەوە دروست بوون، وە هێزێکی نیمچە نیزامی.

02-05-2015خەندان

## کوردستانی سوریا: نکوڵی بورهان غەلیۆن و کەمتەرخەمی کورد

ئەوە یەکەم هەڵەی بورهان غەلیۆن نییە بەرامبەر کورد، لەپاش هەڵگیرسانی شۆڕشی گەلانی سوریا، کاتێ لە ئۆکتۆبەری ٢٠١١بورهان غەلیۆن لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ کەنالی دوتشەڤێلی ئەڵمانی؛ کوردی لە سوریا وەک کۆچبەرانی ئاسیاوی فەرەنسا شوبهاند بە نەفەسێکی شۆڤینی کە ئەوەی غەلیۆن بناسێت توشی ڕاتەکانی دەکات. ئێمە بە حوکمی هاوسۆزیمان لەگەڵ شۆڕشی گەلانی سوریا ئەو لێدوانە زۆر ئازاری داین، بەڵام هێندەی نەبرد لە ٢٠١١/١٠/٢٨ بورهان غەلیۆن لە فەیسبوک وئەنتەرنێتەوە لێبوردن نامەیەکی ئاراستەی کورد کرد لەمەڕ لێدوانەکانی کە ئەو وروژانەی ئەو کاتەی کپ کردەوە، هەرچەندە من نیشانەیەکی پرسیاری گەورە لە زیهنمدا لەسەر ئەو پیاوە دروست بوو.

بەڵام هێشتا ئەوەمان لەبیر نەچۆتەوە وسەرەڕای هاتنیشی بۆ کوردستانی عێراق کەچی لە چاوپێکەوتنەکەی [ڕوداو] دا لەو مانگەی ئەپریلی ٢٠١٢، ئەگەر ڕاست بێت وبەتۆمارکراوی چاوپێکەوتنەکە هەبێت، ئەوە ئەوەی ئەو وتویەتی لە قسەی نوسەرە موخابەراتەکانی ڕژێمی سوریای وەک منذر الموصلي وئەمسالەکانی دەچێت وەک لەوەی لە قسەی ڕۆشنبیرێکی عەلمانی لیبڕال ودیموکراتخواز، کە سەر زمان وبن زمانی مافی مرۆڤ وباسی عەقڵ ودژایەتی کردنی تێروانینە نا دیموکراتیک وسەلەفی وئسوڵیەکانە. بورهان غەلیۆن لەو چاوپێکەوتنەدا دەستەواژەو و ناوی )کوردستانی سووریا(ی قبوڵ نییەو دەڵێ "شتێك نییە بەناوی کوردستانی سووریا، ئەمە گواستنەوەی نموونەی عێراقە. .. سەبارەت بەداواکردنی فیدرالی لەلایەن کوردەکانی سوریاوە وتی "کورد نابێ وابەستەی وەهمی فیدراڵی بێ، چونکە سوودی نییەو وا پیشاندەدات کە کورد داوای جیابوونەوە دەکات". هەروەها دەڵێ ئەوان ئامادەنین دوای رووخانی رژێمی بەشاری ئەسەد ئۆتۆنۆمیش بدەنە کورد "ئێمە ئۆتۆنۆمی قبوڵ ناکەین، چونکە هیچ هەرێمێك نییە لەسووریا کە رێژەی 100%ی دانیشتووانی کوردبن"!! کەوابوو نیمچە فەیلەسوفێکی وا بەو شێوەیە قسە بکات بۆ دەبێت ئەتاتۆرک وژەنەڕاڵە کەمالیستەکان وکەمالیستەی ئاینیەکەی ئۆردۆگان وسەدام وحافز ئەسەد مەعزور نەبن لە چەوساندنەوەی کورد دا؟!

من دەمێکە ئاشنایەتیم لەگەڵ بیر وهزری غەلیۆن دا هەیە لەوەتی بۆ یەکەم جار کتێبی [نقد السياسة: الدولة والدين]م خوێندەوە لە لەندەن پێش نزیکەی ٩ ساڵ، بەڕاستی ئەوەی گوێم لێدەبێت لەسەر دەمی ئەو ڕۆشنبیرە [حداثوی] یە لەوەتی هەڵگیرسانی شۆڕشی سوریا مرۆڤ توشی سەرسوڕمانێك وگومانێکی گەورە دەکات لە بورهان غەلیۆن و لە خودی خۆمیش! سەرسوڕمانی من لەو کەڵە ڕۆشنبیرە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە چۆن سیکیولارستێکی ڕادیکاڵی وخاوەنی ئەو ناونیشانە قەبە وزلانەی وەك:

(المسألة الطائفية ومشكلة الأقليات، ثقافة العولمة وعولمة الثقافة، بيان من أجل الديمقراطية، اغتيال العقل، مجتمع النخبة، نقد السياسة: الدولة والدين) کە بەڕاستی هەمووی کتێبی ناوەرۆکدارن بە دەستی ئەکادیمیەکی گەورە وپسپۆر لە بواری سۆسیۆلۆژیای سیاسی لە زانکۆی سۆربۆن - کە لانکی بیری فەلسەفی ودیموکراتیە لە فەرەنسا- نوسراون، توشی سەرسوڕمان دێت، کە ئەو خاوەن چەندین دکتۆرایە بە زارزمانی نایب عەریفێکی وەك [عەلی حەسەن مەجید] قسە دەکات، بەو پەڕی ناهەستیارانەی نەفامانەوە، بەبێ ئەوەی هەست بەو زامە مێژوویە گەورەیەی کورد بکات لە دەستی سیاسەتە بەد وشۆڤێنیستەکانی ڕژێمی بەعسی بۆگەن کە دەگاتە ئاستی قڕتێخستن وجینۆسایدی مەعنەوی، یان بەبێ ئەوەی هەست بە دزێوی لە دەربڕینی ئەو قسانە کە هێشتا تەنها ئۆپزسیۆنێکی دەرەکیە ولە زۆربەی خۆپیشاندانەکانی ناوەوە وچاوپێکەوتنەکان لەگەڵ شۆڕشگێرانی ناوەوە سەدان جوێن وتەوهینی پێدەکرێت لەبەر بەد هەڵسوڕاندنی ئەنجومەنی نیشتیمانی ئەستەنبۆڵی وەک ناحەزانی ناوی دەنێن، چونکە بۆ کورد وزۆر کەسانی تریش ساغ بۆتەوە کە ئەو ئەنجومەنی نیشتیمانی یە سەرەڕای بوونی ڕەگی بەعسیزم لە خودی خۆیان تورکیا وئەردۆغانیش دەرسی شۆڤێنیەتی کەمالیزمیان دادەدەن، وکێشەی کوردی سوریایان بۆ کردونەتە خەتی سور. ئەگەر نا چۆن ڕۆشنبیرێکی سێکیولاریستی نیشتیمان پەروەر دەربارەی کورد دەڵێت: " ئەگەر هاتنە ناو ئەنجومەنی نیشتیمانی چاکە، گەر نەهاتنیش ئەوە چش!!" وەک کوردەکانی سوریا لێیدەگێڕنەوە.

کە گومانیش لە خۆم دەکەم، تۆ بڵێی ئەو بورهان غەلیۆنەی کە من چەند کتێبێک وچەندین وتاریم خوێندۆتەوە هەمان ئەو بورهان غەلیۆنە بێت کە من بەزۆر لە تەرحەکانی سەرسام دەبووم؟! تۆبڵێی وەک فیلمەکەی عادل ئیمام نەبێت کە دوو دەور بوون، ویەکێکیان تا سەر ئێسقان ڕۆشنبیر وناسک وخاوەن بڕوانامەی بەرز وئاشتی خواز وهەقبێژ وئەوی تریان تا سەر ئێسقان لۆتی وشەڕانگێژ وتاوانکار؟! شتێکی تریش پێویستە بگوترێت ئەوەیە کە کوردەکانی سوریا نابێت لەبەر چەندین هۆ و هۆکار هەمان ئەزموونی کوردستانی عێراق بگوێزنەوە بۆ کوردستانی سوریا، چونکە نەك هەر غەلیۆن، بەڵکو ئاپۆ [عەبدوڵڵا ئۆجلان] نیش تا دوا ڕۆژی لە ژێر سایەی موخابەراتی سوریا نکولی لە بوونی کوردستانی سوریا دەکرد و زۆر لە لێکۆڵەرە عەرەبەکان گەواهی بە قسەکانی ئەو دەهێننەوە!

خالید بەکداشی دامەزرێنەر وسەرۆکی حزبی شیوعی سوری تا مردن بەهەمان شێوە کێشەی کوردی بە دژی یەکێتی خاکی سوریا وجیاوازی نانەوە دادەنا! بەڕای ئێمە شۆکێکی زۆر گەورەیە بۆ جەوی سیاسی گشتی لە سوریا داوای فیدراڵیەت بکەیت، چاکتر وایە هەوڵی زامنکردنی هەقی یەکسانی مرۆیی وفەرهەنگی نێوان کورد وعەرەب زامن بکرێت لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیەکدا چاکترە لەوەی کورد لەو قۆناغە دابڕێت لە شۆڕشی گەلانی

سوریا، چونکه ئه‌و دابڕانه به قازانجی ئه‌سه‌د وڕژێمه‌که‌ی کۆتایی دێت که له مه‌رگ زیاتر هێچی پێ نییه بۆ کورد، له یادیشیان نه‌چێت که کوردستانی عێراقیش دروشمه به‌راییه‌کانی لامه‌رکه‌زیه‌ت وئۆتۆنۆمی بوو دوایی باسی فیدرالّیه‌ت هاته ئاراوه.

کورد له سوریا پێویستی به کارێکی زۆر هه‌یه بۆ ڕاکێشانی سه‌رنجی سوریه‌کان ونوخبه‌ی رۆشنبیر بۆلای خۆیان، چونکه وه‌ك ده‌رده‌که‌وێت هه‌تا غه‌لیۆنیش شاره‌زاییه‌کی ئه‌وتۆی نییه له‌سه‌ر کورد وکێشه‌که‌ی، هه‌رچه‌نده پیاوی فیکر و قه‌ڵه‌مه، به‌ڵکو که‌ڵه شۆڕشگێڕ ومافناسێک که زۆربه‌ی ژیانی خۆی له زیندانه‌کانی به‌عسدا به‌سه‌ر بردوه [هه‌یسه‌م مالح] به شۆڤێنی ناوی ده‌برێت، ، تۆ بڵێی ئه‌و جه‌هل وته‌جهیله خه‌تای کوردیشی تێدا نه‌بێت؟ ئه‌گه‌ر نوخبه‌کانی سوریا وابن ئه‌ی ده‌بێت مرۆڤه ئاساییه‌کان بۆچوونیان چۆن چۆنی بێت.؟!

٢٠١٢/٤/١٩

## مێژووی کورد و نەورۆز بە خاترجەمییەوە شاباشی بێگانە دەکەن

وەقتێ وەکو شەهسەوارێ خاوەر تەعویل دەکرد دە ماهێ ئازەر
یەعنی کو دەهاتە برجێ سەرساڵ قەت کەس نەدەما دە مەسکەن و ماڵ
بیلجوملە دەچوونە دەر ژماڵان حەتتا دەگەهیشتە پیر و کاڵان
ڕۆژا کو دەبوویە عیدێ نەورۆز تەعزیم ژ بۆمە دەما دڵ ئەفرۆز

ئەحمەدی خانی

### وڵاتان شەڕی فەلافل و حومس دەکەن!

ماوەیەکە لوبنان و چەند وڵاتێکی تری عەرەبی لەلایەک و ئیسرائیل لەلاکەی تر شەڕی خاوەنێتی فەلافل و حومس و تەحینە و تەبولە دەکەن، کە چەند خواردەمەنیەکی ڕۆژهەڵاتی بەناوبانگی ناوچەکەن، ئێستا ئیسرائیل دەیەوێت بەناوی ناندینی ]مەتبەخی[ ئیسرائیلیەوە بانگەشەیان بۆ بکات، و لە حالی حازردا ئیسرائیل لە عەرەب زیاتر سودی لە بەرهەم هێنانی ئەو خواردەمەنیانە کردوە وبەرهەکانی پڕی سوپەرمارکێتەکانی ئەوروپایە! هەرچندە هەموو کەس دەزانێت کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی عەرەبین. ئەو شەڕە ڕۆژانە باس دەکرێت خەریکە وڵاتە عەرەبیەکان دەیبەنە نەتەوە یەکگرتوەکان وئیسرائیل تاوانبار دەکەن بە دزینی کلتوری ئەوان ودانە پاڵ خۆی.

لە کاتێکدا ئەو وڵاتانە شەڕ لەسەر فەلافل و حومس وتەحینە وتەبولە دەکەن، کەسانێکی کورد ئامادەن کلتور و نەورۆزی کوردی شاباشی نەک تەنها فارسەکان بکەن بەڵکو دەیخەنە پاڵ فیرعەونیەکان وقیپتیەکان ویەهود وسەڵیبیەکانی جیهان دەڵێی زمانی خیتابی بن لادنی [قاعیدە] بەکار دەهێنن لە شەڕی نەورۆزدا .

سەیر لەوەدایە ئەو برادەرانە پاش ئەوەی نەورۆز وا بێبەری دەکەن لە کورد دێن وگلەییش دەکەن کە ئۆباما لە نەورۆزدا تەنها پیرۆزبایی لە فارسەکان کردوە ولە کوردی نەکردوە هەرچەندە کورد لەسەردەمی حەسەن زیرەکەوە نەورۆز دەکەن! جارێ با ئەو مەلایانە خۆیان خاوەندارێتی لە نەورۆز بکەن وئەو هەموو بەڵگە بێ ناوەرۆکانە نەهێننەوە لەدژی نەورۆز،وئینجا گلەیی لە ئۆباما بکەن! دوایی ڕاستیەکەی ئۆباما پیرۆزبایی ئاراستەی هەموو میللەتێك کرد کە یادی نەورۆز دەکەنەوە وبە تایبەتی گەلانی ئێران کە کوردیش دەگرێتەوە، دوەم هەربژی بۆ زانیاری یەکێك لەو مەلایانە کەوا بزانیت[کورد لەسەردەمی حەسەن زیرەکەوە نەورۆز دەکەن [!حەسەن زیرەک دوێنێ بوو، تۆ بۆ باسی حەزرەتی [خانی ١٦٥٠

١٧٠٧ ز] ناکەیت قەبری پڕی نور بێت که لەسەدەی شازدەوە باسی جەژنی نەورۆزی کردوە کە دەفەرموێ [رۆژا کو دەبوویە عیدێ نەورۆز] وشەی عید واتە جەژنی بۆ بەکار دەهێنێت بەبێ سڵەمینەوە، کەچی مەلاکانی خەتی سعودی سەلەفیەتی دەق پەرست گەورەترین هەرایان ناوەتەوە گوایە نابێت بەو ڕۆژە بڵێین: جەژنی نەورۆز !!بەپێی دەقەکانی سەلەفیەت بێت نابێت بە سەدام یش بڵێین دۆزەخی وەک چۆن گەورە ئیمامی سەلەفیەکانی میسر [ابو اسحاق الحوینی] دەڵێت: " سدام بەهەشتیە، چونکە دوا وشەی لە ژیاندا لا اله الا الله بوو!] کەوابوو ئەو هەموو قەتل وعامە و هەڵەبجە وئەنفال وکوشتاری شیعە وشەرەکانی ئێران هەمووی بەرِیشی ئەبو اسحاق وقەرەزاویش کە بەداخەوە هەمان قسەی کردوە!

-جیاوازی نێوان جەژنی [نیرۆ]ی قیپتی و[نەورۆز]ی ئاریایی

بەراستی ئەو هەڵوێست و رەفتارە نا شارستانیانەی کەسانێکی کورد لە ژێر پەردەی دینداریەوە دەرهەق بە نەورۆز دەیکەن، بەر لە هەر شتێك گوزارش لە نەزانینیان بە نرخی مێژوو وکاریگەری داستانی مێژوو بەسەر کۆ یادەوەری میللەتەکەیان دەکات. مەلاکانی دژە نەورۆز دەڵێن نەورۆز جەژنێکی قیپتی میسریە کۆنەکانە ولە سەردەمی فیرعەونیەکانەوە ئاهەنگی بۆ گێردراوە بەر لە ٤٧٠٠ سال پێش زایین، بێئەوەی بە چاکی بیخوێنەوە کە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان نەورۆزی کوردی وفارسی لەگەڵ [نیرۆس] قیپتی میسری کە عەرب بە هەڵە کردیانەتە ]نیروز]، ئەو مامۆستایانە بە پاڵنەرێکی ئاینی ڕووت پەلەی ئەوەیانە بە زۆری نەورۆز شاباش بکەن وبیدەنە پاڵ [هەر غەیرە کوردێك] وادەزانن بەدبەختیەکانی کورد هەمووی لە ژوور سەری نەورۆزدایە، بۆیە دەبێت لێی ڕزگار بین نە وەک بیروباوەڕی تەوحیدی ئاینیمان خەوشی تێبکەوێت !

کەنیسەی قیپتی میسری دەڵێن:" نیرۆز [نەک نەورۆز] جەژنی سەری ساڵی میسرییە ویەکەم رۆژی ساڵی کشتوکاڵیە و وشەی [نیرۆز] لە [نی-یارۆ] قیپتی هاتوە بە مانای ڕوبارەکان، چونکە ئەو کاتە لە ساڵدا کاتی تەواو بوونی وەرزی لافاوی روباری نیلە کە شادەماری ژیانی میسرە، کە یۆنانیەکان هاتنە میسر پیتی [س] یان خستە سەر ناوەکە بە عادەتی زمانەوانی خۆیان چۆن بۆ نمونە [ئەنتۆنی دەکەنە ئەنتۆنیۆس [بۆیە [نیرۆ] بووە [نیرۆس] و عەرەب وایانزانی نەورۆزی فارسیە "..صفحات خاصة بمناسبه عيد النيروز (رأس السنه القبطيه) http://st-takla.org

لە کتێبی [عيد النيروز أقدم عيد لأقدم أمه: للأغنسطس نبيل فاروق - مراجعه وتقديم الأنبا متاؤس] وەرگیراوە.

**-شاهنامەی فیردەوسی لە نێوان ڕاستی و ئەفسانەدا**

بە بۆچونی من وشەی [نەورۆز] بە هەموو شێوەکانی بەکار هاتنی زیاتر ئاماژەی بۆ وشەی جەژن کردوە و لەوانەیە لەسەرەتادا لە زۆر کۆنەوە بەر لە دەوڵەتی میدیا وفارسەکان جەژنێکی هاوبەشی گەل وتیرە ئاریا-ئێرانیەکان بوە وپاش دابەشبوونی ئاریایەکان بۆ چەندین گەل وهۆز هەرکەسەی بە شێوازی خۆی جەژنەکەی بەسەرکردۆتەوە وبە چەندین یادەوەری ورِوداو وئەفسانەیان بەستۆتەوە ، هەندێکیان بە سروشت نوێبونەوە وئەوانی تر بە شاکانیان و ئەوی تر بە ئەفسانەیەکی سەردەمی عەقلی سەرەتایی مرۆڤ، وهەیانیشە لە ئیلهامی ئەفسانەیەکی تر وەریگرتوە وهتد....ئەو بابەتانە زۆر ئاسانە بیسەلمێنین و ڕەتیشیان کەینەوە، چونکە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ مێژووی کۆنی ئەفسانەیی ونەنوسراوە وەك ئەوە نییە لەگەڵ مێژووی تۆمار کراودا.
میللەتانی زیندوو زوو بە زوو لەو مێژوو وئەفسانانەیان کۆڵیوەتەوە وبە بەرژەوەندی میللەتانی خۆیانیان باداوەتەوە، میللەتی خەوتو لەناو هەنگوینی بێ هۆشیاریدا وەك کورد، ئامادەیە بەخۆی بە دەستی خۆی مێژووی خۆی بداتە پاڵ ئەم و ئەو بەبێ بەرامبەریش، کێ هەیە بە قەد کورد قسە بە ناودارانی بڵێت؟ چ ڕۆژنامەوانێك ولێکۆڵەرێکی بیانی ماوە لەلایدا کورد قسەی بە سەلاحەدینی ئەیوبی نەدا بێت؟ !من دەیەها نمونەم بەرچاو کەوتوە. سەرکردە لە نەزەری کورد دەبێت سوپەرمان بێت، هیچ غەلەتی نەبێت، وهیچ کەموکورتیەکی نەبێت ووەک پێغەمبەرێك مەعسوم بێت تا ڕیزی لێبگیرێت، ئەوەش بێگومان مەحاڵە.

دەکرێت بڵێین مەسەلەی کاوە وزوحاك وکردنەوەی ئاگری ئازادی هەمووی لە بنەڕەتدا داستانێکی یان ئەفسانەیەکی کوردی نە نوسراو بێت وکورد لە بەدبەختی خۆی تۆماری نەکردبێت لەلایەن زانایانی لەوانەیە لەبەر هۆی ئایینیەوە یان لە نەزانییەوە، فارسەکان هەرزوو دەستی خۆیان وەشاند وزۆربەی ئەفسانە وداستانی ئارییایە کۆنەکانیان بۆخۆیان تۆمار کرد وبە هەوەستی خۆشیان دەسکاریان کردوە، بە بەڵگەی ئەوەی [جێمز مۆری] رۆژهەڵاتناس لەسالی ١٨١٢ زایینی لە سیاحەتنامەکەی باس لە یادکردنەوەی کوردان دەکات بەجەژنی رزگاری گەل لە ستەمی زوحاك.

هەروەها نوسەری کتێبی هاونەتەوەیی کورد وماد، حەبیبوڵڵای تابانی دەڵێت: عومەر خەیامی نیشابوریش لە کتێبی نەورۆزنامەی خۆیدا دەڵێت؛ " فەرەیدوونی کورد فەرمانی بە ئێرانیان دا تا ئەو ڕۆژەی زوحاک بەدیل گیرا، ئێران لەشەڕ وکێشەی ئەو ڕزگار بوو بکەن بەڕۆژی جەژن." ل ٧١.
لەجیاتی مێژووناسەکان بەو بەڵگانە وەڵامی ئەو کەسانە بدەنەوە کە دەڵێن نەورۆز هی کورد

نییە، کەسانێکی بەبیانوی دینداریەوە لەیەکەن تەقە تەسلیم دەبن بۆ هەر یەکێک هەر کلتورێکی کورد بەرێت، چونکە بەڕای ئەوان ناکۆکە لەگەڵ ئەندێشەکانی سەلەفی سالْح ! عەقڵیەتی سەلەفی سالْح بۆ سەردەمی خۆیان سالْح بوو، تۆ ناکرێت بەو عەقڵیەتە کار بکەیت کە نە دەقی قورئانە و نە حەدیسی پێغەمبەرە تا دنیاماوە. دەکرێت سودیان لێ وەرگرین بەڵام لاسایی کردنەوەی نوقتە وفاریزەی ئەوان کارێکی نەشیاوە.

ئەوە کاری مێژوو نوسانە بێن بەرگری لە مێژووی میلەتەکەیان بکەن، نەک مێژووناسان بێن بە عەقڵیەتێکی سەلەفی وشکەوە زۆربەی مێژووی کورد بشەیتانێنن.
سەیر لەوەدایە کورد لەبەر لاوازی گیانی نەتەوەیی و لەبەر ئەوەی بایەخی بە نوسین وتۆمارکردن نەداوە، هەتا یەکەم سەرچاوەی مێژویشی ]شەرەفنامە] بە فارسی نوسراوە کاتێك کە شاعیرێکی میللی ئێرانی [فیردەوسی [داستانی شاهنامە دەنوسێت کە لە جەوێکی ئەفسانەیی دا نوسراوە ووەک هەر داستانێکی تری وەک ئەلیادە وگەلگامێش وهیتر، تێیدا بە کەیفی خۆی کەسەکان ورِوداوەکان ئاڵ وگۆر دەکات هەتا زوحاکیش بەعەرەب لەقەڵەم دەدات وبەشێوەیەکی ئەفسانەئامێزانەش ئاماژە بە بوونی کورد دەکات، گوایە لەو منداڵە رزگاربوانە لە سەربرِینی زوحاک کورد دروست بوە
[کنون کرد از ێن تخمە دارد نژاد کز ێاد ناید بدل برش یاد]
[جا کوردەکان لە تۆرەمەی ئەو لاوانەن کە نەیاندەزانی ئاوادانی چیە] ل٧١ هاونەتەوەیی کورد وماد، حەبیبوڵڵای تابانی، وەرگێرانی جەلیل گادانی.

دەیەوێت بڵێت کە کورد لە فارسەوە وەپاش کەوتوە پاش هەڵاتنیان بۆ کێوەکان! لە بنەرِەتدا فارسن ولەدەست زوڵمی پاشای عەرەب رِایان کردوە، بە عەرەب کردنیشی دوژمنانی شا فارسەکان دەلالەتی خۆی هەیە ودەگەرِێتەوە بۆ رِوخانی شانشینی شایەکانی شاهنامەی فیردەوسی لەسەر دەستی عەرەبە موسڵمانەکان، شاهنامەی فیردەوسی جارێکی تریش ئاماژەی نێگەتیڤ بە عەرەب دەکات لە ل ٥٠ی چاپی عەرەبی دەڵێت : " دوایی عەرەبێک بەناوی دەربیس لە دژی کیکاوس هەڵگەرِایەوە لەدەوربەری شام، دوایی کیکاوس بەدەستی بەربەرەکان بە فێڵ دەگیرێت ومەملەکەت بێ شا دەمێنێتەوە ...دوایی ئەفراسیاب دەستی بەسەر دادەگرێت پاش شەرێک لەگەڵ [عەرەب"!]

سەفەویەکان لە بۆشاییدا نەهاتن، بەڵکو وەک بیرمەندێکی گەورەی ئێرانی سادق زیبا کلام بەراشکاوی دەڵێت: " لەوە دەچێت کە ئێمە وەک ئێرانی نوشوستە مێژوییەکانمان لە قادسیە بەر لە ١٤٠٠ ساڵ لەبیرنەکردوە !!"شیعەگەرێتیش کە پیشەسازیەکی ئێرانیە بە پلە یەک لە نوسخە سەفەویەکەی ئەویش گوزارشێکە لە رِقی فارسی نەژادی بەرامبەر ئەو [عەرەبە پێ پەتیانەی] کە ئیمپراتۆریەتی فارسیان رِوخاند.

ئه‌وه‌ له‌ كاتێكدا ئه‌بولقاسمی فیردەوسی له‌ چاو زانا ئاینیه‌ شیعه‌ توندره‌وه‌كانی ئه‌مڕۆ موسڵمانێكی چاكیش بوه‌ و زۆر به‌ڕیزه‌وه‌ش باسی ئیسلام وكه‌سایه‌تییه‌ سونیه‌كانیش ده‌كات وه‌ك ئه‌بوبوكر وعومه‌ر وعوسمان له‌ پێشه‌كیه‌كه‌یدا، هه‌رچه‌نده‌ تاوانباركراوه‌ به‌وه‌ی شیعه‌یه‌كی رافیزییه‌، به‌ڵام به‌ڕای من ڕاستر وایه‌ كه‌ موعته‌زیلی بوه‌ وكه‌ نوێنه‌ری هێڵی عه‌قلانیه‌ت ده‌كه‌ن له‌ ئیسلامدا به‌ به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی له‌ سه‌ره‌تای شاهنامه‌دا ستایشی عه‌قڵ ده‌كات وله‌ كۆتایش وه‌سفی عومه‌ری كوری خه‌تاب ده‌كات، ئه‌گه‌ریش شیعه‌ بوبێت ئه‌وه‌ شیعه‌ی عه‌لی به‌راییه‌ نه‌ك شیعه‌ی سه‌فه‌وی به‌پێی پۆلبه‌ندی بیرمه‌ندی گه‌وره‌ی ئێرانی عه‌لی شه‌ریعه‌تی.

**-شاهنامه‌ و نه‌ورۆز**

شاهنامه‌ نه‌ورۆز ناگێرێته‌وه‌ بۆ شه‌ری كاوه‌ وفه‌ره‌یدون له‌ دژی زوحاك، كه‌ سه‌رله‌به‌ری ئه‌فسانه‌یه‌، به‌ڵكو به‌و جۆره‌ باسی ده‌كات: "ئینجا جه‌مشید هات سه‌ر ته‌ختی فه‌رمانڕه‌وایی له‌ پاش باوكی ته‌همورت كه‌ ئه‌ویش وه‌ك ئه‌و سه‌ركه‌وتو بوو به‌سه‌ر دێو ودره‌نجه‌كانیش وتوانی له‌سه‌ر قه‌رویڵه‌ ڕازاوه‌كه‌ی بفڕێت به‌سه‌ر هه‌موو مه‌مله‌كه‌ته‌كانی به‌ هۆی جنۆكه‌كانیه‌وه‌!! جنۆكه‌كان له‌و رۆژه‌ هه‌ڵیان گرت كاتێ خۆر كه‌وته‌ قوللـه‌ی حه‌مله‌وه‌، وزۆر دلخۆش بوو وه‌مه‌ی ده‌به‌خشرایه‌وه‌ وئه‌و رۆژه‌ ناونرا به‌ رۆژی نه‌ورۆز كه‌ بوه‌ عورفێكی پیرۆز لای فارسه‌كان. " ل ١٠. [الشاهنامه: ملحمه الفرس الكبرى، لابي القاسم الفردوسي، دار العلم للملايين- بيروت الطبعه الثانيه ١٩٧٩[
شاهنامه‌ له‌ ڕووی ڕاستیه‌وه‌ ناكرێت پشتی پێ ببه‌سترێت زۆر له‌ ره‌خنه‌گران پێیان وایه‌ كه‌ قۆناغی یه‌كه‌می شاهنامه‌: سه‌رده‌می ئه‌فسانه‌ییه‌ كه‌باسی گیومیرت وجه‌مشید وزوحاك وفه‌ره‌یدون وكاوه‌ ده‌كات، كه‌ ئه‌و قۆناغه‌ هیچ نرخێكی مێژوویی نییه‌ وره‌نگی ئه‌فسانه‌یی زاڵه‌ به‌سه‌ریدا.

كه‌چی ئه‌و دژه‌ نه‌ورۆزانه‌ی خۆمان هه‌مان هه‌ڵه‌ی ناسیونالیسته‌ كورده‌كان دوپات ده‌كه‌نه‌وه‌ كاتێ چیرۆكی كاوه‌ وزوحاكیان وه‌ك هه‌قیقه‌ت و ڕاستی به‌ خه‌ڵك ده‌فرۆشت، وئه‌وانیش دێن داوه‌ری خۆیان له‌سه‌ر ئه‌و هه‌ڵه‌یه‌ ده‌كه‌ن و چیرۆكی كاوه‌ وزوحاكیان هێنده‌ به‌ جدی وه‌رگرتوه‌ ده‌ڵێی باسی كه‌سانێكی سه‌ده‌ی بیست ویه‌كه‌م ده‌كه‌ن، وكاوه‌ی داماو ده‌كه‌نه‌ خاین وخۆفرۆش، كه‌ ئه‌مڕۆ هه‌زاران كورد ناوی كاوه‌یه‌! وزوحاك ده‌كه‌نه‌ دوا پاشای میدیه‌كان ]ئه‌شتیاگ] نازانم به‌ چ پێودانگێك كه‌ تۆ نه‌توانی هیچ مێژویه‌كی كۆن به‌ وردی دیاری بكه‌یت؟! پێم وایه‌ مێژووی نه‌ورۆز ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ زۆر كۆنتر له‌ مێژووی ڕوخانی ده‌وڵه‌تی

مادەکان یان دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخمینیەکان، نەورۆز کۆنترین داستان یان ئەفسانەی ئاریاییە، ئەفسانە بەر هەمێکی گرنگی عەقڵی مرۆڤە بە گشتی.

هەرچۆنێکی بێت چیرۆکی کاوە وزوحاك دەبێت لە چوارچێوەی داستانێك یان ئەفسانەیەکی نیشتیمانی بخوێندرێتەوە نەك وەك مێژوویەکی واقیعی، خوێندنەوەی بەو شێوەیە داستانێکی بەسوود دەبێت بۆ پتەوکردنی هەستی ئینتیما بوونی پوکاوەمان، لەبیرمە پێش چەند ساڵێك فلمێکی کارتۆنی [ئەنیمەیشن] لەسەر چیرۆکی کاوە وزوحاکمان دیت لە ڤیستڤاڵی فیلمی کوردی لە لەندەن، لەگەڵ هەموو کەموکورتیشی لە ڕووی تێکست وتەکنیکەوەش، هەستم کرد هەستێکی پاك و نوێی کوردبوونی لەلای کوڕە حەوت ساڵانەکەم دروست کرد کەمن بە ساڵانێك نەمتوانی ئەو هەستەی لا دروست بکەم.

بەڕاستی ئەو داستانە نەتەوەییانە هەرگیز بە هیچ تێکستێکی تر تەعویز ناکرێت، چۆن قورئان هەستی ئیمانداریم بە ئایین وڕۆژی دوایی پتەو دەکات، ئەو داستانە نەتەوەییانە وشیعری حاجی قادر وئەحمەدی خانی وپەشێو وبێکەس ودەنگی شڤان پەروەر وشتی تریش هەستی ئینتیمای نەتەوەییم لا قوڵتر دەکات. هەر بۆیە هەست بە لاوازی هەستی ئینتیمای کورد بوون دەکەین لەلای ئیسلامیەکان بە گشتی ولەلای سەلەفیەکان بە تایبەتی، چونکە ناوهێنانی قەوم وقەومیەت بە هەر مەبەستێك بێت نیمچە کوفرێکە لای زۆریان یان ئینتیمای نەتەوەیی دوا خاڵی لیستی بایەخیانە.

فیردەوسی بە پاڵنەری خۆشەویستی میلەتی فارس دێت ئەو هەموو ئەفسانەیە دادەڕێژێتەوە وبە ویستی خۆی تۆماری دەکات وکاوە دەکاتە فارس ونەورۆز دەکاتە جەژنێکی فارسی بۆ تۆمارکردنی شاکارێك بۆ نەتەوەی فارس کە بەڕاستی شاکاریشە کە [نولدکە] ی ئەڵمانی دەڵێت: "داستانێکی بێ وێنەیە لای هیچ نەتەوەیەک وێنەی نییە"
[ابن الاثیر] کە مێژوونوس وزانای فەرمودەناسی پێغەمبەرە ستایشی شاهنامە دەکات بە ئەلفازێك لەوانەیە لەو سەردەمە با سەلەفیەکان تەکفیریان کردبا، ابن الاپیر دەڵێت: " شاهنامە قورئانی عەجەمە ...چونکە سەرتاسەری لە لوتکەی ڕەوانبێژییە"
[مفاهیم الانسانیه في شاهنامه الفردوسي، د.محمد علوی مقدم، مجله العلوم الانسانیه عدد ١٠١.]

**- ڕۆژێک دێت میزاجی سەلەفیەت سەلاحەدین ئەیوبیش شاباش دەکات**

دەبێت بۆ زانایەکی کورد ئەو کارەی پێنەکرابێت؟! لەو سەردەمە کارێکی وای بۆ کورد نەکردبێت؟! ئەگەر دەوڵەتی میدیا زۆر لە مێژ بوو نەمابوو لە یادەوەری کورد، بۆ ئەو هەموو

زانایه كورده داستانێكیان لەسەر سەلاحەدین ئەیوبی نەنوسی كه خۆی له خۆیدا ببوه داستان له نەزەری شەرق وغەربەوه، هەتا شاعیری گەورەی ئیتاڵی دانتی دڵی نەهاتوه بیخاته دۆزەخی [كۆمیدیای خوداوەنیەوه] وبەڕیزەوه له شوێنێكی نێوان دۆزەخ وبەهەشت سەلاحەدینی داناوه، لەكاتێكدا هەموو ئیسلامی به پێغەمبەرەوەش خستۆته دۆزەخی كۆمێدیاكەی!! سەلاحەدین هەموو ئەوروپای سەردەمی جەهالەت وتاریكی كەنیسەی سەرسام كردبوو به ڕەوشتی بەرز وجوامێری وسوارچاكی. بەڕای من كورد لەچاو میلەتانی تر هێندە دەمارگیر وبەپەرۆش نییه بۆ وڵاتەكەی وبۆ سەركردە مێژوویەكانیشی، تا ئەمڕۆش لەگەڵ بوونی ئەو هەموو مەترسیانە دەورمان زۆربەی هەرە زۆری سەركردە ومیلەتیش تاڕادەیەكی زۆر ناوچەگەرێتی وعەشیرەتی وشارچیەتی به پلە یەك دێت ودەردەكە پەریوەتەوه ناو ڕۆشنبیرانیش له ئاستی بەرزەوه! كەوابوو چۆن چاوەڕێی زانایەكی كورد بكەین لەسەردەمی زێڕینی ئیسلام وەك فیردەوسی بێت وشتێك وەك ئەو بكات. بۆ زانینیش شاهنامەی فیردەوسی تاقه شاهنامه نییه له مێژووی فارسدا، بەڵكو زیاتر له پێنج شاهنامەی تر بەر لەئەو بەرهەم هاتبوو.

بەڵام دوور نیه ڕۆژێك ئەو فەرهەنگه تەسك بینە وحەرفیەی سەلەفیەت بەناوی كورد بێ خاوەنی لەسەلاحەدین ئەیوبی بكات وەك نەورۆز، چونكه سەلاحەدین ئەیوبی شافیعی وئەشعەری بوه! كه من ئەو قسەیەم له سەلەفیەكانی عەرەب گوێ لێبوه، یان سەلاحەدین سۆفی بوه وئەهلی تەسەوفی خۆش ویستوه، چۆن نەورۆزیش میلەتانی تری وەك فارس ئیدیعای خاوەنیەتی دەكەن، نوسەر ومێژوو نووسی عەرەبیش هەن وەك ]ابن واسل] و [ابن الدواداری ] وبەڵكو پاشایەكی ئەیوبی به ناوی [الملك الايوبى الأمجد بن الحسن بن داود بن أيوب] له كتێبی نوسراوی خۆیدا " الفوائد الجليه فى الفرائد الناسريه " نكولی له كورد بوونی ئەیوبییەكان دەكات ودەڵێت كورد نەبوون بەڵكو تێكەڵاوی كوردیان كردوه وبەس!

جا دژه نەورۆزەكان به قسەی فیردەوسی فارس پەرەست نەورۆز شاباش بكەن، ئەی دەبێ به قسەی كەسێكی بنەماڵەی سەلاحەدین ئەیوبی چۆن پشت لەو قارەمانه وداستانەی كورد نەكەن؟!

له كۆتاییدا بەو مەلا ومێژووچیه دژه نەورۆزانه دەڵێین:

١ -نەورۆزكردنی كورد لاساییكردنەوەی كەس نییه، ئەوه خەڵكی تره لاسایی كورد دەكەنەوه، كورد ئەگەر تاقه دامەزرێنەری نەورۆز نەبێت، ئەوه بێگومان له دامەزرێنەرانی یەكەمەتی.

٢ -داستانی كاوه وزوحاك ڕاست بێت یان ئەفسانه بێت، بەپێی نوسخه كوردیەكەی دەخوێندرێتەوه كه كورد پشتاوپشت بۆ یەكیان گوێزاوەتەوه، نەك به پێی شاهنامەی فردەوسی كه لەلاتان وەك حەدیسی پێغەمبەری لێهاتوه وسەرلەبەری باوەڕ دەكەن،ویادەوەری كوردی پێ دەتوقێننەوه وپاش هەزاران ساڵ تازه كاوەی ئاسنگەر وەك ڕەمزێكی مێژژویی ناپاكی

ده‌كه‌ن، مێژوو بواری زۆره‌ بۆ سه‌لماندنی به‌ڵگه‌كانی خۆمان به‌ڵام ئێوه‌ وه‌ك جوته‌ كڵاشه‌كه‌ی حونه‌ین به‌ ناحه‌زانه‌ تێی ده‌ڕوانن بۆیه‌ ناتوانن به‌رگری لێ بكه‌ن.
٣ -نه‌ورۆز جه‌ژنێكی نیشتیمانییه‌ و هه‌تا دارو دره‌ختیش له‌ دونیای ئه‌مڕۆدا جه‌ژنی هه‌یه‌، وجه‌ژنه‌كه‌ش دووره‌ له‌ ڕه‌هه‌ندی ئاینییه‌وه‌، مه‌گه‌ر ئێوه‌ به‌و ته‌ركیز كردنه‌تان كاردانه‌وه‌ی خراپ له‌لای خه‌ڵكی كورد دروست بكه‌ن بۆ پێدانی ڕه‌هه‌ندی ئاینی به‌ نه‌ورۆز. ئێمه‌ی كورد خاوه‌نی مێژووی كوردین له‌ پێش وپاش ئیسلامدا، ئه‌وه‌ زانایانی ئیسلام له‌ عه‌ره‌به‌كان بوون ئه‌و هه‌موو كلتور وئه‌ده‌ب وشیعر وموعه‌له‌قات وئه‌فسانه‌ ومێژووی عه‌ره‌بیان له‌ فه‌وتان ڕزگار كرد، خۆزگه‌ ئێوه‌ش وه‌ک حه‌زره‌تی شه‌ره‌فخانی به‌دلیسی وئه‌حمه‌دی خانی وحاجی قادر ده‌بوون، نه‌ك له‌ مه‌لیك مه‌لیكتر بن و له‌ عه‌ره‌ب ئیسلامتر بن!
٢٠١٢/٤/٧
محه‌مه‌د هه‌ریری

# نەورۆز و ژیان لە دیدی كۆلكە سەلەفیان

(كەسی دزێو چاوی بە جوانی هەڵنایێ، ودەبەنگیش زیرەكی بە دوژمنكاری بەسەر خۆی دەبینێت، ودۆڕاویش وادەزانێ سەركەوتن گاڵتەكردنە بە ئەو) شێخ محەمەدی غەزالی

لە نێو جیهانی ئیسلامدا ولە ناو گۆڕەپانی ئەوانەی كاری دینداری ئیسلامی دەكەن دوو عەقڵیەتی سەرەكی بەدیدەكرێت، یەكێكیان میانڕەو وگونجاو لەگەڵ عەقڵ ومەنتقدا، دوەمیان: تونڕەو وشەڕانگێز بەبەردەوامی دژی هەموو شتە ژیربێژیەكان بەناوی سەلەفیەت وگەڕانەوە بۆ سەردەمی زێڕینی سەلەفی صالح، من لەو وتارە دوەمیانم مەبەستە. عەقڵیەتێكی توندڕەوانەی، چاویلكە ڕەش، دەق پەرستی وحەرفی، پێی وایە هەر كارێك پێغەمبەر و هاوەڵانی و شوێن كەوتەكانیان نەیان كردبێت، نابێت بكرێت، لە كاتێكدا ئەو كورت بینانە سەدان و هەزاران كار دەكەن ڕۆژانە بەبێ ئەوەی پێغەمبەر و هاوەڵانی و شوێن كەوتەكانیان كردبێتیان، ئەو عەقڵیەتە لە ناو نێوەندی سونە مەزهەبدا خاوەنی نەشازترین و بەرزترین و دزێوترین دەنگە، پێكەوەش لەگەڵ نیوەكەیتری عەقڵیەتی توندڕەوی شیعی خاوەنی گەورەترین كارەساتن كە بەڕێوەیە ولەو ڕۆژگارە سەرەتاكانی بەدیدەكەین لەو شەرە گەورە وبەرفراوانەی نێوان شیعە و سونەدا بە زمان وقەڵەم وتیڤی وكەناڵی ئاسمانی وئینتەرنێت وچەندین هۆی تر. مایەی گاڵتەجارییە كە ئەو دوو لایەنە شەڕانگێژە یەكێكیان نەورۆز تەحریم دەكات كە سەلەفیەكانن، كەچی شیعەكان ڕۆژەكە وا تەقدیس دەكەن لەڕادەبەدەر !

لە نێو نێوەندی سونیدا، ئەو برادەرانە كە ناو لە خۆیان دەنێن بە سەلەفی بە چاوی پڕ گومانەوە سەیر دەكەنە هەموو دەوروبەریان، وهەموو جولە وكردارێک پەیوەندیشی بە ئایین نەبێت دەیئاینێنن، وەک ئەو بابەتانە:

-دەستكردن بە سەلام لە نا موسڵمان حەرامە! ئەگەر لە ڕێگایەكدا دەڕۆیشتن ناچاری كە لە پەنا دیوارەكان بڕوات تۆ لە نێو سینگی ڕێگاكە بڕۆ!! بڕوانە ئەو دەروونە عەنتەرە بەناو دینەوە!

-حەڕامە پیرۆزبایی جەژنی سەری ساڵ لە مەسیحیەكان بكەیت!! بڕوانە ئەو دەروونە پڕ لە حقدە كە هیچ حیسابێك بۆ هاونیشتیمانی ناكات!

-مەولودكردن بۆ پێغەمبەر بیدعەیە! هینەكەیان گەیشتە پێغەمبەریش!

-ژن نابێت بە تەنها سەفەر بكات ئەگەر لەسەروی پەنجا ساڵیش بێت، دەبێت مەحرەمی لەگەڵدا بێت.! چونكە چەمكی سەفەر هەر بە پێودانگی كتێبە كۆنە فیقهیەكانە كە بە حوشتر وولاغ سەفەریان دەكرد. بڕوانە ئەو عەقڵە چەق بەستوە!

-ژن نابێت سەیارە لێخوڕێت حەرامە، بۆ؟ نەوەک لە بیابانێك سەیارەکە بوەستێت، وپیاو خراپێکی لێ پەیدا بێت!! بڕوانە ئەو دەروونە نەخۆشە!
-بیدعەچی [هەڵبەتە بە مەفهومی خۆیان] نابێت برادەراتی بکەیت، سەردانی بکەیت، سەلامی لێبکەیت وژن وژنخوازی لەگەڵدا بکەیت، ئەگەر مردیش نابێت بچیتە مەراسیمی ناشتنەکەی! بڕوانە ئەو دەروونە پڕ لە ڕق وکێمە لەسەر خودی موسڵمان، جا قوڕبەسەری ناموسڵمان!

ئەوە وگەلێك قسە وکاری منداڵکارانە کە هیچ سەنگی نییە لە واقیعدا.
بەو دوایە پاش ئەوەی ماندوو بوون لە قسەکردن لەسەر قسەکردن لەسەر سەری ساڵ وجەژنی خۆشەویستی و دایک ونیشتیمان ودرەخت وجەژنی لەدایک بوونی پێغەمبەر ]ص[ بایان دایەوە سەر نەورۆز، ئەو نەورۆزەی کە لەوەتی کورد هەیە ئاهەنگی تێدا دەگێڕێت، ئەو بێ ئیش وکەللە بۆشانە دەیانەوێت بە تازەکی لە خەڵکی کوردی حەرام بکەن ودەیانەوێت کوردیش ڕوانگە ڕەنگینەکەی وەک سروشتە ڕەنگینەکەی بگۆڕێتەوە بە ڕوانگە خێڵەکیەکەی سەلەفیەتی دەوارنشینی فیقهی بەدەویەت وهەمان ڕوانگە ڕەشەکەی ئەوان بکەتە تارمایی سەر چاوانی. قسەکانی مەلا سەمەد وئەوانی تر دەقاودەق لە سایتی سەلەفیەکانی خەلیج گواستراوەتەوە بۆ نمونە بڕوانە ئەو بابەتە : [حکم الاحتفال بعيد النيروز] لەو لینکە : http://islamqa.info/ar/ref/101404دەبینیت کە تەنها وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی.

لە ڕووی مێژووییەوە قسەی زۆر جیاواز هەیە لەسەر ئەسڵی نەورۆز وهی کێیە وچۆن دروست بوە، زەحمەتە هیچ کامێکیان ساغ بێتەوە، بەڵام من کارم بە مێژوو نیە نەورۆز هی قیبتیەکانە یان هی دوژمنانی کوردە ئەوانەی ئیمپراتۆریەتی میدیایان ڕوخاند، یان کاوەی ئاسنگەر هەقیقی بوە یان ئەفسانە، یان زوحاك ئەسڵی هەیە یان ئەفسانەیەکی فیردەوسییە..هتد، بەڵام ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە و بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەو بوارەدا کراون نەورۆز پێشینەیەکی دوورودرێژی هەیە و کۆنترین جەژنی مرۆڤە لە سەر زەوی. ، کۆنترین مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی کە لە ئەشکەوتەکاندا ژیاون، ڕۆژی یەکەمی بەهاریان کردووە بە جەژن. نەورۆز ئەوەندەی مێژوو ئاگادارە لەوەتی کورد و مرۆڤ هەیە ئاهەنگی بۆ دەگێڕدرێت.

لە پاش هاتنی ئیسلامیشدا کورد ونەتەوە ئیسلامەکانی تر هەموو کاروبارێکی پێچەوانە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان خۆویستانە فەرامۆش کرد ئەگەر دژایەتی کردبێت لەگەڵ عەقیدەی ئیسلامی، بەڵام زانا وداناکانی ئیسلامی کورد، کە زۆر ژیرتر بوون لەو کۆلکە سەلەفیە شەڕانگێزانەی ئەو ڕۆژگارە پڕ لە بەدبەختیەی کورد، هەر زوو هەستیان بەو جیاوازیە کرد لە نێوان بۆنەی ئایینی وبۆنە وکایەی نیشتیمانی یان بۆنەی سروشتی وبەدرێژایی تەمەنی

ئیسلامیش یادی ئەو بۆنەیە کراوەتەوە لە نێو کوردا ونەورۆزیش لە هەموو دەقە کۆنە کوردیەکان ئاماژەی پێکراوە، ولەلایەن سەدان شاعیری کوردی موسڵمانی پایە بەرزی وەک ئەحمەدی خانی وجزەیری ونالی وحاجی قادر ومەحوی ئاماژەی پڕ لە جوانی بە نەورۆز کراوە لە کاتێکدا پەنجەی هەریەک لەو شاعیرە موسڵمانانەی کورد هەزار کۆلکە سەلەفی وەک مەلا سەمەد ومەلا گەرمیانییە توندڕەوەکان دەهێنێت، کە دەیانەوێت یادەوەری کورد وێران کەن وکۆنەست وهەستی خۆشی منالّی وگەنجی کورد بسڕنەوە.

مەلا سەمەد دەڵێت نەورۆز حەرامە چونکە پێغەمبەر وسەحابە نەیان کردیە، ئەخر پێغەمبەر وسەحابە کە عەرەب وقورەیشی بوون لە کوێ ئاگاداری نەورۆز بوون تا بیکەن یان نەیکەن .

نەکیرەیەکی بی مەعریفەی تر دەڵێت: " بەشداری کردن لە [نەورۆز] تیایدا لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەیە و هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی یە، پێغەمبەری خوایش صلی الله علیه وسلم ئاگاداری کردووینەتەوە لەوەی کوێرانە لاسای گاوڕ و خاچ پەرستان و ئاگر پەرستان نەکەینەوە"....
ئەو بیرکۆڵە دەڵێی باسی [ڤالنتاین] دەکات وکورد دوێنی فێری لاساییکردنەوەی نەورۆز بوە، نازانێت زۆربەی زۆری بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بە کوردی بوونی نەورۆز لە بنەڕەتدا، ئینجا سەیر لەوەدایە تەنها دوازدە وڵاتی ئیسلامی بەرەسمی ئاهەنگ دەگێڕن لە نەورۆزدا، خاچ پەرستی چی و ئاگرپەرستی چی، ئەو قسانە بکە نوشتەیەك وبیخە ناو ئاو وبیخۆرەوە بەڵکو مەنیقی خوارو خێچتان کەمێك ڕاست دەبێتەوە. دەقێك هەیە کە حەزرەتی عەلی کە ناسراوە بە حیکمەت پەسنی نەورۆزی کردوە، کەچی سەلەفیەکان ئەویش بەلێکدانەوەی سەقەت دەشێوێنن:
( أتى على رضى الله عنه- بهديه النيروز فقال ما هذه؟ قالوا يا أمير المؤمنين هذا يوم النيروز قال فاصنعوا كل يوم فيروز) واته " :دیاریەکیان هێنا بۆ ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بە بۆنەی نەورۆزەوە, ئیمامی عەلی فەرمووی ئەم دیاریە چیە؟ ووتیان میری ئیمانداران ئەوڕۆ ڕۆژی نەورۆزە، ئیمامیش فەرمووی هەموو ڕۆژێك بکەن بە [نەورۆز] فەیروز"

برادەرێکی سەلەفی کە تەرجەمەی ڕەشەبای سعودیە دەکات بە کوردی دەڵێت: لە وەڵامی ئەم جۆرە کەسانەی کە دەڵێن حەزرەتی عەلی پەسنی نەورۆزی کردوە "(شێخ سەفەر ئەلحەوالی) دەفەرموێت : ( ئیمامی عەلی ڕازی نەبوو تەنها ئیقرار بە ناوەکەیشیان بکات چی جای ئەوەی یادی بکاتەوە و خواردنیان بخوات، ئیمامی عەلی هەر حەزی نەکرد بڵێت نەورۆز بەڵکو فەرمووی فەیروز،"(ناڵێ عەرەب بە سروشت نازانن ناوی غەیرە عەرەبی وەك خۆی گۆ بکەن وبەڕای من کۆلەوارترین میللەتی دونیان لە بەدگۆکردنی ناوی میللەتانی تر، ئەو [نەورۆزە یان نورۆز [لە هەموو سەرچاوە ئیسلامیەکان پێی دەڵێن

[النیروز]!!! یان هەر کاتی خۆی یەک کورد بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتبوو ناوی [گاوان] بوە فەقیرە، کەچی هەموو سەرچاوەکان پێی دەڵێن [جابان]، هەرچەندە ئەو دەقە ئاشکرایە کە حەزرەتی عەلی هیچ نارەزایەکی دەرنەبڕیوە بەرامبەر نەورۆز وهیوادار بوە هەموو ڕۆژێك نەورۆز بێت بۆ ئەوەی خەڵک دڵخۆش بێت کەچی ئەو زانا سەلەفیە پێی وایە تەنانەت عەلی " حەزی نەکرد بڵێت نەورۆز بەڵکو فەرمووی فەیروز " ئەخر فەیروز مانای چییە؟ وچ ڕەبتێکی بە نەورۆزە، منیش دەڵێم کە کوردم وهەرچەندە سەلەفیەکانی کورد قسەی سعودیەکانیان لا گرنگترە: یان وەک گوتم حەزرەتی عەلی نەیزانیوە ناوەکە بە جوانی گۆ بکات، یانیش ئەوەی نوسیویەتیەوە هەڵەی تێدا کردوە.

ئەو جۆرە قسە نەشازانە پەیوەندیان بە گشتی مەلا وزانایینی کورد نییە، بەڵکو تەنها گوزارش دەکات لە کەمینەیەکی سەلەفی پیشەیان هەر تێکدانە، بەڵام سەدان مەلا سەمەد ونازانم کێ گەرمیانی ناتوانن قەناعەت بەو خەڵکە بکەن بەپێی فیقهی بەدەویەتی بەناو سەلەفیەت بڕۆن بەرێوە، کورد لە بنەڕەتدا حەزی بە توندڕەوی نییە، وپێویستی بە فەتوای سعودی نییە تا فێری دینداری بێت بۆیە چاکترە خۆیان لەو باسە هەستیارانە نەدەن چونکە هێندە ئێسکیان سوک نییە تا قورستری کەن.
نەورۆزی هەموو لایەک پیرۆز.

لەندەن
٢٠١٢/٣/٢٢

# پەیوەندی شیعە و کورد لە ڕۆشنایی عروبەت ومیللەتگەرایی مەزهەبی

زۆر جار گوێمان لێ دەبێت کە تەیاری عروبەت لە ناو شیعەدا لاوازە، لە ناو سونەدا بە هێزە، بۆیە سونەی عروبەت ڕەو ترسناکترن لە شیعەی میللەتگەرا ومەزهەبیەت، بەڵام بە وردبونەوەیەک دەردەکەوێت کە ئەو مەقولەیە بێ کەموکورتی نییە..بە نسبەت نا عروبەتی ڕەوتی شیعەگەرایەتی هەرچەندە کەسایەتیەکی عروبی ناودار لەناو شیعەکان هەڵکەوتون، بەڵام تا ڕادەیەك ڕاستە هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ بەژداری کەسانێکی نا عەرەب بەتایبەتی لە فارسەکان وعەجەمەکان لە دامەزراندنی عەقڵیەتی شیعی گشتی و پێگەکانی ئەو مەزهەبە، هەروەها لەبەر لەباوەش کردنی خەڵکی فارس بۆ دەعوەی ئەهلی بەیت کە هەتا عەباسیەکانیش لەسەر شان وپیلی ناعەرەبەکانی وەک کورد وفارس هاتنە سەر سەکۆی خیلافەت...بێگومان کاریگەری فارسی بەسەر جیهان بینی شیعیدا ناکرێت نکوڵی لێ بکرێت تا ڕادەی ئەوەی هەندێک حەدیسیان بەدەوی ئیمامەکانیان دروست کردوە کە گوایە خودی مەهدی لەوەچەی یەزدجەردی فارسەکانە.

النوری الطبرسي لە کتێبی [النجم الثاقب فی احوال الامام الحجه الغائب] شتێکی زۆر سەیر باس دەکات، دەڵێت یەک لە نازناوەکانی ئیمامی زەمان نازناوی پاشای یان ڕزگارکەری مەجوسە [خسرو مجوس] ١/ ١٨٥ !!!. لە [بحار الانوار] المجلسی ئەو بیرۆکەیە ڕوندەکاتەوە کە ڕیوایەت دەکات لە نوشجان کوری البودمردان دەڵێ :کاتێ فارس دۆرا لە شەڕی قادسیە و هەواڵەکە گەیشتە [یزدجرد کوری شەهریار ..[ڕای کرد ولە دەرکی دیوانەکەی گوتی: السلام علیک ئەی دیوان، ئەوە من بەجێت دەهێڵم، بەڵام یان بەخۆم دەگەڕێمەوە بۆت یا پیاوێك لە وەچەکانم دێتەوە بۆت هێشتا سەردەم وزەمانی نەهاتوە...سلێمان دەیلەمی دەڵێت: چومە خزمەت ئەبو عبداللە پرسیارم لێیکرد: مەبەستی چییە لە [یا پیاوێك لە وەچەکانم دێتەوە بۆت]؟ گوتی: ئەوە ێاحێبی زەمانە لە شەشەم وەچەی منە کە لە پشتی یزدجەرد کەوتۆتەوە وکوری ئەوە. [بحار الانوار ٥١/ ١٦٣ -١٦٤] کەوابوو کوڕی پاشای فارس دەگەڕێتەوە بۆ تۆڵەی باوکانی لە عەرەبدا!!!

هەر لە کتێبی [الغیبە] ی محمد بن ابراهیم النعمانی، ێ ٢٣٤، عن ابی عبداللە علیە السلام قال: [اذا خرج القائم لم یکن بینه وبین العرب و قریش الا السیف،،،] واتە کە مەهدی هات تەنها شمشێری لە نێوان خۆیی وعەرەب وقورەیش لە نێواندایە!!

بیرمه‌ندێکی گه‌وره‌ی ئێرانی سادق زیبا کلام، له‌ دوو چاوپێکه‌وتندا له‌گه‌ڵ هه‌فته‌نامه‌ی »سوبحی ئازادی« که‌ به‌و دواییه‌ کردویه‌تی ده‌ڵێت: وێنه‌ی عه‌ره‌ب له‌ یاده‌وه‌ری نه‌ته‌وه‌یی و ئاییني دا هه‌مان شته‌ و هه‌مان نێگه‌تیڤه‌، "وابزانم زۆر له‌ ئێمه‌مانان ڕقی له‌ عه‌ره‌به‌ له‌ دیندار و عه‌لمانیه‌کاندا" له‌ یاده‌وه‌ری دینداری فارسدا عه‌ره‌ب بریتیه‌: "له‌ سونی ، ناسیبی، ئه‌مه‌وی، عه‌باسی، ئه‌عرابی، مونافیق، دوژمنی ئه‌هلی به‌یت، وه‌هابی،تیرۆریست، به‌عسی، سه‌دامی"!...

له‌ یاده‌وه‌ری نه‌ته‌وه‌یی فارسیدا عه‌ره‌ب بریتییه‌: " پێخواس، پیس، چه‌په‌ڵ، دزێو، ڕه‌ش پێست، تینوی خوێن، دڵ ڕه‌ق، دڕنده‌، بێزراو، ئه‌هریمه‌ن، دز، مارمیلکه‌ خۆر، داگیرکه‌ر، کچ زینده‌به‌چاڵ که‌ر،"..

زیبا کلام ده‌ڵێت: " له‌وه‌ ده‌چێت که‌ ئێمه‌ وه‌ک ئێرانی نوشوسته‌ مێژوییه‌کانمان له‌ قادسیه‌ به‌ر له‌ ١٤٠٠ ساڵ له‌بیرنه‌کردوه‌ !!"

عروبه‌ت وناعروبه‌تی سونه‌ و شیعه‌ له‌و چوارچێوه‌یه‌ ده‌بێت بخوێندرێته‌وه‌، نه‌ك شیعه‌ وه‌ک مه‌زهه‌بێکی ئینسانی و مرۆدۆست وێنا بکرێت، هه‌موو ده‌زانین که‌ لای شیعه‌ به‌پێی ڕیوایه‌ته‌کانیان مه‌کروهه‌ تێکه‌ڵاوی له‌گه‌ڵ کورد بکرێت وژن وژن خوازیان لێنه‌کرێت [باب کراهه معامله الاکراد ومخالطتهم] ، هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ پێست ڕه‌شه‌کانیش، له‌ هه‌موی نامرۆیانه‌تر ڕیوایه‌ته‌کان ده‌ڵێن نابێت مامه‌له‌ له‌گه‌ڵ ده‌رده‌دار وکه‌مئه‌ندامه‌کان مه‌که‌ن چونکه‌ گه‌وره‌تین سته‌مه‌ [باب کراهه معامله ذوی العاهات !]

چونکه‌ شیعه‌ی عه‌ره‌ب په‌راوێزخراون وله‌ژێر کاریگه‌ری شیعه‌ی فارسه‌کاندان وله‌ ژێر کاریگه‌ری ئه‌و ڕیوایه‌تانه‌ دان، سه‌ره‌ڕای کاریگه‌ری ره‌وتی عروبه‌تی نه‌ته‌وه‌یی عه‌ره‌ب که‌ سه‌دام گوزاریشی لێده‌کرد، ناعروبه‌تی شیعه‌ی عێراق هیچ مسۆگه‌ریه‌ک نییه‌ بۆ مرۆڤایه‌تی ڕێبازیان، چونکه‌ ته‌نها عه‌ره‌ب فاشیه‌تی عروبی دروست ناکات، شۆڤێنیه‌تی مه‌زهه‌بی وفارسیش له‌ئارادایه‌، ئه‌وه‌ نییه‌ کورده‌ فه‌یلییه‌کان به‌ ملیۆن له‌ به‌غدا و خوارووی عێراقن که‌چی ده‌نگێکیان ناچێته‌ گیرفانی کورده‌وه‌، چونکه‌ وه‌ک چۆن عه‌ره‌بی شیعه‌ وه‌لایان بۆ مه‌زهه‌به‌ زیاتر هه‌رواش کوردی شیعه‌ وه‌لایان بۆ مه‌زهه‌به‌ زیاتر له‌ نه‌ته‌وه‌که‌ی خۆیان. هه‌ر بۆیه‌ ئه‌گه‌ر بڕوانینه‌ مێژووی دوور ده‌بینین کورد له‌ ئێران مه‌ینه‌تیه‌کی زۆری دیوه‌ له‌سه‌ر ده‌ستی سه‌فه‌ویه‌کان که‌ هه‌وڵێکی زۆر دۆزه‌خیانه‌ی دا بۆ به‌ شیعه‌کردنی کورد وئه‌وانه‌شی ڕه‌تیان کردوه‌ به‌ کوشتن وتاڵانکردن و نه‌فی کردن تێیان که‌وتن، کورده‌کانی خوراسانیش نمونه‌ی زیندون له‌و هه‌ڵمه‌ته‌ سه‌فه‌وییه‌دا. ئه‌مڕۆش هه‌موومان ئاگادارین به‌ وه‌زعی کورد له‌

ئێراندا، هه‌رچه‌نده‌ ئێران عروبی نییه‌، به‌ڵام ترسناکی مه‌زهه‌بیه‌تی سه‌فه‌وی که‌متر نییه‌ له‌ عروبه‌تی فاشی.

ئه‌گه‌ر سونه‌ی عێراق ته‌نها له‌به‌ر مه‌وروسی ئایدیۆلۆژیا وفیکری نه‌ته‌وه‌په‌رستی عه‌ره‌بی هه‌ڵوێستی نێگه‌تیڤانه‌یان ده‌رهه‌ق به‌ کورد هه‌ بێت، ئه‌وه‌ وێنه‌ی کورد له‌ یاده‌وه‌ری جه‌معی شیعه‌ زۆر خراپتره‌، و ئه‌وه‌شی شیعه‌ ده‌جوڵێنێت که‌ مه‌زهه‌به‌ زۆر ترسناکتره‌ له‌ وه‌ی که‌ سونه‌ ده‌جوڵێنێت، ڕاسته‌ سونه‌ش قاعیده‌ی هه‌یه‌ به‌ڵام ئه‌گه‌ر قاعیده‌ له‌ چاکترین حاڵه‌تیدا بتوانێت سه‌دا دووی سونه‌ بجوڵێنی و هانیان بدات بۆ هه‌ر ده‌به‌نگییه‌ک یان کارێکی خۆکوژی ئه‌وه‌ مه‌راجیعی شیعه‌ ورمووزی ته‌لیسماوی مه‌زهه‌ب توانای جولاندنی سه‌دا نه‌وه‌تی هه‌یه‌ ٩٠% زۆر وردتر وکاریگه‌رانه‌ تر له‌ قاعیده‌. ده‌یان ده‌قی پیرۆزی مه‌زهه‌بی له‌ فیقهی شیعه‌دا هه‌یه‌ که‌ کورد له‌ مرۆڤایه‌تیش داده‌بڕێنێ، ده‌قگه‌لێک ده‌گاته‌ ئاستی جینۆسایدی مه‌عنه‌وی، قوربه‌سه‌ری کورد ئه‌گه‌ر ڕۆژێک ئه‌و ده‌قانه‌ ته‌فعیل بکه‌ن. ئه‌مڕۆ شیعه‌ له‌ عێراق هه‌وڵی لوشدانی هه‌موو عێراقیه‌تی ده‌نا ئه‌گه‌ر ده‌ستور هێنده‌ پیرۆز بێت لای ده‌سه‌ڵاتی شیعه‌ی عێراق که‌ هه‌رده‌م که‌ شتێکیان لێ عاسێ ده‌بێت په‌نای بۆ ده‌به‌ن، ئه‌ی بۆ دژایه‌تی داوای به‌ ئه‌قلیم بوونی پارێزگای سه‌لاحه‌دین و دیاله‌ به‌و شێوه‌یه‌ توندە ڕه‌ت ده‌که‌نه‌وه‌ تا ڕاده‌ی ڕاونانی مه‌جلیسی پارێزگای دیالا وخودی پارێزگار بۆ کوردستان؟!!

ئه‌ی ئه‌و هه‌موو ده‌ستی پێکردنه‌ له‌ کێشه‌ی که‌رکوک وناوچه‌ دابڕاوه‌کانی تر چی پیده‌گوترێت جگه‌ له‌ دووباره‌کردنه‌وه‌ی ته‌ماعی وچاوتێبڕینی شیعه‌ له‌ که‌رکوک به‌شێوه‌یه‌کی خراپتر له‌ عه‌ره‌به‌ به‌عسییه‌ عروبه‌ییه‌کان!! بۆ ئه‌وانه‌ی له‌ ئێراننن خۆ به‌عسی نین، ئه‌گه‌ر حکومه‌ته‌ شۆفێنییه‌کانی به‌عس وتورک جاروبار موفاوه‌زاتیان ده‌کرد له‌گه‌ڵ کورده‌کان ئه‌گه‌ر بۆ چاوبه‌سته‌ی خه‌ڵکیش بێت به‌ڵام چاکتره‌ له‌و ڕژێمه‌ مه‌زهه‌بی وتایفیه‌ی ئه‌گه‌ر له‌و سه‌رده‌مه‌ نه‌بوایه‌ پێی ئاسایی بوو هه‌موو کورد وسونه‌ی ئێران وه‌ک ده‌وڵه‌تی به‌دناوی سه‌فه‌وی به‌زۆر بکاته‌ شیعه‌ یان قه‌ڵا چۆیان بکات! ئه‌گه‌ر باڵی ڕاسته‌ی ئێران که‌ سوریایه‌ شکا به‌ تینی شۆڕشی بوێر وغه‌در لێکراوی سوریا ئه‌وه‌ زۆری پێناچێت ئێران به‌ هۆکاری ناوه‌وه‌ و ده‌ره‌وه‌ هه‌مان چاره‌نووسی ده‌بێت، پێویسته‌ کورد ئه‌و حساباتانه‌ بکات ووێنه‌ی جمکی دووانه‌یی له‌گه‌ڵ شیعه‌ی عێراق له‌ مێشکی خۆیی وکه‌سانی تر بسڕێته‌وه‌، وه‌ك خۆشیان گوتیان ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌ زه‌واجێکی موتعه‌ی کورت خایه‌ن بوو! چونکه‌ قیاده‌ی شیعه‌ی عێراق مایه‌ی خه‌شم و قینی هه‌موو جیهانی سونییه‌ له‌به‌ر ده‌مارگیری مه‌زهه‌بی وتایفیان، گومانم نه‌بووه‌ پاش سه‌رکوت کردنی سونه‌ی عێراق به‌ته‌واوی وه‌ک به‌رازی یه‌کانه‌ ملی پانیان به‌ره‌و کورد هه‌ڵده‌سوڕێنن وه‌ك ئێستا له‌ هێزه‌کانی دیجله‌ وته‌پڵ لێدانی جه‌نگ له‌لایه‌ن مالیکیه‌وه‌ به‌دیار ده‌که‌وێت. ئه‌وانه‌ دۆستیان نییه‌ له‌ ده‌ره‌وه‌ی مه‌زهه‌ب، ئه‌گه‌ر هه‌شیان بێت دۆستایه‌تی توقیه‌ یه‌ [ڕواڵه‌تبازی] یه‌ یان خۆیان گۆته‌نی زه‌واجی موتعه‌یه‌. 27-11-2012

## شەڕی سەغیر ومەهدی لە دژی کورد

ئەوەی شێخ جەلالەدین سەغیر باسی کرد دەربارەی بەدیارکەوتنی مەهدی وشەڕی موقەدەسی لەگەڵ ئێران دەکرا وەک شیتەڵکردنێکی سیاسی ئانی کارێکی بلیمەت با بەڵام بەستنەوەی بە زهوری مەهدی وسوفیانی وئەو بەندو باوە خورافیی مەزهەبیە کارەکەی زۆر دزێو کرد، سەیر لەوەدایە کە کورد دەڵێی فرچکی گرتوە بە کەمپین، کەمپینێک بەڕێوەیە لە دژی شێخ جەلالەدین سەغیر، چونکە یەکەم کەسایەتی شیعیە لە بەناو هاوپەیمانەکانمان کە بەڕاستی گوزارش لە دیوی ناوەوەی دڵ وبیروباوەڕیان دەکەن دەربارەی کورد. من پێشتریش گوتومە ئەوە تەنها کوردە وا بە ساویلکەیی دەڕوانێتە دۆستایەتی کورد وشیعە، ئەگینا شیعە لە ڕووی مێژووییەوە سەلاحودینی ئەیوبی یان لەبیر ناچێتەوە کە دەوڵەتی گەندەڵی فاتیمی ڕوخاند لە میسرو تا ئێستاش شیعەکان نەفرەتی لێدەکەن بە عەقلی خۆیان ئەگەر سەلاحودین نەبوایە ئێستا میسر سەرتاسەری شیعە بوو!

لەڕووی فقهیەوە هەموو دەزانین کە لای شیعە بەپێی ڕیوایەتەکانیان مەکروهە تێکەڵاوی لەگەڵ کورد بکرێت وژن وژن خوازیان لێنەکرێت [باب کراهە معاملە الاکراد ومخالطتهم] ، هەروەها لەگەڵ پێست ڕەشەکانیش، لە هەموی نامرۆیانەتر ڕیوایەتەکان دەڵێن نابێت مامەلە لەگەڵ دەردەدارو کەمئەندامەکان مەکەن، چونکە گەورەتین ستەمە [باب کراهە معاملە ذوی العاهات]!!!!

بیرۆکەی هاتنی مەهدی لە بنچینەدا بیرۆکەیەکی ئەفسانەیی دێرێنی ئادەمیزادە گوزارش لە خەونی مرۆڤەکان دەکات لە جیهانێکی پڕ لە دادپەروەری ویەکسانی، زۆربەی هەرە زۆری ئاینە کۆنەکان باس لە بیرۆکەی مەهدی یان رزگارکەر وشتی لەو جۆرە دەکەن، هەتا بیرۆکەی سامۆیل پێکتیش لە چاوەڕوانی گۆدۆدا گوزارش لەو بیرۆکەیەی ئادەمیزاد دەکات، کە پێیوایە تاقە مرۆڤێک دێت ودنیا دەگۆڕێت وپڕی دەکات لە عەدل و یەکسانی پاش ئەوەی لێواو لێو بوە لە جەور وستەم. بەڵام کێشەکە لەوەدایە مەهدیەکەی شیعە کە باسی دەکەن لە ڕیوایاتە زۆر وزەبەند وبی سەروبەر وپڕ لە خورافاتەکان کەسێکی پڕاوپڕە لە دڵ رەقی ودڵ رەشی ونا مرۆیی وبێ رەحمی!!

کەسێکە یەکەم کاری کە دێت واز لە مردوەکانیش ناهێنێت، بەڵکو لاشەی ئەبوبەکری سدیق و کچەکەی خێزانی پێغەمبەر عائیشە وعومەری کوڕی خەتاب و حەفسەی کچی لە قەبر دەردەکات ولە خاچیان دەدات!!

بەپێی ڕیوایاتی کتێبە شیعیەکان هەموو عەرەب و قورەیش ئیبادە دەکات، و هیچ مزگەوتێك بە ساغی ناهێڵی و حوکم بە شەریعەتی ئال داود دەکات وجولەکەش پشتگیری دەکەن لە مەهدی!!!

عەلامە النوری الطبرسی لە کتێبی [النجم الثاقب فی احوال الامام الحجە الغائب] شتێکی زۆر سەیر باس دەکات، دەڵێت یەک لە نازناوەکانی ئیمامی زەمان نازناوی پاشای یان ڕزگارکەری مەجوسە [خسرو مجوس] ١/ ١٨٥.!!!

لە [بحار الانوار] المجلسی ئەو بیرۆکەیە ڕوندەکاتەوە کە ڕیوایەت دەکات لە نوشجان کوری البودمردان دەڵێ: کاتێ فارس دۆرا لە شەڕی قادسیە و هەواڵەکە گەیشتە [یزدجرد کوری شەهریار].. ڕای کرد ولە دەرکی دیوانەکەی گوتی: السلام علیک ئەی دیوان، ئەوە من بەجێت دەهێڵم، بەڵام یان بەخۆم دەگەڕێمەوە بۆت یا پیاوێك لە وەچەکانم دێتەوە بۆت هێشتا سەردەم وزەمانی نەهاتوە...سلێمان دەیلەمی دەڵێت: چومە خزمەت ئەبو عبداللە پرسیارم لێیکرد: مەبەستی چییە لە [یا پیاوێك لە وەچەکانم دێتەوە بۆت]؟ گوتی: ئەوە یاحێیی زەمانە لە شەشەم وەچەی منە کە لە پشتی یزدجەرد کەوتۆتەوە وکوری ئەوە. [بحار الانوار ٥١/ ١٦٣ - ١٦٤] کەوابوو کوڕی پاشای فارس دەگەڕێتەوە بۆ تۆڵەی باوکانی لە عەرەبدا!!!

هەر لە کتێبی [الغیبە] ی محمد بن ابراهیم النعمانی، ێ ٢٣٤، عن ابی عبداللە علیە السلام قال: [ذا خرج القائم لم یکن بینە وبین العرب و قریش الا السیف،،،] واتە کە مەهدی هات تەنها شمشێری لە نێوان خۆیی وعەرەب وقورەیش لە نێواندایە!!

ئەگەر بچیتە ناو وردەکاری ئەخباری مەهدی دەبێت سەد سەڵاوات لە کتێبەکەی ئەلف لەیلە وو لەیلە بدەیت پڕواوپڕە لە خورافاتی پێکەنین هێنەر!

کێشەکە لەوەدایە هەرچەندە خورافاتیس بێت شیعەکان وەک قورئان باوەڕیان پێی هەیە، وادیارە تەنگژەکانی نێوان هەرێم وحکومەتی مالیکی مەلا و ئاخوندەکانی شیعەی بەرەو ئەو قەناعەتە بردوە کە هەرگیز ئەو پەیوەندیە نەچێتەوە دۆخی جاران بۆیە دەیانەوێت لە ڕێگای ڕیوایاتەکانی مەهدی کە بەر لە ١٣٠٠ ساڵە لە دایک بوە کورد بشێوێنن وشوێنکەوتەکانیان ئامادە بکەن بۆ شەڕی کورد. کەچی کێسەکە هەمووی سیاسیە ولەوە دەردەکەوێت کە کوردی سوریا و تورکیا جیا دەکاتەوە لە هەڵمەتەکەی مەهدی نامونتەزیر بە بیانووی ئەوەی [پ ک ک] قیادەکەی عەلەوییە وەک شێخ جەلالەدین سەغیر دوپاتی دەکاتەوە وعەلەویەکی زۆریش هەن لەناو گەریلاکانی [پ ک ک] دا!! ئەگەر وابێت دەبێت مەهدی هەموو گەریلا سونەکانی سوریا و تورکیا قەتل وعام بکات! بۆیە هەرچی زوە دەبێت گەریلا سونەکانی ناو [پ ک ک]

كودەتايەک بكەن وسەركردايەتيە عەلەويەكە لە ناوبەرن، نەوەك وەك مەڕ لە دوارۆژدا تەسليمى چەقۆى مەهدى قەسابيان بكات!

هەوڵدانى ئێران بۆ نانەوەى تەنگژە لە سەرتاسەرى جيهان، تەئكيد لەسەر ڕاستيەک دەكاتەوە كە ئەو دەوڵەتە لەوەتى هەيە بە پەيڕەوانى ڕێبازى [حوجەتيەكان] بەڕێوە دەچێت، مەبەست لە حوجەتيش كە لە وشەى [الحجه] هاتوە ئاماژەيە بە ئيمام مەهدى، ئەوەش بزوتنەوەيەكە لە پەنجاكانى سەدەى ڕابردوو دامەزرا، لەلايەن ئايەتوڵڵا شيخ محمود الحلبى دامەزرا.

حوجەتيش: ئەو تيۆرەيە كە باوەڕى بەوەيە بڵاوبوونەوەى شەڕوگەندەڵى و جەور وستەم چاكترين ڕێگايە بۆ بەدياركەوتنى مەهدى مونتەزير . شێوازى ئەحمەد نەژاد لە دواندنى مەهدى ولێدوانەكانى هەتا لەناو كۆڕى نەتەوە يەكگرتوەكان مرۆڤ دەگەيەنێتە ئەو قەناعەتە كە خودى ئەحمەدى نەژاديش حوجەتيە، نەژاد لە نامەيەكدا بۆ خەزورى كورەكەى دەنوسێت: " ئێمە لە سەردەمى بەدياركەوتنداين – واتە زهورى مەهدى – تۆش عاشقى ئيمامى زەمانى وباوەڕت پێى هەيە" هەر لەپاش هەڵبژاردنەوەى لە ٢٠٠٥ نەژاد گوتى:" ئيمانداران بە تەعاليمە ئيسلاميەكان هەموو كارێک دەكەن پێيان بكرێت بۆ خێراكردنى بەدياركەوتنى مەهدى"!! هەتا خەڵكى ئێران بە گاڵتە دەڵێن نەژاد لە دانيشتنەكانيدا كورسيەكى بەتاڵ بۆ ئيمامى زەمان دادەنێت، ولە نان خواردنەكانيشيدا دەفرێكى بەتاڵ بۆ ئيمامى زەمان دادەنێت!

ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووى شيعەگەرايەتى سەفەوى بۆ خەڵک دەردەكەوت لە ڕێگاى بە شيعەكردنى خوێندكارە سونييە سەرسام بوەكان بە شۆڕشى ئيسلامى كە دەچوونە ئێران يان بانگهێشت دەكران بۆ خوێندن لەوێ، يان لە ڕێگاى ئەو هەموو كتێبانەى كە باسى لە كەسانێك دەكرد مەزهەبى خۆيان دەگۆڕى لە سونييەوە بۆ شيعە پاش ئەوەى بۆيان دەدەكەوت كە سونەگەرێتى يانى گومڕايى وەک كتێبگەلێكى وەك [لاكون مع الصادقين، ثم اهتديت، الشيعه هم اهل السنه وهتد...!! لە نوسەرێكى عەرەبيم گوێ لێبوە دەڵێ كاتى خۆى بۆ كۆنگرەى يەكێتى ئيسلامى شيعە وسونە داوەت كرابوو كە سەدان نوسەر وبيرمەندى سونى و شيعى بەژداريان تێدا كردبوو، كەچى هەر لەبەردەمى هۆڵەكە كتێبى شەرى مەزهەبى بە خۆڕايى وبەلاش دەدرايە خەڵک!!!

شيعەگەرايەتى ئەمڕۆ بەداخەوە لە چەندين شوێنى گرنگ وهەستيار چەقى گرژى دروست كردوە سەرەڕاى خودى ئێران لە لوبنان لە سوريا كە لەو ڕۆژگارە خەريكە شەرەكە دەبێتە شەڕى مەزهەبى شيعە وسونە، كاتێ ميليشياكانى حزب الله شيعى وهەزاران پاسدارى ئێران بە سەرۆكايەتى ئاغاى سلێمانى بەژدارى دەكەن لە سەركوتكردنەوەى خەڵكى سونى سوريا. لە لوبنان حزب الله شيعى دەوڵەتێكە لە نێو دەوڵەتدا وهيچ مانايەكى بۆ دەولەت بوونى لوبنان

نەهێشتۆتەوە. لە پاکستان زەبر وەشاندنی مەزهەبی شیعە وسونە لە یەک گەیشتۆتە سنوری بێهودەیی وعەبەسیەت کە تێیدا حورمەتی مزگەوتەکانی یەکتریش ناپارێزن. لە بەحرەین شۆڕشێکی مەزهەبی بەرپاکرا لە ژێر پەردەی بەهاری عەرەبی، بەڵام خەڵک هەر زوو پێیان زانی.

لە یەمەن حوسیەکان خەریکە گڕ لە سەرتاسەری یەمەن بەردەدەن بە پاڵپشتی ڕاشکاوی ئێران، هەرچەندە یەمەن شیعەی زەیدین وزۆر میانڕەون زۆر جار کە سەرنجی بیروڕاکانیان دەدەم دەڵێی هەموو لایەنە چاکەکانی شیعە و سونەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، بەڵام عەقڵیەتی سەفەوی ئێرانی ڕقی لەو تەبابییەیە ئەوەتە تیۆری گەڕانەوە بۆ ئەسڵ لەگەڵ زەیدیەکانیش بەکار دەهێنێت وەك چۆن لەگەڵ عەلەویەکان بەکاری دەهێنێت وخەریکە زەیدیەکانی یەمەن دەکاتە دوازدە ئیمامی کە ئەوەش کارەساتێکە بۆ ئیسلام و خودی شیعەگەرێتیش...

کێشەکە گواستراوەتەوە هەندێك وڵات کە تا دوێنێ یەك تاقە شیعەیشی تێدا نەبوو وەک میسرو تونس وجەزائیر ومۆریتانیا و نەیجێریاش بە ڕادەی جیاواز کێشەی مەزهەبی شیعە وسونەی تێدا دروست بوە، هەرچەندە شیعە لەو وڵاتانە ١% دانیشتوانیش نابن!!

لە تورکیا هەرچەندە ئامارێکی زانستی نییە، بەڵام تەقدیراتەکان باسی نزیکەی ٤ ــ ١٠ ملیۆن عەلەوی دەکات کە ناسراون بە زۆر دووری لە دین، هەتا مزگەوتیشیان نییە وبەشێکی زۆریشیان کوردن، دەمێکە ئێران لەسەر ئەو تایفەیە ئیش دەکات هەرچەندە شیعەی بەرایی ئیمامی ئەو عەلەوییانەی بە کافر دەزانی، چونکە بەڕاشکاوی عەلی بە خوا دادەنێن لە بیروباوەڕ ودەقەکانیاندا، بەڵام لای شیعە چاکترە عەلی بەخوا دابنێیت، بەڵام سونی نەبیت وپێت وابێت ئەبوبوکر وعومەر وعوسمان لە پێش عەلیدا دێن بە پێی زنجیرەی سونی!! هەروەها شیعەی جەعفەری باوەڕی بە تیۆری گەڕانەوەی لق هەیە بۆ ئەسڵ، واتە خۆی وەك شیعەی جەعفەری پێ ئەسڵە و عەلەویەکانی پێ لقە وهەوڵی گەڕانەوەیان دەدات بۆ ئەسڵەکە، لە جیاتی تەکفیر کردن و نەفرەت کردنیان، ئەوەش بێگومان زیرەکیان دەردەخات، ئەوە نییە سەلەفیەکاني خۆمان خەریکە هەموو ئۆمەتی سونی وشیعی پێکەوە تەکفیر دەکەن!!

لە سوریاش هەرچندە عەلەویەکان کەمینەن ڕێژەیان لە چاکترین تەقدیردا ناگاتە ١٠% بەڵام لە ڕێگای سوپا وکودەتای سەربازی دەستیان بەسەر چارەنوسی ئەو وڵاتە داگرتوە بۆ زیاتر لە ٤٠ ساڵ ودەرگاکانیشیان بەو دواییە لەسەر پشت کردۆتەوە بۆ چالاکی تەبشیری ودەعەوی شیعەگەرایەتی وپارە وپولێکی زۆریشی تێدا هەڵدەرێژن، بەڕای من یەک لە سەرەکیترین هۆکاری شۆڕشی سوریا کە لە شاری دەرعا سەری هەڵدا، وەڵامدانەوەی ئەهلی سونەی

ئه‌وێیه‌ له‌ دژی به‌رفراوترین هه‌ڵمه‌تی شیعه‌گه‌رایه‌تی كه‌ له‌ ده‌رعا به‌ڕێوه‌ ده‌چێت وبه‌ یارمه‌تی وموباره‌كه‌ی ڕژێمی به‌عسی عه‌لمانی عه‌له‌وی نه‌ته‌وه‌یی وعروبی!!

زۆر جار گوێمان لێ ده‌بوو كه‌ سونه‌ ترسناكترن له‌سه‌ر كورد له‌ شیعه‌ گوایه‌ ته‌وژم وته‌یاری عروبه‌ت له‌ ناو شیعه‌دا لاوازه‌، به‌ڵام هه‌مان ته‌یار له‌ ناو سونه‌دا به‌ هێزه‌، به‌ڵام به‌ وردبونه‌وه‌یه‌ك ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ ئه‌و مه‌قوله‌یه‌ بێ كه‌موكورتی نییه‌.. راسته‌ نیوه‌ندی سونی زۆر دڵ ڕه‌شانه‌ هه‌ڵسوكه‌وت ده‌كه‌ن له‌گه‌ڵ كێشه‌ی كورد، به‌ڵام ته‌حه‌دایه‌كان خه‌ریكه‌ به‌ره‌و گۆڕانی گه‌وره‌یان ده‌بات وه‌ك له‌ ره‌فتاری توركیا ده‌رده‌كه‌وێت.

به‌ نسبه‌ت نا عروبه‌تی ڕه‌وتی شیعه‌گه‌رایه‌تی تا ڕاده‌یه‌ك ڕاسته‌ هۆیه‌كه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ به‌ژداری كه‌سانێكی نا عه‌ره‌ب به‌تایبه‌تی له‌ فارسه‌كان وعه‌جه‌مه‌كان له‌ دامه‌زراندنی پێگه‌كانی ئه‌و مه‌زهه‌به‌، هه‌روه‌ها له‌به‌ر له‌باوه‌ش گرتنی خه‌ڵكی فارس بۆ ده‌عوه‌ی ئه‌هلی به‌یت كه‌ هه‌تا عه‌باسیه‌كانیش له‌سه‌ر شان وپیلی ناعه‌ره‌به‌كانی وه‌ك كورد وفارس هاتنه‌ سه‌ر سه‌كۆی خیلافه‌ت...بێگومان كاریگه‌ری فارسی به‌سه‌ر جیهانبینی شیعیدا ناكرێت نكوڵی لێ بكرێت تا ڕاده‌ی ئه‌وه‌ی هه‌ندێك حه‌دیسیان به‌ده‌وی ئیمامه‌كانیان دروست كردوه‌ كه‌ گوایه‌ خودی مه‌هدی له‌وه‌چه‌ی یه‌زدجه‌ردی فارسه‌كان وه‌ك باسمان كرد. عروبه‌ت وناعروبه‌تی سونه‌ و شیعه‌ له‌و چوارچێوه‌یه‌ ده‌بێت بخوێندرێته‌وه‌، نه‌ك شیعه‌ وه‌ك مه‌زهه‌بێكی ئینسانی و مرۆدۆست وێنا بكرێت، هه‌موو ده‌زانین كه‌ لای شیعه‌ به‌پێی ڕیوایه‌ته‌كانیان مه‌كروهه‌ تێكه‌ڵاوی له‌گه‌ڵ كورد بكرێت وژن وژن خوازیان لێنه‌كرێت [باب كراهه معامله الاكراد ومخالطتهم] ، هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ پێست ڕه‌شه‌كانیش، له‌ هه‌موی نامرۆیانه‌تر ڕیوایه‌ته‌كان ده‌ڵێن نابێت مامه‌له‌ له‌گه‌ڵ ده‌رده‌دار وكه‌مئه‌ندامه‌كان مه‌كه‌ن چونكه‌ گه‌وره‌تین سته‌مه‌ [باب كراهه معامله ذوی العاهات]!

سه‌ره‌ڕای كاریگه‌ری ره‌وتی عروبه‌تی نه‌ته‌وه‌یی عه‌ره‌ب كه‌ سه‌دام گوزاریشی لێده‌كرد، ناعروبه‌تی شیعه‌ی عێراق هیچ مسۆگه‌ریه‌ك نییه‌ بۆ مرۆڤایه‌تی ڕێبازیان، چونكه‌ ته‌نها عه‌ره‌ب فاشیه‌تی عروبی دروست ناكات، شۆڤێنیه‌تی مه‌زهه‌بی وفارسیش له‌ئارادایه‌، ئه‌وه‌ نییه‌ كورده‌ فه‌یلییه‌كان به‌ ملیۆن له‌ به‌غدا و خوارووی عێراقن كه‌چی ده‌نگێكیان ناچێته‌ گیرفانی كورده‌وه‌، چونكه‌ وه‌ك چۆن عه‌ره‌بی شیعه‌ وه‌لایان بۆ مه‌زهه‌ب زیاتره‌ هه‌رواش كوردی شیعه‌ وه‌لایان بۆ مه‌زهه‌به‌ زیاتر له‌ نه‌ته‌وه‌كه‌ی خۆیان. له‌وه‌ش گرنگتر ئه‌وه‌یه‌ له‌وه‌ ناچێت ئه‌و كێشه‌ گه‌وره‌یه‌ی نێوان ئێران وسوریا وحزبوڵڵا له‌ دژی توركیا وئه‌مریكا وعه‌ره‌به‌كانی خه‌لیج له‌ به‌رژه‌وه‌ندی ئێران ته‌واو ببێت... بۆیه‌ خۆبه‌ستنه‌وه‌ی كورد به‌و میحوه‌ره‌ ته‌نها زیان وزه‌ره‌ری به‌دواوه‌یه‌..

هه‌رچه‌نده‌ ته‌شه‌یوع وئێران عروبی نییه‌، به‌ڵام ترسناکی مه‌زهه‌بیه‌تی سه‌فه‌وی که‌متر نییه‌ له‌ عروبه‌تی فاشی. هه‌ڕه‌شه‌کانی شێخ جه‌لاله‌دین سه‌غیر، که‌ ناوه‌که‌ی پڕ به‌ پیستیتی، که‌متر نین له‌ هه‌ڕه‌شه‌کانی عروبه‌تی فاشی!

**رۆژی بڵاوبونه‌وه‌**

٢٠١٢/٨/٢٣

## کێ دەڵێ شاهنامەی فیردەوسی پەڕاوی ئاسمانی نییە

یەک شەممە, 23 حوزەیران 2013 19:50

زانیمان سەلەفیە سینگ تەنگ وئاسۆ کورتەکان دژایەتی هەموو شتێکی چاک وخراپ دەکەن لە نێو ئەو شتانەش نەورۆز، ئەگەر حەدیسێکی لەسەر نە هاتبێت یان سەحابیەك لە بارەوەی نەدوا بێت، یان هەر نەبێت حەدیسێکی زەعیفی لەسەر هاتبێت، وەك مەعلومە حەدیسێکی زەعیفیش لە عەقلّی هەزار عاقڵ باشترە لای قوتابخانەی سەلەفیزم، ئەوە کارێکی چاوەڕوانکراوە، بەڵام ئەوەی چاوەڕوان نەکراوە ئەوەیە بە ناوی ئەکادیمیەت ولە ژێر پەردەی زانستی وبابەتخوازیدا بێیتوو هەمان وڕێنەکانی سەلەفیەکان دوبارە کەیتەوە، وتا سەر ئێسقان پشتگیری لە ئەفسانەکانی دوژمنانی مێژوویی کورد بکەیت وئەفسانەکانی شاهنامە کە پڕاوپڕە لە هەڵەی مێژوویی ولۆژیکی لێت ببێتە سەحیحەکەی بوخاری!!

هەر دوێنێ بوو مەلایەك بەدەوری گۆی زەوی دەسوڕایوە بۆ دۆزینەوەی هەر ئەفسانەیەك تا نەورۆز لە کورد داماڵێنێت، بۆیە یەکەم جار گوتی جەژنێکی فارسەکانە وتازیمانەی کوردانە بەپێی گێڕانەوەی فیردەوسی کە نازانم کەسانی سەلەفی باوەڕ بە عاقڵترین قسە ناکەن ئەگەر سەنەدی ڕاست نەبێت، بەڵام بۆ دژایەتی کردنی نەورۆز باوەڕ بەڕیوایەتی فیردەوسی دەکەن کە خۆیان دەڵێن شیعەیەکی ڕافزی بوو!! کە مەلا هێشتا دڵی ئاوی نەخواردەوە، کەمێکی تر لە گوگڵ گەڕابوو جەژنێکی تری قیبتیەکانی بەرچاو کەوتبوو بە ناوی [نیرۆ] یان نیرۆز، ئەوجارە دەیگووت ئەها نەورۆز جەژنی مەسیحیەکانی میسرە!! لەکاتێکدا جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان [نیرۆ] ی قیبتیەکان و [نەورۆز] ی ئاریایەکان. بەڕاستی ئەو هەڵوێست و رەفتارە نا شارستانیانەی کەسانێکی کورد لە ژێر پەردەی دینداریەوە دەرهەق بە نەورۆز دەیکەن، بەر لە هەر شتێك گوزارش دەکات لە نەزانینیان بە نرخی مێژوو وکاریگەری داستانی مێژوو بەسەر کۆ یادەوەری میللەتەکەیان. مەلاکان وبەناو ئەکادیمیەکانی دژە نەورۆز دەڵێن نەورۆز جەژنێکی قیبتی میسریە کۆنەکانە ولە سەردەمی فیرعەونیەکانەوە ئاهەنگی بۆ گێڕدراوە بەر لە ٤٧٠٠ سال پێش زایین، بێئەوەی بە چاکی بیخوێنەوە کە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان نەورۆزی کوردی وفارسی لەگەڵ [نیرۆس] قیبتی میسری کە عەرب بە هەڵە کردیانەتە [نیروز]، ئەو مامۆستایانە بە پاڵنەرێکی ئاینی ڕووت پەلەی ئەوەیانە بە زۆری نەورۆز شاباش بکەن وبیدەنە پاڵ [هەر غەیرە کوردێك] وادەزانن بەدبەختیەکانی کورد هەمووی لە ژوور سەری نەورۆزدایە، بۆیە دەبێت لێی ڕزگار بین نە

وەک بیروباوەڕی تەوحیدی ئاینیمان خەوشی تێبکەوێت!! کەنیسەی قیپتی میسری دەڵێن:" نیرۆز [نەک نەورۆز] جەژنی سەریساڵی میسرییە ویەکەم رۆژی ساڵی کشتوکاڵیە و وشەی ]نیرۆز] لە [نی-یارۆ] قیپتی هاتوە بە مانای ڕوبارەکان، چونکە ئەو کاتە لە ساڵدا کاتی تەواو بوونی وەرزی لافاوی روباری نیلە کە شادەماری ژیانی میسرە، کە یۆنانیەکان هاتنە میسر پیتی [س] یان خستە سەر ناوەکە بە عادەتی زمانەوانی خۆیان چۆن بۆ نمونە [ئەنتۆنی دەکەنە ئەنتۆنیۆس] بۆیە [نیرۆ] بووە ]نیرۆس] و عەرەب وایانزانی نورۆزی فارسیە"..

بە بۆچونی من وشەی [نەورۆز] بە هەموو شێوەکانی بەکار هاتنی زیاتر ئاماژە بە وشەی جەژن دەکات و لەوانەیە لەسەرەتادا لە زۆر کۆنەوە بەر لە دەوڵەتی میدیا وفارسەکان جەژنێکی هاوبەشی گەل وتیرە ئاریا-ئێرانیەکان بوە وپاش دابەشبوونی ئاریایەکان بۆ چەندین گەل وهۆز هەرکەسەی بە شێوازی خۆی جەژنەکەی بەسەرکردۆتەوە وبە چەندین یادەوەری ورِوداو وئەفسانەیان بەستۆتەوە ، هەندێکیان بە سروشت نوێبونەوە وئەوانی تر بە شاکانیان و ئەوی تر بە ئەفسانەیەکی سەردەمی عەقلی سەرەتایی مرۆڤ، وهەیانیشە لە ئیلهامی ئەفسانەیەکی تر وەریگرتوە وهتد...ئەو بابەتانە زۆر ئاسانە بیسەلمێنین و ڕەتیشیان کەینەوە، چونکە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ مێژووی کۆنی ئەفسانەیی ونەنوسراوە وەك ئەوە نییە لەگەڵ مێژووی تۆمار کراودا.

میللەتانی زیندوو زوو بە زوو لەو مێژوو وئەفسانانەیان کۆڵیوەتەوە وبە بەرژەوەندی میللەتانی خۆیانیان باداوەتەوە، میللەتی خەوتو لەناو هەنگوینی بێ هۆشیاریدا بە زانا ونەزانیەوە وەك کورد، ئامادەیە بەخۆی بە دەستی خۆی مێژووی خۆی بداتە پاڵ ئەم و ئەو بەبێ بەرامبەریش. دەکرێت بڵێین مەسەلەی کاوە وزوحاك وکردنەوەی ئاگری ئازادی هەمووی لە بنەڕەتدا داستانێکی یان ئەفسانەیەکی کوردی نە نوسراو بێت وکورد لە بەدبەختی خۆی تۆماری نەکردبێت لەلایەن زانایانی جا لەبەر هۆی ئایینیەوە یان لە نەزانییەوە بێت، فارسەکان هەرزوو دەستی خۆیان وەشاند وزۆربەی ئەفسانە وداستانی ئارییایە کۆنەکانیان بۆخۆیان تۆمار کرد وبە هەوەستی خۆشیان دەسکاریان کردوە، بەڵام تۆمار نەکردنی مانای ئەوە نیە وەك نەریتیکی دەماودەم بە درێژایی مێژووی کورد گواستراتیەوە وکوردیش وەك هەر نەتەوەیەکی تری ئاشنا بە نەورۆز تێڕوانین وبۆچوون وچیرۆکی تایبەت بە خۆی هەیە بۆ نەورۆز، بە بەڵگەی ئەوەی ئەحمەدی خانی لە نێوان ساڵی ١٦٥١- ١٧٠٧ باسی

نەورۆزی کردوە، نالی وحاجی قادری کۆیی وزۆربەی شاعیرانی کلاسیکیمان باسیان کردوە، [جێمز مۆری] رۆژهەلاتناس لەسالی ١٨١٢ زایینی لە سیاحەتنامەکەی باس لە یادکردنەوەی کوردان دەکات بەجەژنی رزگاری گەل لە ستەمی زوحاك، واتە پێش دەرکەوتنی بیری ناسیونالیزم ئەو هەموو خەڵکە پایە بەرزانە باسیان لە نەورۆز کردوە!

هەروەها نوسەری کتێبی هاونەتەوەیی کورد وماد، حەبیبوڵڵای تابانی دەڵێت: عومەر خەیامی نیشابوریش لە کتێبی نەورۆزنامەی خۆیدا دەڵێت؛ " فەرەیدوونی کورد فەرمانی بە ئێرانیان دا تا ئەو ڕۆژەی زوحاک بەدیل گیرا، ئێران لەشەڕ وکێشەی ئەو ڕزگار بوو بکەن بەڕۆژی جەژن." ل ٧١. لەجیاتی مێژووناسەکان بەو بەڵگانە وەلامی ئەو کەسانە بدەنەوە کە دەڵێن نەورۆز هی کورد نییە، کەسانێکی بەبیانوی دینداریەوە یان ئەکادیمی سەلەفیەوە لەیەکەم تەقە تەسلیم دەبن بۆ هەر یەکێک هەر کلتورێکی کورد بەرێت، چونکە بەڕای ئەوان ناکۆکە لەگەڵ ئەندێشەکانی سەلەفی سالح!

شاهنامە لە نێوان ڕاستی و ئەفسانەدا

ئەوە کاری مێژوو نوسەرانە بێن بەرگری لە مێژووی میللەتەکەیان بکەن، نەک مێژووناسان بێن بە عەقڵیەتێکی سەلەفی وشکەوە گرنگترین و زۆربەی مێژووی کورد بشەیتانێنن. سەیر لەوەدایە کورد لەبەر لاوازی گیانی نەتەوەیی و لەبەر ئەوەی بایەخی بە نوسین وتۆمارکردن نەداوە، هەتا یەکەم سەرچاوەی مێژویشی [شەرەفنامە] بە فارسی نوسراوە کاتێك کە شاعیرێکی میللی ئێرانی [فیردەوسی] داستانی شاهنامە دەنوسێت کە لە جەوێکی ئەفسانەیی دا نوسراوە ووەک هەر داستانێکی تری وەک ئەلیادە وگەلگامێش وهیتر، تێیدا بە کەیفی خۆی کەسەکان وڕوداوەکان ئاڵ وگۆڕ دەکات هەتا زوحاکیش بەعەرەب لەقەڵەم دەدات وبەشێوەیەکی ئەفسانەئامێزانەش ئاماژە بە بوونی کورد دەکات، گوایە لەو منداڵە رزگاربوانە لە سەربڕینی زوحاک کورد دروست بوە

]کنون کرد از ێن تخمە دارد نژاد کز ێیاد ناید بدل برش یاد] [جا کوردەکان لە تۆرەمەی ئەو لاوانەن کە نەیاندەزانی ئاوادانی چیە] ل٧١ هاونەتەوەیی کورد وماد، حەبیبوڵڵای تابانی، وەرگێڕانی جەلیل گادانی.

دەیەوێت بڵێت کە کورد لە فارسەوە وەپاش کەوتوە پاش هەلاتنیان بۆ کێوەکان! لە بنەڕەتدا فارسن ولەدەست زوڵمی پاشای عەرەب ڕایان کردوە، بە عەرەب کردنیشی دوژمنانی شا

فارسەكان دەلالەتی خۆی هەیە ودەگەڕێتەوە بۆ ڕوخانی شانشینی شایەكانی شاهنامەی فیردەوسی لەسەر دەستی عەرەبە موسڵمانەكان، شاهنامەی فیردەوسی جارێكی تریش ئاماژەی نێگەتیڤ بە عەرەب دەكات لە ل ٥٠ی چاپی عەرەبی دەڵێت : " دوایی عەرەبێك بەناوی دەربیس لە دژی كیكاوس هەڵگەڕایەوە لەدەوربەری شام، دوایی كیكاوس بەدەستی بەربەرەكان بە فێڵ دەگیرێت ومەملەكەت بێ شا دەمێنێتەوە ...دوایی ئەفراسیاب دەستی بەسەر دادەگرێت پاش شەرێک لەگەڵ [عەرەب!] سەفەویەكان لە بۆشاییدا نەهاتن، بەڵكو وەک بیرمەندێكی گەورەی ئێرانی سادق زیبا كلام بەڕاشكاوی دەڵێت: " لەوە دەچێت كە ئێمە وەک ئێرانی دۆڕانە مێژوییەكانمان لە قادسیە بەر لە ١٤٠٠ ساڵ لەبیرنەكردوە"!! شیعەگەرێتیش كە پیشەسازیەكی ئێرانیە بە پلە یەک لە نوسخە سەفەویەكەی ئەویش گوزارشێكە لە ڕقی فارسی نەژادی بەرامبەر ئەو [عەرەبە پێ پەتیانەی] كە ئیمپراتۆریەتی فارسیان ڕوخاند.

ئەوە لە كاتێكدا ئەبولقاسمی فیردەوسی لە چاو زانا ئایینیە شیعە توندرەوەكانی ئەمڕۆ موسڵمانێكی چاكیش بوە و زۆر بەڕیزەوەش باسی ئیسلام وكەسایەتییە سونیەكانیش دەكات وەک ئەبوبوكر وعومەر وعوسمان لە پێشەكیەكەیدا، هەرچەندە تاوانباركراوە بەوەی شیعەیەكی رافیزییە لەبەر چەند دێرێك لە وەسفی ئەهلی بەیتدا، كە ئەو دێرانە جێگای مشتومڕی لێكۆڵەرانە وبە درانە پاڵ وساختەی دەزانن، بەڵام بەڕای من ڕاستر وایە كە موعتەزیلی بوە وكە نوێنەری هێڵی عەقلانیەت دەكەن لە ئیسلامدا بە بەڵگەی ئەوەی لە سەرەتای شاهنامەدا ستایشی عەقڵ دەكات ولە كۆتایش وەسفی عومەری كوری خەتاب دەكات، هەرچەندە من بە دووری دەزانم شیعە بوبێت، بەڵام ئەگەر شیعەش بوبێت ئەوە شیعەی عەلی بەرایيە نەك شیعەی سەفەوی بەپێی پۆلبەندی بیرمەندی گەورەی ئێرانی عەلی شەریعەتی.

# شاهنامە و نەورۆز

شاهنامە نەورۆز ناگێڕێتەوە بۆ شەری کاوە وفەرەیدون لە دژی زوحاك، کە سەرلەبەری ئەفسانەیە، بەڵکو بەو جۆرە باسی دەکات:

"ئینجا جەمشید هات سەر تەختی فەرمانڕەوایی لە پاش باوکی تەهمورت کە ئەویش وەك ئەو سەرکەوتو بوو بەسەر دێو ودرەنجەکانیش وتوانی لەسەر قەروێڵە ڕازاوەکەی بفڕێت بەسەر هەموو مەملەکەتەکانی بە هۆی جنۆکەکانیەوە!! جنۆکەکان لەو ڕۆژە هەڵیان گرت کاتێ خۆر کەوتە قوللەی حەملەوە، وزۆر دلخۆش بوو ومەی دەبەخشرایەوە وئەو ڕۆژە ناونرا بە ڕۆژی نەورۆز کە بوە عورفێکی پیرۆز لای فارسەکان. " ل ١٠] .الشاهنامە: ملحمە الفرس الکبری، لابي القاسم الفردوسي، دار العلم للملایین- بیروت الگبعە الپانیە ١٩٧٩]شاهنامە لە ڕووی ڕاستیەوە ناکرێت پشتی پێ ببەسترێت زۆر لە ڕەخنەگران پێیان وایە کە قۆناغی یەکەمی شاهنامە: سەردەمی ئەفسانەییە کەباسی گیومیرت وجەمشید وزوحاك وفەرەیدون وکاوە دەکات، کە ئەو قۆناغە هیچ نرخێکی مێژوویی نییە ورەنگی ئەفسانەیی زاڵە بەسەریدا.

کەچی ئەو دژە نەورۆزانەی نێوەندی دینی ودینی پەردەپۆشکراو بە ئەکادیمی، هەمان هەڵەی ناسیونالیستە کوردەکان دوپات دەکەنەوە کاتێ چیرۆکی کاوە وزوحاکیان وەک هەقیقەت و ڕاستی بە خەڵک دەفرۆشت، وئەوانیش دێن داوەری خۆیان لەسەر ئەو هەڵەیە دەکەن و چیرۆکی کاوە وزوحاکیان هێندە بە جدی وەرگرتوە دەڵێی باسی کەسانێکی سەدەی بیست ویەکەم دەکەن، وکاوەی داماو دەکەنە خاین وخۆفرۆش، کە ئەمڕۆ هەزاران کورد ناوی کاوەیە! وزوحاک دەکەنە دوا پاشای میدیەکان [ئەشتیاگ] نازانم بە چ پێودانگێك کە تۆ نەتوانی هیچ مێژویەکی کۆن بە وردی دیاری بکەیت؟!

پێم وایە مێژووی نەورۆز دەگەڕێتەوە بۆ زۆر کۆنتر لە مێژووی ڕوخانی دەوڵەتی مادەکان یان دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخمینیەکان، نەورۆز کۆنترین داستان یان ئەفسانەی ئارییە، ئەفسانەش بەرهەمێکی گرنگی عەقڵی مرۆڤە بە گشتی. هەرچۆنێکی بێت چیرۆکی کاوە وزوحاک دەبێت لە چوارچێوەی داستانێك یان ئەفسانەیەکی نیشتیمانی بخوێندرێتەوە بە پشت بەستن بە هەر دەقێك وبە تەقلیدی شەفەوی، نەك وەك مێژوویەکی واقیعی، خوێندنەوەی بەو شێوەیە داستانێکی بەسوود دەبێت بۆ پتەوکردنی هەستی ئینتیما بوونی پوکاوەمان، بەڕاستی ئەو داستانە نەتەوەییانە هەرگیز بە هیچ تێکستێکی تر تەعویز ناکرێت، چۆن قورئان هەستی

ئیمانداری بە ئایین ورۆژی دوایی پتەو دەکات، ئەو داستانە نەتەوەییانە وشیعری حاجی قادر وئەحمەدی خانی وپەشێو وبێکەس ودەنگی شڤان پەروەر وشتی تریش هەستی ئینتیمای نەتەوەیی لای خەڵك قوڵتر دەکات. هەر بۆیە هەست بە لاوازی هەستی ئینتیمای کورد بوون دەکەین لەلای ئیسلامیەکان بە گشتی ولەلای سەلەفیەکان بە تایبەتی، چونکە ناوهێنانی قەوم وقەومیەت بە هەر مەبەستێك بێت نیمچە کوفرێکە لای زۆریان یان ئینتیمای نەتەوەیی دوا خاڵی لیستی بایەخیانە. فیردەوسی بە پاڵنەری خۆشەویستی میلەتی فارس دێت ئەو هەموو ئەفسانەیە دادەڕێژێتەوە وبە ویستی خۆی تۆماری دەکات وکاوە دەکاتە فارس ونەورۆز دەکاتە جەژنێکی فارسی بۆ تۆمارکردنی شاکارێك بۆ نەتەوەی فارس کە بەڕاستی شاکاریشە لە رووی ئەدەبیدا، وەك [نولدکە] ی ئەڵمانی دەڵێت: "داستانێکی بێ وێنەیە لای هیچ نەتەوەیەک وێنەی نییە" [ابن الاثیر] کە مێژوو نوس وزانای فەرمودەناسی پێغەمبەرە ستایشی شاهنامە دەکات بە ئەلفازێك لەوانەیە لەو سەردەمە با سەلەفیەکان تەکفیریان کردبا، ابن الاثیر دەڵێت: " شاهنامە قورئانی عەجەمە ...چونکە لێوان لێوە لە ڕەوانبێژی" مفاهیم الانسانیه في شاهنامه الفردوسي، د.محمد علوی مقدم، مجله العلوم الانسانیه عدد ١٠١.

دەبێت بۆ زانایەکی کورد ئەو کارەی پێنەکرابێت؟! لەو سەردەمە کارێکی وای بۆ کورد نەکردبێت؟! ئەگەر دەوڵەتی میدیا زۆر لە مێژ بوو نەمابوو لە یادەوەری کورد، بۆ ئەو هەموو زانایە کوردە داستانێکیان لەسەر سەلاحەدین ئەیوبی نەنوسی کە خۆی لە خۆیدا ببوە داستان لە نەزەری شەرق وغەربەوە، هەتا شاعیری گەورەی ئیتاڵی دانتی دڵی نەهاتوە بیخاتە دۆزەخی [کۆمیدیای خوداوەنیەوە] وبەڕیزەوە لە شوێنێکی نێوان دۆزەخ وبەهەشت سەلاحەدینی داناوە، لەکاتێکدا هەموو ئیسلامی بە پێغەمبەرەوەش خستۆتە دۆزەخی کۆمێدیاکەی!!

سەلاحەدین هەموو ئەورووپای سەردەمی جەهالەت وتاریکی کەنیسەی سەرسام کردبوو بە ڕەوشتی بەرز وجوامێری وسوارچاکی. بەڕای من کورد لەچاو میلەتانی تر هێندە دەمارگیر وبەپەرۆش نییە بۆ وڵاتەکەی وبۆ سەرکردە مێژوویەکانیشی، تا ئەمڕۆش لەگەڵ بوونی ئەو هەموو مەترسیانە دەورمان زۆربەی هەرە زۆری سەرکردە ومیلەتیش تاڕادەیەکی زۆر ناوچەگەرێتی وعەشیرەتی وشارچیەتی بە پلە یەك دێت لە ئەجیندایان! دەردەکە پەڕیوەتەوە ناو ڕۆشنبیرانیش لە ئاستی بەرزەوە! کەوابوو چۆن چاوەڕێی زانایەکی کورد بکەین لەسەردەمی زێڕینی ئیسلام وەک فیردەوسی بێت وشتێك وەک ئەو بکات. بۆ زانینیش

شاهنامەی فیردەوسی تاقە شاهنامە نییە لە مێژووی فارسدا، بەڵکو زیاتر لە پێنج شاهنامەی تر بەر لەئەو بەرهەم هاتبوو.

لە کۆتاییدا بەو سەلەفی وئەکادیمیکە مێژووچیە دژە نەورۆزانە دەڵێین :نەورۆز لەوەتەی هەبوە هەر رۆژێکی خۆش بوە بە شاهێدی هەموو مێژوو وکەڵە شاعیرانی کۆن ونوێی کورد ، ولە یادکردنەوەشیدا کورد لاسایی کەسی نەکردۆتەوە، ئەوە خەڵکی ترە لاسایی کورد دەکەنەوە، کورد ئەگەر تاقە دامەزرێنەری نەورۆز نەبێت، ئەوە بێگومان لە دامەزرێنەرانی یەکەمەتی. داستانی کاوە وزوحاک ڕاست بێت یان ئەفسانە بێت، بەپێی نوسخە کوردیەکەی دەخوێندرێتەوە کە کورد پشتاوپشت بۆ یەکیان گوێزاوەتەوە، نەك بە پێی شاهنامەی فردەوسی لێوان لێو لە خورافات وشتی پوچ، کە لەلاتان وەك صحيحی البخاري لێهاتوە وداکۆکی لە سەرلەبەری دەکەن، ویادەوەری کوردی پێ دەتەقێننەوە وپاش هەزاران ساڵ تازە کاوەی ئاسنگەر وەک رەمزێکی مێژوویی ناپاکی وێنا دەکەن، مێژوو بواری زۆرە بۆ سەلماندنی بەڵگەکانی خۆمان بەڵام ئێوە لە بنچینەدا ناحەزن بە بۆنەکە، دەبا فیردەوسی قسەیەکی بە ئیسلام گوتبا ئەو کات سەرلەبەریتان لە سفر دەدا! ئێوە بە ناحەزانە تێی دەڕوانن بۆیە ناتوانن بەرگری لێ بکەن. ئەگەر ترس وفۆبیای ئایینی پاڵنەرتانە لەو دژایەتی کردنەی نەورۆز، دەبێت بزانن نەورۆز جەژنێکی نەتەوەیی ونیشتیمانییە و هەتا دارو درەختیش لە دونیای ئەمڕۆدا جەژنی هەیە، وجەژنەکەش دوورە لە ڕەهەندی ئایینییەوە، مەگەر ئێوە بەو تەرکیز کردنەتان کاردانەوەی خراپ لەلای خەڵکی کورد دروست بکەن بۆ پێدانی ڕەهەندی ئاینی بە نەورۆز. ئێمەی کورد خاوەنی مێژووی کوردین لە پێش وپاش ئیسلامدا، ئەوە زانایانی ئیسلام لە عەرەبەکان بوون ئەو هەموو کلتور وئەدەب وشیعر وموعەلەقات وئەفسانە ومێژووی عەرەبیان لە فەوتان ڕزگار کرد، خۆزگە ئێوەش وەک حەزرەتی شەرەفخانی بەدلیسی وئەحمەدی خانی وحاجی قادر دەبوون، نەك لە مەلیك مەلیکتر بن و لە عەرەب ئیسلامتر ولە شاهنامە فارستر بن!

یەک شەممە, 23 حوزەیران 2013 19:50

# كاوه‌ و زوحاك له‌ نێوان ڕاستی وئه‌فسانه‌دا!

چوار شه‌ممه‌, 26 ئازار 2014 23:40

محه‌مه‌د هه‌ریری...

من تێناگه‌م بۆ هه‌موو ساڵێك له‌ نه‌ورۆزدا چه‌ندین لایه‌ن به‌ دینی وسێكیولار ومه‌لا ورۆشنبیره‌روه‌، به‌س خه‌ریكی هێرش كردنن بۆسه‌ر نه‌ورۆز به‌ چه‌ندین پاساوی دینی ومێژوویی وئه‌كادیمی وشتی تریش.

ساله‌كانی ڕابردوو هێرشی سه‌له‌فیه‌ دینیه‌كان وسێكیولاره‌كان وئه‌كادیمیه‌كان له‌سه‌ر خودی نه‌ورۆز بوو گوایه‌ جه‌ژنێكی كوردی نیه‌، وبه‌ده‌وری گۆی زه‌وی ده‌سوڕانه‌وه‌ بۆ دۆزینه‌وه‌ی هه‌ر ئه‌فسانه‌یه‌ك تا نه‌ورۆز له‌ كورد داماڵێنێت، به‌ڕاستی ئه‌و هه‌ڵوێست و ره‌فتاره‌ نا شارستانیانه‌ی كه‌سانێكی كورد له‌ ژێر په‌رده‌ی دینداریه‌وه‌ وئه‌كادیمیه‌وه‌ ده‌رهه‌ق به‌ نه‌ورۆز ویاده‌ كوردیه‌كان ده‌یكه‌ن، به‌ر له‌ هه‌ر شتێك گوزارش ده‌كات له‌ نه‌زانینیان به‌ نرخی مێژوو وكاریگه‌ری داستانی مێژوو به‌سه‌ر كۆخه‌یاڵدان وكۆیاده‌وه‌ری میلله‌ته‌كه‌یان.

له‌ ڕووی مێژووییه‌وه‌ قسه‌ی زۆر جیاواز هه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌سڵی نه‌ورۆز وه‌ی كێیه‌ وچۆن دروست بوه‌، زه‌حمه‌ته‌ هیچ كامێكیان ساغ بێته‌وه‌، به‌ڵام كاتێك به‌ هێزترین سه‌رچاوه‌ی كۆن سه‌ره‌ڕای نوسینی به‌ ده‌ستی فارسێكی ده‌مارگیری وه‌ك فیرده‌وسی نكوڵی له‌ كوردبوونی كاوه‌ ناكات وبه‌ ئاشكرا باسی ڕۆڵی سه‌ره‌كی كاوه‌ وكورده‌ ڕزگاربوه‌كانی چیا ده‌كات له‌ ڕوخانی زوحاك، ئه‌وه‌ بێگومان خۆ به‌ كه‌م زانینه‌ بڵێیت نه‌ورۆز و كاوه‌ چه‌ند په‌یوه‌ندی به‌ كورد هه‌یه‌ هێنده‌ش په‌یوه‌ندی به‌ ئۆزبه‌ك وپاشتون وتاجیك وبلوش هه‌یه‌! كورد ئه‌گه‌ر كه‌سانێكی عاقڵی مێژوویان بنوسیبایه‌وه‌ گومانم نه‌بوو سێ چاره‌گی درۆكانی شاهنامه‌ی فیرده‌وسی هه‌ڵده‌وه‌شایه‌وه‌.

من نازانم ئه‌وانه‌ی باسی كاوه‌ ده‌كه‌ن گوایه‌ په‌یپێی شاهنامه‌ هاتوه‌، كام نوسخه‌ی شاهنامه‌یان خوێندۆته‌وه‌!

شاهنامه‌ نه‌وروز ناگێرێته‌وه‌ بۆ شه‌ری كاوه‌ وفه‌رەیدون له‌ دژی زوحاك، كه‌ سه‌رله‌به‌ری ئه‌فسانه‌یه‌، شاهنامه‌ له‌ ڕووی ڕاستیه‌وه‌ ناكرێت پشتی پێ ببه‌سترێت زۆر له‌ ره‌خنه‌گران پێیان وایه‌ كه‌ قۆناغی یه‌كه‌می شاهنامه‌: سه‌رده‌می ئه‌فسانه‌ییه‌ كه‌باسی گیومیرت وجه‌مشید وزوحاك وفه‌رەیدون وكاوه‌ ده‌كات، كه‌ ئه‌و قۆناغه‌ هیچ نرخێكی مێژوویی نییه‌ وره‌نگی ئه‌فسانه‌یی زاڵه‌ به‌سه‌ریدا. كه‌چی ئه‌و دژه‌ نه‌ورۆزانه‌ی به‌ناوی ئیسلامه‌تیه‌وه‌ هه‌مان هه‌ڵه‌ی ناسیونالیسته‌ كورده‌كان دوپات ده‌كه‌نه‌وه‌ كاتێ چیرۆكی كاوه‌ وزوحاكیان وه‌ك هه‌قیقه‌ت و ڕاستی به‌ خه‌ڵك ده‌فرۆشت، وئه‌وانیش دێن داوه‌ری خۆیان له‌سه‌ر ئه‌و هه‌ڵه‌یه‌ ده‌كه‌ن و چیرۆكی كاوه‌ وزوحاكیان هێنده‌ به‌ جدی وه‌رگرتوه‌ ده‌ڵێی باسی كه‌سانێكی سه‌ده‌ی بیست ویه‌كه‌م ده‌كه‌ن، وكاوه‌ی داماو ده‌كه‌نه‌ خاین وخۆفرۆش، كه‌ ئه‌مڕۆ هه‌زاران كورد ناوی كاوه‌یه‌**!!** وزوحاك ده‌كه‌نه‌ دوا پاشای میدیه‌كان [ئه‌شتیاگ] نازانم به‌ چ پێودانگێك وچ سه‌رچاوه‌یه‌ك كه‌ تۆ نه‌توانی هیچ مێژویه‌كی كۆن وسه‌رده‌می ئه‌فسانه‌ به‌ وردی دیاری بكه‌یت؟ !پێم وایه‌ مێژووی نه‌وروز ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ زۆر كۆنتر له‌ مێژووی ڕوخانی ده‌وڵه‌تی ماده‌كان یان دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی ئه‌خمینیه‌كان، نه‌ورۆز كۆنترین داستان یان ئه‌فسانه‌ی ئارياییه‌، ئه‌فسانه‌ش به‌رهه‌مێكی گرنگی عه‌قڵی مرۆڤه‌ به‌ گشتی.

ئه‌مساڵێش چه‌ندین كه‌س هێرشی خۆیان كرده‌ سه‌ر نه‌ورۆز وسه‌ره‌ڕای به‌ خاین كردنی كاوه‌ش !ڕابه‌ری بزوتنه‌وه‌ی ئیسلامی عیرفان عه‌لی عبدالعزیز ، هه‌مان شه‌كری پار وپێراری كۆلكه‌ سه‌له‌فی وئه‌كادیمسته‌كانی شكاندەوه‌، به‌وه‌ش نه‌وه‌ستاوه‌ كه‌ كاوه‌ وه‌ك دوژمنی كورد نیشان بدات، به‌ڵكو حه‌سه‌ن زیره‌كی خاوه‌ن خۆشترین ودێرینترین یادگاری نه‌ورۆزی گه‌وره‌ وبچوك ئیدانه‌ ده‌كات، له‌به‌رئه‌وه‌ی دیرێك له‌و گۆرانیه‌ به‌سه‌ر شای ئێران گوتراوه‌**!!** وده‌ڵێت: " ئه‌وه‌ی جێ سه‌رسوڕمانه‌ ناسیۆنالیزی كوردیی و هه‌ندێك گێله‌ موسوڵمان گۆرانیه‌كی حه‌سه‌ن زیره‌ك ده‌كه‌نه‌ شاهنامه‌ی فیرده‌وسی**!!** و له‌ورۆژه‌دا چه‌ندین جار لێی ده‌ده‌ن بێ ئاگا له‌وه‌ی كه‌ دێڕێكی لێ سانسۆر كراوه‌ كه‌ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌: به‌فه‌رمانی شاهنشاه ئاریامیهر ئه‌مرۆژه‌ ساڵی تازه‌یه‌ نه‌ورۆزه‌ هاته‌وه‌ )كه‌وابێت به‌فه‌رمانی حمه‌ ره‌زا شاه‌ گۆرانیه‌كه‌ی وتووه‌"!!

ناسیۆنالیزی كوردیی و هه‌ندێك گێله‌ موسوڵمان گێلن كه‌ گۆرانیه‌كی حه‌سه‌ن زیره‌ك ده‌كه‌نه‌ شاهنامه‌ی فیرده‌وسی؟! من له‌و مامۆستایه‌ زیره‌كه‌ ده‌پرسم كه‌ خه‌ڵكی پێ گێله‌: بۆ شاهنامه‌ی فیرده‌وسی لای تۆ هێنده‌ مه‌زن وجێگای متمانه‌یه‌ وه‌ك قورئان تا وا باسی بكه‌یت**؟!**

باوەڕناکەم ئەو قسەیە لە ئێرانیترین ئێرانی دەربچێت، کە زۆر لە لێکۆڵەرانی گەورەی ئێران باسی ئەفسانەئامێزی شاهنامە دەکەن. د. مەولود ئیبراهیم جەسەن دەربارەی حەسەن زیرەك دەڵێت: " "حەسەن زیرەک" بە دەنگە خۆشەکەی، هەرچەندە شیعرەکەی پیرەمێردی وەک خی نەگوتووتەوە، بەڵام بەهۆی ئاوازە نایاب و دەنگە زوڵاڵەکەی شیعرەکەی لە شیعری خوێندەوارانەوە کرد بە شیعری هەموو گوێگران و دواجار هەموو کورد".

ئینجا دەربارەی خیانەتی کاوەی ئاسنگەر کە بڕوای ئێوە وکەسانێک وئەمساڵ مام جەلالیشی هاتە سەر خەت، گوایە لە ووتارێکدا ساڵی ١٩٨٩_١٩٩٠ئەویش وتویەتی " :نەورۆز لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی راستە، "زوحاك" خۆی کورد بووە ، "کاوە "فارس بووە، جەژنی نەورۆز خۆی لە خۆیدا هی فارسەکانە، هەر بۆیەش پێی دەڵێن " فرس المجوس" واتا فارسی ئاگرپەرست، بەڵام بەهۆی ئەوەی سەدان ساڵە کورد بەو شیوە بیری کردۆتەوە کە نەورۆز جەژنی کووردە بۆیە کار لە کار ترازاوەو تازە کورد حاڵی نابێ و ناچێتە گوێی...! " من باوەڕ ناکەم ئەوە قسەی مام جەلال بێت، کە چەند سایتێکی ناپرۆفێشناڵ لە فەیسبوك بڵاویان کردەوە، لەبەر لاوازی ئەو قسانە، ئەگەر شاهنامە وعمر خەیام وەك دوو فارسی بڵێن کاوە کورد بوو دەبێت مام جلال چی بۆ بمێنیتەوە بیڵێت؟ ئینجا ئاگرپەرستی پەیوەندی چیە بە نەورۆز، فورسەکان وکوردیش ئاگریان بە پیرۆز دەزانی وئاتەشگەدەی گەورەیان هەبوو کە ساڵ دوازدەی مانگ داگیرسابوو، نەك بەس لە نەورۆز ئاگر بکەنەوە!!

مامۆستا عیرفانیش دەڵێت: "بۆیە لەناو خەلکەکە کەسێك پەیدا بوو بەناوی کاوەی ئاسنگەر توانی رابەرایەتی نارازاییەتی خەڵکی بکات وئیژدهاك بکوژێت .... بەلام ئەوەی کە جێگەی سەرنجە بۆ ئێمەی کورد کە خۆمان بەبەشێك لە لەهجەی شمالی ئێران دەزانین و ماددەکان بەباوەگەورەی خۆمان دەزانین ئەوەیە کەئایا ئەم داستانە بۆ ئێمە نەتەوەییە یان ئەخلاقی !" لە وەڵامدا دەڵێت:

"بێگومان ئەم داستانە بۆ ئێمە ئەخلاقیە بەمانەی ئەوەی کە بەگژاچونەوەی زولم و زۆربوو چونکە هەردوو لا هەر یەك رەگەز بوون کەئەویش رەگەزی مادد بوو بەڵام ئایا بەکوشتنی ئیژدهاك کاوە توانی خۆی حوکمی ماد بکات, ئایا توانی ئیمپراتۆری ماد بپارێزێت؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر بەکوشتنی ئیژدهاك ماددەکان بۆهەتا هەتایە کۆتاییان پێهات وەحەخامەنشیەکان کەلەهجەی جنوبی ئێرانە ئەو هەلەیان قۆستەوە و لەژێر رکێفی ماددەکان دەرچوون".

ئەگەر کاوە خائین بێت ئەوە صلاح الدین یش خائینە بە هەمان پاساو!

کەوابوو لای کاک عیرفان وئەوانەی ماوەیەکە باسی خیانەتی کاوە دەکەن بەبێ بیردکردنەوە وبە کۆپی کردنەوەی وتاری کەسانی تر، کاوەش وئەژدیهاک یش هەر کوردن، نەك کاوە فارس بێت وەك مام جەلال دەڵێت، بەڵام کێشەکە لە بەرژەوەندی دوژمنان کۆتایی هات، هەرچاکە ناڵێت کاوە بەکرێگیراوی ئەخمینیەکان بوو وبە فیتی ئەوان مادەکانی لەسەر حوکم لابدات؟!

ئەگەر وای دابنێین ئەو چیرۆکەی زوحاك دوا پاشای مادەکان ڕاستە و کاوەی ئاسنگەر بە شۆڕشەکەی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی ڕوخاندوە بەر لە چەندین سەدەی بەر لە میلاد! بەڵام سەیر لەوەدایە کاتێك باسی صلاح الدینی ئەیوبی دەکرێت بە خراپی لەلایەن کوردە ئاسۆ تەسکە نەتەوەچیەکان، کە دەڵێن هیچی بۆ کورد نەکردوە ولە خزمەتی عەرەبدا بوە، هەموومان، بە موسڵمان وئیسلامیەوە دەڵێین: کورە بابە کەی ئەو کاتە سەردەمی ناسیۆنالستی بوو، کەی سەردەمی دەولەتی قەومی بوو، ئەوە کە صلاح الدین لە چاو کاوە وزوحاك دوێنێ بوو!

بەڵام لەبەرئەوەی کاوەی بەسەزمان موسڵمان نەبوو، ئەوە ئیسلامی وهەندێ سیکیولاری نەتەوەیی دێن وهەمان پێوەری دەوڵەتی ناسیونالستی و سەردەمی فیکری قەومی بەسەر کاوەیەك جێبەجی دەکەن کە جیرۆکەکەی نزیکترە لە ئەفسانە تا مێژویەکی ڕاستگۆی تۆمارکراو. ئەگەر تۆ ڕازی نابیت ئەو پێوەرە لەسەر صلاح الدین جێبەجێ بکەیت – کە لە ڕاستیدا جێبەجێش نابیت بە ڕای ئێمە – ئەی بۆچی هەمان پێوەر لەسەر چەندین هەزار ساڵ بەر لە صلاح الدین جیبەجێ دەکەیت؟! ئەگەر کاوە خائین بیت، بەپیی ئەو پێوەرە سەقەتە ئەوە بێگومان صلاح الدین یش خائینە بە هەمان پێوەر کە ئیعلانی دەوڵەتی کوردستانی گەورەی نەکرد وەك نەتەوەچیە حەوسەلە تەنگەکان وا دەڵێن!

ئینجا لە ڕوەکی تر من بۆنی جۆرێك لە بەرگری دەکەم لە دەسەڵاتی گەندەڵ لەو قسانە، چونکە ئەگەر کاوە سەرکۆنە بکرێت لەبەر ڕاوەستانەوەی لە دژی زوحاك، کە گوایە پاشایەکی کوردی ناسیۆنالیست بوە [!!] ئەوە هەموو ڕۆلەیەکی ئەو نیشتیمانە کە لە دژی دەسەڵات دەوەستنەوە ناپاکن وەك کاوە، کە بوە هۆی ڕوخانی میدیەکان!

دەڵێن زانایەکی دینی دوو سەعات خەریکی ڕاڤەکردن و پینەپەڕۆکردنی فەرمودەیەکی پێغەمبەر بوو کە بە عەقڵ دا نەدەچوو، زانایەکی تر بە یەك ڕستە کۆتایی بەو مەهزەلەیە هێنا وگووتی: ئەو فەرمودەیە ڕاست نیە وهەڵبەستراوە پێویست ناکات ئەو هەموو شێر وڕیوی یە بهێنیتەوە بۆی!

ئێوە کەوا خۆتان هیلاك دەکەن بە مێژووی کاوە وئەژدیهاك دەبێت ئەو راستیانە بزانن:

١ -جەژنی نەورۆز پێشینەیەکی دووردرێژی هەیە و کۆنترین جەژنی مرۆڤە لە سەر زەوی. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەو بوارەدا کراون، کۆنترین مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی، ئەو کاتەی کە لە ئەشکەوتەکاندا ژیاون، ڕۆژی یەکەمی بەهاریان کردووە بە جەژن. دکتور مەولوود ئیبراهیم حەسەن لە وتارێکی تێر و تەسەلدا بە وردی چووەتە سەر بنج و بناوانی مێژووەوە و بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو جەژنە هەمان جەژنی (تەمووز و عەشتار) ە، کە سۆمەرییەکان پێش ئەوەی لە ئەشکەوتەکانی کوردستان بێنە دەر و بەرەو خوارووی وڵاتی عێراقی ئێستا داگەڕێن، ئەو جەژنەیان بەڕێوە بردووە. هەروەها دەڵێت: (ماجید عەبدڵلا ئەلشەمس) دەنووسێ:(ڕەنگە زۆربەمان ئەوە نەزانین کەسایەتی "کاوەی ئاسنگەر "لە فیکری کوردی، ئەوە شێوەیەکی بەرچاوی کەسایەتی تەمووزی عێراقی کۆنە ( نەورۆز کەی دروستبووە و هی چ میللەتێکە؟!

٢ -شاهنامە لە ڕووی ڕاستیەوە ناکرێت پشتی پێ ببەسترێت زۆر لە ڕەخنەگران پێیان وایە کە قۆناغی یەکەمی شاهنامە: سەردەمی ئەفسانەییە کەباسی گیومیرت وجەمشید وزوحاك وفەرەیدون وکاوە دەکات، کە ئەو قۆناغە هیچ نرخێکی مێژوویی نییە ورەنگی ئەفسانەیی زاڵە بەسەریدا، شاهنامە نەورۆز ناگێرێتەوە بۆ شەری کاوە وفەرەیدون لە دژی زوحاك، کە سەرلەبەری ئەفسانەیە، بەڵکو بەو جۆرە باسی دەکات: ئینجا جەمشید هات سەر تەختی فەرمانڕەوایی لە پاش باوکی تەهمورت کە ئەویش وەك ئەو سەرکەوتو بوو بەسەر دێو ودرەنجەکانیش وتوانی لەسەر قەروێڵە ڕازاوەکەی بفڕێت بەسەر هەموو مەملەکەتەکانی بە

هۆی جنۆکه‌کانیه‌وه‌!! جنۆکه‌کان له‌و رۆژه‌ هه‌ڵیان گرت کاتێ خۆر که‌وته‌ قولله‌ی حه‌مله‌وه‌، وزۆر دلخۆش بوو ومه‌ی ده‌به‌خشرایه‌وه‌ وئه‌و رۆژه‌ ناونرا به‌ رۆژی نه‌ورۆز که‌ بوه‌ عورفێکی پیرۆز لای فارسه‌کان" .

لێکۆڵه‌ری ئێرانی موجته‌با ئه‌لمینوی ده‌رباره‌ی که‌سایه‌تیه‌کانی شاهنامه‌ ده‌ڵێت:

که‌سانێك له‌ پاشینه‌کان ویستیان ئه‌و ڕوداوه‌ مێژووویانه‌ی له‌ شاهنامه‌دا هاتوه‌ جێبه‌جێیان بکات له‌سه‌ر ڕوداوه‌ هه‌قیقیه‌کانی په‌یوه‌ست به‌ سه‌رده‌می هه‌خامنیشینه‌کان، بۆیه‌ ناوی پاشاکانی شاهنامه‌ یان وه‌ك پاشاکانی هه‌خامنشینه‌کان حسێب کردا! .... ئایه‌ ئه‌و که‌سایه‌تیانه‌ خوداوه‌ندن یان نیمچه‌خوداوه‌ندن؟ به‌ڵام کاتێك جێرۆکه‌کانی به‌راورد ده‌که‌ین له‌گه‌ڵ میتۆله‌ژیای ئه‌فسانه‌کانی هیندی، تێده‌گه‌ین که‌ که‌سایه‌تی جمشید وکه‌یخوسره‌و وفره‌یدون وکاوس بریتین له‌ خوداوه‌ند یان نیمچه‌خوداوه‌ند که‌ له‌ شێوه‌ی مرۆڤ به‌رجه‌سته‌کراون له‌ شاهنامه‌." که‌وابوو ئه‌وه‌ به‌ زۆرله‌خۆکردن ده‌یانه‌وێت پاشاکانی شاهنامه‌ ئیسقات که‌ن به‌سه‌ر مێژووی واقیعی، وئه‌و چیرۆکه‌ ئه‌فسانه‌ییانه‌ هیچ ئه‌رزشێکی واقیعی نیه‌!

٣ -زوحاك هه‌ندێك جا وه‌ك پاشایه‌کی ئاشوری یان بابلی نیوی هاتوه‌، له‌ شاهنامه‌ش وه‌ك پاشایه‌کی عه‌ره‌ب ناوی هاتوه‌، وکه‌ پاشاکانی فارسه‌کان داوای یارمه‌تی ئه‌ویان کردوه‌ له‌دژی شای شاکانی فارسه‌کان!

له‌وه‌دایه‌ کورد له‌به‌ر دواکه‌وتوویی ولاوازی گیانی نه‌ته‌وه‌یی بایه‌خی به‌ نوسین وتۆمارکردن نه‌داوه‌، هه‌تا یه‌که‌م سه‌رچاوه‌ی مێژویشی [شه‌ڕه‌فنامه‌] به‌ فارسی نوسراوه‌ کاتێك که‌ شاعیرێکی میللی ئێرانی [فیرده‌وسی] داستانی شاهنامه‌ ده‌نوسێت که‌ له‌ جه‌وێکی ئه‌فسانه‌یی دا نوسراوه‌ ووه‌ک هه‌ر داستانێکی تری وه‌ک ئه‌لیاده‌ وگه‌لگامێش وهیتر، تێیدا به‌ که‌یفی خۆی که‌سه‌کان وڕوداوه‌کان ئاڵ وگۆڕ ده‌کات هه‌تا زوحاکیش به‌عه‌ره‌ب له‌قه‌ڵه‌م ده‌دات وبه‌شێوه‌یه‌کی ئه‌فسانه‌ئامێزانه‌ش ئاماژه‌ به‌ بوونی کورد ده‌کات، گوایه‌ له‌و منداڵه‌ رزگاربوانه‌ له‌ سه‌ربڕینی زوحاک کورد دروست بوه‌

]کنون کرد از ێن تخمه‌ دارد نژاد کز ێباد ناید بدل برش یاد[

]جا كوردەكان لە تۆرەمەی ئەو لاوانەن كە نەیاندەزانی ئاوادانی چیە] دەیەوێت بڵێت كە كورد لە فارسەوە وەپاش كەوتوە پاش هەڵاتنیان بۆ كێوەكان! لە بنەڕەتدا فارسن ولەدەست زوڵمی پاشای عەرەب ڕایان كردوە، بە عەرەب كردنیشی دوژمنانی شا فارسەكان دەلالەتی خۆی هەیە ودەگەڕێتەوە بۆ ڕوخانی شانشینی شایەكانی شاهنامەی فیردەوسی لەسەر دەستی عەرەبە موسڵمانەكان، شاهنامەی فیردەوسی جارێكی تریش ئاماژەی نێگەتیڤ بە عەرەب دەكات لە ل ٥٠ی چاپی عەرەبی دەڵێت : " دوایی عەرەبێك بەناوی دەربیس لە دژی كیكاوس هەڵگەڕایەوە لەدەوربەری شام، دوایی كیكاوس بەدەستی بەربەرەكان بە فێڵ دەگیرێت ومەملەكەت بێ شا دەمێنێتەوە ...دوایی ئەفراسیاب دەستی بەسەر دادەگرێت پاش شەرێك لەگەڵ [عەرەب]...باشە ئەگەر باوەڕ بە خیانەتی كاوە دەكەن لەسەر پشت بەستن بە شاهنامە، ئەو ئەوەتە شاهنامە دەڵێت زوحاك عەرەب بوە! عومەر خەیام لە نەورۆزنامەكەیدا دەڵێت كاوە كورد بوو، وفەرەیدونیش هەر كورد بوو كە لە پاش ڕوخانی زوحاك هاتە سەر دەسەلات، وەك نوسەری كتێبی هاونەتەوەیی كورد وماد، حەبیبوڵڵای تابانی دەڵێت: عومەر خەیامی نیشابوریش لە كتێبی نەورۆزنامەی خۆیدا دەڵێت؛ " فەرەیدوونی كورد فەرمانی بە ئێرانیان دا تا ئەو ڕۆژەی زوحاك بەدیل گیرا، ئێران لەشەڕ وكێشەی ئەو ڕزگار بوو بكەن بەڕۆژی جەژن." ل ٧١.

كەوابوو ڕای جوراوجۆر زۆرە لەسەر زوحاك كە دەڵێن فارس بوە وبابلی بوە وعەرەب بوە، تەنها كورد هەر لە خۆیەوە كردویەتی بە ورد لەبەر هیچ نا تەنها لەبەر لێك چوونی ناوی ئەژدیهاك وزوحاك بە ناوی دوا پاشای میدیەكان ئەشتیاگ! هەتا با بڵێین كە فیردەوسیش لە شاهنامەدا وادەڵێت، ئایە هێندە ساویلكەبین هەموو قسەكانیمان لێی وەرگرین كە بە هەوەسی خۆی یاری بە ناوەكان وبە ڕوداوەكان دەكات؟!

زوحاكێك بەپێی شاهنامە تەمەنی ١٠٠٠ هەزار ساڵ بێت ومار لە شانەكانی بڕوێت پاش ماچكردنی ئەهریمەن دەبێت پەیوەندی بە ئەشتیاگەوە چی بێت؟ لەدوای ئەودا فرەیدوون بێتو ٥٠٠ ساڵ حوكم بكات دەبێت چ پەیوەندی بە ڕاستی ومێژووەوە هەبێت، تا هێندە بە جیدی وەریگریت، وكاوەی فەقیر كە تێكرای كورد وەك ڕەمزێكی ئەفسانەیی نەتەوەیی لیی دەڕوانیت، بكەیت بە خائین، وزوحاكێک كە هێمای جەور وستەمە بەزۆری وبە پێچەوانەی فیردەوسی وشاهنامەشەوە بكرێتە كورد؟!

ئینجا ئەوەندە بەسە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو قسە بێ بنەمایانەی کە زوحاك دەکەنە ئەشتیاگ ولەبەرکردنی بەرگی واقیعی میژوویی لەبەر ئەو ەفسانەیە ئەوەیە، ئەو دوو ناوە هیچ پەیوەندیەکیان بە یەك نیە، چونکە ناوی زوحاك لە بنەڕەتدا بەر لە هەزاران ساڵ لە ئاوێستا وئەفسانە ئاریە کۆنەکان وەرگیراوە، کە لە ئاڤیستا دەڵێت ئەژیدهاك ئەهریمەنیکە لیناگەڕێت ئاوی هەورەکان دابەزێتە سەر زەوی وخۆی خاوەنی ڕوحێکی نەگریسە، یان ئەژدیهایەکی سێ سەرە، و هەر لە ئاڤیستاس بە [تازی] واتە عەرەب لە قەڵەم دراوە.

کەوابوو فیردەوسی ڕێك لە ئاڤیستا وە ئەو کەسایەتیەی دۆزیوەتەوە کە وەك شەیتانی قورئانە، نەك ویستبێتی ناوی دوا شای کورد [ئەشتیاگ] بشێوێنێت، کورد هەر لەخۆڕا خۆی تێکداوە! کابرا فارسیە ولە بەرژەوەندی مێژووی خۆیدا نوسیویەتی، نازانم بۆ کەسانێك لە فارسە نەتەوەییەکان لە فیردەوسی ڕاست نەبونەتەوە وبڵێن: لەوەتی عەرەب هەیە هەر ژێردەستەی فارس بوونە، خێرە ئەو خیانەتە لە مێژووی فارس دەکەیت، یان دوای ڕوخانی ساسانیەکان بە دەستی موسلمانەکان ماستاو بۆ عەرەب دەکەیت؟! چونکە فیردەوسی دەڵێت گوایە پاشاکانی ئیران داوای یارمەتیان کردوە لە زوحاکی عەرەب بۆ ڕوخاندنی شای شاکانی ئیران؟ ودواییش ئەو عەرەبە ستەمکارە پێ پەتیە دەبێتە شای عەرەب وفارس؟!!

گومانم نیە ئەگەر فیردەوسی کوردبا ئێستا ئەویش لەدەستی ئەو ڕەخنە ساردوسڕە نا بابەتیانەی کوردە سەلەفی وئەکادیمی ونەتەوەچیەکانێش ڕزگاری نەدەبوو.

کەوابوو بەسە ئیتر ئەو خۆ وخەڵك هیلاک کردنە، کەس داواتان لێناکات وەك فارسەکان شاهنامە تەقدیش کەن ونەورۆز پیرۆز کەن، وئەمساڵ یادی هەزار ساڵەی نوسینی شاهنامەیان کردوە لەناو بارەگای یۆنیسکۆ، ووێنەکێشێکی ئیرانیش پێنج سەد وێنەی ڕوداوەکانی شاهنامەی کێشاوە وبە وەرگێرانەی ئینگلیزیەوە چاپیان کردوە، نەخێر بەس هێندە خەڵکی کورد لەوەش کۆڵەوارتر مەکەن بە هێرش کردنە سەر نەورۆز وکاوەی ئاسنگەر، تێبگەن هەموو گەلانی جیهان ئەفسانەی نیشتیمانی وا سەیر ونامۆیان هەیە منداڵیش دەزانێت ڕاست نین، بەڵام کاریگەری خۆی هەیە بەسەر ڕوحی نەتەوایەتی وپەروەردەکردنی منداڵ وهەستکردن بە ئینتیمابوون وخۆشەویستی میللەت ووڵاتدا، پار وپێرار شەڕی نەورۆزمان کرد، ئەوە ئەمساڵیش شەڕی کاوە وزوحاکمان پێدەکەن، ئەوەش هەقیقەتی کاوە وزوحاك بوو کە باسمان کردن، دوو کەسایەتی نزیکتر بۆ خەیاڵ وئەفسانەن

تا راستی، به‌ڵام ئه‌فسانه‌یه‌كی پێویسته‌ بۆ كورد به‌پێی گێڕانه‌وه‌ی كوردی كه‌ ده‌ماو ده‌م بۆمان هاتوه‌ نه‌ك گێڕانه‌وه‌ی شاهنامه‌.

-قسه‌یه‌ك له‌سه‌رنه‌ورۆزو سه‌ری ساڵی كوردی و ئه‌فسانه‌

عیرفان عه‌لی عبدالعزیز http://bzavpress.com/Detail.aspx?id=3082&LinkID=18

-ل ١٠. [الشاهنامه: ملحمه الفرس الكبری، لابي القاسم الفردوسي، دار العلم للملايين- بيروت الطبعه الثانيه ١٩٧٩]

- - [1]فردوسي و مقام أو، ص 541.

http://www.marefa.org/index.php/%D8%B4%D8%A7%D9%87_%D9%86%D8%A7%D9%85%D9%87

- [1]ل٧١ هاونه‌ته‌وه‌یی كورد وماد، حه‌بیبوڵڵای تابانی، وه‌رگێڕانی جه‌لیل گادانی.

http://ar.wikipedia.org/wiki/%D8%B6%D8%AD%D8%A7%D9%83

## ئەردۆگان و نانەوەی شەڕی لایەنگرانی هەدەپە و هوداپار!

لە هەرمەی بانگەشەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەردۆگان و ئاک پارتی هیچ چەكێكی فریودەر وناڕەوشتی نەماوە بەكاری بهێنن، بەكاریان نەهێنابێت...

بەكارهێنانی وتاری دینی و بەرزكردنەوەی نوسخەیەك لە قورئانی تەفسیركراو بە كوردی لەلایەن ئەردۆگان، وەك بەرزكردنەوەی پیاوانی معاویە لە كاتی خۆی تەنها بۆ فریودان بوو. درۆكردن لەسەر دەمیرتاش و باسی مافی هاوڕەگەزبازەكان و گۆڕینی قیبلەی ئیسلامیش هەر لە نێو ئەو وتارە دینیە فریودەرە بوو. پاش ئەوەی زۆربەی كارتە دینی و شۆڤێنستەكانیان بەكار هێنا دیارە ئەردوگانی دووڕوو و حزبە شوۆڤێنستە مەخمەلیەكەی دڵی ئاو ناخواتەوە تا شەڕی كوردكوژیش دروست نەكاتەوە لە نێوان كوردا. یەكەم ئاماژەكانی ئەو شەڕنانەوەیە لە نێوان هەدەپ و هوداپاری میراتگری حزب الله دروستكراوی میتی توركی بە عەقڵیەتێكی حزبوڵلایی ئێرانی لە چەند شوێنێك دەركەوتن، ئەوەش هەمان كارت بوو كە ئەردۆگانی ماوە بەسەرچوو لە میانەی ئەو نارەزاییانەی لە سەرتاسەری شارەكانی توركیا دەردەبردرا لە دژی تێوەگلانی توركیا لە یارمەتیدانی داعش و بەژداری كردنی لە فشار توندتركردنە سەر كوردە خۆڕاگرەكانی ناو كۆبانی، بەكاری هێنان. ئەو كاتەش بووە ڕوبەڕووبوونەوەیەكی ناوخۆ لەنیوان هەدەپە و حزبوڵلای كوردی، كە ئێستا حزبێكی نوێی دروستكردوە بەناوی Hür Dava Partisi,كە كورت دەكرێتەوە بۆ Hüda-Par هوداپار، كە بەمانای پارتی بانگەوازی یان دەعوەی ئازاد دێت.

بەداخەوە من تا ئێستا قسەیەكی باشم لەسەر ئەو حزب الله یە كوردیە گوێ لێ نەبوە جگە لە جاڕدانی جەنگ نەبێت ەدژی پ ك ك بە پاڵنەری سوپا و دەزگای میتی توركی. ئەگەر ئەردۆگان ئامادە بێت دەست بخاتە ناو دەستی داعش بۆ لێدانی كورد، چۆن دەست لە پشتی ئەو كوردە ئیسلامیە فریوخۆرانە نادات لەو ساتە ناسكەدا هەوڵی نانەوەی شەڕێكی ناوخۆ نادات لە نێوان هوداپار و هەدەپە لەو هەڵبژاردنە چارەنووسسازە؟!

بۆ ناسینی ئەو هوداپارەی میراتگری حزب الله ی پێشوو دەڵێیین:

حزب الله لە ساڵی ١٩٩٢ چەندین ڕۆژنامەنوسی كوشت وەك Halit Güngen و Namik Taranciو Hafiz Akdemir تەنها لەبەرئەوەی پەیوەندی بەكرێگیراوانەی حزب الله و سوپاو میتی توركیایان ئاشكرا كرد، لە كەیسی حافز ئەكدەمیر بكوژەكەش گیرا، بەڵام پاش شەش هەفتە بەبێ دادگایی كردن بەردرا!! لە ٢٠١١/١/١٧ عارف دۆگان Arif Doğan كە كۆلۆنێلێكی سەربازی خانەنشینكراوە و دامەزرینەری ] JİTEMئیستخباراتی جەندرمە و

دژه تیرۆر] یشە، کە بە تایبەت لە دژی خەباتی پ ك ك دامەزرا بوو هەزاران تاوانی ئەنجامدا لە کوشتن و ئەشکەنجەدانی کورد و لایەنگرانی پ ك ك ، تا رادەی ھوەی جلی پ ك ك یان لەبەر دەکرد و دەچوون لە گوندە کوردیەکان خەڵکیان دەکوشت بۆ ناوزڕاندنی پ ك ك ، سەرەڕای کوشتنی ڕۆشنبیری گەورە و نوسەرانی کورد وەك موسا عەنتەر و ویداد ئایدن و ئەحمەد جەم!! لە دادگا لە کاتی دۆسیی ئەرگەنیکۆن، ڕایگەیاند کە ئەو دامەزرێنەری حزب الله ی کوردی تورکیایە وەك هیزێکی چەکدار دروستی کردن لە پێناو کوشتن و ڕاوەدونانی ئەندامانی پ ك ك.

بە پێی فایق بولوت ی ڕۆژنامەنوس چەندین ئەندامی حزب الله لە ئەستەمبۆڵ گیراون بە ٤٠ کیلۆگرام تەقەمەنیەوە کە پێناسنامەی موخابەراتی میتی شیان لە گیرفان بوو!! لایەنگرانی ئەو حزب الله یە لە ساڵی ٢٠٠٢ ڕێکخراوێکیان دروستکرد بە ناوی هاوسۆزی لەگەڵ موستەزعەفان! و دواییش لە کۆتایی دیسەمبەری ٢٠١٢ هوداپار Hüda-Par پارتی دەعوەی ئازادیان دروست کرد بە هاندانی ئاشکرای ئەردۆگان وپارتەکەیەوە بۆ ڕوبەڕووبونەوەی خەباتی حزبە کوردیەکان و ئەو کاتە لە دژی بەدەپە Demokratik Bölgeler Partisiپارتی هەرێمی دیموکراتی. ئەمڕۆش وادیارە ئەردۆگانی میانڕەو کە ماسکی خۆی گۆڕیوە بۆ داعشڕەو، شانە نوستوەکانی ئەو داعشە خۆفرۆشانەی کورد زیندوو دەکاتەوە بۆ نانەوەی شەڕێکی کورد دژی کورد، هەربۆیەش محمد حسین یەلماز بەرپرسێکی هوداپار دەڵێت: دەوڵەت و لایەنگرانی پ ك ك هێرش دەکەنە سەر بارەگاکانیان، وهێزە ئەمنیەکان چاوپۆشی دەکەن و هیچ ناکەن لە ئاستیدا!

بێگومان ئەوەش بۆ خۆشترکردنی ئاگرەکەیە. بێویژدانی ئردۆگان ئاك پارتی هێندە بڕ دەکات بە دوری نازام گروپێکی هاوشێوە داعشی، لەو هوداپارانە دروست بکات و چەکداریان کات بۆ لەناوبردنی خەباتی کورد، ئەوئەردۆگانە داعشڕەوە کە نەوەی هەقیقی هۆلاکۆ و جەنگیزخانە هیچ دین و ڕەوشت و بەهایەکیان نیە لە زیان گەیاندن بە کورد ودۆزەکەی. هیوادارم هەدەپە و پ ك ك ولایەنگرانی هەوڵی بەرتەسک کردنەوەی کێشەکە بکەن و ئەگەر کەسانێکی عاقڵیان تێدا بێت ئەو هوداپارانە با گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن، هەرچەندە لە باگراوندی حزب الله ی پێشوویان جگە لە مێنتالیتی داعشیەت هیچ هیوایەك بەدی ناکرێت بۆ گفتووگۆ .

31-05-2015خەندان

## ئەردوگان و کەوتن لە دەرسی کوردی

ناسینی من بۆ ئەردۆگان دەگەرێتەوە بۆ بەر لە بوونە سەرۆک وەزیران، لە ١٩٩٥ کە لە ئەستەمبۆل بووم، نزیکەی هەشت مانگێک لەوێ بووم، لەو ماوەیە خەڵکێکی زۆرم ناسی لە تورک وکوردی تورکیا، لەو رۆژانە ئەستێرەی ئەردوگان تازە دەرکەوتبوو بەڵام دەرکەوتنێکی زۆر بە هێز، ئەو کاتە ئەردۆگان نزیکەی دوو ساڵ بوو سەرۆک شارەوانی ئەستەمبۆل بو، بەڵام چۆن سەرۆک شارەوانیەک گەورە و بچوک ستایشی کارەکانی دەکرد، من هەر ئەو رۆژانە هەستم بە دوارۆژی پرشنگداری ئەو پیاوە دەکرد، هەستم دەکرد لە ئەربەکانی مامۆستای سیاسیترە، هێندەی نەبرد لە ساڵی ١٩٩٨ ئەردۆگان لە ئەربەکان جیابوەوە لەگەڵ گروپێک لە هەڵبژاردەی ناو حزبەکە بۆیە ئەربەکان تا مردیش ئەو زامە نێرگزیەی لەبیر نەچوو یان ئەو پێشکەوتنەوەی قوتابیەکەی بۆ هەرس نەکرا تا ئەو رادەیەی بەر لە کۆچی دوای بە ماوەیەکی کەم گوتی:

"ئەردۆگان و عبدوڵلا گول ئامرازی دەستی زایۆنیزمن" و "تەڵەی دوژمن مناڵەکانمان لێ دەرفێنێ، تورگوت ئۆزال لە سەرەتا لێمان جیابوەوە، ئینجا ئەردۆگان لێمان جیابوەوە، بەڵام کاتی ئەوە هاتوە هەموو کەس جیاوازی نێوان رەسەن و لاسایی کەر بزانن، جیاوازی زۆرە لە نێوان رەسەن وجیاوازی کەر." لەوەش زیاتر گوتی " :زایۆنیزم زۆربەی میدیای وڵاتەکەی قۆرخ کردوە وهەر هەموویان لە خزمەتی ئەردۆگان دان، ٣٠ رۆژنامە و ٣٠ کەناڵی ئاسمانی شەو و رۆژ لەرازەی ئەودان...." قسەی تریش بەڵام پێویست بە زیاتر ناکات.

جا ئەو لێدوانانە لە هەر هۆیەکەوە سەریان هەڵدا بێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەردۆگان بەردەوام بوو لە سەرکەوتن و توانی بەسەر زۆر تەحەدای گەورە زاڵ بێت، ئەگەر بزانین ژیان هەمووی دەرس و وانەیە بۆ سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەی دنیادا بەلای کەمەوە لای ئەردۆگان وایە وەک کەسێکی دیندار لەسەر ئاستی تاکە کەسیدا و تا رادەیەکیش سیاسیدا، ئەوە گومانی تێدا نییە کە ئەردۆگان لە زۆربەی هەرە زۆری وانەکانی سەرکەوتوو بوە بەڵام بە ئیمتیاز لە دەرسی کوردی ساقیت وکەوتوو بوە.
لە دەرسی سیاسی دەست پێبکەین هێشتا لە حوکمی قەدەغەکردنی لە سیاسەت دەرنەچو بوو کاتێک زۆربەی کورسیەکانی پەرلەمانی بردەوە لە ٢٠٠٢، ئەو سەرکەوتنانە تا ئەمرۆش بەردەوامە، وتەنها حزبێکە بۆ ئەو ماوەیە درێژە بە تەنها بەبێ تەحالف حوکم دەکات.

له‌ ده‌رسی عه‌سکه‌ری دا، ئه‌وه‌ی ئه‌و پیاوه‌ کردی به‌ دامه‌زراوه‌ی عه‌سکه‌ری نه‌ به‌ خه‌یاڵی که‌س دا ده‌هات نه‌ به‌ که‌س ده‌کرا، توانی زۆر زیره‌کانه‌ په‌ڕ وباڵی ئه‌و نوخبه‌ عه‌سکه‌رییه‌ بکات که‌ له‌ سه‌رده‌می ئه‌تاتورکه‌وه‌ له‌سه‌ر سنگی گه‌لانی تورکیا دانیشتوون.
له‌ ده‌رسی ده‌ستوریش تا راده‌یه‌کی زۆر توانی هه‌موو خاڵه‌ نێگه‌تیڤه‌کانی ده‌ستوور لا بدات، هه‌رچه‌نده‌ کورده‌کانی تورکیا به‌ شێوه‌یه‌کی گشتی لێی ڕازی نه‌بوون.
له‌ ده‌رسی یۆنانی سه‌رکه‌وت له‌گه‌ڵ ئه‌و دوژمنایه‌تیه‌ مێژووییه‌ی نێوانیشیان، توانی په‌یوه‌ندیه‌کی چاک دروست کاته‌وه‌. له‌ ده‌رسی ئه‌رمه‌نی تا ڕاده‌یه‌کی زۆر سه‌رکه‌وتوو بوو، چه‌ندین ده‌رگای داخراوی له‌سه‌ر کۆماری ئه‌رمنستان کرده‌وه‌.
له‌ ده‌رسی ئابووری له‌ سه‌رده‌می سه‌رۆک شاره‌وانییه‌وه‌ تا ئه‌مڕۆش سه‌رکه‌وتن به‌ دوای سه‌رکه‌وتن تۆمار ده‌کات. له‌ ده‌رسی په‌یوه‌ندییه‌ ئیسلامیه‌کانی توانی گه‌وره‌ترین کاریزما بۆ خۆی مسۆگه‌ر بکات، تا ئه‌و ڕاده‌یه‌ی بۆته‌ خۆشه‌ویسترین سه‌رکرده‌ی جیهانی ئیسلامی، هه‌رچه‌نده‌ من سه‌رنجێکی زۆرم هه‌یه‌ له‌و باره‌وه‌ له‌ وتاره‌کانی ترم له‌سه‌ر ئه‌ردۆگان زۆر جار گوزارشم لێکردوه‌ به‌ پێویستی نازانم دوباره‌یان بکه‌مه‌وه‌. له‌ ده‌رسی ئیسرائیل زۆر سه‌رکه‌وتوو بوه‌ تا ئه‌و ڕاده‌یه‌ی زۆربه‌ی سه‌رکرده‌ عه‌ره‌به‌کانی خستۆته‌ قه‌یرانی بێ هه‌ڵوێستی.

له‌ وه‌ڵامی ئه‌وانه‌ی که‌ هه‌نگاوه‌ سسته‌کانی ئه‌ردۆگان ده‌گه‌ڕێننه‌وه‌ بۆ ترسی ئه‌ردۆگان له‌ سوپا یان بنکه‌ جه‌ماوه‌ریه‌که‌ی ده‌ڵێین، ئه‌گه‌ر ئه‌و پیاوه‌ توانای شکاندنی ئه‌و هه‌موو موحه‌رره‌ماته‌ ته‌قلیدیانه‌ی سیاسه‌تی تورکی هه‌بێت، بۆچی که‌ دێته‌ سه‌ر دۆزی کورد وا چه‌ق ده‌به‌ستێت؟! له‌ ڕاستیدا ئه‌ردۆگان ویستی چاره‌سه‌رکردنی لا نییه‌، ته‌نها جاروبار لێدوانێکی له‌ناکاو ده‌دات له‌ گه‌رمه‌ی گه‌مه‌ی هه‌ڵبژاردن وخه‌ڵکێکی زۆریشی پێ هه‌ڵده‌خه‌ڵه‌تێنێ، ئه‌و قه‌یرانه‌ی ئه‌م دوایه‌ش سه‌لماندی که‌ ئه‌ردۆگان هێنده‌ی سه‌رکه‌وتوه‌ له‌ ده‌رسه‌کانی تری ناوه‌وه‌و ده‌ره‌وه‌، هێنده‌ش ساقیته‌ له‌ ده‌رسی کوردی .

محه‌مه‌د هه‌ریری
٢٠١١/١٠/٢٧

## وەستای گەورە ئەردۆگان سەلاحیەتی کۆتاییهاتووە

زۆربەی کەسە کاریزماکان لە مەیدانی سیاسەت و هونەر و هەتا وەرزشیشدا، هەوڵ دەدەن لە کاتێکی گونجاو دا گۆڕەپانی یاریان جێبهێڵن، لە کاتێکدا لە لوتکەی سەرکەوتوویی خۆیانن، هەتا جەماوەر ئەو وێنە جوانەی زهنیان، کە لەسەر ئەوانی وێناکردوە وەك خۆی بمێنێت.

نیلسون ماندێلا پاش خەباتێکی بێ وچان و زیندانی ٢٧ ساڵ و بوونە سەرۆك لە ساڵی ١٩٩٤، هێشتا لەسەر توانای خۆی بوو ڕەتی کردەوە خۆی کاندید کاتەوە بۆ خولێکی تری سەرۆکایەتی سەرەڕای مافی دەستوری و داوای خەڵك، سەرۆکی بەڕازیل لولا دا سیلڤیا پاش بوونی بە سەرۆك لە ٢٠٠٢ ـ ٢٠١٠ بۆ دوو خول، هێندە خۆشەویست و بەجەماوەر بوو، هەتا پەرلەمانی وڵات ئامادە بوون دەستوری وڵات بگۆڕن تا بتوانێت بەردەوام بێت لە سەرۆکایەتی، بەڵام ئەو قبوڵی نەکرد وخەڵك بە گریانەوەماڵئاواییان لێیکرد.

ئەردۆگان پاش ١١ ساڵ لە سەرۆك وەزیرانی ٢٠٠٣-٢٠١٤ هێشتا دڵی ئاوی نەخواردەوە، بە هەزار فڕوفێڵ خۆی کردە سەرۆك کۆمار، ئێستا ساڵێکی نەکردوە لە سەرۆکایەتی نەك ماندوو نەبوە و جێگرێکی شایستەی دروست نەکردووە، بەڵکو سەرۆك وەزیرانی ئەحمەد داود ئۆغلو، کە زۆر کەس چاوەڕێی دەکرد جێگای ئەردۆگان بگرێتەوە، هێندە بێ نرخ کردوە، لە جیاتی ئەو و بێ پرسی ئەو کۆبوونەوەی بە وەزیرەکانی دەکات، هێشتا وەك سەرۆك وەزیرانی بەری ڕەفتار دەکات! وەك پەرلەمانتاری هەدەپە، ئەڵتان تان دەلێت: سەرۆکێکمان هەیە ڕۆژانە پێنج سەعات قسە دەکات، زۆرەبڵێترین خەسوو ناتوانیت هیندە جەنەبازی بکات لە رۆژیکدا، ئەو ڕاست وچۆپ جوێن بە هەموو کەسێك دەدات، تا بەو دواییە لەگەڵ جێگری سەرۆک وەزیران بولنت ئەرینج بەریەک کەوتن!

یاسایەکی مردووی بە ناوی ئیهانە کردنی مەقامی سەرۆکی زیندوو کردۆتەوە تا ئێستا سەدان کەسی سزا داوە بە تۆمەتی ئیهانە کردنی پایەی سەرۆك، کە لە نێویاندا منداڵێکی ١٦ ساڵ و شاجوانی تورکیا لەبەر شەیرکردنی شیعرێك لەسەر وەستای گەورە (بیوك ئوستا) کە نازناوی ئەردۆگانە لە تورکیا، هەروەها دوو وێنەکێشی کاریکاتێر و چەندین نووسەر و هونەرمەند و میدیاکاری تر .

بێ وەعدی و یاریکردنی بە کێشەی کورد و پاڵپشتیکردنی تیرۆرستانی داعش و شکانیان لە کۆبانێ زیاتر ئەو پیاوەی تووشی هیستریا کردوە، بۆیە پاش ئەو هەموو ساڵەی دەستی دەستی پێکردنی کورد، تازە دەڵێت: شتێك نیە بە ناوی کێشەی کورد لە تورکیا، تەنها کورد کێشەی هەیە، وەك چۆن تورکیش کێشەی هەیە !لێدوانەکانی هێندە ئیستیفزازی بوون هەتا جێگری سەرۆك وەزیرانی خۆیان بولنت ئەرینج لێی بەدەنگ هات و گووتی با واز لەو لێدوانە عاتیفیانە بهێنێت و هێندە دەست نەخاتە ناو هەموو کارێکەوە، تەنها حوکمەت بەرپرسە لەو دۆسێیە !کە سەرۆك شارەوانی ئەنقەرەی زۆر نزیك لە ئەردۆگان وەڵامی دایەوە بە تۆمەتبارکردنی بە خیانەت و گوڵەنی بوون! ئەردۆگانیش گووتی من سەرۆکم! نەك هێندە بەڵکو هەتا دژایەتی ڕێکەوتنێکی دە خاڵی نێوان حوکمەت و چەند پەرلەمانتارێکی هەدەپەی کرد بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەی ئاشتی! وادیارە وەستای گەورە ڕژدە لەسەر تەواوکردنی ژیانی سیاسی خۆی لەسەر شێوازی دکتۆرەکانی عەرەب، و نەهێشتنی هەر وێنەیەکی جوان لە زهنی خەڵك.

خەندان26-03-2015

## باوکێکی زۆردار (تورکیا) وکچە زۆرلێکراوەکەی (کورد)!!

### تورکەکان کوردەکانتان خۆش بوێت، وبیان پارێزن، ومتمانەیان پێ بکەن

لە نوسینی نوسەری تورکی: موستەفا سۆنمز

وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: محەمەد هەریری

لەو چەند مانگانەی دوایی مانشێتە سەرەکیەکانی میدیاکان داگیر کرابوون لەلایەن دۆزی کورددا، بە تایبەتی پرسی لە ناوبردنی) PKK پ.ک.ک) وخستنەوە قەبارەی سەرکردە کوردەکانی باکووری عێراق. لە سەروبەندی پەیوەندیەکان وسەردانەکانی بەرپرسانی ئەمریکا بە دیار کەوت کە ئەو وڵاتە ڕێگا نادات دەست درێژی بکرێتە سەر سەرکردە کوردەکان.

لەو کاتەدا حزبی خەڵکی کۆماری (CHP) توانی لە هەڵوێستی هەڵۆکانی جەنگ دەرچێت ونزیک بێتەوە لە هەڵوێستی کۆتری ئاشتی dove-like ولقی زەیتونی بەرز کردەوە بە پێشنیار کردنی نزیک بوونەوە وبەستنی پەیوەندی پەروەردە وفێرکردن، وبازرگانی وفەرهەنگی لەگەڵ کوردەکانی باکووری عێراق، ئەو هەنگاوە مایەی سەرسوڕمانی هەموو لایەک بوو. سەرنج بدە چۆن سەرکردە کوردەکانی باکووری عێراق کە هەردەم تەرکیزیان دەخرێتە سەر، وهەڵۆکانی جەنگ دەڵێن با لێیان بدەین، کەچی کۆترەکان پەرۆشی کێش کردنیانن بەلای خۆیان. بۆچی باکووری عێراق لە هەرە پێشەوەی باسەکانە؟ چونکە باکووری عێراق وەک هەڕەشەیەک دەبینرێت لە دژی تورکیا... وبارزانی وتاڵەبانی وەک هاندەرێکی ئاشوب گێران وپلانگێڕان دەبینرێن کە دەیانەوێت کورد لە تورکیا گومڕا بکەن.

-  باوکێکی زۆردار "A despotic father..."

بە هەڵەی نابینم تورکیا بە باوکێکی زۆردار بچوێنم، کە ئازاری کچەکەی دەدات بە هۆی دڵ پیسی ونا متمانە تراژیکۆمیدیاکانی tragic comical دەرهەق بە کچەکەی.

کچەکە هەر لە ناو ماڵەوەیە، نا چێتە دەرەوە، تەنگی پآ هەڵچنراوە، نا ینێرن بۆ قوتابخانە، وبایەخی پێویستی پآ نادرێت (کچەکە سیمبولی حاڵی کوردە لە تورکیادا)، کەسانێک (PKK) پێی دەڵێن دەبێت یاخی بێت، وکەسانێکی تریش (سەرکردایەتی کوردانی باکووری عێراق) بە نهێنی بە کچەکە دەڵێن دەبێت ڕا بکات بۆ لای ئەوان وماڵە باوکی بەجآ بهێڵێت.

باوکی زۆردار نیگەرانە لە ڕودانی ئەو دەست لە پشت دانانە، لەبەر ئەوەی ئەو ساڵەهای ساڵە هەرگیز لە ئاشتی دا نەبووە لەگەڵ کچەکەی، ولەبەر ئەوەی هیچ خۆشەویستی ومیهرەبانیەکی نیشانی کچەکەی نەداوە. بۆیە هەندێک جار لە کچەکەی دەدات ودەیترسێنێت، هەندێک جاری تریش لەوانە دەدات ودەیانترسێنێ کە هانی دەدەن بۆ گومڕا بوون.

ئەوەی لەو هەڵوێستە دابێت چاوەڕوانی چی لێدەکرێت؟ دەبێت باوکەکە لەگەڵ کچەکەی گفتوگۆ بکات، لە پێویستیەکانی تێ بگات وجێبەجێ یان بکات، ودەبێت خۆشی بوێت، ومتمانەی وەگیر بێنێت... ئەگەر وا بکات متمانە بە کچەکەی دەکات، ونیگەران نا بێت لە هەوڵی هیچ کەسێک بۆ گۆڕانی کچەکەیی وهاندانی بۆ یاخیبوون. چونکە کەس ناتوانێت جیاوازی بخاتە نێوان کچەکە وباوکەکە...

چارەسەری مرۆیی ئەو کێشەیە بەو ئاسانیەیە کەچی ئەوانەی تورکیا حوکم دەکەن نەیان توانیوە ئەو چارەسەرە پێشکەش بکەن، کەی توانیان کوردەکانیان خۆش بوێت وباوەشیان بۆ کردنەوە، ئەو کاتە دەتوانن ڕێگا لە گومڕا کردنیان بگرن وکۆتاییەک بۆ جەنگی بآ بڕانەوەی نێوانیان دابنێن.

- **دەربارەی کچەکە**

حاڵی کچەکە ( کوردەکان) چۆنە؟ ئایا دەتوانێت متمانە بە باوکی بکات؟ نەخێر ناتوانێت. چونکە ئەو ناوچەیەی ئەوان تێیدا دەژین هەردەم لە گالیسکەی پلە سێیەمی شەمەندەفەری تورکیا دابووە.

کێشەکانی بریتین لە هەژاری وزەوت کردنی ئازادی، وسوکایەتی پێکردن، ونەتوانینی قسەکردن بە زمانی خۆیان، ورێگرتن لە ژیان لەناو کەلچەری خۆیان، ئەگەر ئەو کێشانە بۆ سیاسەتی ڕەسمی بەرزنەکرێنەوە بۆ چارەسەرکردنیان، چۆن کچەکە دەتوانێت متمانە بە باوکە زۆردارەکەی بکات؟

پاش ماوەیەک کچەکە تورە بوو، وگوێی شل کرد بۆ ئەوانەی ڕێگایەکی تریان نیشان دەدا... باوەڕی پێیان کرد لە ژێر کاریگەری ترس بێت یان هیوا بێت... دە ساڵ بەو شێوەیە تێپەڕی، بەڵام بۆی بە دیار کەوت کە ئەوە ئەو ڕێگایە نییە کە ئەو بە دوایدا دەگەڕێت.

بەڕاستی کورد ماندو وشەکەتە، وبێ هیوایە، باوەڕیان بە PKK کاڵ بۆتەوە، بە دوای کردنەوەی دەرگای چارەسەری تردا دەگەڕێن... بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی دەیانەوێت لە ناوچەکانی خۆیاندا بژین بەبێ ترس، وچاوەڕێی ئۆپۆزسیۆنی تورکی – کوردی دەکەن کە هەندێکیان هەوڵی بڵاوکردنەوەی شەڕی ناوەخۆی پەنهانی دەدەن لە سەرانسەری وڵات.

### پێویستە تورکیا ماڵەکەی خۆی ڕێک بخات

لە ڕاستیدا ئەوەی پێویستە بکرێت زۆر ڕوون وئاشکرایە، پێویستە تورکیا ئاشتی ساز بکات لەگەڵ کوردەکانی، هەر نەبێت لەمەولاوە. پێویستە کوردەکانی خۆی خۆش بوێت، وبیان پارێزێت ومتمانەیان پێ بکات. یەکەم شت پێویستە ماڵەکەی خۆی ڕێک بخات، کورد تەنها ئەو 10 ملیۆن کەسە نین کە لە 21 پارێزگا لە ڕۆژهەڵات وباشوری ڕۆژهەڵات دا دەژین.

نزیکەی 20% لە خەڵکی ئیستانبۆل لە باشوری ڕۆژهەڵات لە دایک بوون. هەمان ڕێژەی دانیشتوان لە مەرمەڕە وئیزمیر وکەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست وبەشی ناوەوەی ئەنادۆڵ هەیە. تورک وکورد ژن وژن خوازی لە نێوانیان هەیە لە سەدان ساڵەوە، وخزمەتی سەربازیان پێکەوە کردوە، وپێکەوە ژیاون... تورک ناتوانن بەبێ کورد بن، وکوردیش ناتوانن بەبێ تورک بن...

### هەژاری شورەییە!

هەژاری کوردەکان لە ڕێگای کارتی سەوزەوە تۆمارکراوە [کارتی سەوز ئەو کارتەیە کە بۆ چارەسەری تەندروستی خۆڕایی دەدرێتە خێزانە هەژارەکان]. ئەو دەوڵەتەی کە متمانەی پێدەدرێت هەڵسێت بە ڕاپەڕاندنی ئەرکە دەستوریەکانی لە دابەش کردنی داهاتەکانی بە شێوەیەکی عادیلانە، پێویستە شەرمەزاری دابگرێت لە ڕادەی هەژاری کوردی تۆمار کراو

بە هۆی کارتە سەوزەکانەوە. شورەییە کە لە ساڵی 2007 نزیکەی 47% لە خەڵکی وان Vanخاوەنی کارتی سەوز بن لەبەر هەژاری.

لەگەڵ بوونی چەندین دەرزەن لە پرۆژەکانی گاپ GAP projects هێشتا ڕێژەی بێکاری لە 18% بێت لە دیاربەکر وشانلی ئۆرفا، ژمارەکان ئابڕووبەرن. پێویستە دەوڵەت شەرمەزار بێت بەرامبەر ئەو خێزانە کوردە بآ ئومێدانەی کە ڕۆڵەکانیان دەفرۆشن بە PKK لە چیاکاندا یان دەیان فرۆشن بە مافیاکان (گرووپی تاوانی ڕێکخراو) لە ئیستانبۆل. لەو باوکە کوردانە توڕە مەبن کە منداڵەکانیان دەفرۆشن بە چیاکان یان بە مافیاکان، بەڵکو لەو سەرکردانە توڕە بن کە ئەوانیان ناچار کردوە بکەونە ناو ئەو حاڵەتە.

## کێشەی کورد ئابووری یە

ئەوانەی دەڵێن کێشەی کورد ئابووری نییە، بەڵکو سیاسی وفەرهەنگییە بە داخەوە هەڵەن. هەڵبەتە ڕاستە کێشەی کورد ڕەهەندی سیاسی وفەرهەنگی هەیە، بەڵام لە شوێنی یەکەمدا کێشەیەکی ئابوورییە. ئەگەر کوردەکان لە ناوچەکانی خۆیاندا تا ئەمڕۆ نەیانتوانی بێت خۆیان دەرباز بکەن لەو بارە دواکەوتوەی کە تێیدان لە تورکیا وبە درێژایی مێژوو، وئەگەر نەهێشتنی ئەو نا یەکسانییە ئەرکێکی دەستوریش بێت، کەچی دەوڵەت نەیتوانی بێت ئەو نا یەکسانییە کەم کاتەوە، کەوابوو کێشەی کوردی ئەگەر ئابووری نەبێت دەبآ چی بێت؟

کوردەکان هەرچەندە خزمەتی سەربازی خۆیان دەکەن، وباجەکانی دەوڵەت دەدەن، کەچی هەر مەحرومیشن لە خێر وبێری ئەو سەردەمە، لە پەروەردە وفێرکردن، وخزمەتگوزاری تەندروستی، ومافی کارکردن ونیشتەجآ کردن. ئەگەر ئەو بارە بۆ چەندین دەرزەن ساڵ بەردەوام بو بێت، هەقی خۆیان نییە هەست بکەن ئەوان منداڵێکی زڕن

a stepchild؟ ئینجا کە یەکێک هاتوو وگوتی:"چونکە ئێمە کوردین، بۆیە دەوڵەت بەو شێوەیە ڕەفتارمان لەگەڵدا دەکات" کەسێک دەبێت باوەڕی پآ نەکات؟

لە بنەڕەتدا هەژاری باڵی کێشاوە، ئەگەر تێروانینێکی گونجاو ئامادە نەکرێت بۆ چارەسەر کردنی هەژاری ورشیشە کێش کردنی لە ڕەگەوە، کێشەی کورد هەر بەردەوام دەبێت.
هەڵبەتە ئەرکی سەرشانمانە کە دان بە مافەکانی فەرهەنگی کوردی دابنێین، بۆ پەخش کردنی دیموکراسی بۆ هەموو کەسێک، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئێمە پێویستە ڕەفاهیەت وکار وخۆراکیان بۆ دابین بکەین، بەرادەیەک نەهێڵین لە ژێرەوەی ئاستی ژیان لە تورکیادا بمێننەوە. ئەگەر ئەوەیان بۆ کرا تەنها ئەو کاتە کچەکە باوەڕ دەکات کە کچی باوکی خۆیەتی، ومتمانەی پآ دەکات، وهەست بە تەناهی دەکات. تەنها ئەو کاتە کوردەکانی تورکیا، کە بە هەموو لایەکدا کۆچیان کردوە – لەبەر هەژاری، وەرگێر – هەست بە تەناهی دەکەن، وزیاتر وەک هاوڵاتییەک هەست دەکەن.

## مەسەلەی چینایەتی

زۆربەی کورد وەک زۆربەی تورک لە چینی کرێکارن، زۆربەی هێزی کاری تورکی نزیکەی 70% یان 13 ملیۆن کەس وەک کرێکار کار دەکەن. ژمارەی ڕەسمی بێکاران 2.5 دوو ملیۆن ونیوە، بەڵام لەڕاستیدا دوو ئەوەندەی ئەو ژمارەیە. ئەوە مانای ئەوەیە کە تێکڕای 18 ملیۆن کرێکاری کاردار وبێکار هەن، کە 80% خەڵکی چالاک لە ڕووی ئابووری یەوە پێک دەهێنن.

گەلێک ئەستەمە جیاوازی بکەیت لە نێوان خەباتی کورد لە پێناو ناسنامەیان identity وخەباتیان لە پێناو کاردا، هەر وەک چۆن ئەستەمە خەباتی کرێکارە تورکەکان لە پێناو دیموکراسی وسەربەخۆیی جیابکەیتەوە لە خەباتیان لە پێناو کاردا. ئەوانە لە یەک جیا نین، هەموویان خەبات دەکەن لە پێناو دیموکراسی پارووی ڕۆژانە.

شتێکی ئاشکرایە کەوا کێشەکە چینایەتی یە. بەرنامەیەکی چینی هاوبەشە، کە پاکە لە هەموو خەوشێکی نەتەوە پەرەستی، وهەموو مافە فەرهەنگییەکانی کوردیش بەخۆوە دەگرێت، وتورکیاش پەلکێش دەکات بەرەو ڕوناکبیریەکی زیاتر، وپاشەرۆژێکی دیموکراسی زیاتر. ئەوەش لەوە دەچێت ئەمرۆ زیاتر لە دوێنآ مومکینە ڕووبدات.

## دەمیرتاش و هاوڕەگەزبازەکانی سەڵتەنەتی ئەردۆگان!

بە بۆنەی ئەو شانامە درۆیەی مەکینەی میدیایی ئەردۆگانی بۆ سەلاحەدین دەمیرتاشیان دروستکردوە، کە ئەردۆگان و داود ئۆغلۆ بەشێوەیەکی کەسی، شەرم ناکەن، ئەو درۆیەی کە هەڵیان بەستوە، هەر خۆشیان پەخشی دەکەن، گوایە دەمیرتاش باسی پێدانی مافی هاوڕەگەزبازانی تورکیای کردوە! با بزانین لە بنەڕەتدا بارودۆخی هاوڕەگەزبازان چۆنە لە تورکیا، وئەردۆگان وحکومەتەکەی هەڵوێستیان چۆن بوە بەرامبەر ئەو دیاردە کۆمەلایەتیە.

لەو چەند ساڵەی دواییدا ژیانی هاوڕەگەزبازەکان وردە وردە بەرجەستەتر دەبێت و زیاتر دەکەوێتە بەرچاو لە شارە گەورەکانی تورکیا، و لە هەر شارێك چەندین گازینۆ و کافێ و یانەی تایبەت بە خۆیان هەیە، لە ٢٠١٣ گەیەکان و لێزبیانەکانی ئەستانبۆل خۆپیشاندانێکیان کرد، گەورەترین خۆپیشاندانی هاوڕەگەزبازەکان بوو نەک لە خۆرهەڵات و وڵاتێکی ئیسلام، بەڵکو لە ئەوروپا، ١٠٠ هەزار کەسی هاوڕەگەزباز بەژدار بوون لەو خۆپیشاندانە! بەر لە هەموو شتێك هۆمۆسێکچوالیتی یان هاوڕەگەزبازی تاوان نییە لە تورکیا، وهیچ سزایەکی یاسایی بۆ دانەنراوە لە یاسای تورکی، هەردوو کەسێك ئەو کردە سێکسیە هاوڕەگەزبازەیان کرد لە نێر یا لە مێ بشگیرێن هیچ سزایەك نیە لەسەریان بە مەرجێك ١٨ ساڵ وبۆ سەرەوە بن و بە ڕەزامەندی هەردوو تەرەف بێت! یاسا تەنها چەند گوزارشێکی ناڕوونی تێدایە دەربارەی کردە سێکسیەکان، کە باسی تاوانی ئابرووبەر دەکات یان تاوان لە دژی ڕەوشتی گشتی "offences against public morality" کە ئەوەش زۆر شتێتر دەگرێتەوە و دەقێکی یاسایی تایبەت نیە بە هاوڕەگەزبازی.

ڕاستە لەسەر ئاستی شەعبی بە چاوێکی پڕ نەنگی و شەرمەزاری دەڕوانرێتە هاوڕەگەزبازەکان، وەك هەر وڵاتێکیتری ئیسلامی، بەڵام لەسەر ئاستی دەوڵەتی شتێکی ترە، و کۆمەڵگای تورکی لە چاو زۆر کۆمەلگای موسلمانی تر تۆلەرانتر و لێبوردەترە بەرامبەر ئەو دیاردەیە.

هەندێك شت هەیە لە تورکیا کە دەکرێت وەك کاری دژی ئازادی هاوڕەگەزبازەکان دەژمێردرێت، هەرچەندە کەسانێکیتر ئێرەییان پی دەبەن، بۆ نمونە لە کاتی چوونە خزمەتی سەربازی، هەر کەسێك گووتی من هاوڕەگەزبازم، و سەلمێندرا کە هاوڕەگەزبازە لە سەربازی دەبەخشرێت! بەڵام سەلماندنی هاوڕەگەزبازێتیەکەی زۆر پڕ سوکایەتیە، جونکە ئەو کەسە جارێ دەبێت پاسیڤ بێت یانی بە کوردیەکەی بەرکار [مفعول بە] بێت، وەك هەر کۆمەڵگایەکی خۆرهەڵاتی، فاعیل و بکەر زۆر کێسەی نیە لە وەرگیران لە سوپای تورك! ئینجا دەبێت وێنەیەکی خۆی بێنێت لە کاتی فیعلەکە! و سەرەڕای چەندین پشکنین و شتی

ئابڕوبەرتر تا دەگەنە قەناعەت کە کابرا هاوڕەگەزبازە، کە سەلمێندرا، بروانامەیەکی پەمەیی دەدەنێ بۆ ئەوەی بە یەکجاری لە سەربازی ببوێردرێت!

بێگومان دەزگای سوپای تورکی لەسەر بنچینەی بریاری پزیشکی کۆنی ئەمریکی ساڵی ١٩٦٨ دەڕوات کە هەر جۆرێك لە هاوڕەگەزبازی بە نەخۆشیەکی دەروونی و لادانێکی سێکسی دەژمێرێت. ئینجا لە هەمووی خۆشتر ساڵانە یەکێتی ئەوروپی ڕەخنە لە حکومەتی تورکی دەگرێت، سەبارەت بە ڕەوشی خراپی هاوڕەگەزبازەکان، ئەو ئەردۆگانە مل شۆڕەی کە ئەو هەڵایە درۆیینەی ناوەتەوە بۆ دەمیرتاش، ساڵانە هەوڵی خۆ گونجاندن دەدات لەگەڵ پێوەر ونۆرمەکانی یەکێتی ئەوروپا و هەزار ماستاو دەکات بۆ سەلماندنی باشکردنی وەزعی هاوڕەگەزبازەکان، بەڵام یەکێتی ئەوڕوپا هەر پیی باوەڕ ناکەن، لە ڕاپۆڕتی ساڵانەی خۆیان بەردەوام تورکیا تاوانبار دەکەن بە دژایەتی کردنی مافەکانی هاوڕەگەزبازان! دوا ڕەخنەیان لە تورکیا قەدەغەکردنی کتێبێکی ئەستێرەیەکی پۆپ بوو، چونکە تیایدا باسی هاوڕەگەزی خۆیدا دەکات! دادگای یەکێتی ئەوروپا تورکیای تاوانبار کرد بە پێشێلکردنی مادەئ ١٠ ی یاسای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ و سزای دا بە پێدانی ٢٠٠٠ یۆورۆ بە چاپکەری کتێبەکە وەك قەرەبوو!

نەک هەر ئەوەندە بەڵکو لە ٢٠١٢/١/٩ لە سەردەمی حوکمی ئەردۆگان، گۆشە نوسێك بە ناوی سەردار ئارسەڤین Serdar Arseven لە ڕۆژنامەیەکی ئیسلامی Yeni Akit وتارێکی نووسی تیایدا خەڵکی هاوڕەگەزبازی بە مونحەریف ولادەر وەسف کرد، دادگای ئەردۆگان ئەو ڕۆژنامەیەی سزادا بە ٤٠٠٠ لیرەی تورکی و کاک سەرداریش بە ٢٠٠٠ لیرەی تورکی بە تۆمەتی قسەی پڕ ڕق.

لە ٢٠١٤/٧/١٧ یانی پێش ساڵێك دادگای باڵای تورکیای ئاك پارتی و ئەردۆگان بریاری دا هەر ئاماژەیەك بۆ هاوڕەگەزباز وگەی وەك لادەر ومونحەریف، وەك وتاری رق و کەراهیەت دێتە هەژماردن . کەوابوو ئەردۆگانی دوو ڕوو ئەو هەموو هەڵایە لە پیناو چی دەکات لەدژی بەرێز دەمیرتاش، ئەگەر گریمان واشی گووتبێت، کەواشی نەگووتوە بە زمانی خۆی گووتی، لە کاتێکدا ئەردۆگان خۆی مامە حەمەیی بۆ یەکێتی ئەوروپا دەکات لە ڕێگای نازکێشانی هاوڕەگەزبازەکان؟!

لە هەمووی ناخۆشتر ئەو لەشکرە کوردە ئیسلامیە بێ خێر و ساویلکەیەیە کە بێ ئاگان لە خەلیفەکەیان کە چۆن لە دەوڵەتی ئیسلامی ئەودا تەنها وەسف کردنی هاوڕەگەزبازێك بە لادەر لە ڕەوشت تاوانە و سزای لەسەرە، کەچی ئاگریان تێ بەربوە گوایە دەمیرتاش باسی ڕیزگرتن لە مافی هاوڕەگەزبازانی کردوە؟ ! 2015-05-19خەندان

## سەرکەوتنی هەدەپە ئەزمونێکی مەزن و دەگمەنە دەبێت بیپارێزرێت!

ئەو فەلسەفە واڵایە و پلورالیزمە فیکریەی کە لە پشت هەڵمەتی مەزنی هەدەپە وەستا بوو، دەتوانم بڵێم نوێترین تەرحی سیاسیە لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناویندا، لە پیناو خاوکردنەوەی کێشەکان و نزیک کردنەوەی نەتەوەکان، ئەو عەقڵیەتەشی لە پشت ئەو فەلسەفە و ڕوئیا دەگمەنە سیاسیە وەستاوە، دەبێت شانازی بەو ئەزموونە سەرکەوتووە و دەگمەنە بکات، نابێت پاش ئەو دۆزینەوە مەزنە، بە هیچ جۆرێك ئاوڕ لە دواوە بداتەوە.

یەکەم جارە لە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست حزبێکی نەتەوەیی بتوانێت سنووری نەتەوەیی خۆی ببڕێت و سەدان هەزار دەنگدەری تورک و ئەرمەن و یەزیدی و عەلەوی و مەسیحی وچەرکس بۆ خۆی کۆبکاتەوە! یەکەم جارە حزبێکی کوردی بتوانێت ئافرەتێکی تورك بکاتە هاوسەرۆکی خۆی، کە ئەوە دەسکەوتە وەك ئافرەت و وەك تورکێك! یەکەم جارە حزبێکی کوردی بتوانێت ملیۆنەها کەس لە شارە تورک نشینەکان کۆ بکاتەوە لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردن! یەکەم جارە حزبێکی کوردی بتوانێت ژمارەی کاندیدە غەیرە کوردەکانی زیاتر بێت لە کوردەکان، یەکەم جارە حزبێك بتوانێت دیندار و بێ دین و چەپ و ڕاست و جۆرەها خەڵك و مەیل وئاڕاستە لە یەك لیستدا کۆ بکاتەوە.

ئەو کارە بەڕاستی ئاسان نییە، حزبەکانی باشوور تا ئەمڕۆ نەیان توانیوە هەزار کەس لە بەغدا کۆکەنەوە لە پێناو هەر ئامانجێك، نەیانتوانیوە قاچە کورسیەک لە وجودی زیاتر لە ملیۆن کورد لە بەغدا بهێنن، نەیانتوانیوە هەستی کوردبوون لای کوردانی شیعە بەهێزتر کەن لە هەستی مەزهەبی دینی خوڕافی توندرەو! ئەوەتە گەنجەکانیان هەموویان دەبنە خەڵوزی حەشدی وەحشی! هەتا ئێستا نەیانتوانیوە یەزیدیەکان بهێننە قەناعەت کە شانازی بە کوردبوونیان بکەن و نەك بەدوای ئینتیمای بچوك و بەرتەسك بگەڕێن.

بە هەمان شێوە حزبە کوردیەکانی ڕۆژهەڵاتیش نەیانتوانیوە سنوری نەتەوایەتی و جوگرافی خۆیان ببڕن. نەك لەسەر ئاستی کوردستان، بەڵکو هەتا لە وڵاتەکانی ناوچەکە، کەی حزبێك توانیتی عەرەب وجولەکە کۆکاتەوە لە ئیسرائیل و کاریگەریان هەبیت؟!

کەوابوو ئەو ئەزموونە مەزنەی هەدەپە و پەکەکە پێویستە پەرەی پێ بدرێت و لەسەر هەموو گۆڕەپانەکانی کوردستان جێبەجێ بکرێت، پێویستە پەکەکە بەو ڕوحیەتەو فەلسەفەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ هێزە کوردستانیەکان بکات، چونکە تۆ بتوانی لەگەڵ تورکێك و لازێك و چەرکسێك و ئەرمەنیەك بگونجێیت، بۆ ئاسانتر نیە بگونجێیت لەگەڵ کوردەکە؟.!

ئینجا خاڵێکی تر کە زۆر گرنگە هەدەپە و پ ک ک جەختی لەسەر بکەنەوە، ئەویش ئەو خۆ دەربازکردنەیە لە ئایدیۆلۆژیای شمولی وبەرتەسك وەك هەدەپە لە ئەزموونی ئەو هەڵبژاردنە نواندی، کاتێك توانی بە کەمێك کۆششەوە ملیۆنەها دەنگی چەپ و ڕاست و دیندار و بێ دین لە دەورەی بەرنامەی خۆی کۆبکاتەوە.

با کورد بای ئەوەندە زیرەك وبلیمەت بن هیچیتر نەهێڵن ملیۆنەها دەنگیان بەفیڕۆ بچێت بۆ نەیارانیان لە ڕێگای ئیستیغلالی هەستی دینیان، دەبێت ئاوڕێکی جیدی لە هەستی دینی کورد بدەنەوە، تا ئەوپەڕی ڕیز لەو هەستە گرنگە بگیرێت، چونکە هەر سوکایەتی کردنیك بەو شعورە دینیە، یان بە کەم گرتنی دەبێتە هۆی لە دەستدانی دەنگی کوردێکی زۆر، و نانەوەی پشێویش بۆیە دەبێت ئەو ئەزموونە پلورالیزمیە فیکریەی هەدەپە وپەکەکە بە کۆتایی هەڵبژاردن کۆتایی نەیەت، چونکە داهینانیک و ئەزمونیکی کوردی مەزنە لە بواری سیاسەت لەو ناوچەیە جەنجاڵ وئاڵۆزەدا، دەیسەلمێنیت کە کورد لە هەموو میللەتانی ناوچەکە ئاسۆ کراوەتر و میانڕەوتر و ژیان دۆستترن.

محەمەد هەریری

٢٠١٥/٦/٨

# ئه‌ردۆگان ومالیکی: یه‌كه‌می سه‌ره‌تایی له‌ دیموكراسیدا!

له‌ هه‌فته‌ی رابردوو به‌ پێی هه‌واڵی ئاژانسه‌كانی توركیا ره‌جه‌ب ته‌یب ئۆرودوگان سه‌رەک وه‌زیرانی توركیا له‌ دیاربه‌كره‌وه‌ له‌ كاتی كۆبونه‌وه‌یه‌ک له‌گه‌ڵ رێكخراوه‌كانی كۆمه‌ڵگه‌ی مه‌ده‌نی رایگه‌یاند، ئه‌گه‌ر هاتوو حكومه‌تی توركیا مافی ئه‌وه‌ بده‌نه‌ كورده‌كان به‌ زمانی كوردی په‌روه‌رده‌ وخوێندن بكه‌ن، ئه‌وه‌ ده‌بێته‌ هۆی ئه‌وه‌ی (لاز وچه‌ركه‌سیش) داوای هه‌مان ماف بكه‌ن، ئه‌وه‌ش هه‌ڕه‌شه‌یه‌ک ده‌بێت بۆ سه‌ر یه‌كگرتوویی خاكی توركیا!! هه‌ر له‌و سیاقه‌وه‌ كۆكسال تۆپتان سه‌رۆكی په‌رله‌مانی توركیاش پاش ماوه‌یه‌كی كه‌م هه‌مان قسه‌ی دوباره‌ كرده‌وه‌ به‌ بیانوی ئه‌وه‌ی ئه‌و هه‌نگاوه‌ ده‌بێته‌ هۆی دابڕانی كۆمه‌ڵگای كوردی له‌ توركیا، هه‌روه‌ها گوایه‌ ده‌ستوری ساڵی 1982 وهه‌روه‌ها ده‌ستوره‌كانی به‌ر له‌وه‌ش جه‌خت له‌سه‌ر یه‌كسانی هه‌موو هاوڵاتیانی توركیا ده‌كه‌نه‌وه‌ .

ئه‌ردۆگان وحزبه‌كه‌ی ته‌نها، ته‌نها وبه‌س له‌ سایه‌ی دیموكراسیه‌تی توركیاوه‌ توانیان له‌و هه‌موو حزبه‌ نه‌ته‌وه‌یی وعه‌لمانیانیانه‌ تێپه‌ڕن، وهه‌موو تابۆكانی دامه‌زراوی عه‌سكه‌ری ببڕن، وحوكمی هه‌موو توركیا بگرنه‌ ده‌ست، هه‌ر كاتێک دووچاری ته‌نگژه‌یه‌ک ده‌بنه‌وه‌ وه‌ک بۆ نمونه‌ پۆستی سه‌رۆک كۆمار، وحیجابی ئافره‌تان، وئیمزاكردنی رێكه‌وتنامه‌كان له‌گه‌ڵ ئیسرائیل، به‌وپه‌ڕی كارامه‌یی ووه‌ک دیموكرات خوازێكی ناو جه‌رگه‌ی پایته‌خته‌ دێرینه‌كانی دیموكراسیه‌ت یاری دیموكراسی ده‌كه‌ن.

ئه‌ردۆگان وحزبه‌كه‌ی له‌و مه‌سه‌لانه‌ی په‌یوه‌ست به‌ كوردن، هێنده‌ ناشیانه‌ ره‌فتار ده‌كه‌ن وه‌ک له‌و لێدوانانه‌ی سه‌ره‌وه‌ ده‌رده‌كه‌وێت، ده‌ڵێی له‌ پۆلی یه‌كه‌می سه‌ره‌تایی دان له‌ دیموكراسیه‌تدا، كه‌چی بۆ ئه‌و كێشانه‌ی په‌یوه‌ست به‌ كورد نیه‌ با به‌ گۆشه‌ی 180 پله‌ش پێچه‌وانه‌ی ئیسلام بێت هه‌ر په‌یڕه‌وی ده‌كه‌ن وبه‌بآ گوێدانه‌ هیچ حه‌رام وحه‌ڵاڵێک! بۆ نمونه‌ ئه‌ردۆگان وحزبه‌كه‌ی له‌ پێناو یاری دیموكراسیدا چاو پۆشیان كرد له‌و هه‌موو بازاڕانه‌ی داوێن پیسی كه‌ له‌ هه‌موو شاره‌كانی توركیا هه‌ن، وتێیدا ئافره‌ت به‌ ڕووتی ونیمچه‌ ڕووتی خۆیان له‌ناو جامخانه‌كانی ئه‌و بازاڕه‌ نیشان ده‌ده‌ن، بۆ سێكس فرۆشی! به‌ڵێ له‌ ترسی ژه‌نه‌ڕاڵه‌كان نه‌وێران په‌نجه‌ بۆ ئه‌و حاڵه‌ته‌ نا مرۆییه‌ به‌رن، ومه‌سه‌له‌ی حیجابی ئافره‌تانیش وقه‌ده‌غه‌كردنی له‌ زانكۆ وامه‌زراوه‌ ده‌وڵه‌تیه‌كان به‌ هه‌مان شێوه‌. جارێكی تر ئه‌ردۆگان وحزبه‌كه‌ی ده‌ستبه‌ردای یاسای به‌ تاوانكردنی زینا بوون، له‌ پێناو ڕه‌زامه‌ندی یه‌كێتی

ئه‌وروپا، وجێبه‌جێ كردنی پێوه‌ری كۆبنهاگن Copenhagen criteria كه‌ بریتیه‌ له‌ پێوه‌رێک بۆ دیاریكردنی ئه‌و وڵاتانه‌ی شیاوی ئه‌وه‌نه‌ ببن به‌ ئه‌ندام له‌ یه‌كێتی ئه‌وروپا، گرنگترین پێوه‌ره‌كانی بریتییه‌ له‌ پێویستی هه‌بوونی ده‌زگا ودامه‌زراوه‌ی پێویست له‌و وڵاته‌ بۆ پاراستنی دیموكراسیه‌ت ومافه‌كانی مرۆڤ، وكه‌مینه‌كان وپه‌یڕه‌و كردنی ئابووری بازاڕ، وقبوڵ كردنی هه‌موو فه‌رمان وڕاسپارده‌كانی یه‌كێتی ئه‌وروپا.

كه‌وابوو ئه‌ردۆگان وحزبه‌كه‌ی مافی زینا كردن وهۆمۆسێكچواڵ ولیزبیانه‌كان ده‌سه‌لمێنن به‌ڵام كه‌ مافه‌كه‌ په‌یوه‌ند به‌ خوێندن وپه‌روه‌رده‌ی گه‌لی كورد بوو به‌ زمانی كوردی، ئه‌وه‌ بڤه‌یه‌ به‌ بیانوی هه‌ڕشه‌ كردنی له‌ یه‌كپارچه‌یی خاكی توركیا، هه‌رچه‌نده‌ سه‌دان ده‌وڵه‌ت هه‌ن وچه‌ندین زمان تێدا ڕه‌سمییه‌ وهیچ هه‌ڕه‌شه‌یه‌كی دروست نه‌كردوه‌، وبه‌ پێچه‌وانه‌شه‌وه‌ ده‌وڵه‌ت هه‌یه‌ یه‌ک زمان تێیدا ڕه‌سمی بوه‌ كه‌چی پارچه‌ پارچه‌ش بوه‌. سه‌یر له‌وه‌دایه‌ مافه‌كانی كوردیش به‌به‌ر ئه‌و پێوه‌ره‌ ده‌كه‌وێت، كه‌ مافی خوێندن به‌ زمانی زیگماكی له‌ هه‌ره‌ ئاسایترین مافه‌كانه‌، به‌ڵام ئه‌ردۆگان وحزبه‌كه‌ی له‌ ناخیاندا هه‌ر مافێكی سه‌ره‌تایش بۆ كورد ڕه‌تده‌كه‌نه‌وه‌ له‌به‌ر زاڵبوونی جیهان بینی كه‌مالیزم به‌سه‌ر هه‌موو دام وده‌زگاكان به‌ تایبه‌تی كه‌رتی په‌روه‌رده‌ وفێركردن. تۆ بڵێی مافی خوێندن وپه‌روه‌رده‌ به‌ كوردی زیاتر خه‌ڵكی توركیا ڕاچڵه‌كێنێت له‌ ڕێكه‌وتنه‌ ستراتیژیه‌كان له‌گه‌ڵ ئیسرائیل، وله‌ بازاڕه‌كانی له‌ش فرۆشی، وله‌...، وله‌...

هه‌ر له‌و باره‌یه‌وه‌ وه‌ک گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ خودی ئیستبدادی ڕۆژهه‌ڵاتی، كه‌ زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆری سیاسه‌ت مه‌داره‌كانی كردۆته‌ پرۆژه‌یه‌كی ئیستبدادی له‌ چاوه‌ڕوانی هه‌لێدا، مالیكی بۆ یه‌كه‌م جار پاش گه‌ڕانه‌وه‌ی له‌ له‌نده‌ن پێشوازی كرا به‌ ته‌پڵ ومۆسیقا وئاهه‌نگ گێڕان ووێنه‌ ولافیته‌ی زل زل!! كه‌ بوه‌ مایه‌ی نیگه‌رانی كه‌سانێكی دیموكراتخواز له‌ عێراقدا. مه‌حمود عوسمان ڕه‌خنه‌ی له‌و دیارده‌ گرت وگوتی:" نابێت ئه‌و دیارده‌یه‌ په‌ره‌ی پآ بدرێت چونكه‌ سه‌رده‌مێكی هه‌ستیار به‌ بیر هه‌موو عێراقیه‌كان دێنێته‌وه‌...هه‌موو لایه‌ک ته‌حه‌فوزاتی هه‌بوو له‌سه‌ر شێوازی پێشوازیه‌كه‌، چونكه‌ ئێمه‌ ده‌مانه‌وێت دوور كه‌وینه‌وه‌ له‌ كه‌ساندن (شه‌خسه‌نه‌) وبنیاتنانی ده‌وڵه‌تی دامه‌زراوه‌كان وناساندنی خه‌ڵک به‌ ماف وئه‌ركه‌كانیان، وبنیاتنانی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنچینه‌ی دروست، ڕاسته‌ ئه‌و گۆڕانه‌ پێویستی به‌ كاتێكی زۆر هه‌یه‌، به‌ڵام ده‌بێت ده‌وڵه‌ت هانده‌ری ئه‌و گۆڕانه‌ بێت، نه‌ک به‌ پێچه‌وانه‌وه‌.

عاليه جاسميش ئەندامی پەرلەمانی عێراق گووتی:"ئەو شێوازەی مالیکی پێشوازی لێکرا بە بەرزکردنەوەی وێنە ولافیتەکان وێنە (قائیدی زەرورەی) بە بیرهێنایەوە، وناگونجێت لەگەڵ دەوڵەتێک هەوڵدەدات ڕژێمێکی دیموکراسی بنیات بنێت لەسەر بنچینەگەلێکی ڕاست ودروست".

عەدنان دلێمی سەرۆکی جەبهەی تەوافوق کە هەتا لە شایەتمانیش جیاوازە لەگەڵ مالیکی، گووتی:" شتێکی ئاساییە بەو شێوەیە پێشوازی لێ بکرێت...باوەڕ ناکەم دژی دیموکراتیەت بێت، یان دژی هەستی هەر لایەک بێت!!!" وادیارە دلێمی غەریبی (قائیدی زەرورە) دەکات هەتا لە فۆرمی دوژمنێکی سەرسەختی وەک مالیکیش دا بێت. ترسناکی هەرە گەورەی ئەو دیاردەیە خۆی لە سایکۆلۆژیەتی مەزهەبی مرۆڤی شیعی دەنوێنێت، کە سەرەڕای دواکەوتویی سیاسی وژیاری، دەروونێکی ئامادەی هەیە بۆ پەرستنی تاکەکەسی personal cult . لە هەرمەی بانگەشەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەردۆگان و ئاک پارتی هیچ چەکێکی فریودەر ونارەوشتی نەماوە بەکاری بهێنن، بەکاریان نەهێنابێت...

بەکارهێنانی وتاری دینی و بەرزکردنەوەی نوسخەیەك لە قورئانی تەفسیرکراو بە کوردی لەلایەن ئەردۆگان، وەك بەرزکردنەوەی پیاوانی معاویە لە کاتی خۆی تەنها بۆ فریودان بوو. درۆکردن لەسەر دەمیرتاش و باسی مافی هاوڕەگەزبازەکان و گۆڕینی قیبلەی ئیسلامیش هەر لە نێو ئەو وتارە دینیە فریودەرە بوو. پاش ئەوەی زۆربەی کارتە دینی و شۆڤێنستەکانیان بەکار هێنا دیارە ئەردوگانی دووڕوو و حزبە شوۆڤێنستە مەخمەلیەکەی دڵی ئاو ناخواتەوە تا شەڕی کوردکوژیش دروست نەکاتەوە لە نێوان کوردا.

یەکەم ئاماژەکانی ئەو شەڕنانەوەیە لە نێوان هەدەپ و هوداپاری میراتگری حزب الله دروستکراوی میتی تورکی بە عەقڵیەتێکی حزبوڵلایی ئێرانی لە چەند شوێنێك دەرکەوتن، ئەوەش هەمان کارت بوو کە ئەردۆگانی ماوە بەسەرچوو لە میانەی ئەو نارەزاییانەی لە سەرتاسەری شارەکانی تورکیا دەردەبردرا لە دژی تێوەگلانی تورکیا لە یارمەتیدانی داعش و بەژداری کردنی لە فشار توندترکردنە سەر کوردە خۆڕاگرەکانی ناو کۆبانی، بەکاری هێنان. ئەو کاتەش بووە ڕوبەڕووبوونەوەیەکی ناوخۆ لەنیوان هەدەپە و حزبوڵلای کوردی، کە ئێستا حزبێکی نوێی دروستکردوە بەناوی Hür Dava Partisi, کە کورت دەکرێتەوە بۆ Hüda-Par هوداپار، کە بەمانای پارتی بانگەوازی یان دەعوەی ئازاد دێت.

بەداخەوە من تا ئێستا قسەیەکی باشم لەسەر ئەو حزب الله یە کوردیە گوێ لێ نەبوە جگە لە جاڕدانی جەنگ نەبێت مدژی پ ک ک بە پاڵنەری سوپا و دەزگای میتی تورکی. ئەگەر ئەردۆگان ئامادە بێت دەست بخاتە ناو دەستی داعش بۆ لێدانی کورد، چۆن دەست لە پشتی ئەو کوردە ئیسلامیە فریوخۆرانە نادات لەو ساتە ناسکەدا هەوڵی نانەوەی شەڕێکی ناوخۆ نادات لە نێوان هوداپار و هەدەپە لەو هەڵبژاردنە چارەنووسسازە؟!

بۆ ناسینی ئەو هوداپارەی میراتگری حزب الله ی پێشوو دەڵێین: حزب الله لە ساڵی ١٩٩٢ چەندین ڕۆژنامەنوسی کوشت وەك Halit Güngen و Namik Taranci و Hafiz Akdemir تەنها لەبەرئەوەی پەیوەندی بەکرێگیراوانەی حزب الله و سوپاو میتی تورکیایان ئاشکرا کرد، لە کەیسی حافز ئەکدەمیر بکوژەکەش گیرا، بەڵام پاش شەش هەفتە بەبێ دادگایی کردن بەردرا!! لە ٢٠١١/١/١٧ عارف دۆگان Arif Doğan کە کۆلۆنێلێکی سەربازی خانەنشینکراوە و دامەزرینەری [ JİTEMئیستخباراتی جەندرمە و دژە تیرۆر] یشە، کە بە تایبەت لە دژی خەباتی پ ك ك دامەزرا بوو هەزاران تاوانی ئەنجامدا لە کوشتن و ئەشکەنجەدانی کورد و لایەنگرانی پ ك ك ، تا ڕادەی مەوەی جلی پ ك ك یان لەبەر دەکرد و دەچوون لە گوندە کوردیەکان خەڵکیان دەکوشت بۆ ناوزڕاندنی پ ك ك ، سەرەڕای کوشتنی ڕۆشنبیری گەورە و نوسەرانی کورد وەك موسا عەنتەر و ویداد ئایدن و ئەحمەد جەم!! لە دادگا لە کاتی دۆسیی ئەرگەنیکۆن، ڕایگەیاند کە ئەو دامەزرێنەری حزب الله ی کوردی تورکیایە وەك هیزێکی چەکدار دروستی کردن لە پێناو کوشتن و ڕاوەدونانی ئەندامانی پ ك ك.

بە پێی فایق بولوت ی ڕۆژنامەنوس چەندین ئەندامی حزب الله لە ئەستەمبۆڵ گیراون بە ٤٠ کیلۆگرام تەقەمەنیەوە کە پێناسنامەی موخابەراتی میتی شیان لە گیرفان بووا!! لایەنگرانی ئەو حزب الله یە لە ساڵی ٢٠٠٢ ڕێکخراوێکیان دروستکرد بە ناوی هاوسۆزی لەگەڵ موستەزعەفان! و دواییش لە کۆتایی دیسەمبەری ٢٠١٢ هوداپار Hüda-Par پارتی دەعوەی ئازادیان دروست کرد بە هاندانی ئاشکرای ئەردۆگان وپارتەکەیەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی خەباتی حزبە کوردیەکان و ئەو کاتە لە دژی بەدەپە Demokratik Bölgeler Partisi پارتی هەرێمی دیموکراتی. ئەمڕۆش وادیارە ئەردۆگانی میانڕەو کە ماسکی خۆی گۆڕیوە بۆ داعشڕەو، شانە نوستوەکانی ئەو داعشە خۆفرۆشانەی کورد زیندوو دەکاتەوە بۆ نانەوەی شەڕێکی کورد دژی کورد، هەربۆیەش محمد حسین یەلماز بەرپرسێکی هوداپار دەڵێت: دەوڵەت و لایەنگرانی پ ك ك هێرش دەکەنە سەر بارەگاکانیان، وهێزە ئەمنیەکان چاوپۆشی دەکەن وهیچ ناکەن لە ئاستیدا!

بێگومان ئەوەش بۆ خۆشترکردنی ئاگرەکەیە. بێویژدانی ئردۆگان ئاك پارتی هێندە بڕ دەکات بە دوری نازام گروپێکی هاوشێوە داعشی، لەو هوداپارانە دروست بکات و چەکداریان کات بۆ

لەناوبردنی خەباتی کورد، ئەوئەردۆگانە داعشرەوە کە نەوەی هەقیقی هۆلاکۆ و جەنگیزخانە هیچ دین و ڕەوشت و بەهایەکیان نیە لە زیان گەیاندن بە کورد ودۆزەکەی. هیوادارم هەدەپە و پ ك ك ولایەنگرانی هەوڵی بەرتەسک کردنەوەی کێشەکە بکەن و ئەگەر کەسانێکی عاقڵیان تێدا بێت ئەو هوداپارانە با گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن، هەرچەندە لە باگراوندی حزب الله ی پێشوویان جگە لە مێنتالیتی داعشیەت هیچ هیوایەك بەدی ناکرێت بۆ گفتووگۆ .

## کێ سێ چالاکوانه‌کانی په‌که‌که‌ی کوشت؟

کوشتنی ئه‌و سێ چالاکوانه‌ی پ ک ک ته‌نها تاوانێکی کوشتن نییه‌، به‌ڵکو بۆته‌ مه‌ته‌ڵێکی سیاسه‌تی نێوده‌وڵه‌تی.

هه‌ر له‌ یه‌که‌م ساتی بڵاو بوونه‌وه‌ی هه‌واڵی کوشتنی ئه‌و ۳ که‌سایه‌تیه‌ی پ ک ک، هێشتا که‌س نه‌گه‌یشتۆته‌ بریاری کۆتایی له‌ دیاریکردنی بکوژه‌کان له‌به‌ر تێکه‌ڵ وپێکه‌ڵی وزۆری ئه‌ویاریکه‌رانه‌ی له‌ گۆڕپانی کوردی وناوچه‌که‌ یاری ده‌که‌ن. راسته‌ که‌سانێك له‌ زۆر له‌ وڵاتان رژانه‌ سه‌ر شه‌قامه‌کان، به‌ڵام هه‌تا ئه‌و خۆپیشاندانانه‌ش جۆرێك له‌ ته‌ردود ودوو دڵی ودڵنیا نه‌بوونی پێوه‌ دیار بوو، دروشمه‌کانیشی به‌ زۆر ئاراسته‌ بوو. هه‌تا خودی په‌که‌که‌ش له‌ زمانی زۆر له‌ لێپسراوانیان تاوانه‌که‌یان نه‌خستۆته‌ ئه‌ستۆی لایه‌نێکی دیاریکراو.

ئه‌گه‌ر بێینه‌ سه‌ر راپۆرته‌که‌ی ویکلیکس که‌ ئێن ئار تی تیڤی بڵاوی کرده‌وه‌، ئه‌وه‌ ئه‌و بۆمبه‌ میدیایه‌ نه‌بوو که‌ خه‌ڵك چاوه‌ڕوانی ده‌کرد، به‌ڵکو شتێکی چاوه‌ڕوانه‌ له‌ ئه‌مریکا وزۆر له‌ ئه‌وروپاش هه‌وڵی چک کردنی سه‌رچاوه‌ی دراوی پ ك ك بده‌ن وه‌ک نیفاقیکی ئه‌مریکی بۆ خۆشیرین کردن له‌به‌رچاوی ده‌سه‌ڵاتی تورکی وله‌بیربردنه‌وه‌ی لایه‌نگیری ئه‌مریکا بۆ ئیسرائیل ئه‌و کارانه‌ بکه‌ن له‌ دژی کورد. ئه‌مریکا به‌ هاوکاری ئیسرائیل خودی ئاپۆیان گرت ورادەستی تورکیایان کرد، چۆن کارێکی وا ناکه‌ن؟!

دوور له‌و ڕاپۆرته‌ ئه‌گه‌ر باسی ئه‌گه‌ره‌کان بکه‌ین یه‌ك به‌ یه‌ك ده‌بینین زۆریان له‌ ئاستیکی یه‌کساندان بۆ هه‌ڵگرتنی به‌رپرسیاره‌تی ئه‌و تاوانه‌...

ئه‌گه‌ر له‌ تورکیا ده‌ست پێبکه‌ین، ئه‌وه‌ گومانی تیدا نییه‌ ئه‌زموونی مێژووییمان له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی تورك ئه‌و هه‌سته‌مان به‌ شیوه‌یه‌کی تۆماتیکی لا دروست ده‌کات که‌ چاوه‌ڕوانی بۆمبی ئه‌تۆمیش له‌ تورك ئه‌که‌ین نه‌ك تیرۆر وته‌سفیه‌ی به‌ده‌نی، به‌ڵام ئه‌وه‌ی زیاتر ئه‌و ئه‌گه‌ره‌ لاواز ده‌کات ئه‌وه‌یه‌ که‌ حکومه‌تی ئه‌ردۆگان له‌ هه‌موو کاتێك زیاتر پێویستی به‌ هێمنی وپاراستنی باری ئاسایشی نێوان ده‌وڵه‌ت و پ ك ك هه‌یه‌، به‌ تایبه‌تی پاش ئه‌وه‌ی گه‌یشتنه‌ ئه‌و قه‌ناعه‌ته‌ی که‌ تورکیا هه‌رچیه‌ک بکات وهه‌ر رۆڵێکی ڕابه‌ری بگێڕێت دۆزی

کورد وەک تۆپی ئاسنینی پێی بەندیەکان لە پێیدا ئاڵاوە وجوڵەی سست دەکات ئەگەر نەیوەستێنێت. ئەوەی زیاتر گەیاندیە قەناعەت ڕوداوەکانی سوریا بوو کە پ ك ك زۆر بە هێز یاری لەو گۆرەپانە دەکات، دوەمیش ترسی تورکیایە لە دەرکەوتنی هێزی توندرەو ویاخی بەپێچەوانەی ئاڕاستەی میانڕەوانەی ئۆجەلان کە لە وەتی لە زیندانە تەبەنای دەکات، بۆیە گەیشتۆنەتە قەناعەتێك کە ئۆجەلان لەوانەیە چاکترین کەس بێت بۆ ئەوەی لەگەڵی ڕێککەون، بەر لە روودانی ئەگەرێکی چاوەروان نەکراو یان بەرلەوەی ئۆجەلان شتێکی لێ بێت لە بارودۆخی نالەباری زیندان. ئکەوابوو مەگەر ئەو تاوانە بە دەستێکی تورکیش ئەنجام درابێت، ئەوە وەک شارەزایان وزۆر لە کەسایەتی ناوداری پ ك ك پییان وایە تورکە نەتەوەپەرستە ڕاستەڕەوەکان ئەنجامیان داوە تا ئێستا پەنجەیان بۆ حکومەتی ئۆردۆگان درێژ نەکردوە. وەک زوبێر ئایدار نوینەری پ ك ك لە ئەوروپا تاوانی تیرۆرەکەی خستە سەرشانی [هێزە تاریکپەرستەکان] کە ویستیان گفتوگۆکە بپچڕێنن. هەروەها سەرکردەیەکی کۆنگرەی نیشتیمانی کوردی سەر بە پ ك ك، ڕەمزی کارتەل دەڵێت: ئەوە تاوانێکی سیاسیە بێ گومان لەکاتیکدا ئۆجەلان دەوڵەت چونە ناو گفتوگۆی ئاشتی، هەندێك بازنە دژی چارەسەرکردنی دۆزی کوردن ودەیانەوێت پرۆسێسی ئاستی لەناو بەرن.

ئیسرائیل یش ئەگەریکی تری بەهێزە کە بەو دواییە پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیا لە خراپترین باردایە ولە هەمان کاتدا هەوڵی کردنەوەی کەناڵێکی زۆری داوە لەگەڵ پ ك ك تا ڕادەی پێشکەش کردنی زانیاری عەسکەری، کەوابوو ئیسرائیل حەز بە بەرقەرار بوونی تورکیا ناکات لەژێر حوکمی ئەردۆگان کە دەیەوێت ببێتە کاریزمایەکی ئیسلامی بەهێزی ناوچەکە وجیهانی ئیسلامی، وزۆرجار ئەردۆگان لەو پێناوەدا بەسەر پلیکانەی ئیسرائیل هەڵدەگەڕێت زۆر بەتوندی لێدوان دەدات لەدژی ئیسرائیلدا.

بەڵام ئەگەرێکی تری بەهێزیش هاوپەیمانی ئێران وسوریایە، بە تایبەتی ئەو دوو دەوڵەتە بە یەک دەست دەجەنگێن لە شەڕی ناوخۆی سوریادا لەسەر بنچینەی تایفیەت. پێکهاتنی پ ك ك لەگەڵ تورکیا گورزێکی تری جەرگبڕ لە ڕژێمی ئەسەد دەدات، چونکە وەک زانراوە PYD وەک بەهێزترین حزبی کوردی سوریا هەموو بڕیار وچارەنوسی دۆزی کوردی کوردەکانی سوریای قۆرخ کردوە وبە ئاشکرا وبە نهێنیش دەستی تێکەڵاوکردوە لەگەڵ ڕژێمی ئەسەد، کە ئەوەش یاریەکی ترسناکە دوور نیە ئاکامێکی زۆر خراپ وترسناکی

لێبکەوێتەوە لە پاش ڕوخانی ئەسەد کە بۆتە مەسەلەی وەقت. جا لەبەر ئەوەی یەک لە سێی چەکدارەکانی پ ك ك کوردی سوریان کەوابوو زەحمەت نیە بۆ موخابەراتی سوری وئێرانی هەموو نهێنی یەکانی ناو پ ك ك بزانن وچەندین چاو وهاریکار وسیخوڕیان بێت لەناو پ ك ك دا ولە ڕۆژێکی وادا بەکاریان بهێنن.

ئەو ئەگەرە ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو ئەگەرە بەهێزەمان دەبات کە ئەو تاوانە بە دەستی کەسانێکی ناو پ ك ك ئەنجامدرا بێت، ئەوەی ئەو ئەگەرە بە دوور دەزانێت وخۆی لێبۆتە شیکاری سیاسی وزوڕناکانی سەردەمی میدیای ریالیزمی سۆشیالستی ئەوە نە لە سیاسەت تێدەگات ونە پ ك ك دەناسێت، ڕاستە هەموو باڵەکانی ناو پ ك ك لە ژێر پەردەی شەرعیەتی ئاپۆ کارەکانیان دەکەن بەڵام لە غیابی ئاپۆدا و، نەبوونی پەیوەندی خێرا وڕۆژ بە ڕۆژدا هەموو لایەنێك خۆی بە هەڵگری ئەو شەرعیەتە دەزانێت ولە ژێر پەردەیدا کارەکانی خۆی دەکات. هەتا زۆر هەواڵ بڵاوبوونەوە لەسەر دەمی ئاپۆ کە رازی نییە لە گەریلاکانی لە قەندیل چونکە گوێ بۆ فەرمایشتەکانی ناگرن. ئەوەی زیاتر گریمانی تەسفیە کردنی ناوەخۆی لێدەکرێت یەکەم: ئەو هەوالانە بوون کە پۆلیسی فەرەنسیش دوپاتی لەسەر کردەوە کە بکوژان بە ئاسانی وبەبێ بەکارهێنانی هێز چوبونە ناو ساختتمانەکە ووشەی پاسوێردشیان پێ بوو، کە ئەوەش زەحمەتە بە کەسێکی دەرەکی بکرێت.

دوەمیش: پ ك ك وەک حزبێکی نەرێت ستالینی پێشینەیەکی دەوڵەمەندی هەیە لە تەسفیە کردنی ناوەخۆیی، ئەوەی لەبەر سۆزی نەتەوەیی ئەو ڕاستیە نابینن بەداخەوە خۆشیان پێ ڕۆشنبیرە ئەوە دەبێت زیاتر بابەتیانە بیرکەنەوە هاوبەش نەبن لە هەڵەی حزب بە بێدەنگی وشاردنەوە وچاوپۆشی، ئەمڕۆ پ ك ك قەندیل وئەوروپا وناوخۆی کوردستانیشی قۆرخ کردوە وفزەی لەهەر کەسایەتیەک وهێزێکی تر بڕیوە لە کوردستانی تورکیا و سوریا بەو ترس ولەرزەی کە بڵاوی کردۆتەوە وبەو پاکتاوکردنانەی کە دەیکات لە ناوەوە ودەرەوەی کوردستان، بەڵکو لە ئەوروپاش. ڕفاندن وکوشتنی سیپان لە موسڵ وکوشتنی کەمال شاهین لە سلێمانی، وکوشتنی کەسانێکی زۆر لەوانەی جیابونەوە لە پ ك ك لە ئامەد وشارەکانی تری کوردستانی باکوور ولە عەفرین و حەلەب وبەر لە ئێستاش پاکتاوکرنی سەدان گەریلا لە چیاکان لەسەر هۆی زۆر لاواز وبێ بنەما داب ونەرێتی حزبە ستالینیەکانمان بەبیردەهێنێتەوە بە هەموو ڕووە نێگەتیڤیەکانی، بۆیە تێوەکلانی پ ك ك لەو تاوانە بەدوور ناگرین، ڕۆژگاریش لەوانەیە شتەکان زیاتر ڕوون بکاتەوە. لەندەن ٢٠١٣/١/١٣

## وتارێک لەسەر کۆبانی بە ستایلی جەندرمەیەکی تورکی

محەمەد هەریری

کاتی خۆی ئوسامەی بن لادنی قاعیدە وداعش گووتی: لەمەودوا دنیا دەبێتە دوو فوستات [یانی خێمە وچادر، نمونەکەشی دەبێت بەدەوی بێت وەك خۆی] فوستاتی ئیمان، یانی قاعیدە و ئیسلامی سیاسی بە گشتی، کەسانێکی کەم نەبێت، و فوستاتی کوفر، کە هەموو نا قاعیدە و ئیسلامە ناسیاسیەکان دەگرێتەوە، دەڵێی پێشبینیەکەی دێتە جێ، ئەوە نییە، زۆربەی عەرەب بە گەلان و بە دەسەڵاتدارانیانەوە پشتگیری لە فوستاتی باوکی ڕووحی داعشەکان دەکەن، ئەگەر چەند دەسەڵاتدار وحاکمێکیش بە گوێ ڕاکێشان ئەمرۆ بە ڕەسمی کەوتۆتە بەرەی دژە داعش وەك سعودیە وقەتەر بۆ نمونە ئەوە ڕاپرسیەکان دەیسەلمێنن کە خەڵکی عەرەبی ئەو وڵاتانە ٩٨% زیاتر پشتگیری لە فوستاتی داعش دەکەن!

وتارێکی برادەرێکی بزوتنەوەی ئیسلامیم خوێندەوە لەسەر کۆبانی، کە وادیارە دەچێتە خانەی ئەو فوستاتەوە، چونکە ئەردۆگان لە ڕێگای دەست لە پشتدانەکانی قەرازوی و ئیخوانەوە و لە پێناو کێشەی لەگەڵ ڕژێمی ئەسەدەوە، هێندە دەبەنگ دەرکەوت خۆی خستە ناو چادر و فوستاتی ئوسامە وداعش، هەموو ئەو میراتە میانڕەوەی کە لای خەڵك بنیاتی نابوو لە سەردەمی ئیستیزعاف و لاوازی بە پێی زاراوەی ئیسلامی سیاسی، قوربانی فوستاتی داعشی کرد لە قۆناغی تمکین و باڵادەستیدا !بەو کارەشی ئەو تیۆرەی نەیارانی ئیسلامی سیاسی سەلماند، کە لە کاتی لاوازی بە نیفاق باوەڕ بە دیموکراتیەت و ئازادی دەکەن، بەڵام کاتێ بەهێز بوون هەموو ڕەفتار وبیر وسلوکی سەردەمی استضعاف یان دەگۆڕن بۆ سەردەمی باڵادەستی و تمکین! ئەسەد یش لەو زیرەکتر دەرچوو، کە توانی سەرنجی دنیا لە ئیدانەکردنی خۆی لادات بۆسەر ئەو وەحشانەی داعش!

زۆر دەمێکە سەرنجی هێندێ بیروڕای چەواشەکارانەی ئەو برادەرەم دابوو، بەڵام دەمزانی کە باگراوەندی بزوتنەوەیی و ئیسلامیبوونە سیاسیەکەی پێی دەکات و زۆرجاریش خۆم لێی لادەدا لەبەر درێژدادڕی لە نوسیندا، ئەوەی خەڵك بە چەند ڕستەیەك گوزارشی لێدەکات، کاك شوان پێویستی بە وتارێکی ١٤٠٠ وشەیی هەیە تا بەو شێوازە جاڕسکەرە مەرامی خۆیت پێ بگەیەنێت! من لێرە ناچارم کەمێك درێژدادڕی بکەم چونکە وتارەکە لەوەڵامی وتارێکی درێژدادڕدا نوسراوە! ئەو وتارەشی کە بە ناونیشانی [کورد و قەیرانی کۆبانی]

نوسیویەتی دەچێتە خانەی چەواشەکاری و فوستاتەکەی ئوسامەی باوکە گەورەی داعش. لە سەرەتادا دەڵێت: "هەموان دەزانن کۆبانی لە هەرێمی کوردستانەوە سەدان کیلۆمەتر دوورە ، کە زۆربەی ئەو ناوچانەش لە دەستی داعشدایە ، ...دەبێ ئەوەش بزانین (PYD) کە باڵی سوریای ( PKK ) یە رێگە بە بوونی پێشمەرگە نادەن لە خۆرئاوای کوردستاندا جێگیر ببن ، چونکە پێشتر دژی بوونی حیزبە سیاسیەکان بوون ، چ جای ئەوەی هێزی چەکدار بچێتە ناوچەکەیان ." زانیمان رێگا دوورە، بەڵام (PYD) و ( PKK ) ش لەسەر زمانی باڵاترین کەسیان بەخێرهاتنی پێشمەرگە دەکەن بۆ کۆبانی، ئەوە چەواشەکاریەک!

چەواشەکاری دووەم، ئەوەیە خەریکە کۆبانی دووچاری قەتڵ وعام دەبێت، ئەو هێشتا پێی مخابنە ئەوەی" لە چەند رۆژی رابردوودا لایەنگرانی ( PKK) لە ئەوروپا و باکووری کوردستان کردیان ، لە بری قازانج گەیاندن بە کورد زیانی زۆر تر بوو" خۆی زیاتر خەمی شێواندنی تورکیایە، بەڵام چەواشەکارانە باسی ئەوروپا و پەرلەمانی هۆڵەندا دەکات! نەخێر ئەوەی ئەو خەڵکە بە شەڕەفەی کوردانی باکوور کردیان لە ئارامی تێکدانی دەسەڵاتدارانی تورکیا لەبەر هەستکردنیان بە ترسناکی دۆخەکە بوو، نەك وەك تۆیەکی سارد وسڕ خەمی پشێویی تورکیای ژێر فوستاتەکەی داعشت بێت !ئەی بۆ بە ئەردۆگان ناڵێیت لێکچواندنی داعش بە پەکەکە -پێت باش بێت یان خراپ- کە نوێنەرایەتی دۆزی کورد دەکات و ملیۆنەها کورد پشتگیری لێدەکەن چ سودێك بە پرۆسەی ئاشتی دەگەینیت؟! یان کورد کە فێری نۆکەری وکاسەلێسی بوو چاویشی کوێر دەبێت لە ئاست ڕاستیەکاندا؟! وەك کۆمێنتەکەی کاك کامران کوردی بۆی نووسیت: " سەیرە ! ئەتوو وەرە چاوت ئەو هەموو دوو ڕووییەی ئۆردوگانی نەبینی ئەو نیفاق و بێ ناموسیە سەرنجت ڕانەکێشی ، کوشتنی خۆنیشاندەرانیش سەرنجت ڕانەکێشی ، بێیە سەرباسی توندوتیژی هەندەک لە خۆنیشانددەران ئاگرکردنەوەیان لە هەندەک شوێن ؟||

ئەو کوردەی لە سەرتاسەری جیهان گڕی گرتوە بۆ خوشك وبرایانیان لە کۆبانێ، بڕیاری بەرائەتیان داوە لە فوستاتەکەی ئوسامە وداعش، وەك کەسانێك نین لەگەڵ دەست وپێوەندەکانی ئەردۆگانەوە چووبنە ژێر فوستاتەکەی داعش!

ئەردۆگان و ئاك پارتی کە ساڵەهایە خەڵك چەواشە دەکەن بەناوی پرۆسەی ئاشتی، ئەگەر ئەو پرۆسەیە ڕۆژی یەك ملیمیش بچووبایە پێش ئێستا هیچ کێشەیەك لە ئارادا نەمابوو،

هێشتا دەیەوێت چەواشەمان بکات بەو ئاشتیە ساختەیەی کە هەموو کەسێکی عاقڵ و کەم قسەکەر و زۆرتر فیکرکەر دەزانێت درۆیەکی ڕووتی ئەو تورکە نیو عوسمانیە فێڵبازانەیە، بە بەڵگەی ئەوەی ساڵەهایە ناوی پرۆسەی ئاشتی دەهێنن، وچەکەکان بێ دەنگ بوون، کەچی ئەردۆگانی داعشڕەو توانی کۆنترۆڵی شەقام و پەرلەمان ودەسەڵاتی تشریعی و جێبەجێکردن بکات، و کۆنترۆڵی سوپا ودادگا و پۆلیس بکات، بەڵام نەیتوانی چارەسەری کێشەی کورد بکات!! لە یەکەم هەلدا بەبێ گوێدانە هەستی ملیۆنەها کورد، پەکەکە ی هاوبەشی لە پرۆسەی ئاشتی بە داعش وەسف کرد!! کاک شوان ئەگەر یەك زەرە ئینسافی هەبا، ئەوەندە بەس بوو بۆ ئیدانەکردنی ئەو سوڵتانە بێ بەهایەی کە ناوی ئەردۆگانە، بەڵام هێشتا دەڵێت: " ئایا ئەم ئاژاوەیەی کە ( PKK) و باڵە سیاسیەکەی ) حیزبی دیموکراتی گەلان ) دروستی کردووە بە خۆپیشاندانی توندوتیژانە چ سوودێك بە کۆبانی و پرسی کورد دەگەیەنێت ؟ ئایا راگەیاندنی باری نائاسایی و ناردنەوەی هێزی سەربازیی و هەزاران جەندرمە بۆ شارەکانی کوردستان چ دەردێکی کورد دەرمان دەکات ؟ " ئەوە چەواشەکاری سێیەم!

ئینجا هێندە باسکردنی پەیوەندی (PYD) و ( PKK ) بە ڕژێمی ئەسەد، وعەلەوییەت و شیعاتی، گوایە بەکرێگیراوی ئەسەد و ئێرانن، ئەوە چەواشەکاری چوارەمە! ئەخر هەر کێ باسی بەکریگیراوەتی بۆ شیعە وئێران بکات نابێت کەسێکی بزوتنەوەی وەك تۆ باسی بکات، کە لەسەر خوانی شیعە وئێران گەرەبوون! کاتی خۆی منیش وا تێگەیشتبووم، بەڵام کە دیتم ئۆپۆزسیۆنی سوری هەمووی داعش مەشرەبن و ئەو برایانەی (PYD) توانیان جۆرێك لە سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن وناوچەکانیان بپارێزن لەو سەگ وسوارانەی داعش، و ڕژێمی سوریش چاوپۆشی کرد لەو وەزعەی شارە کوردیەکان بە مەرجێك هیچ مەترسیەك نەبێت بۆ سەر ئەو، ئەو جۆرە پەیوەندیە لە گۆڕەپانێکی خوێناوی وجەنجاڵی وەك سوریادا بەڕاستی لوتکەی زیرەکی وخوێندنەوەی سیاسی دروستە، کە نە شەڕی ئۆپۆزسیۆن بکەیت و نە شەڕی ڕژێم، چونکە یەك لە یەکتری نەفرەتیترن! ئەگەر (PYD) بەکرێگیراوی ڕژێم بایە، ئێستا فڕۆکەکانی ڕژیم وئێران لە دەوروبەری کۆبانی دەدیتران لە داعش بدەن، یان هەرنەبا کەمێك ڕژێمی ئەسەد بۆ کۆبانی تەنگاو دەبوو ، کە دەڵێی نە بای دیوە ونە بۆران! بەڵکو گومانی بەهێز هەیە کە ڕژێم ئەسەد وەزعەکەی بە دڵە، لەبەر نزیکبوونەوەی (PYD)لەگەل چەند هێزێکی تری ئۆپۆزسیۆن. ئەوە چەواشەکاری چوارەم!

ئینجا لە هەموو چەواشەکاریەک خراپتر ئەوەیە بۆتە قسەکەر بەناوی حوکمەتی تورکی ودەڵێت: بە راستی ( ئەفکان ئالا ) ی وەزیری ناوخۆی تورکیا زۆر باش وەڵامی ( HDP ) ی دایەوە کە وتی : ئێوە بۆ خۆتان رێگر بوون لەوەی پەرلەمانی تورکیا رێگا بە سوپا بدات لە سوریا هێرش ئەنجام بدات ، ئێستاش خۆپیشاندان دەکەن و داوا دەکەن سوپا بچێتە کۆبانی بۆ شکاندنی تیرۆر" !!

کورد خۆشباوەڕە، بەڵام هەرگیز هێندە خۆشباوەڕ نەبوە تا ئەوڕادەیەی داوا لە سوپای تورك بکات کورد بپارێزێت. ئەخر ئەوە سپاردنی پەزە بە گورگ! کورد کە دەنگی نەدا بەو سوپا درندەیە بچێتە کۆبانێ، چونکە دەزانی ئەردۆگانی سوڵتانی درۆی داعشڕەو بە ئاشکرا چەندین جار گووتی ئێمە دەجەنگێین دژی پ ك ك و داعش وەك یەك!! کە چوە ئەوێ بۆ لێدانی کورد دەچێت، ئەگەر تورکیا هێندە نیەتی باشە دەتوانێت ڕێگا بە هەر هێزێکی نێودەوڵەتی جێگەی متمانە بدات بۆ ڕزگارکردنی کورد بچێتە کۆبانێ، با ڕێگا بدات بە پیشمەرگە لە تورکیاوە بچن، با ڕێگا بە گەیشتنی چەك بدات، بەڕاستی شورەییە و لوتکەی نەفامی و خۆهەرزانفرۆشییە بە لۆژیکی تورکی بیرکەیتەوە و کەسایەتی کوردیت بخەسێنیت! ئەوە چەواشەکاری پێنجەم!

دوایی دێت باسی نەخشەڕێگای تورکیا دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سوریا، نازانم لە تورکیەوە وەریگێڕاوە یان بۆیان وەرگێڕاوە، هەموو لۆمەکان ئاڕاستەی (PYD) و ( PKK ) دەکات چونکە ڕێگرن لە کەوتنە ژێردەستی تورکیا ودەیانەوێت بەرخودانی خۆیان بپارێزن! کاك شوان دەیەوێت:" تورکیا ناوچەی دژە فڕین و ئازاد لە باکووری سوریا دروست بکات لە ژێر کۆنترۆلی خۆی!! " دوایی " تورکیا داوای ئەوە دەکات هێزە شۆڕشگێڕە سورییەکان لەو ناوچەیەدا یارمەتی بدرێن لە رووی مەشق و چەك پێدان و ئامادە بکرێن بۆ داهاتووی ئەو وڵاتە !!" یانی تورکیا کۆمەڵێکی بەکرێگیراو لەو ناوچە کوردیە پڕ چەك بکات بۆ هاتنە گیان وکوشتنی کورد!!" دوایی کاکی سیاسەتزان دەڵێت:" تورکیا داوای لە ئەمەریکا ئەوەیە ریشەی دروست بوونی تیرۆر کە بەردەوامیی قەیرانی سوریایە وشك بکرێت ، ئەویش بە رووخاندنی ئەو رژێمە خوێنڕێژە ، بەڵام ئاشکرایە ( PKK) دژی ئەو نەخشەیە ، چونکە کۆڵەکەی عەلەویەت دەڕوخێت کە هاوپەیمانی ستراتیژیی ئەوانە ." یانی نووسەر ئەگەر تورکێکی ئەستەنبۆل و ئەنقەرەش با، دەیزانی کە مەبەستی ئەردۆگانی داعشڕەو لە

نەهێشتنی تیرۆر بە پلەی یەکەم وئەخیر هەر (PYD) و ( PKK ) یە! کەچی سەرکۆنەشیان دەکات کە ڕێگا نادەن ئەو نەخشەیە چارەسەر جێبەجێ بکەن!!! قەسەم بەخوا جەندرمەیەکی موسەقەفیش شەرم دەکات ئەو قسانە لە فەیسبوك و سایتەکان بڵاو بکاتەوە، چ جای کوردیك ئەو تەفاهاتانە بڵێت! دیارە نووسەر خۆی هەستی بە تورکیزمەکەی خۆی کردوە بۆیە پاساو دەهێنێت ودوای ئەو قسانە دەڵێت ":لێرەدا با کەس موزایەدەی ئەوەمان بەسەردا نەکات ئێمە خزمەت بە بۆچوونی تورکیا دەکەین ، تورکیاش وڵاتێکی گەورەیە و وەکو هەموو وڵاتانی ناوچەکە هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەدات ، "ناوەڵلا بابە کەس زاتی ئەوە ناکات موزایەدەت لەسەر بکات، وەرە شەقێکیشمان تێ هەڵدە! ئەوەی تۆ هەر بە موزایەدە کردن چارەسەر نابێت، بەڵکو ئەگەر گەل دادگایەکی هەبا، دەبوایە بداربایتە دادگا بە تۆمەتی ناپاکی وخیانەت، چونکە هەر وەك جەندرمەیەکی قەڵەم بەدەستی تورکیا قسە دەکەیت.

٢٠١٤/١٠/١٠

# تورکیا وئیسرائیل دوو نەتەوەی چۆن یەک!

محمد هەریری

ئەوە دەیەها ساڵە ئیسرائیل زەبر بەدوای زەبر دەوەشێنێتە عەرەبی فەلەستین وبەوپەڕی گوێنەدان بە هیچ نارەزاییەک بەردەوامە لەسەر پرۆژەی تەواوکردنی داگیرکردنی بست بە بستی خاکی فەلەستین، سەیر لەوەدایە ئیسرائیل هەر قسە ورەخنەی نەیارەکانی پشتگوآ ناخات بەڵکو گوآ بە رەخنەی دۆستەکانیشی نادات لە نێو ئەوانەش ئەمریکا وولاتانی ئەوروپای رۆژئاوا .

دەیەها ساڵە ئیسرائیل بە هەوەستی خۆی دەکوژێت ودەبڕێت بآ گوێدانە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان وهیچ دامەزراوەیەکی تری نێودەوڵەتی. ئەو ئیسرائیلە هێشتاش ماندوو نەبوە وئامادە نیە دەستبەرداری لە 3% خاکی فەلەستین یان ئیسرائیل بێت بۆ فەلەستینیەکان تا دەوڵەتۆکەیەکی لەسەر دروست بکەن!

ئیسرائیل بە بیانووی هیستیریای مێژووییەوە دەیەوێت هەموو شتێکی سەر ئەو خاکە هەستیارە بسڕێتەوە یان مۆرکێکی جولەکایەتی لێبدات، هەر بەو بیانوە مێژوویانەشە ئەوە بۆ چەندین ساڵە ژێر مسجد الاقێی هەڵدەکۆڵێت. دوا هەنگاوی پڕ لە فیز وعونجوهیەتی ئیسرائیل ئەو هێرشە دڕندانەی بوو بۆسەر (فلوتێلای ئازادی) (کاروانی دەریایی ئازادی) وبآ گوێدانە هیچ پێوەرێکی سیاسی ودیبلوماسی ومرۆیی، بەبآ سلّکردنەوە لە هاولاتیەکانی ئەو ولاتانەی کە تەنها بە مەبەستی شکانی گەمارۆ نامرۆییەکەی غەزەدا هاتبوون.

بێگومان ئیسرائیل بەو کارە نامرۆییانە وگەلحۆیانەی بە شایەدی دۆستەکانی پێش دوژمنانی هەلەیەکی گەورەی کرد وهەلێکی گەورەشی دایە دەستی ئەردۆگان بۆ زیاتر بەدەستهێنانی شەعبیەت وناوداری لە سەرتاسەری ولاتانی عەرەبی وتورکیادا. لێدوانە ئاگرین وتوندەکانی ئەردۆگان دوبەدوای ئەو ڕوداوە سەرتاسەری جیهانی عەرەبی وروژاند وتورکیاشی جۆشدا وشەعبیەتی ئەردۆگانی گەیاندەوە چلّە پۆپە !

تورکیا وئەردۆگان وەک ئەو شێرکوژەیە کە هەموو ولات گەڕابوو بەدوای ڕاوکردنی شێرێک کەچی شێرەکە بەرداوێژێک لە دواوەی ماڵەکەی خۆیان بوو!! ئەو کێشەیە گەورەیەی کورد کە بە هەموو پێوەرێکی دونیایی وئاسمانی گرنگترین کێشەیە ولەکاتێکدا

هەزاران منداڵی هەرزەکار لە باوەشی گەرمی دایکیان دەرهێندراون ولە زیندانەکان ژیانیان دەگوزەرێنن وڕاپۆرتەکەی بی بی سی لەو بارەیەوە بەردی بە گریان دەهێنا، کەچی ئەردۆگان سەرگەردانی عەدالەتە لە دووری هەزاران کیلۆ مەترەوە بۆ فەلەستینیەکان، ئەوە لە کاتێکدا ئەردۆگان دەتوانآ لە پەنجەرەی ئۆفیسەکەی دەیان منداڵی کوردی بۆیاغچی پیلاو ببینێت کە چۆن بە دەستی جەندرمەکانی ئاوارە وسەرگەردان کراون وچۆن شیرازەی سەرتاپای ملیۆنەها خێزانی کوردیان لێکترازاندوە.

ئەوەی جێگای پرسیارە دەبێت بۆ ئیسرائیل دەیەها ساڵە بە هەوەستی خۆی یاری تۆپتۆپێن بە جەستە وخاک وویژدان وئەعسابی عەرەب وموسڵمانان دەکات بێ ئەوەی لە هیچ بترسێت یان سڵ بکاتەوە؟! ئیسرائیل لە کآ بترسێت بەر لە هاتنە سەرهێڵی تورکیا؟ لە میسر ؟! ئەخر ئیسرائیل چۆن لەو میسرە بترسێت کە بونەتە ئێشکگری ئەمنی سنوری ئیسرائیل ولەوانیش توندتر تاڵاو بەدەمی فەلەستینیەکان دەکەن؟ لە ئوردن؟! کە بە دوو سآ سەعات دەتوانێت هەمووی داگیر بکات؟ لە سوریای ماڵباتی ئەسەدی ناوەوە وڕێوی بەردەمی ئیسرائیل؟! سوریا بەس بۆ گیانی نەتەوەیەکی بآ دەرەتانی وەک کورد ئازایە بۆ گیانی گەلی سوریای بارمتە ئازایە بۆ گیانی لوبنانیەکان ئازایە، وسنوریشی لەگەڵ ئیسرائیل لە تەقەی خۆشی ژن وژن گۆڕینەوەی هەردوو لای سنور هیچی تری لێ نیە. لە عەرەبستانی سعودی کە لە فەلەستینیەکان زیاتر سواڵی ئاشتی دەکات لە ئیسرائیل؟! ئەوەی لەسەر ئاستی عەسکەری کەمێک ئیسرائیلی هەژاندبێت حزب الله یە ولەدواوەش ئێران، بەڵام هەموو گەفوگوڕەکانی ئێران بەقەد ئەو هەڵمەتە سیاسی ودیبلۆماسیانەی ئەردۆگان وتورکیا کاریگەری نەبوو بەسەر ئیسرائیل، بەڵکو ئیسرائیل هەڕەشەکانی ئێرانی وەبەرهێناوە بۆ بەرژەوەندی خۆی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. ئەوەی ئەردۆگان وتورکیا پێیان کرا لەگەڵ ئیسرائیلی بکەن کەس پێی نەکراوە، ئەوەش سەرەڕای لێزانی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەکی سەرەکی:

ئەویش وەک چۆن جولەکەکان خۆیان پآ گەلی هەڵبژاردەی خوایە، تورکەکانیش بە پێی کلتوری سیاسی کەمالیستی وکلتوری ئیسلامی عوسمانیش ئیدیعای ئەو نوخبەویەتە دەکەن وتوێژینەوەیەکی زۆر لەو بارەیەوە هەیە، بۆیە تاکی تورک هەست بە عونجوهیەتێکی زۆر سەیر دەکات لە سۆنگەی ئەو پەروەردە دوو سەرەی کەمالیی وتاڕادەیەکێش عوسمانیەت. چونکە ئەگەر تورک هێندە ئاشتیخوازن نە دەبوایە بەو جۆرە دڕەندایەتیە هەڵسوکەوت لەگەڵ میللەتێکی گەورەی وەک کورد بکات، ئێمە هەر باسی ئاستی سیاسی وحکومی ناکەین بەڵکو

باس له‌سه‌ر ئاستی كه‌سێتی وشه‌خسی ده‌كه‌ین، له‌ شاگردێكی توركی ڕێستورانه‌وه‌ بگره‌ تا پرۆفیسۆرێک هه‌مان خۆبه‌زلزان وعونجوهیه‌ت وخه‌ڵک به‌هیچ نه‌زان، هه‌ر خۆم جارێكیان له‌ ڕێستورانێكی توركی كه‌ زۆربه‌یان كوردی توركیا بوون له‌ یه‌كێكیانم پرسی جه‌نابیشت كوردی! گوتی نا، (نا) یه‌كی هێنده‌ گه‌وره‌ وقه‌ڵه‌و وهێنده‌ ڕوخساری تێک چوو وه‌ک بڵێی پێم گوتبێت جه‌نابت گه‌وادی؟! ئه‌زموون زۆرن له‌گه‌ڵ شوفێری تاكسی وڕۆشنبیر وسیاسی وئیسلامی وعیلمانیه‌وه‌ هه‌موویان یان زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆریان هه‌مان گیانی گه‌لی هه‌ڵبژارده‌ی خوایان تێدا ده‌خولێته‌وه‌، جا وه‌ک چۆن عه‌ره‌ب ده‌ڵێن (ته‌نها ئاسن ئاسن ده‌چه‌مێنێته‌وه‌) بۆیه‌ ئه‌و عونجوهیه‌ته‌ی جوله‌كه‌كان پێویستی به‌و عونجوهیه‌ته‌ی توركان بوو، ڕۆژئاواش زۆری پێخۆشه‌ به‌ڕه‌ی حه‌ماس وفه‌له‌ستینیه‌كان له‌ ژێر پێی ئێران ده‌ربهێنێت وبیخاته‌ ژێر پێی نیوعوسمانیه‌كان كه‌ زۆربه‌ی كات له‌ میكیاڤیلی میكیاڤیلیانه‌تر ڕه‌فتار ده‌كه‌ن وڕه‌هه‌ندێک هه‌یه‌ بۆ عه‌قڵ وگفتوگۆ.

٢٠١٠/٦/٢٢

## بەڵام هەموو دیموکراسیەتێك عەلمانیە و هەموو تیۆکراتیەك نا دیموکراسیە

کاک مەریوان وریا قانع بابەتێکی نووسیوە بە ناوی: قیڕەقیڕی عەلمانیەت و دین لە کوردستاندا! تیایدا هەردوو لایەنی ئەو قیڕەقیڕە، ئیسلامیەکان و عەلمانیەکان تاوانبار دەکات بە تێ نەگەیشتن لە عەلمانیەت و دیموکراسیەت! لە سەرەتادا دەڵێت: "ئەمڕۆ دووجۆر قیڕەقیڕ و نەڕەنەڕ لە دونیای ئێمەدا بە ئاشکرا دەبیستین،

یەکەمیان هی ئەو مەلا و خوێندەوار و هێزە ئیسلامییانەیە کە عەلمانیەت وەک شتێکی گڵاو و قێزەون و بەدڕەوشت وێنادەکەن و لەشکرێک گەنجیان لەسەر ئەم ڕوانینە ترسناکە ڕاهێناوە و ئەوەیان لەمێشکدا چەسپاندون کە ئیسلام چارەسەری هەموو کێشەکانەو دەرەوەی ئیسلامیش بیابانێکی فیکریی و ئەخلاقیی و سیاسیی کاکی بە کاکییە .
دووهەمیان، بڕێک لەو خوێندەوار و ڕۆشنبیر و چالاکەوان و ناوەندە عەلمانیانەن کە بەسادەیەکی ترسناکەوە عەلمانیەت بە هەموو دیاردە و دەسکەوت و بەها گرنگ و ئینسانیی و یەکسانخواز و مافپەرستەکانی ناو دونیای مۆدێرن، یەکساندەکەن ".

حاڵەتەکە ڕاستە، ئەو دوو دەستەیە خەریکی ئەو شەڕە فیکری و ئایدیۆلۆژیەن، بەڵام کێشەی ئەو تەسنیف و پۆڵێن کردنە لەوەدایە، کە کاک مەریوان هاوسەنگیەک ناکات لە نێوان مەترسی هەر لایەك لە هەردوو لایەکە. و بە کورتی دەڵێت هەردووکتان یەکسانن و خراپن! منیش دژی وتاری هەڵچوو و پڕ لە قیڕەقیڕی مەلا وبانگخوازە ئیسلامیەکان و بەشێك لە سیکیولارستە سەرەڕۆکانم، کە زۆر جار بە نەزانیەوە زیاتر بەرەی توندڕەوی دینی بە لێدوانێکی نا بەرپرسانە بەهێزتر دەکەن! بەڵام ئەوەی کە کاک مەریوان چاوی لێ پۆشیوە ئەوەیە، جارێ دەبوایە وەڵامێکی یەکلاییکەرەوەی دابایەوە بۆ ئەو جەماوەرە دینیەی کەوا تێگەیەندراوە عەلمانیەت یانی هاوڕەگەزبازی و بێ ڕەوشتی و کوفر وئیلحاد، ئینجا بهاتبایە سەر باسەکانیتر.

نەك هیوایەکی زائیف وساختە ببەخشێت بە پشتگیری کەرانی ئایدیۆلۆژی دینی، کە دەکرێت دیموکراسیەت لەسەر دەستی دیندارە ئایدیۆلۆژیەکان دابمەزرێت! ئەگەر سەرنج بدەینە ڕژێمە دینیەکان لەوەتی شتێك هەیە بە ناوی دیموکراسیەت، هیچ ڕژێمێکی سروشت دینی،

دیموکراسیەتی لێ شین نەبووە و نابێت، چونکە سروشتی دینی ئەحکامەکان وایە، وجیاوازیەکان زۆر گەورەن لە نێوان ئیماندار و بێ ئیمانەکان، هیچ یەکسانیەك نییە لە نێو ئەو دوو جۆرە، ئەوە ئەگەر لێبگەڕێن جیاوازی هەبێت، یان کەسانێکی جیاواز هەبن! لە هەموو مێژووی دنیای هاوچەرخ بخوێنینەوە دەزانین ڕژێمی دیموکراسی هەردەم دووانە بوە لەگەڵ سیکیولاریزم، بۆیە راستە گەر بڵێین هەموو ڕژێمێکی دیموکراسی عەلمانیە، بەڵام هەموو عەلمانیەتێکیش دیموکراسی نییە! بەڵام بێگومانەوە دەڵێین هەموو ڕژێمێکی دینی یان تیۆکراتی نا دیموکراسیە و نا عەلمانیشە.

من دەتوانم نمونە بە سەدان ڕژێمی دیموکراسی بهێنمەوە کە عەلمانیەت بنەماکەیەتی، بەڵام خۆزگە کاك مەریوان تەنها یەك نمونەی ڕژێمێکی دینی و تیۆکراتی دەهێنایەوە کە دیموکراتیەتی لێ شین بوو بێت؟! ئەگەر زۆریش بیر کاتەوە لەوانەیە هەر ڕژێمە نیمچە دیموکراتیەکەی ئەردۆگانی بێتە خەیاڵ، کە ئەویش ڕژێمێکی تەواو عەلمانیە، بە دانپێهێنانی خودی گول و ئەردۆگان وداود ئۆغلۆ، تەنها باگراوندی سەرکردەکانی ئاکەپە ئیسلامیە وکاتی خۆی سەر بە ئەربەکان بوون! بەڵام کەزانیان حزبێکی ئیسلامی ناتوانێت بە ناوی جێبەجێکردنی شەریعەت و فەرزکردنی ڕوئیای دینی ببێتە دەسەڵاتدار لە تورکیای کە لە حیمایەتی سوپایەکی کەمالی عەلمانی بەهێز بوو، یاریەکەیان گۆڕی، حزبێکی دیموکراتی نیمچە موحافیزکاریان دروست کرد، هێندە دیموکراتی لە زاهیر هەموو جامخانەکانی لەشفرۆشیشیان لە تورکیا پێ قبوڵ کرا، و بە ئاشکرا مافی هاوڕەگەزبازان تیایدا رۆژانە زیاد دەکات، کە ئەوانە لە رژێمێکی ئیسلامیدا هەمووی رەجم دەکرێن و دەکوژرێن،

لە چاکترین حاڵەتدا جەڵدە وشەلاقیان لێدەدرێت و زیندانی دەکرێن! کەوابوو نمونەکەی ئەردۆگانیش ئیسلامی نییە، هەرچەندە لەبەر پاشماوەی ڤایرۆسی ئایدیۆلۆژیەتی دینی ئەمرۆ بە ئاشکرا دەستی تێکەڵ کردوە لەگەڵ فاشیسترین هێزی ئیسلامی داعش، لە ڕێگای نافەرمیەوە هەموو دەزگاکانی دەوڵەت خراونەتە خزمەت بە هێزکردنی هێزە ئیسلامیەکان، کە لە بۆسەدان بۆ گۆڕینی رووی دیموکراتی و عەلمانیەتی تورکیا! ئەوانەی دەچنە تورکیا لە نزیکەوە ئەو هەڵگەڕانەوەیە شارستانیە دەبینێت بەرەو فاشیزمیەتی دینی! و لە پێناو کوشتنی کورد ودیموکراتیەت! چونکە هەر وڵاتێك کوردی تێدا کوژرا، دیموکراتیەتیش پێش وەخت کوژراوە.

کاک مەریوان دەڵێت بیست ساڵە دژایەتی هەر دوو دیدی دینی و عەلمانی پەرگیر دەکات، منیش دژایەتی پەرگیری دەکەم لەهەر لایەك بێت، بەڵام دەشزانم چۆن هاوسەنگی بکەم لە نێوانیان، وکامیان لە ڕووی ڕوحیەوە و دەروونیەوە نزیکترە لە دیموکراتیەت! من ناچم وەهەمی دینداران فوو تێبکەم کە دەتوانن دیموکراتیەت بنیات بنێن لە ڕێگای ڕژێمێکی دینیەوە وەك کاک مەریوان دەڵێت: " دەکرێت هێزی دینیش هەبێت باوەڕی پتەوی بە دیموکراسیەت و لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ڕێزگرتنی مافە بنەڕەتییەکانی ئینسان و مافی یەکسانی گروپە جیاوازەکان، هەبێت."! بەڕای من کە دیندارە ئایدیۆلۆژیەکان توانای ئەوەیان هەبێت ببنە ئەو دیموکراتخوازانە، ئەوە دەبێت نیوەی تێکستە پیرۆز و موقەدەسەکان لە قودسیەت داماڵن، یان حەلێکی بۆ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی تەجمیدی بکەن و لەکاری بخەن!

ڕاستە کاک مەریوان دەڵێت: " بەڵام ئەم گەنجانەی دین و دیموکراسییەت گونجانیکی بێمەرج و خۆبەخۆ نییە، دین بۆ ئەوەی ببێت بە بەشێک لە سیستمی دیموکراسی دەبێت واز لە یەکێک لە تەماحە گەورەکانی بهێنێت، تەماحی ئەوەی هەقیقەتەکانی خۆی وەک هەقیقەتی موتڵەق بخاتە ناو فەزای گشتیی کۆمەڵگاوە ".باشە چۆن مرۆڤی دیندار واز لە هەقیقەتی خۆی دەهێنێت کە لای ئەو موتڵەقە، چما ئەو قەولێکی بوخاری وموسلم، ناڵیین خوا و پێغەمبەر بە ئەقوالی هەموو زانایانی جیهان دەگۆڕێتەوە؟! تۆ سەرنجی ئەو زەردەخەنەیەی پڕ لە متمانەی موتڵەقی سەرلیوی دیندارانت نەداوە کە گفتوگۆ دەکەن لەگەڵ کەسێکی نا ئیماندار یان عەلمانی و لادەر؟ !

چۆن تەسەور دەکەیت بگاتە ئەو ئاستەی کوردێکی نا موسڵمان، یان عەلمانی بۆ نمونە ببێتە سەرۆکی یان تەنها ڕێی پێبدات خۆی کاندید کات لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی دینیدا؟! ئەوەی تۆ ناوی دەنییت قیرە قیڕ شەڕی گۆڕەپانێکە، کە زۆری وەك ئێوە کارامانە نەتان کردوە، لە جیاتی مێژووی واقیعی هەردوو بەرەکە بخوێنیتەوە و دەیان تیۆر و گریمانەت هێناوە کە نە هەموو عەلمانیەك دیموکراسیە و نە هەموو دینیەك نا دیموکراسیە! نا بەڕێزم هەموو ڕژێمێکی دیموکراسی لە واقیعدا عەلمانیە، ڕاستە جیاوازی هەیە لە نێوان جۆری عەلمانیەکان، بەڵام گومانم لەوە نییە کە هەموو ڕژێمێکی دینی وتیۆکراتی نادیموکراسیە، لە نێوان ئەو ئەوپەڕی فاشیەت وبەربەریەتدا بۆ ئەوپەڕی دیکتاتۆریەتی مەلاکاندا، جاوێك بە

دەوڵەتی داعش و سعودیە و ئێران و تاڵیبان بخشێنیت دەزانیت ناکرێت هیچ ڕژێمێکی دینی دیموکراتی بێت،

چەندە خەیاڵیشمان فراوان بێت، چونکە ئەو بیرمەند و زانا ڕیفۆرمخوازانەیشی کە هەڵدەکەون لەناو بواری دینی ڕیفۆرم دەکەن، بۆ دەربازکردنی دین لە تەنگژە تەشریعیەکانی، زۆربەیان دەکەونە بەر هێرشی توندرەوانی کە خەڵك لەوەدەچێت بە خاوەنی هەقیقی دینەکەیان بزانن، چونکە خەلکە ئاساییەکەش ئەوەندەی گوێ بۆ ابن باز و ابن تیمیە دەگرن، بە یەك لە سەدا گوێ بۆ نجم الدین الگوفی و محمد شحرور ناگرن، ئەو خەڵکەی گوێ بۆ حسن البنا دەگرن، سەدایەکی ئەو ژمارەیە گوێ بۆ جمال البنا ی برای ناگرن، کە پرۆژەیەکی سەرتاسەری هەیە بۆ ڕزگار کردنی دین لە تەنگژەکانی سەردەم و ئاشتکردنەوەی بە ڕوحی سەردەم. من چانسی دیموکراتی بوونی هێزێکی دینی دەستگرتوو بە هەموو تێکستەکاندا بە فەهمی تەقلیدی و ئەئیمەی سەلەف، وەك چانسی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکی هەستیار و ترسناکی نەخۆشێک دەبینم، کە ڕێژەی سەرکەوتنی لە سەدا پێنجە.

26-07-2015خەندان

# ئەگەر دینی خوایە بۆچی ئیحراج دەبن؟!

کێ هەیە لە ئێمە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیحراج بوونی زانایانی دینی ئیسلامی و خەڵکی ئاسایی دینداری نەبینیبێت کاتێ بەروەڕووی پرسیارگەلێکی ئیحراجکەر دەبنەوە؟!
کێ هەیە شپرزەیی و تورەبوونی ئەو شێخ و مەشایخانەی نەدیتبێت، کە لە جیاتی وەڵامێکی روون و ئاشکرا پەنا دەبەنە بەر هەڕەشە و جوێن و وروژاندنی دیندارە عاتیبفی و نەزانەکان؟!
بابەتەکانی ئیحراجکەریش زۆرن لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ! لە سەردەمی کۆن ئیحراجیەکان کەمتر بوونە، بە پێی سەردەم و پێگەیشتنی عەقڵی پرسیارگەلی ئیحراجیش کەم بوون..
لەو سەردەمە کەس پرسیاری لە مەشروعیەتی ڕەجمکردنی زیناکەر و بڕینی دەستی دزیکەر، و بە کۆیلەکردنی مرۆڤی نێر ومێ نەدەکردەوە، چونکە سەردەمەکە گونجاو بوو لەگەڵ بوونی ئەو حوکمانەدا. بەڵام هێشتا ئەو سەردەمەش خالی نەبوو لە شتی ئیحراجکەر، بۆ نمونە کاتێ وەکیعی کوڕی جەراح، کە بە ئیمامی سونە بوو و ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئیمامی موسڵمانانی کاتی خۆی بوو، و ابن معین دەڵێت: وەکیع ئەوزاعی زەمانی خۆی بوو ، الذهبي لە سير الاعلام دەربارەی دەڵێت: " وكان من بحور العلم وأئمة الحفظ . " ئەو زەریایەکی زانست و ئیمامێکی حافز بوو لە حەدیس، مامۆستای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و شافیعی و اسحاق بن راهویە و عبدالله بن المبارك و وعلى المديني بوو، ئەو وەکیعە لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید لە البهي یەوە لە ساڵی ١٨٥ هیجری لە مەککە حەدیسێکی گێرایەوە کە پاش وەفاتی پێغەمبەر د.خ ولەبەر نەناشتنی بۆ شەو و ڕۆژێك، جەستەی ئاوسابوو وپەنجەکانی چەمابوونەوە، قوڕەیش هەستیان بە ئیحراجیەکی زۆر کرد و سێدارەیان ئامادەکرد بۆ لە سێدارەدانی وکیع، ئەگەر سفیان بن عیینة نەبوایە کە بەرگری لێکرد وگووتی: الله، الله ئەوە فەقیهی خەڵکی عێراق و کوڕی فەقیهی عێراقیشە، دەنا دەیان کوشت!
لە مەککەش عبد المجيد بْن عَبْد العزيز ابْن أَبِي رواد فەتوای کوشتنی دەرکرد، گووتی ئەوە دڵی پڕی بوغزە بۆ پێغەمبەر! تاوانی غێرانەوەی حەدیسێک بوو کە لەگەڵ وێنەی ئیمانی عاتیفی موسڵمانانی ئەو کاتە زوەش نەدەگونجا و هەستیان بە ئیحراجی کرد، چۆن دەبێت جەستەی پێغەمبەریش پاش مردن بئاوسێ وەك مرۆڤی تر؟ !
وەکیع دەڵێت: بۆیە خوا لاشەی پیغەمبەری وا لێکرد، چونکە هەندێك لە ئەسحابەکان دەیان

گووت نامرێت، خوا حەزی کرد ئایەتی مەرگیان نیشان بدات، لەوانەش عومەری کوڕی خەتاب! کە سکاڵای لێدەکەن لای هارون ڕەشید، ئەویش پرسیار لە سفیان دەکات ئایە موستەهەقی کوشتنە؟ سفیان دەڵێت: نەخێر کوشتنی لەسەر نییە، حەدیسێکی گوێ لیبوە و گێڕاویەتیەوە، مەدینە شارێکی زۆر گەرمە، پیغمبەر د.خ دووشەممە مرد، لاشەکەی مایەوە تا شەوی چوارشەم...لەبەر ئەوە لاشەی گۆڕانی بەسەرداهاتوە! یانی سوفیانیش باوەڕی بە ڕوداوەکە بوە.

حَدَّثَنا وَكِيعٌ ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ ابْنِ أَبِي خَالِدٍ ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْبَهِيِّ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا مَاتَ لَمْ يُدْفَنْ ، حَتَّى رَبَا بَطْنُهُ وَانْثَنَتْ خَنْصَرَاهُ ، قَالَ قتيبة : حدث بهذا الحديث وكيع ، وهو بمكة ، وكانت سنة حج فيها الرشيد ، فقدموه إليه ، فدعا الرشيد سفيان بْن عيينة ، وعبد المجيد بْن عَبْد العزيز ابْن أَبِي رواد ، فأما عَبْد المجيد ، فقال : يجب أن يقتل هذا ، فإنه لم يرو هذا إلا وفي قلبه غش للنبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فسأل الرشيد سفيان بْن عيينة ، فقال : لا يجب عليه القتل ، رجل سمع حديثا فرواه ، لا يجب عليه القتل ، إن المدينة أرض شديدة الحر ، توفي النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يوم الاثنين ، فترك إلى ليلة الأربعاء ؛ لأن القوم كانوا في صلاح أمر أمة مُحَمَّد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، واختلفت قريش والأنصار ، فمن ذلك تغير.
تاريخ دمشق ابن عساكر

ئەو حەدیسە لە زۆر سەرچاوە ی ئیسلامیدا هاتووە، دوایی هەر لەبەر ئەو ئیحراجیە، موحەدیسەکان تێی کەوتن بە تەزعیف کردنی و دیتنەوەی دەیان عیللەت تێیدا!

لە سەردەمی نوێدا پاش ئەوەی مرۆڤایەتی گەشەیەکی زانستی و فیکری وعەقڵی زۆر گەورە و بێ شوماری بە خۆیەوە دیت، ڕوبەری پرس و پرسیارە ئیحراجەکان فراوانتر بوون، رووبەری تەساموح و زانیاری دینی شێخ ومەشایخەکانیش هەر وەك بەر لە هەزار ساڵ مایەوە بۆیە، کاتێ ڕوو بە ڕووی پرسیارێکی موحریج دەکرێنەوە، نازانن وەك مرۆڤێکی ئاسایی بابەتیانە وەڵامی دەنەوە. لە جیاتی ئەوەی چارەسەری گونجاو و ئالیات و میکانیزمی نوێ بۆ ئەو کێشە نوێیانە ببیننەوە، پەنا دەبەنە بەر جوێن وهاوارکردن و جەماوەری عاتیفی وروژاندن، ودابەزاندنی عەزاب و خەشمی خوایی. دەربارەی بابەتێکی وەك کۆیلایەتی و [ ما ملکت ایمانکم ] بۆ نمونە بە چەندین شێوە گوزارش لەو ئیحراج بوونە دەکرێت لەلایەن شێخ ومەشایخی ئیسلام، و دیندارانی ئاسایی.

لە ڤیدیۆیەکی بەسمە وەهبە دەربارەی [ما ملکت ایمانکم[!!

پێشکەشکاری بەرنامەکە بەسمە وەهبە بابەتەکەی تایبەت کردبوو بە کۆیلایەتی و کەنیزە لە

ئیسلامدا، هەر لە سەرەتاوە دەپرسێت ئەو بابەتە چۆنە، ئیسلام تاوانبار دەكرێت بە هاندانی كۆیلایەتی و ئەسحابەكان خەریكی كەنیزە وڕابواردنی سێكسی بوون لە گەڵیان، ئێوە دەڵێن چی؟!
شێخ موبارەک بە توڕەیی دەڵێت ئینشاڵلا خوا تەمەنمان دەداتێ ئەو ڕۆژە دەبینین موسڵمان یەك ژن و پێنج، شەش، حەوت، هەشت ، نۆ كەنیزەی دەبێت!
شێخ جەمال قوتب گوایە زانایەكی ئەزهەرییە هەر لە سەرەتاوە ناڕازییە لە باسكردنی بابەتەكە ودەڵێت: ئەوە بابەتی باس كردن نییە؟! و بابەتی وەڵامدانەوە نییە؟! تانەدانە لە پێغەبەر،دوایی بە بیانووی كەمی كات دەڵێت ناكرێت لە یەك ئەڵقە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە!
پێشكەشكاری بەرنامەكە دەڵێت: ٩٠% لە ڕۆڵەی موسڵمانان بە منیشەوە لە هۆكاری حەڵالكردنی كەنیزە تێناگەین، وناشتوانین هەرسی كەین بە ڕاشكاوانە پێت بڵێم!
شێخ جەمال قوتب ئیحراج بوونی دەگاتە لوتكە و دەڵێت: هیچ پێویست ناكات تێبگەن و هەرسی كەن!
https://www.facebook.com/hariri66/videos/vb.592866807/10153840717131808/?type=2&theater
هەتا شێخ محمد رمضان البوطي، كە لەناو شێخانی دین، لوتكەیەكە لە عەقڵانیەت و میانڕەوی، كە زنجیرەی [ما ملكت ایمانكم] دەركەوت لە تەلەفزیۆن، گووتی: پەتایەكی ترسناكی بینی سەبارەت بەو زنجیرەیە لە ئاسماندا دابەزی، وەك پنتی شیرپەنجەی پیس و قێزەون، ئاژەڵێكی زۆری لێ جیادەبوەوە باڵەفڕكییان دەكرد و بەخێرایی بڵاودەبونەوە لەسەر دیمەشق، من زانیم میكرۆبی پەتایەكی ترسناكن لە وڵات بڵاودەبنەوە!"
من خۆم زنجیرەكەم دیت، تەنها ڕۆژمێری جیهادیەكی تیرۆرست بوو، نازانم بوتی، بۆ وەك كاهینێكی سەردەمی عەقلیەتی مناڵكارانەی ئادەمیزاد خەڵكی دەترساند پێی؟! یانی خوا ڕازیە پەنجا ساڵ دیكتاتۆریەتی ئەسەد خەڵک داپلۆسێت، بەڵام لەبەر دەستەواژەی ماملكت ایمانكم عەزابی گەورەی خۆی ڕەواندەكاتە سەر خەڵك؟! ئەوە چ وێنەیەكی خۆپەرستانەی دزێوە بۆ خوا؟! دەزانم كێشەكەی بوتی هەمووی ئیحراج بوون بوو لە خودی ما ملكت ایمانكم!
http://www.aksalser.com/?page=view_news&id=cd8fdf2730b11f65ca915353d84bc7b8
كاتێ لە حزبە ئیسلامیەكان دەپرسیت: ئەگەر دەسەڵاتتان گرت چی دەكەن؟! لە وەڵامدا

دەڵێن: بێگومان شەریعەت جێبەجێ دەکەین، کە دەپرسیت هەموو شەریعەت دەڵێن بەڵێ نابێت [تؤمن ببعض و نکفر بعض] بکەین. دەیباشە یانی هەموو سزاکانیش دەکەن وەك دەستبڕین و ڕەجمی زیناکەران، و کوشتنی هەڵگەڕاوەکان، شەلاق لێدان و دەست وپێ بڕینی دوژمنانی خوا! و جەلدە لێدانی عەرەق خۆر و لە بینایەی بەرز تێهەڵدانی هاوڕەگەزبازان و هتد؟ یەك وەڵامی ڕاشکاوت نادەنەوە لەبەر ئیحڕاج بوون، نە دەوێرن بڵێن نەخێر لەبەر جەماوەریان، نە دەوێرن بڵێن بەڵێ لەبەر ئەو ئیحراجیەی ئەو ئەحکامانە دروستیان دەکات لە کۆنتێستی ژیاری سەردەمی نوێدا!
دەستەیەکیتر هەر لەبەر هەمان ئیحراجیدا، هاتوون دەریچەیەکی سەیریان دۆزیوەتەوە، ئەویش پەنا بردنە بۆ نکوڵی لێکردن و سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی زاراوەکان و ماناکان! ئەوانە زیاتر قورئانیەکان و کەسانیتریشن، هێندە متمانە نیشان دەدەن بەڵام لەبەرامبەر گفتوگۆی جیدی خۆیان پێناگیرێت، دەزانم خەڵکی باش و نیەت پاکن، دەیانەوێت دین دوورخەنەوە لە هەموو شتێکی دژ بە مرۆڤایەتی و نالایق، هاتوون وێنەیەکی زیهنی زۆر میسالیان بۆ دین داتاشیوە، ئەوەی بەدەر لە قورئانە لەو هەموو حەدیس و تەفسیر و فیقە و سیرە و مێژوو و علومی قورئانیش نکوڵی لێدەکەن، هەر ڕوداوێکی هەتا متواتر بێت ڕەتی دەکەنەوە و دەڵێن لە قورئاندا نەهاتووە.
باشە قەیناکا، بەڵام کە دێنە سەر قورئانیش. لەبەرئەوەی قوڕسە قورئان ڕەتکردنەوە، ئەوجارە سەرلەنوێ چەمك وزاراوە و ماناکانی کە هەزار و چوارسەد ساڵە ئومەت لەسەری ڕێککەوتوون، ئەوان نکوڵی لە ماناکانی دەکەن هەتا بەدیهیترین ماناش بێت وەك بۆ نمونە دەڵێن: اقطعوا ایدیهما، مانای دەستیان ببڕن نییە!
ماملکت ایمانکم، ملك الیمین کە هەتا ساڵانی ١٩٤٥ یش لە هەموو وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان هەبوو، دەڵێن بە مانای کۆیلەکردن نایەت!
کە دێنە سەر ئایەتی: [والذین هم لفروجهم حافظون الا علی ازواجهم او ماملکت ایمانهم فانهم غیر ملومین] ئەوانەی دامێنیان دەپارێزن تەنها لە ژن و کەنیزەکانیان نەبێت] دەڵێن نەخێر وانیە دەبێت بە زەواج و هاوسەرگیری لەگەڵی بخەوێت، سەرەڕای یەك چیا لە توراسی کۆیلایەتی و دەستور وئادابی کۆیلەداری! بەو شێوەیە بۆ هەموو باسێکی ئیحراجکەر وەڵامێکیان پێیە، بەشێوەیەکی نا ئیرادی پاکسازی دین دەکەن، لەبەر ئیحڕاج بوون.
سەیرم بەو کەسانە دێت لە جیاتی خوا ئیحراج دەبن؟! ئەگەر ئەو دەقاەی لێی ئیحراج دەبن

دینی خوایە، بۆ ئیحراج دەبن لە جیاتی خوا؟! کە ئیحراج دەبن مانای ئەوەیە یان دینی خوا نییە، یانیش ئێوە نازانن چۆن ڕەفتار بکەن لەگەڵ دینی خوا.

محەمەد هەریری

٢٠١٥/٩/٤

# ئەرستۆ وەك دامەزرێنەری فەلسەفەی چەوسانەوە و نزمێتی ئافرەتان

بیروڕاکانی ئەرستۆ زۆر قوول چۆتە ناو فەرهەنگی ئایینی جولەکە و مەسیحی و هەتا ئیسلامیش بە شیعی وسونیەوە.

ئەو بیروڕایانەی بە دەگمەن نەبێت فەیلەسوف وزانای ئایینی وشاعیر وئەدیبێک لە دەستیان ڕزگاریان نەبووە، بەڵکو ئەو تیۆرە باڵادەست بوو لە فیکری خۆرئاواییش بۆ ماوەیەکی زۆر، تا ئێستاش لەسەر ئاستی گەلێری بەردەوامە. من خۆم کاتێ بیروڕاکانی زانایانی حەدیس وتەفسیر وفیقە دەخوێنمەوە هەست بە کاریگەری فەلسەفەی ئەرستۆ دەکەم بەسەر زانا ئیسلامیەکان کە لەڕێی بڵاوبونوەوەی ئەو بیروباوەڕانە لە نێو عەرەبی پێش ئیسلام و دوایش لە ڕێی وەرگێڕان و سەرچاوەکانی ئەهلی کیتابەکان دزەیان کردە ناو کایەکانی فیکری ئیسلامی .

هەمووومان دەزانین کە لە فەرمودە جۆرێك هەیە بەناوی ئیسرائیلیات کە بریتین لەو حەدیسانەی زانایانی جولەکە پاش موسڵمان بوونیان بەرگی ئیسلامیان بەبەر کرد! هەندێکیان ئاشکرا کران، بەڵام زۆریشیان دزەیان کردە ناو حەدیسەکان بی ئەوەی کەس هەستیان پێ بکات. بە هەمان شێوە کاریگەر مەسیحیەتیش هەر هەبوو تا ڕادەیەك بەسەر حەدیس لە ڕێگای سەحابەکانی کە لە پێشوودا مەسیحی بوون .گرنگترین تێروانینی ئەرستۆ دەربارەی ئافرەت ئەوانەن- :

سروشت بەرپرسیارە لە بەهرەدارکردنی نێر [پیاو] بە پیویستیەکانی حاکمێتی و فەرمانڕەوایەتی، وپێدانی پێویستیەکانی مەحکوم وبەرفەرمانیەتی بە مێ ]ئافرەت[. واتە پەیوەندی ژن و مێرد وەك پەیوەندی حاکم ومەحکومە. ئەوەش قەدەر وچارەنووسە، و حاڵەتێکی سروشتیە، وەك پەیوەندی [کۆیلەدار بە کۆیلە[، ئافرەتان بە سروشت نزمترن لە پیاو، ئەرکیان خزمەتکردنی پیاوانە، بۆیە ئاساییە کە پیاوە حوکمیان بکات، ئەو هەموو ئەرک و بارودۆخ و پێگە و پایانەش بە سروشتە نەك بە داب و نەرێت !

ئەرستۆ دەڵێت: پێکگاتەی جەستەیی بڕیار دەدات کە سەرۆکایەتی و باڵادەستی بۆ پیاوە، و گوێڕایەڵیش بۆ ئافرەت و کۆیلەیە" - ئەرک وفەرمانی یەکەمینی مێ مناڵ بوونە، بۆ پاراستنی تۆرەمە ونەوەکان دروستکراوە، ئەوەش هۆی سەرەکی بوونییتی. مێ بوونەوەرێکە بە تایبەتمەندی نزمێتی و نێگەتیڤی، لەکاتێکدا نێر تایبەتمەندی بەرزێتی وپۆزەتیڤی هەیە، دەبێت

مێ ملكەچی حوكم وفەرمانی پیاو بێت كە سروشت بەهرەداری كردوە بۆ ئەو ئەركە.

پیاو لەسەریەتی بیربكاتەوە وبڕیاربدات و بەڵگە بهێنێتەوە، بەڵام مێ تەنها دەفرێكە [وعاو] بۆ ئەوە !

-جیاوازییەكی بایۆلۆژی هەیە لە نێوان نێر ومێ، وادەكات كە بڕی گەرمایی لە خوێنی پیاو زیاتر بكات لە خوێنی ئافرەت، ئەو زیادەیەش پەیوەندی هەیە بە زیادی هیزی دەروونی پیاوەكە، لە ئەنجامدا پیاو لەسەر ئافرەت زاڵە لە ڕووی هێزی بلیمەتیە دەروونیەكان.

- ئافرەت لە پیاو كەمترە لە ڕووی عەقڵ وزیرەكیدا، لە بواری بەها و ڕەوشتیشەوە، ڕەوشتی تایبەت بەخۆیەوە هەیە، كە جیاوازی لە ڕەوشت وبەهای پیاو، وەك ئەنجام زاڵبوونی پیاو بەسەر ئافرەت بابەتێكی زۆر ئاساییە.

- مرۆڤ لایەنی عەقڵی و نا عەقڵی تێدایە، لە پیاودا لایەنی عەقڵی زاڵە، بەڵام لای ئافرەت لایەنی نا عەقلانی زاڵە، ئەوەش بڕیاری سروشتە .

-ژنی چاك دەبێت دەست بە خەرجیەكانی ماڵدا بگرێت، و هەڵەخەرجی نەكات لە بایەخدان بەشتی جوانكاری وڕازاندنەوە، پێویستە هەموو داواكاریەكانی پیاو جێبەجێ بكات وەك یاساگەلیك خودا سەپاندبێتی .

]ارسطو والمرأە، امام عبدالفتاح ]ئەو بیرروباوەڕانە دەتوانم سەدان نمونەی بۆ بهێنمەوە لە ئایینی جولەكە و قسەكانی باوكانی مەسیحیەت، و بەڵكو دزەی كردۆتە ناو ئینجیلەكانیش. هەمان ئەو بیروڕایانە لە هەموو تەفسیرەكانی قورئان بەدیدەكرێت هەتا لە تەفسیرە نوێكانیش، و هەروەها لە حەدیس و فیقە و هەموو زانستەكانی پەیوەست بە ئایین.

لەسەر ئاستی خەڵكیش هێندەی ئەو بیروڕایانە لەسەر مینبەرەكان و لە بەرنامە دینیەكان بگوترێتەوە، زۆر خراپ بەناو خەڵكی ئاساییش بڵاوبۆتەوە، بۆیە سەرەڕای ئەوەی ئەرستۆ مەزنترین فەیلەسوفی مێژووە، بەڵام بەڕای من دامەزرێنەری فەلسەفەی چەوساندنەوەی ئافرەتیشە، چونكە كەس بەرلەو بەو شیوەیە سیستماتیكە عەقڵیە بیناغەی چەوساندنەوە و بە نزم سەیر كردنی ئافرەتی دانەناوە، سەرەرای ئەوەی كە ئەرستۆ دوو جار ژنی هێناوە، لە هەردوو جاریشدا زۆر بەختەوەر بووە لە ژیانی خێزانی و وەسیەتی كردوە لە تەك ژنی یەكەمی بنێژرێت، وكچەكانی زۆر خۆش ویستوە ! ٢٠١٥/٥/٢٣

## خۆپێشاندانی ملیۆنی پاریس وهەلێکی تری لە دەست کورد دەرچوو!

کورد فێرە فورسەتی چاك و مێژوویی لەدەست بدات، لە زۆر بۆنە هەوڵی ئەوەمان داوە و خەڵکانیکی زۆر ویستویانە ئاگاداریان کەنەوە، بەڵام بێ سوود بوە، ئەوانە تەنها گوێ بۆ ئەو چەند کارمەندە مفتەخۆرە دەگرن کە ناوێر هەتا پێشنیاریکیان بۆ بکەن بۆ بەرژەوەندی میللەت، چونکە خۆیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان لەو شوێنەدان!

ئەگەر سەرنوسەری گۆڤارە فەرەنسیە هێرش بۆ سەر کراوەکە دوا وتاری بۆ پشتگیری کورد نووسیبێت، ئەگەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی شەڕی نەگریسی داعشی خستۆتە کۆڵی کوردەوە، جیا لەو هەموو هێزە نیزامیانەی وڵاتان، ئەگەر کورد لە دنیادا باسی ئازایەتی وجوامێری دەکریت لە سەری تیرۆرستان، باشە بۆ کورد بە وەفدێکی باڵاوە بە سەرۆکایەتی هەرێم یان وەزیران یان هەر نەبێت پەرلەمان بەژداری نەکرد لەو بۆنەیە سیاسیە گەورەیە کە پەنجا سەرۆک و سەرۆک وەزیران بەژداریان تێدا کرد؟! ئەحمەد داود ئۆغڵۆ بەژداری بکات بەو شۆڕەتە زڕاوەوە، کە سەرۆکی فەرەنسا پۆرتی باوکیشی شکاند، و وەک میوانێکی ڕەزاقورس مامەڵەی کرد، کەچی کورد ڕۆژانە بەرپرسانی ئەوروپا سەردانی هەولێر دەکەن، سەبارەت بە شەری داعش، بەژدار نەبیت بە کەسیکی دیار؟! هەرنەبا کاکەی فەلاح تان ناردبا!

هێشتا خوشك و برایانی کوردی تورکیا زیرەکتربوون و لەیلا زانا و سەلاحەدین دەمیرتاش بەژداربوون و توانیان تارادەیەك سەرنجی خەڵك بۆ دۆسیی سێ کچە شەهیدەکەی کورد لە پاریس ڕاکێشن! بەڵام دەبوایە تەرکیزیان لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی کورد بە داعش کردبا، نەك کەیسێکی وا، هەرچەندە ئەویش گرنگە.

سەرۆکەکانی ئێمە بە قەد محمود عەباسی فەلەستین یشیان تێدا نەبوو، کە لە دژی ناتانیاهوو خۆی گەیاندبووە ڕیزی یەکەمی سەرۆکەکان وتا کۆتایی لە تەك مێرکل بوو؟!

بەڕاستی پیاو نازانێت ئەو دەزگایانە چۆن بەڕێوە دەچێت، دەچنە سەیران وسەردانی شۆپینگ و بازارکردن، لە کاتە کارەساتاویەکان، بەڵام بۆ بۆنەیەکی واگرنگ نەبایان دیوە و نە باران!

محەمەد هەریری ٢٠١٥/١/١٣

## تەنها ئاڵای عێراق هێمای ڕژێمی بەعس نییە

کەس نییە لەو کوردستانە پشتگیری لە هەڵوێستی سەرۆک بارزانی نەکات دەربارەی ئاڵای عێراق، ئەو ئاڵایە دزێوەی لە سایەیدا بەشی هەرە گەورەی تەمەنی سوتاندین بەبآ هودە، وسەدان هەزاری لێ کوشت وقڕ کردین، وتەنها بۆ چاوبەست کردنی خەڵکی ساویلکە ونەتەوە پەرەستی وئیسلامی عروبەتی دەستەواژەی (الله اکبر)لەسەر نوسراوە. لەسەر ئاستی کەسێتیدا چەندین جار ڕوبەرووی ئەو پرسە بومەتەوە لە چەندین هەڤپەیڤینی تەلەفزیۆنی عەرەبی وبەهەمان مەنتیقی سەرۆکی هەرێم بەرگریم لەو هەڵوێستەی بەڕێزیان کردوە، کە هەڵوێستی هەموو کوردێکی پاک ودروستە. بێگومان ئەو باسە لە هەموو بەرنامەیەکی سیاسی تایبەت بە دۆزی کورد لە میدیاکان دەوروژێنرێت، هەتا لە چاوپێکەوتنەکانی سەرۆک بارزانیش ئەو پرسیارە سواوەی دوبارە وسآ بارە لێدەکرێتەوە، هەر چەندە وەڵامەکەیشی گەلێک ڕوون وئاشکرایە کەچی میدیا وعەقڵیەتی عەرەبی بۆیان هەرس ناکرێت، وهەردەم دۆڵی شێواندن وتەحریف کردنی بۆ لێدەدرێت لە میدیا عەرەبیەکان.

بەو دواییە بە بۆنەی خۆ ئامادە کردن بۆ میوانی کردنی کۆنگرەی یەکێتی پەرلەمانتارەکانی عەرەب لە هەولێری پایتەخت لە سەرەتای ساڵی نوێدا، وناردنی سەرۆکی هەرێم نامەیەک لەو بارەیەوە بۆ هەر سآ سەرۆکایەتیەکان (سەرۆکایەتی کۆماری، ووەزیران وئەنجومەنی نیشتیمانی) ئەو کێشەیە جارێکی تر وروژێنرایەوە. بەڵام وروژاندنی ئەو جارەیان لە بەرژەوەندی کورد نەبوو لە سایەی ئەو بارودۆخەی دۆزی کورد پێی تێپەڕ دەبێت، وەک هەڕەشەکانی تورکیا وبۆردومان کردنی خەڵکی مەدەنی وگوند نشینەکان، وسوار بوونی داشی عەرەبەکانی عێراق لە حکومەت وسەر ئەرزی واقیع، ودەسی دەسی پێکردنی مادەی 140 ودواخستنی، وهەوڵەکانی حکومەتی عێراق بۆ خۆ پڕ چەک کردن، کە هەندێکیمان لە میدیاکان بەرچاو کەوت.

پێم وایە لە بنچینەدا قبوڵ کردنی بەستنی کۆنگرەیەکی وڵاتانی عەرەبی لەسەر خاکێکی کوردی ئەگەر عێراقیش بێت هەڵەیە، چونکە ئەوە جۆرێکە لە دان هێنان بەوەی کە کوردستانی عێراقیش بەشێکە لە نیشتیمانی عەرەبی، وەک عەمرو موسای ئەمینداری گشتی کۆمکاری عەرەبی لە ناو پەرلەمانی کوردستان گوزارشی لێکرد زۆر بوێرانە. دووەم هەڵنەکردنی ئاڵای عێراقی یدام حسین لە کاتی بەستنی کۆنگرەکە ئیحراجێکی گەورە

دروست دەکات بۆ حکومەتی هەرێم وهەلێکی زێرینیش دەداتە دەست میدیا عروبیەکانی ئەو هەموو وڵاتە عەرەبیانە ومیدیای تریشی وەک جەزیرە وبەغدادیە وشەرقیە وموستەقیلە هتد.. بۆ زیاتر شێواندنی مەسەلەکە، وزیاتر چەواشە کردنی بینەری عەرەبی.

وابزانم ئەو نامەیەی بەڕێز سەرۆکی هەرێم بۆ پەرلەمانی عێراقی کاریگەری نابێت لەسەر ئەو پەرلەمانە حوسێنییەی کە نیوەیان زیاتر خەریکی حەج کردنن ونیوەشیان هەر لە ئەساسدا رۆژێک هەن وده نین، بۆیە چاکتر وایە لە جیاتی ئەو کێشەیەی ئاڵا زیاتر تەرکیز بکرێتە سەر کێشە جەوهەریەکان، وەک چارەنووسی کەرکوک، وپتەوکردنی بەرەی ناوەخۆ، وتەگەرە خستنە بەردەم تەسلیح کردنەوەی حکومەتی عێراق، یان هەر نەبێت داریکردنی بەشی حکومەتی هەرێم لەو چەکانە وچەندین پرسی گرنگتر.

شتێکی تر، سەرۆکی هێژا چاک دەزانێت کە تەنها ئاڵای عێراق هێمای بە جێماوی بەعس نییە لە کوردستان، فایلدارەکان هێمای بە جێماوی بەعسن، بەرپرسێکی سەردەمی بەعس وئێستاش کەوەک ئەو سەردەم بۆی چۆتە سەر هێمای بەعسە، ئەندام پەرلەمانێکی عێراق کە لەسەردەمی ئەنفال وکیمیا باران کردندا ڕاوێژکاری ێدام بوو هێمای سەردەمی بەعسە، دیاردەی نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردی، وبەزمی سۆرانی وبادینی هێمای سەردەمی بەعسە کە سیاسەتی (هاوکاری) و (بزاڤ) ی پەیڕەو دەکرد، وچەندین دیاردە وکەس وشتی تر هێمای سەردەمی بەعسن، هەمووشیان زۆر زیان بەخشن، ئاڵای عێراقی بەعس کە تەنها پارچە کوتاڵێکە وابزانم لە هەموویان زیانی کەمترە، ئەگەریش بمانەوێت قەڵاچۆی هێماکانی بەعس بکەین با سەیرێکی دەوروبەری خۆمان بکەین ئەوسا دەبینین چۆن هێماکانی بەعس تێکەڵ بە هەموو ژیانمان بوون، وەک هەوا بە سییەکانماندا گوزەر دەکەن.

ورشەی بیر لە

# ترس لە دەستبڕین هەر لای دز نییە!

ئەو ڕستەیەی کە لە دەمی کاك خلیل ئیبراهیم، دەرچوو وەك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامی، کە باسی دەستبڕین کرا وەك سزایەکی توند وناگونجاو، لە جیاتی ڕەواندنەوەی گومانەکان و ترسەکان وەك هەر سەلەفیەکی دەقپەرست رەپ وڕەق گووتی: دەستبڕین سزایەکی خودایە، تەنها ئەو کەسانە دەترسن لە دەستبڕین کە دز بن! لە دەیان کتێبی ئیسلامی و وتار گوێم لێبوە، هێندە داهێنەرانە نەبوو.

کێشەکە ئەوە نیە لای کەسانێك نابێت دەستبڕین هەبێت چونکە دەسەڵاتدارەکان ڕزگاریان دەبێت و دەستی هەزارەکان بەبردرێت! کێشەکە پرەنسیپە. بە واتایەکی تر کێشەکە هەر پەیوەست نییە بە دەستبڕین، بەڵکو هەموو سزاکانی ئیسلام و قورئان دەگرێتەوە. یانی ئەگەر دەستبڕین هەبوو، دەبێت دەست وپێش پیکەوە لە بن هەنگڵەوە ببڕین وەك سزای موحارەبەی خوا و پێغەمبەر، و سزای جەڵدە لێدان لە زیناکەر لە بەرچاوی خەڵك و چەندین سای تر بەپێی قورئان. ئەگەر بێینە سەر سونە، ئەوە دەبێت زیناکەرانی ژندار و مێرددار ڕەجم بکرێن، دەبێت کاری نیربازی بکوژرێن و بسوتێنرێن، یان لە بەرزترین بینایەی شار فڕێدەرێنە خوارەوە و سوتان بە زندی و خنکاندن و چەندین سزای تر هاتوە لە سونە وفیقهدا.

جارێکیتریش باسی ئەوەم کردوە، ئیخوان بە گشتی لە ژێر وتاری تەشریعی و عەقیدی سەلەفیەت رزگاری نەبووە، بەردەوام چارەسەرەکانی ئەوان دەبینن بۆ کۆمەڵگای هاوچەرخ، کاتێکیش ڕەخنەیان لێدەگریت بە خۆیان دێنەوە و دەزانن چ هەڵەیەکیان کردوە، دیسان هەوڵی خۆ ڕزگارکردن دەدەن لە هەڵەکان، بە هێنانەوەی عوزر و بیانوو. بەڵام کە بە بێ خۆ ئامادەکردن قسە دەکەن، ئەو شتە دەڵێن کە لە دڵیاندایە. ئەوەش لەبەر نەبوونی خوێندنەوەی تایبەت بە خۆیانە بۆ مەنهەجی عەقیدی تەشریعی.

بە نیسبەت ڕەفتارکردن لەگەڵ ئەو دەقانەی سزادان کە ئاماژەمان پێکرد، هەر کەسە و بە جۆرێك دەیەوێت خۆی لە ئیحراجی ئەو سزایانە رزگار بکات. تەنها سەلەفیەکان بەبێ گوێدانە هیچ ئیعتیباراتێکی سەردەم دەست بەو سزا و دەقانە دەگرن، بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە جێبەجێ دەکەن، بێ گوێدانە سەردەم و زەمەن و گۆڕانی ژینگەی سارستانی و عەقڵی. کەسانێکیش هەن وەك قورئانیەکان [کە تەنها باوەڕیان بە دەقەکانی قورئانە بە تەئویلی خۆیان] وەك پێشەی هەمیشەییان نکوڵی دەکەن لەوەی ئەو ئایەتە بە مانای دەستبڕین بێتەوە:

"وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (38) )" ألمائده (هەر لەو وشەیەش واناکەن، بەڵکو لە مەسەلەی ملك اليمين و شتیتریش بە پێچەوانەی هەموو زانستی تەفسیر و حەدیس و عەرەبی دەڵێن َاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا مانای دەستیان ببڕن نییە، گوایە وشەی القطع بە مانای تری زۆر هاتوە، بە مانای ڕێگەگرتن و نەهێشتن! بەوە خەنی

بوونە كە لە سورەتی یوسف دا هاتوە:[ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ] (یوسف:31)

كاتێ خانمەكان یوسف یان دیت دەستیان بڕی لەبەر جوانی یوسف، گووتیان ناشێت ئەوە مرۆڤ بێت...! دەڵێن خۆ ژنەكان دەستیان لێنەكردەوە بە دیتنی یوسف؟! كەوابوو قطع مانای بڕینی لێكجوداكەرەوە ناگەیەنێ! ئەو بەڵگەیە وبەڵگەی تریش زۆر لەوە لاوازترن خۆیان بگرن بەرامبەر ئەو ئایەتە ڕاشكاوەی دەستبڕین. لە كوردیش بە بڕینی لێك جوداكەرەوە و بڕینی دەست وەك زامدار كردن هەر دەڵێن دەستبڕین. لە عەرەبیش هەروایە..بێگومان وشە زۆرجار لە سیاقی قسە مانای دەگۆڕێت، بەڵام زانایانی زمانی عەرەبی هەر خۆیان ئاماژەیان بۆ ئەو مانایانە كردوە.

هەروەها دەڵێن زانایانی وەك بوخاری و موسلیم و زمەخشەری و ترمذي و ابو داود و النسائي عەرەب نەبوون و لە مانای َاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا تینەگەیشتوون وەك عەرەبێك؟!

باشە ئەی شافیعی و مالیک و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل خۆ عەرەب بوون هەر واش تێگەیشتوون؟ !ڕاستیەكەی من هەموو ئیجتیهادێكی قورئانیەكان ڕەت ناكەمەوە، زۆر بیروڕای جوانیشیان هەیە لە دووبارە تێگەیشتنەوە لە قورئاندا، بەڵام ڕەتكردنەوەی مانای بەدیهی و كە هەموو سەرچاوە و مێژوو و واقیع كە لەسەری ڕێككەوتوون ئاسان نییە. من تێیان دەگەم ئەو ئیحراجیە لەبەر ڕوحی سەردەم، پێشان موسڵمانان بەر لە سەدساڵیش هەستیان بە هیچ ئیحراجیەك نەدەكرد وەك داعشیەكانی ئیستاش چونكە لە دەرەوەی مێژوون، باسی دەستبڕین وسەربڕین و ڕەجمكردنی زیناكەر و ئەو سزا توندانە بكەن، چونكە سەردەمەكە لێیانی قبوڵ دەكرد، بەڵام هیچیتر زۆر لەو ئەحكامانەی كە بەڕای من لە ئەساسدا وەك مەرحەلی هاتوون و وەك وەڵامدانەوەی داخوازیەكانی ئەو كات و سەردەمە، وەڵامی دروست نین بۆ چارەسەری كێشەكانی ئەو سەردەمە. لە وڵاتان ئەوەی دەستێكی براو بێت یان پێیەك، دەوڵەت هەموو مەسروفاتی خۆیی ومنداڵەكانی دەكێشێت، با لە كاتی دزینیش وای بەسەر هاتبێت! ئەگەر دەستی دز ببرابایە بەخێرایی، ئەوە دەستی زەرقاوی و عەنتەر زەوابری و حەتاب و زۆر لە سەركردەكانی جیهادی سەلەفی دەبوایە ببرایە، چونكە ڕابردوویان زۆر پیس بوو لە تاواندا! بەڵكو لەو باوەڕەدا بووم زۆر لە شەڕكەرانی داعشیش دەبوایە بێ دەست بان، كە كاتی خۆی خەڵكی دز و جەردە وبێ رەوشت بوون، بە كاریگەری سۆزداری هاتونەتە ناو ئیسلامێكی گونجاو لەگەڵ ئاڕاستەی توندوتیژیان!

جاریكیتر دووبارەی دەكەینەوە وەك دەزانین قورئان لە ٢٣ ساڵدا دابەزیوە، ١٣ ساڵی لە مەككە، و ١٠ ساڵی مەدینە، لەو دەساڵەی مەدینەدا كە ئایەتەكانی ئەحكام و معاملات دابەزیوە، چەندین ئایەت بە ڕای زۆربەی زانایانی ئیسلام نەسخ كراوەتەوە لە پێناو گۆڕانی

واقیعدا و هێنانەدی بەرژەوەندی موسڵمانان، ماقوڵ نییە بە درێژایی هەزار وچوارسەد ساڵ هەموو ئەحکامەکان وەك خۆی بمێنێتەوە! ئایە مەرجە تەنها پێغەمبەر لە ژیاندا بێت تا نەسخ رووبدات، لە کاتێکدا زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئایەتانەی کە باس لە نەسخبوونی دەکرێت، دەقێکی ڕوون وئاشکرای لەسەردا نەهاتووە کە لە زەمەنی پێغەمبەر [د.خ [نەسخ کراوەتەوە، زیاتر ڕای ئەسحابە و ئیمام و فەقیهە گەورەکانی پاش وەفاتی پیغەمبەرە؟! کە نەسخ پاش وەفاتی پێغەمبەر [د.خ] بڕیاری لەسەر دراوە، ئەی بۆ تەنها کە نۆرەی سەردەمی ئیمە هات گووتیان نابیت دەست بۆ نەسخ ببرێت؟!

بەڕای ئیمە هێشتنەوەی هەندێك کێشەی زۆر هەستیار بەبێ چارەسەرێکی برەر و یەکلایی کەرەوە، ئەگەر باوەڕمان بە بێ سنووری زانستی خوا هەبێت بە رابردوو وئێستا وئاییندە، دەگەینە ئەو راستیەی کە خودا پرسگەلێکی وەك بۆ نموونە کۆیلایەتی و سزا توندەکانی وەك ڕەجم و دەستبرین و هتد، بۆ بژاردە و هەل ومەرجی موسڵمانانی جێهێشتووە بە پێی میکانیزمی جۆراوجۆری وەک، ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان، کە نەجمەدین تۆفی دۆزیەوە، هەروەها بۆ نەسخی زەمەنی کە ئێمە لە وتارێکی سەربەخۆدا باسمان کردوە . دەنا ماقول نییە موسڵمانانی جیهان شەرم لە باسی دەستبڕین و کۆیلایەتی وڕەجمکردن بکەن، خودا نەزانێت ڕۆژێکی وا بەسەر جیهاندا دێت کە ئەو چەند ئەحکامە مەرحەلیانە ئیحراج بۆ موسلمانان دروست دەکات!

ئیخوان و هەر جەماعەت و گروپێکی ئیسلامی سیاسی دەبێ بزانن، کە دەسەڵاتیان بەسەر شوێنێك شکا، و ئەو ڕۆژەی بەبێ منەت ئەو سزایانەیان جێبەجێ کرد، ئەوە جیهانیش هەمووی بە زۆربەی موسڵمانانیشەوە لێیان بێ منەت دەبن و دژایەتیان دەکرێت. بۆیە چاکترە ئەو باسانە بۆ سورپرایز و شەقی بەخت بەجێ نەهێڵن، باشترە توێژینەوەی وردی لەسەر بکەن. ترسی خەڵك لە دەستبڕین و سەربڕین و پێ بڕین لەبەر ئەوە نیە ئەوەی لەو سزایانە دەترسێت دزە یان تاوانبارە، بەڵکو لەبەر تووندی سزاکانە، کە هیچ جانسێکیتر نادەنە تاوانبارەکە بۆ گەڕانەوە لەو ڕێگایە خراپەدا. ملیۆنەها یاسازان و ڕۆشنبیر و بیرمەند لە دنیادا دژی ئەو جۆرە سزایانەن، ماقوڵە هەمووی دژ بن؟!

15-07-2015خەندان

# بۆ بانگەوازە دینیەکانی پێش ئیسلام بە جیهاد نەگەیشتن؟ !

محەمەد هەریری

ئەگەر ویستت میللەتێك لەبەر چاوی جیهان ڕەش کەیت جیهادیان پێ بکە! چونکە ئەو میراتە فیکری و دەقە زۆر وزەبەندانەی لەو بوارەدا بۆمان جێماوەتەوە تێکەڵی کەیت بە ئاوی زەریاش ڕەشی دەکات .لە ئەدەبیاتی ئیسلامی بە هەموو سەرچاوەکانیەوە یەك پارچە ستایش و پیاهەڵدانە بە جیهاد وموجاهیدان و پلەی گەورەی ئەوان لای خوا و ئەو پاداشتە گەورانەی بۆیانی ئامادە کردوە، و زۆر بە شێوازێکی لە ڕادەبەدەر وەسف وسەنای موجاهیدان کراوە.باشە ئەگەر وابێت و جیهاد ویستی خوای لەسەر بێت و هێندە کارێکی پیرۆز وبەرز بێت، بۆ ئەمڕۆ ئەو میللەتانەی کە خوا غەزەبیان لێ دەگرێت و کۆمەڵێك موجاهیدی ڕیشن و ڕیقن و بێ عەقڵیان بۆ دەنێرێت لە ماوەیەکی پێوانەیی کورتدا دەبنە یەکێك لە میللەتە هەرە قێزەونەکانی دونیا؟ !بڵێی کێشەکە هەر لە خودی جیهادەکە بێت یان لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنیدا؟!

لە ڕاستیدا کاتی خۆی کە جیهاد سەپێنرایە سەر موسڵمانان وەزیفەیەکی کاتی رادەپەڕانت ئەویش پاراستنی دەعوە و پێغەمبەر و خودی دینەکە بوو، هەتا سەقامگیربوونی قەوارەی موسڵمانان لە پاش شەڕی هەڵگەڕاوەکان، دەکرا لە پاش ئەو شەڕە کۆتایی پێ بێت، بەڵام تێوەگلانی ئیسلام لە مەسەلەی فتوحات، کە بەڕای من ئیجتیهادێکی هەڵە بوو سەد دەر سەد، وای لەو ڕوحیەتە جیهادیە کرد، کە من ناوم ناوە بە ڕوحی جەنگاوەری لە وتارێکی تردا، هەموو دینەکە بە بۆیەی جەنگاوەرێتی ڕەنگ بکات .نیتشە گاڵتە بە مەسیحیەت دەکات و بە دینێکی مێینە وەسفی دەکات، ئەگەر شارەزای ئیسلام با، بێگومان بە دیانەتێکی نێرینە و جەنگاوەر وەسفی دەکرد! کە بەڕای من ئەو جەنگاوەرێتیە ڕوحی پەیامی ئیسلامی خستۆتە ژێر سێبەری تۆخی لایەنە جەنگاوەریەکە.خوا ئەبو سوفیان و ئەبو جەهل و باقی سەرانی قوڕەیش بگرێت، ئەگەر لییان گەڕابا پێغەمبەر [د.خ] بە ئازادی دەعوەی خۆی بکات، بەو شێوەیە شەڕیان نەکردبا و شوێنکەوتانیان نەچەوساند بایەوە، هەرگیز پێغەمبەریش ناچار نەدەبوو هیجرەت بکات و عەشایر لە دەوری خۆی کۆکاتەوە و نیوەی زیاتری پەیامەکەی بۆ جەنگ و جیهاد تەرخان بکات !خۆ بەر لە پەیامی پێغەمبەر محەمەد [د.خ] کەسانێکیتر هەبوون خاوەن پەیام بوون، پێیان دەوتن حونەفاکان، هەندێ کەس دەڵێن پێغەمبەریش بوون! وەك [زید بن عمرو بن نفیل [کە دژی پەرستنی بت وسەنەم بوو، گۆشتی ئاژەڵێکی نەدەخوارد بۆ بت وسەنەم سەربڕابان، کچی لە زیندەبەچاڵکردن ڕزگاردەکرد، ئەرەق و گۆشتی بەراز و مردووی لە خۆی حەڕام کردبوو.

(بلوغ الأرب للبغدادي ج 2 ف, زيد بن عمرو (یەکیکیتر ناوی [قُس بن ساعدة] كه به وتاربێژی عەرەب ناسراو بوو، یەکەم کەس بووە باوەڕی بە زیندووبوونەوە و حیساب وکیتاب کردوە لە ناو عەرەب .قەسی کوڕی ساعیدە شەو ڕۆژ خەڵکی بانگ دەکرد بۆ دەعوەتەکەی هەتا لە بازاڕی عوکاز بە ئاشکرا بانگەوازی دەکرد بۆ دینەکەی هەتا دەڵێن پێغەمبەر دەربارەی وتوە: رحم الله قُساً، إني لأرجو أن يبعثه الله أمة وحده.. ڕەحمەتی خوا لە قەس بێت، هیوادارم خودا وەك ئومەتێك بە تەنیا زیندووی کاتەوە! (بلوع الأرب 2:246 - السيرة الحلبية 1:318) (السيرة النبوية - ابن كثير - 1:146 (یەکێکیتر لەوانە [أمية بن أبي الصلت] ورغم كە خاوەن شوهرەتێکی زۆر بەرفراوانە، ئەویش لە زۆربەی بیروباوەڕەکانی وەک ئیسلام گوزارش لە خۆی دەکات، وهەموو حەڕامەکانی حەرام کردوە لە خۆی!

لە هەندێك دەقدا خاوەن پەنجەمۆری تایبەتی خۆیەتی بۆ نمونە لە وەسفی مەلایکەتدا، بۆیە ناتوانین بڵێین هەموو شیعرەکانی دراوەتە پاڵی هەڵبەستراون .ئەو ئەزموونە دینیانە کە دەشێت هەندێکیان نبوەت وپێغەمبەرایەتی بوبن، زۆربەی زۆری بیروباوەڕی ئیسلامیان لە خۆدا گرتوە بەپیی هەواڵەکان! هەموو حەرام وحەڵاڵەکانی ئیسلامیان تێدا بووە، یەکتا پەرستی خوا خاڵی هاوبەشیان بووە لەگەڵ ئیسلام، زیندوبوونەوە و ڕۆژی حیساب و دۆزەخ وبەهەشتیش، و هەموو وردەکاریەکانیتریان تێدا بووە، کەوابوو ئەزموونی دینی زۆر هەبوون پێش پێغەمبەر، هەڵگری هەمان ڕوئیا و پەیام بوون، بەلام بۆ بەو ئەنجامە نەگەیشتن کە تێوەگلێن لە کوشت و کوشتار وجیهادا؟ !دەکرێت قیادەکان و سەرانی قوڕەیش لەسەردەمی ئەواندا زۆر حەکیمتر بووبن لە هەڵس وکەوتیان لەگەڵ بانگەوازی ئەوان، و هێندە تەنگیان پێ هەڵنەچنیون وەك دەرهەق پێغەمبەر محەمەدیان کرد، نازانم قوڕەیش بۆ هێندە نەرم بوون لە تەك بانگەوازی ئەواندا، وهێندە توندوتیژ بەربەرەکانێی ئیسلامیان کرد؟!

لەوانەیە کەسانێك بڵێن چونکە ئیسلامیش توند بوو لە هەڵسوکەوت دەرهەقی قوڕەیشدا و خستنیە بەردەم دووڕیانیکی سەخت: یان شەڕ یان موسلمان بوون! ڕاستە ئەوە پەیامی ئیسلامی مەدەنی بوو، بەڵام لە مەکەدا وانەبوو ئایەتە مەککیەکان زۆر ڕوونن کە ڕیزی لە هەڵبژاردەی عەقیدەیی دەگرێت، وەك بۆ نمونە: (وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ) الكهف: ٢٩ ]بڵێ هەق لە لایەن پەروەردگارەوەیە، ئەوەی بیەوێت با ئیمان بهێنێت و ئەوەی بیەوێت بابروا نەهێنێت [.قل يا ايها الكافرون لا اعبد ما تعبدون، ولا انتم عابدون ما اعبد، ولا انا عابد ما عبدتم، لكم دينكم ولي دين. الكافرون )قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ، لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ، وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ، وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ ، وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ، لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ) الكافرون: ١-٦ ]بڵێ ئەی بێباوەڕان، ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، ئێوەش ئەوە ناپەرستن کە من دەیپەرستم، منیش ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، ئێوەش ئەوە ناپەرستن کە من دەیپەرستم، ئێوە دینی خۆتان بۆ خۆتان و منیش دینی خۆم بۆ خۆم [

ده‌كرێت بڵێین هه‌ردوو لای هاوكێشه‌كه‌ سه‌رانی قوڕه‌یش و خودی پێغه‌مبه‌ر د.خ، یه‌كه‌میان به‌ چه‌وساندنه‌وه‌ی له‌ ڕاده‌به‌ده‌ریان و دووه‌میشیان به‌ كاردانه‌وه‌ و هه‌ڵچوونی له‌ ڕاده‌به‌ده‌ردا ئه‌و حاڵه‌ته‌یان گه‌یاندبێته‌ ئه‌و ڕاده‌یه‌ی كه‌ به‌ ته‌نها به‌ شمشێر كێشه‌كانیان یه‌ك لایی بكه‌نه‌وه‌. گوومانم نییه‌ ئه‌گه‌ر لێیان گه‌ڕابایه‌ ئیسلام به‌ ئازادی بانگه‌واز و په‌رستشه‌كانی كردبا، ناچار نه‌ده‌بوو هه‌موو دینه‌كه‌ به‌رگی ئاسنینی جه‌نگاوه‌ران بپۆشێت، ئه‌و باجه‌ گه‌وره‌یه‌ له‌ مێژوو و گیان و ڕوحی ئومه‌تدا بدات، به‌ڵكو دیانه‌تێكی ڕووحی زۆر نه‌رمونیان ده‌بوو.

07-07-2015خه‌ندان

# چۆن شەڕی فیکر بە فیکر دەکەیت؟!

لەوەتی هەواڵی قەدەغەکردنی دانراوی چەند زانایەکی سەلەفی بڵاوبۆتەوە، خەڵکێکی زۆر وروژاوە، هەتا کەسانێك کە هیچ پەیوەندیەکیانیش بە فیکری سەلەفی نییە، بونەتە مامەخەمەی فیکر. من لەوەتی هەم دژی قەدەغەکردنی فیکر و کتێبم، لەبەر باوەڕم بە ئازادی دەربڕینی بیروڕا، نەك لەبەرئەوەی باوەڕم بەوەیە کە شەڕی فیکر تەنها بە فیکر دەکرێت! من لەو باوەڕەدا نیم هەموو شەڕێکی فیکری بە تەنها بە فیکر بکرێت، لەبەر چەندین هۆ:

-زۆرجار ئەوەی بەرامبەرت تەنها بیرێکی سەتحی و شەعبیە ختووکەی عەقڵی ساویلکە و نەزانان دەدات، ئەو خەڵکە ئامادەگی بۆ وەرگرتنی فیکری توندڕەو و ناعەقڵانی زیاترە لەوەرگرتنی فیکری میانڕەو و شارستانی، بە تایبەتی ئەگەر فیکرە توندرەوەکە تێکەڵ بە موقەدەسات کرابیت.

-لە زۆر سەردەم و کات و شوێندا هەلی یەکسان لەبەردەم فیکرەکان وەك یەك نین تا بتوانن شەڕی فیکر بە فیکر بکەن. ئەوەی پارە ودەسەڵات ومیدیای بەدەستە جیایە لەوەی لەو ئامرازانە بێ بەشە.

-چونکە جاروبار ئەو فیکرە لە سنووری فیکر راناوەستێت تا تۆ بتوانی هەلی شەڕکردنیت هەبێت، هێندەی پێ ناچێت ئەو کراوەتە مەخلوقێکی توندڕەوی بێ فیکر، کە مامۆستایانی شورەیەکی قایمیان لە دەوری عەقڵیدا هەلبەستوە، نا هێڵن کاریگەری هیچ فیکرێکی تری بکەوێتە سەر.

-کاتێ سەلەفیەت کەسێك پەروەردە دەکات لەسەر گوێ نەدانە کەس لە خۆیان زیاتر، وبە گومڕا زانینی هەموو خەڵکیکی دینداری نا سەلەفی، بەڵکو بە کافر زانینیان، شەڕی فیکر بە فیکری چی دەکەیت؟! مەگەر شەڕی کلاشینکۆڤ و ئاربیجی لەگەڵدا بکەیت.

کە سەلەفیەتی توندڕەو دەوڵەمەندترین دەوڵەتی کەنداو و گەورەترین دەوڵەمەندانی عەرەبی لە دوا بێت، کتێب بە لێشاو چاپ بکەن بە خۆرایی، سەدەها کەناڵی ئاسمانی بێ کەڵك ژینگەی ئاسمانی پێ پیس بکەن، پارەیەکی زۆر لە خزمەت بانگەواز و بانگخوازانی بێت، شەڕی فیکر بە چ دەکەیت کە تۆ نەتوانیت دوو کتێبیش چاپ بکەیت، و کەناڵێکی ئاسمانیت هەبێت و رادیۆیەکت هەبێت؟!

کە دەسەڵاتی سیاسی لە پشت فیکری توندڕەو بوو لەبەر خێڵەکی بوونی خۆی و لاسایی کردنەوەی خێڵە عەرەبیەکانی کەنداو، سەدەها و هەزارەها مزگەوتی خستە خزمەتی فکری توندرەو، خەڵکی ئاسایی سەرچاوەی فیکری وفەرهەنگی خۆی لەو مینبەرە توندڕەوانە وەرگرت لەبەر هەژاری فەرهەنگی، پێم ناڵێی چۆن شەڕی فیکر بە فیکر دەکەیت؟! چۆن دەنگت دەگاتە ئەو خەڵکە ساویلکە وسەتحیە؟! کە قسەی مەلایەکی توندڕەو بە هەموو موفەکیر ومیانڕەوانی جیهان ناگۆڕێتەوە؟!

-چۆن بواری فیکری بۆ فیکرێکی سروشت فاشست ونازی خۆش دەکەیت، کە فیکر وعەقڵ بۆ جارێك بەکار دەهێنێت تا سەردەکەوێت، کاتێ سەرکەوت، هێندە دڕندانە لەگەڵت دەجەنگێت نەك بواری فیکریت پێ دەدات بەڵکو خۆت وفیکریشت سەرکوت دەکات؟!

-لە هەر دەوڵەتێك کە سەلەفیەت تیایدا دەستباڵا بێت، هەموو جۆرە کتێبێکی نەگونجاو لەگەڵ فیکری توندڕەوی خۆیان قەدەغە کراوە، نەك ئەوە ببینە پاش کودەتاکەی المتوکل ٢٣٢ هـ، بەسەر موعتەزیلە، قەسابخانەیەکیان بۆ کتێبەکانی موعتەزیلە و کەسانیتر کرد بە جۆرێك لە ١% بەرهەمی ناوازەیی وعەقڵی موعتەزیلەکان لە نێوبردران، و ئەوەندەشی ماوەتەوە لە شوێنە دووردەستەکان پارێزران، وبەردەستیان نە کەوتن دەنا ئێستا شتێکمان نەدەزانی دەربارەیان .ئێستاش لە سعودیە بریکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری سعودی عبدالعزیز العقیل لە پێشانگای کتێبی ریاز پار لە ئازاری ٢٠١٤ گووتی: "هەر کتێبێك پێچەوانەی سەوابتی دینی و سیاسی مەمەلکەتی عەرەبی سعودی بکات، قەدەغەیە هی هەر دەوڵەتێك و حزبێك بێت" کەتیایدا هەموو کتێبەکانی ئیخوانیش قەدەغە کران!

-ئەمڕۆ جیهان گۆڕانکاری زۆری بەخۆیەوە دیوە، تەنها ڕاستی ودروستی فیکرێك، ئەو فیکرەیە سەرکەوتوو ناکات، ئەگەر بێتوو پاڵپشتێکی مادی ومەعنەوی گەورەی نەبێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە، ئەمڕۆ فیکرێکی تەپیوی وەك سەلەفیەت کە لە سەرچاوەکەشی لە سعودیە خەلك لە دەستی بێزارە، ئەوەی ئاگاداری باسوخوازی سعودیە بێت دەزانیت، لە ڕێگای پاڵپشتی مادی کەنداو و پاڵپشتی سیاسی دەسەڵات خەریکە سروشتی دینداری میانڕەوی هەزاران ساڵەی کوردستان دەگۆڕێت، ئەو فیکرەیە نا مرۆییە لە ڕێگای کەناڵی میدیاکانی و مینبەر و کتێب ونامیلکەکانی دەچیتە هەموو شار و گوند و ماڵێکی کوردی بێ سەروبەر و ناکوتراو لە دژی توندڕەوی ئایینی، خەڵکێکی زۆریان هەتا لە گوندەکان و شارۆچکەکان فریوداوە، هەتا توانیتی سنوری ناوچە داخراوەکانیش ببڕێت وەك دەڤەری بارزان، کە بەپێی زانیاری من خەڵکێکی زۆریشی لەوێ خستۆتە ژێر کاریگەری خۆی، دەتانەوێت چەندیتر چاوەڕێ بین تا بەتەواوی سەلەفیەتی توندڕەو دەست بەسەر کوردستان

دادەگرێت و خەڵك دە سەدە بۆ دواوە بگێڕێتەوە؟! ئەو هەنگاوانەی دەسەڵات بە ئاگا هاتنێکی درەنگیش بێت باشترە پشتگیری بکرێت، نەك خەمی شەڕی فیکری تیرۆریستیمان بێت.

باسی شەڕی فیکریم بۆ دەکەن، شەڕی فیکری بەچی دەکەیت، کە ئێمەی نووسەرانی میانڕەو لەسەر حیسابی کات و ژیان و خێزانی خۆمان شەو ورۆژ دەخوێنینەوە و بەدواداچوون دەکەین، بە خۆڕایی بۆشتان دەنووسین، کەچی خاوەن پارە وپولە ملەستورە دەبەنگەکان دڵیان نایەت ئەوەی دەشینوسین بۆمان چاپ بکەن لە دژی فیکری شەڕانگیژ و توندڕەو؟! دەڵێ شەڕی فیکر بە فیکر دەکەین، خەریکە دەخورێیت هەی بەستەزمان! هەتا لە ئەوروپا یاسایەکی زۆروزەبەند هەیە لە دژی سەربەرزکردنەوەی فیکری فاشیستی و نازیزم، سەرەڕای پێشکەوتنی سیستمی پەروەردەوفێرکردنیان هێشتا هێندە بە متمانەوە ناڵێن شەڕی فیکر تەنها بە فیکر دەکەین!

خەندان11-05-2015

## سه‌له‌فیه‌ت و عروبه‌ت

سه‌له‌فیه‌ت ئه‌گه‌ر دروستکراوی ده‌ستی ئومه‌ویه‌کان نه‌بێت ئه‌وه‌ بونیادی گشتی وتیۆره‌کانی له‌ ڕاژه‌ وبه‌رژه‌وه‌ندی ئومه‌ویه‌کان بوه‌ وتا ئه‌مڕۆش هه‌ر ئه‌و ڕۆڵه‌ ده‌گێڕێت، چونکه‌ که‌ ئێمه‌ باسی ئومه‌ویه‌کان ده‌که‌ین مه‌به‌ستمان ته‌نها ئه‌و ماوه‌ مێژووییه‌ نیه‌ که‌ تێیدا ئومه‌ویه‌کان حوکمه‌ جیهانی ئیسلامیان کردوه‌، به‌ڵکو مه‌به‌ستمان ئه‌و شێوازه‌ تایبه‌ته‌ی ئومه‌ویه‌کانه‌ له‌ نوسینه‌وه‌ی تیۆری سه‌له‌فیه‌ت وبه‌ ته‌قدیس کردنی ئه‌و تاکه‌ شێوازه‌یه‌ ودوورخستنه‌وه‌ی هه‌موو شێوازه‌کانی تره‌.
بێگومان له‌ماوه‌ی فه‌رمه‌نڕه‌وایی ئومه‌ویه‌کان له‌ ساڵی 40 کۆچی تا دواییه‌کانی 132 کۆچی، ئومه‌ویه‌کان به‌ گیانێکی پڕ له‌ ده‌مارگیری بۆ سێکوچکه‌ی به‌نی ئومه‌یه‌ وقوره‌یش وعروبه‌ت هه‌وڵیان ده‌دا، زانراوه‌ش له‌و سێکوچکه‌یه‌ به‌نی ئومه‌یه‌ له‌سه‌ری لوتکه‌ی ئه‌فزه‌ڵیه‌ته‌ وئینجا قوره‌یش به‌ پله‌ دوو وئینجا عروبه‌ت به‌ شێوه‌یه‌کی گشتی. وه‌ک ئه‌بو زه‌هره‌ له‌ کتێبی (ابو حنیفة حیاته وعصره) ئاماژه‌ به‌و حاڵه‌ته‌ ده‌کات و ده‌ڵێت:"ئومه‌وییه‌کان نه‌زعه‌یه‌کی توندی عروبه‌تیان تێدا بوو، زۆر له‌ کلتوری عه‌ره‌بی پێش ئیسلامیان زیندوو کردوه‌."
ڕق لێبوونه‌وه‌ی سه‌له‌فی به‌ناو ساڵح له‌ زمانه‌کانیتری ناعه‌ره‌بی تا ئه‌و ڕاده‌یه‌ بڕی ده‌کرد که‌ ئه‌بو ره‌یحانی به‌یرونی ده‌یگوت: (پێم خۆشتره‌ به‌ عه‌ره‌بی دامشوڕن وزه‌مم بکه‌ن نه‌ك به‌ فارسی مه‌دح وسه‌نام بکه‌ن)!! «والله لأَنْ أُهْجى بالعربية، أحبُّ إليَّ من أن أُمدح بالفارسية!».
ئومه‌ویه‌کان له‌ماوه‌ی فه‌رمانڕه‌وایه‌تیان بیرۆکه‌ی سه‌روه‌ری عه‌ره‌ب به‌سه‌ر گه‌لانی تریان پیاده‌ کرد که‌ زۆر به‌ ئاشکرایی له‌ دژی بنه‌ماکانی ئیسلام بوون، ڕه‌گه‌زپه‌رستی عه‌ره‌بی ئومه‌وی به‌وه‌ گه‌یشتبوو که‌ هه‌تا نه‌ده‌بوو غه‌یره‌ عه‌ره‌بێک (مه‌والی به‌ زاراوه‌ی ئه‌و ڕۆژگاره‌) پێشنوێژی بۆ عه‌ره‌ب بکات!! یان نه‌ده‌بوو غه‌یره‌ عه‌ره‌بێک ژنێکی عه‌ره‌ب بهێنێت!
به‌پێی کتێبی ابن تیمیه‌ (اقتضاء الصراط المستقیم) که‌ سانێک له‌وانه‌ی پێیان ده‌ڵێن سه‌له‌فی سالح یش له‌ سه‌حابه‌ وتابعی وئه‌ئیمه‌کان که‌وتونه‌ته‌ داوای ئه‌و عروبه‌ته‌ی ئومه‌وییه‌کان وه‌ک له‌و به‌شه‌ی کتێبه‌ی به‌ ناوی (أعمال الكفار والأعاجم ونحوهم تنقسم إلى ثلاثة أقسام) هه‌تا ڕیوایه‌تێکی داوه‌ته‌ پاڵ خودی پێغه‌مبه‌ر (د.خ) گوایه‌ نه‌هی کردوه‌ که‌سانێک ئه‌گه‌ر عه‌ره‌بی بزانن به‌ زمانێکی عه‌جه‌می واته‌ غه‌یره‌ عه‌ره‌بی قسه‌ بکه‌ن، بۆ؟! چونکه‌ ده‌بێته‌ هۆی دروست بوونی نیفاق!! (.. عن نافع عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: " قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: من يحسن أن يتكلم بالعربية فلا يتكلم بالعجمية فإنه يورث النفاق (.من

نازانم زمان پەیوەندی چیە بە نیفاق، هەزاران کەسی عەرەبی نەزان هەن چاکترین موسڵمانن بە پێوەری ئیسلام، لەکاتێکدا هەزارەها وملیۆنەها عەرەبی زمان هەن خۆیان بە دوژمنی ئیسلامیش دەزانن!

هەروەها چەندین ڕیوایەتی لە سەحابەیەکی وەک عومەر وعبداللەی کوڕی وسعدی کوڕی ئەبو وەقاس دەگێڕێتەوە کە عەقڵ پێی هەرس ناکرێت ئەو ڕەگەزپەرستیە چۆن لەوانە دەرچوە، بۆ نمونە: ( قال: قال عمر: إياكم ورطانة الأعاجم، وأن تدخلوا على المشركين يوم عيدهم في كنائسهم.) [نەکەن بە عەجەمی بدوێن، یان بچنە لای موشریکەکان لە پەرستگاکان وکلێساکانیان] هەر لە ڕیوایەتێکی تردا گوایە حەزرەتی عومەر وتویەتی: (وروى أبو بكر بن أبي شيبة في المصنف، ...عن أبي بريدة قال: قال عمر: ( ما تكلم الرجل بالفارسية إلا خب [صار خداعا]، ولا خب إلا نقصت مرؤته ) ئەوەی بە فارسی بدوێت فێری تەڵەکەچیەتی دەبێت، کە بو بەتەڵەکچیش مروئەتی وپیاوەتی کەم دەبێت!! کارەساتە ئەگەر ئەو ڕیوایەتانە درۆ وهەڵبەستراو نەبن، فارسی ئاخاوتن بۆچی مرۆڤ تەڵەکباز دەکات وبێ مروەتی لێ دەردەچێت!؟

لە ڕیوایەتێکە تری عبداللەی کوڕی عومەر باسی نەورۆز دەکات ودەڵێت ئەوەی لە وڵاتی عەجەمان بوو وەک ئەوان ئاهەنگی نەورۆزی کرد وخۆی پێیان چواند تا مردن لەگەڵ ئەوان حەشر دەکرێت: (عن عبد الله بن عمر قال: من بنى ببلاد الأعاجم فصنع نيروزهم ومهرجانهم وتشبه بهم حتى يموت وهو كذلك - حشر معهم يوم القيامة.)

بێگومان لەبەر نزیکی سەردەمی خەڵکی فارس بە ئیسلام بونیان دەکرێت کوڕی عومەر ترسا بێت کە نەورۆز ڕەهەندێکی ئایینی هەبێت کە لە ڕاستیدا نەورۆز هیچ بنەمایەکی ئاینی نییە، بەڵام دەکرێت عبداللەی کوڕی عومەر هەر هێندەی زانیبێت دەربارەی نەورۆز بۆیە لەبەر نەبوونی زانیاری ئەو کاتە خەڵکی بەچاوی پڕ گومان وترسەوە دەیانڕوانیە یەکتر، سەیر لەوەدایە سەلەفیەکانی سەدەی ٢١ لە عەرەب وکورد لەو ڕۆژگارە هەمان قسەکانی عبد الله کوڕی عومەر دوبارە دەکەنەوە بێ ئەوە هیچ بیانوێکیان هەبێت، تەنها دواکەوتنی کوێرانە و نا عەقڵانیانەیە بە شوێن سەلەفی ساڵح لە ورد ودرشت وچاك وخراپ وڕاست وچەوتیاندا.!

هەر لە هەمان سەرچاوە محەمەدی کوڕی سعدی کوڕی ئەبو وەقاس گوێی لە کەسانێک بوە بە فارسی قسەیان کردوە، پێیانی وتوە: ئەو مەجوسیەتە لە پای چی لە پاش دینی حەنیفیەت (واتە ئیسلام) (عن داود بن أبي هند أن محمد بن سعد بن أبي وقاص سمع قوماً يتكلمون بالفارسية فقال: ما بال المجوسية بعد الحنيفية.) کەوابوو تەنها قسەکردن بە فارسی هاوتای ومومارەسەکردنی دینی مەجوسیەت بوە لە عەقڵیەتی سەعددا، کێ ناڵێت هەر باس باسی

ئیسلام بوە بەڵام بۆ عەرەبی نەزانێکی فارس بە زمانی خۆی بۆی ڕونکراوەتەوە!!
هەر لەو بارەیەوە چەندین ڕیوایەتی تر لە تابعیەکاندا دەگێڕێتەوە کە هەمووی ئەو پەڕی ڕەگەزپەرستی پێوە دیارە، بۆ نموونە موجاهید رقی لەناو نانی مانگەکان بۆتەوە بە فارسی، نەک هێندە، بەڵکو رقی لەوەش بوە کە هەتا ناویشی فارسی بێت ناوی بهێنێت!!
(وروى فيه عن مجاهد حديثاً أنه كره أن يقال: آذرماه، وذي ماه قلت: فإن كان اسم رجل أسميه به ؟ فكرهه)
ابن موبارەک ڕقی لەو وشەی (یەزدان) یش بوە کە بە خوا دەگوترێت بە فارسی، لە ترسی ئەوەی ئیزافە کرابێت بۆ شتێکی پەرستراو! دەکرا پرسیاری کردبا لە ماناکەی بەر لەوەی ڕقی لە ناوی خوا بێتەوە تەنها لەبەر ئەوەی بە فارسی هاتوە: (قال: وكان ابن المبارك يكره ايزدان يحلف به، وقال: لا آمن أن يكون أضيف إلى شيء يعبد)
ئەو هەڵوێستانە هەمووی یان زۆربەی لەترس ولە نەبوونی زانیاریەوە هاتوە، یەکیان نازانێ نەورۆز چیە، ئەویتریان نازانێت یەزدان مانای چیە ترسی هەیە ئیزافە کرابێت بۆ شتێکی پەرستراو!
هەروەها ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەسفی زمانی فارسی دەکات بە زمانی خراپ، کە ناشێ سویندی پێ بخورێ یان نوێژ وهەموو عیبادەتەکانی تری پێ بکرێت! ئەوە لەو کاتەدا فارسی یەکێك بوو لە گرنگترین زمانی جیهانی ئەوسا وعەرەب بە هەزاران کتێبی ودەستنوسی فارسیان وەردەگێرا لە بەرهەمی ژیاری فارسیدا، ئەو زمانەی کە تا ئێستاش گرنگی خۆی لە دەست نەداوە:
وقد سُئل الإمام أحمد بن حنبل عن الدعاء في الصلاة بالفارسية؟ فكرهه. وقال: لسان سوء ولا يصح الحلف بها ولا الصلاة ولا سائر العبادات اقتضاء الصراط المستقيم، ص 204 .
هەروەها مالیک بن ئەنەس بارەکە گرژتر وقوڕەکە خەستتر وکەیسەکە نزیك دەکاتەوە لە ڕەگەزپەرستیەکی ڕاشکاو کاتێ دەڵێت: ئەوەی لە مزگەوتەکانمان بە غەیری عەرەبی دوا وەدەردەنرێت!! " مَنْ تَكَلَّمَ فِي مَسْجِدِنَا بِغَيْرِ الْعَرَبِيَّةِ أُخْرِجَ مِنْهُ"
ئەو جۆرە بیرکردنەوە بوە هۆی کاردانەوەیەکی توند لەلایەن گەلانی غەیرە عەرەب وڕەوتێکی پێچەوانە دروست بوو بە ناوی بزوتنەوەی (اهل التسويه) یان بزوتنەوەی شعوبیەت.
لەوەش ترسناکتر مەیلێکی ترهەیە بۆ تەعریب کردنێکی تۆبزی بەبێ ئەوەی لێشت بپرسن کە تۆ ڕات چیە لەو بارەیەوە، دەڵێن ئەوەی بە موسڵمان لە دایك بوو عەرەبە:
"روى الحافظ أبو طاهر السلفي - في فضل العرب - بإسناده عن أبي شهاب الحناط حدثنا حبان

بن موسى، عن أبي جعفر محمد بن علي بن الحسين بن علي قال: " من ولد في الإسلام فهو عربي ". اقتضاء الصراط المستقيم/ 408
بە پێی ئەو چەمکە عروبەت پەیوەندی بە خوێن ونەسەب نیە بەڵکو زمانە، هەرکەسەی بە عەرەبی دوا ئەوە عەرەبە، حەدیسێك لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە لە چەندین سەرچاوە بە لاواز وزەعیف دەستنیشان کراوە دەڵێت: عەرەبی بوون بە دایک وباوك نییە، بەڵکو بوزمانە ئەوەی بە عەرەبی قسەی کرد عەرەبە!

عن مالك بن أنس "...وإن العربية ليست لأحدكم بأب ولا أم، إنما هي لسان، فمن تكلم بالعربية فهو عربي "
ابن تیمیە لە کۆمێنتی خۆیدا سەرەرای ناوهێنانی بەلاواز بەڵام هێستا لەبەر مەیلی عروبیەتی دەڵێت: ئەوە حەدیسێکی لاوازە بۆ مالیك هەڵبەستراوە، بەڵام لە ڕووی مانادا دوور نیە، بەڵکو ڕاستە لە هەندێ ڕوەوە!!
" هذا الحديث ضعيف، وكأنه مركب على مالك لكن معناه ليس ببعيد، بل هو صحيح من بعض الوجوه " اقتضاء الصراط المستقيم 410
ئەوەش چەمکی سەرەکی ئومەویەکان بوو بۆ تەعریب کردنێکی پەردەپۆش کراو بە دین کە لەبەر ساویلکەیی ئایینی وژیاری زۆر میللەتانیان بە ئاسانی تواندەوە لە ناو عروبەت وئەمڕۆ بونەتە رەسید بۆ عروبەت نەك بۆ ئیسلام!
دەگێڕنەوە لە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، کە کۆڵەگەیەکی عروبەتە، کە هاتە عێراق بە خەڵکەکەی گوت: تەنها عەرەب دەبێ ئیمامەتی نوێژتان بۆ بکات، خەڵکەکەش هەڵیان کوتایە سەر یەحیای کوڕی وەساب بۆ وەلانانی، کە ئەو کارە بە حەجاج گەیشتەوە گوتی: هەی لەناوچن من گوتم عەرەبی زمان، بەڵام یەحیای کوڕی وەساب هیچی تر ڕازی نەبوو پێشنوێژیان بۆ بکات.!!
أنساب الأشراف للبلاذري [11 / 200]
ئەوە بەشێکە لەو نمونانەی کە دەیسەلمینێت چۆن بە ناوی ئیسلام خزمەتی عروبەت کراوە، وچۆن سوکایەتی بە زمان و کلتوری میللەتان کراوە، بەزەبری دین خۆبەخشانە زمان و کلتوری خۆیانیان پێ سڕیونەتەوە، و لەو ڕێیەدا دەیان میللەتی ناعەرەبیان کردۆتە عەرەب و بە بەکارهێنانی سۆزی دینی. ٢٠١٥/١٠/٢٩

## تەنها پێشنیارێك بۆ سەرکردایەتی کورد و داعش!

چەند کەسایەتیەکی ئاینی کۆبکەنەوە و یا یەك دوو داعشی خۆماڵیشی تێدا بێت، لەگەڵ یەك دوو سیاسی بیان نێرن بۆ خزمەت خەلیفە ئەبوبەکری بەغدادی هاشمی قورەیشی حفظه الله، و داوای ڕاگرتنی شەڕیان لێبکەن لەو سنورانەی ئێستا و تەنها داوای کشانەوەی تەواویان لێبکەن لە شەنگال، لە بەرامبەردا بەڵێنی ئەوەیان پێبدەن تا ئەوان دووربن لە دەستدرێژی بۆ سەر کوردستان، ئێوەش ئاشتی بپارێزن لەگەڵیاندا !

بەڕاستی بە کوشت دانی لاوانی کورد لە پێناو ئەوەی عیبادی خۆی پێ بابدات لە کۆنفراسەکەی لەندەن، شەڕ کردن لەبری هەموو دنیا لە دژی تیرۆریزم، هەموو دنیاش هێندە ڕیز لە قوربانی وخوێنی ڕۆڵەکانت نەنێن، داوەتیشت نەکەن بۆ کۆنفراسێکی پەیوەست بەو شەڕەی کە کورد نیابەتەن عەن هەموو جیهان دەیکات، بەڕاستی لوتکەیی دەبەنگیە بەردەوام بیت لەو شەڕە بێ مەعنایە، وەك برایەك گووتی گەوادی بکەین باشترە لەوەی ئەو شەڕە لە بری هەموو دنیا بکەین! دوو دەوڵەتی گەورەی وەك ئەمریکا وبەریتانیا کورد بەبێ ئاگای خۆی بە شوو بدەن لەسەر بێشکە! بەبێ ئەوەی پرس وڕاشی پێ بکەن، هیچ مانایەك بۆ بەردەوامی ئەو شەڕە خوێناوییە ناهێڵێتەوە!

ڕاستە داعش درندە وتیرۆرستن، بەڵام سیاسەت زانیشن، وەك لە پاراستنی قەبری باپیرە گەورەی عوسمانیەکان لە ژێر دەستی داعش دەیسەلمێنێت، لە کاتێکدا قەبری دەیان پێغەمبەر و ئەسحابەیان تەقاندەوە! بەتایبەتیش پاش لاوازبوونیان، وگەیشتن بەو ڕاستیەی کە شەڕ لەگەڵ کورد ئاسان نییە!

پێشنیارم بۆ داعشیش ئەوەیە کە وەڵامی ئەو داخوازیەی کورد بداتەوە، ئەگەر کوردیش ئەو دەستپێشخەریەی نەکرد، با دەوڵەتی ئیسلامی خۆیان وەفدێک بنێرن بۆ ڕاگرتنی شەڕ لەگەڵ کورد، چونکە لە بنەڕەتدا شەڕی ئێوە هەڵە بوو لەگەڵ کورد، کورد بۆ ڕۆژێکیش کەسی لە سونەی عەرەب نەکوشتوە، تەنها بەرگری لە خۆی کردوە، ئەوەتا نزیکەی ملیۆن ونیوێك عەرەبی سونە لە کوردستانن، ئێوە ڕێگاتان بزر کردوە دەنا شەڕی ئێوە لە ناوەڕاست وخوارووی عێراقە نەک لە شمالکم الحبیب!

باش بزانن لەو شەڕەدا تەنها ئێوە و کورد زیادمەندن، کەمێك بە عەقڵتان دا بچنەوە بابەس بێت شەڕی خۆتڕێنی! دەکرێت لەو بورەدا سوود لە پەیوەندیەکانی تورکیا و داعشیش وەربگیرێت، چونکە هێشتا پەیوەندیەکانتان لەگەڵ تورکیا زۆر باشە!

٢٠١٥/١/٢٥

## دەستی تیرۆرستی دەبەنگ نەگرین بە دەردی مەملەکەتی خوارەزم دەچین!

ئەمرۆ لە جیهاندا زۆر هێزی دەوڵەتی و ڕێکخراوەیی کاری کوشتن و کاوڵکردن دەکەن لە ژێر لافیتەی هەر ناوێك بێت، بەڵام کەم هێز هەیە وەك هێزی ئیسلامی جیهادی لوتکەی هونەر بنوێنێت لە کوشتن و نامرۆیی و کاولکاریدا، بەبێ ئەوەی یەك بیانووش بهێنێتەوە. ئەمریکا کاتێ ڕۆکێتێك دەنێت بە خەڵکی مەدەنی، دەیان و سەدان پۆزش دەهێنێتەوە، کە ئەو هەڵەی کردوە، جارێکی تر هەوڵ دەدەن دووبارە نەبێتەوە .

بەڵام دەبەنگەکانی قاعیدە و داعش و نوسرە و بۆکۆ حەرام بە هیچ جۆرێك نازانن شتێك هەیە بە ناوی داوای لێبوردن لە کافران! ئەگەر ئیبن تەیمیەی مامۆستایان بڵێت کافر هەتا مافی نان خواردنی نییە لە دنیا چونکە خوا دەڵێت ) :یا أیها الناس کلوا مما فی الٲرچ حلالا گیبا) کافریش حەلالی بۆ ڕەوا نیە، کەوابوو مافی خواردنی نییە! ئەمڕۆ سەلەفیەتی جیهادی لە سەرتاسەری جیهان کاری بۆتە بەدناوکردنی موسڵمانان و دزێوکردنیان لەبەردەم خەڵکی جیهان، گومان خستنە سەریان لە هەر کوێیەك بن .

هەزاران موسڵمان لەسەراسەری ئەو جیهانە ئەو باجەی بەدناوکردنی ئەوان دەدەن بە جۆرەها شێوە! وروژاندنی جیهان و ناحەزان، چیرۆکێکی دەبەنگانەمی بیر خستەوە کە کاتی خۆی لە مێژوو ڕوویداوە لە نێوان شاە عەلائەدینی شاە خوارزم و جەنگیزخانی پاشای تەتارەکان، کە وای وروژاندن لە ئەنجامدا بوە هۆی لە نێوبردنی ولاتی خۆیی و خەلافەتی عەباسیش. عەلائەدینی شاە خوارزم پاشای مەملەکەتی خوارەزم بوو، کە لە مەزنی و پێشکەوتوویدا زۆر لە خەلافەتی عەباسیش مەزنتر و بەهێزتر بوو، سوپاکەی لە سوپای تەتارەکانی هاوسێشی بەهێزتر بوون !

جەنگیزخان ریزی لە ئازادی ئایینی موسڵمانان و هەر دینێك دەگرت لە وڵاتەکەی، لە ساڵی ٦١٥ هـ لەگەڵ سێ بازرگانی موسڵمان دیاریەکی گران بەهای نارد بۆ علاو الدین شاە خوارزم بۆ بنیاتنانی پەیوەندی سیاسی و بازرگانی، علاو الدین شاە خوارزم وەڵامی دایەوە بە ناردنی دیاری، بەڵام وادیارە لە خۆی بوغرا بوو کە چۆن جەنگیزخان دەستپێشخەری کرد لە ناردنی دیاریەکان! لە هەمان ئەو ساڵەدا والی علاو الدین شاە خوارزم لەسەر شاری ئەترار [یەنال خان]، کاتی خۆی زیانمەند ببوو لەسەر دەستی جەنگیزخان، بەدوای هەلێک دەگەرا بۆ تۆڵە سەندنەوە. کاتێ بازرگانەکانی تەتەر گەیشتنە شارەکەی کە ژمارەیان ٤٠٠ کەس دەبوو، یەکسەر گرتنی و دەستی بەسەر هەموو پارەو و تفاقی داگرتن، هەواڵی نارد بۆ علاو الدین شاە خوارزم کە ئەوانە سیخوڕن !

ئەویش لە دەبەنگی خۆی گووتی بیانکوژن، و هەموویان کوشتن! کە جەنگیزخان بەو هەواڵەی زانی، تەنها داوای دانەدەستی والیەکەی ئەترار ی کرد، زانی لە ژوور سەری ئەوە، بەڵام لەبەر هەڵەشەیی و بوغرایی علاو الدین شاه خوارزم نەك هەوڵی هێورکردنەوەی بارە گرژەکەی نەدا، بەڵکو پەیامهێنەرەکەی جەنگیزخانیشی کوشت، کە ئەوەش لە عورفی نێوان دەوڵەتەکان مانای جاڕدانی دوژمنایەتی وجەنگ دێت! ئەوەش بوە هۆی زۆر تورەبوونی جەنگیزخان، بەڵام علاو الدین شاه خوارزم بەوەندە دەبەبگیەش بەسی نەکرد، بەڵکو ئەو سوپای خۆی ئامادەکرد و هێرشی کردە سەر دەوڵەتی تەتار، کە لە ئانی هێرشەکەدا جەنگیزخان سەرقاڵی شەڕێکی دوور لە ئاوەدانی خۆیان بوون لە دژی پاشایەکی چین،

بۆیە سوپای علاو الدین شاه خوارزم کە جگە لە منداڵ و ژنی زیاتر نەدیت لە شارەکە، ئەو منداڵ و ژنانەی تەتاری بە کۆیلە برد! دوایێ تەنها لەشکرێکی سوپای جەنگیزخان کە گەرانەوە بە باسەکەیان زانی، سەرەرای بچوکی ژمارەیان لەبەراوردا لەگەڵ سوپای علاو الدین شاه خوارزم، بەڵام توانییان سێ ڕۆژی تەواو شەڕی تەواوی سوپای خوارەزم بکەن و هیلاکیان بکەن، بۆیە شەڕی بێ وێنەی ئەو لەشکرەی تەتار ترسێکی زۆری خستە دڵی علاو الدین شاه خوارزم، زانی ڕۆژانێکی ڕەش چاوەڕوانی دەکات! لە ساڵی ٦١٦ جەنگیزخان و کوڕەکانی سوپایان دابەش کردە سەر چوار لەشکر، هەر یەکەی هێرشی کردە سەر بەشێك لە مەملەکەتی مەزنی خوارەزم، وەك ڕەشەبایەکی ڕوخێنەری هەڵتەکێنەر ئەو شار و شارستانیەی بوخارا و سەمەرقەندیان یەك بە دوای یەك وردووخاش کرد، سەدان هەزار کەسیان کوشت مزگەوتێکیان بە پێوە نەهێشت!

ئەو مەملەکەتەی کە خەلافەتی عەباسیشی لە ژێر دەست بوو، لە هێز و توانای دا بوغرا بوو، خودی جەنگیزخان مەرایی بۆی دەکرد، لەبەر سەرەڕۆیی منداڵکارانەی وای لێهات لە ماوەیەکی کەمدا ببێتە کەلاوەیەکی بێ گیان! هەتا دایك و ژنی و منداڵەکانی علاو الدین شاه خوارزم کەوتنە ژێر دەستیی جەنگیزخان کە نێرینەکانی کوشتن و مێینەکانی دابەش کردە سەر سوپاکەی و کوڕەکانی! ئەوەی سەلەفیەتی جیهادی دەیکات لەو کوشت و کوشتار وسەربڕینەی خەڵك و ڤیدیۆکردن و ئەرشیفکردنی هەموو تاوانەکانیان، هەموو جیهانی لێ وروژاندوون، بەڵام جارێ ٩٩% زیانەکانیان بۆ گیانی خودی موسڵمانانە بۆیە جارێ تورەیەکی سەرتاسەری جیهان لە دژیاندا دروست نەبوە! بەڵام کاتێ ئەو دەستدرێژیانەیان گەیشتە وڵاتانێکی غەیری ئیسلام، بە دووری مەزانە، ئەنجامی کاری ئەو منداڵکارانە لەناوبردنی هەموو جیهانی ئیسلامی لێ بکەوێتەوە !

بۆ نموونە ئەگەر توانیان دەست بەسەر زۆربەی وڵاتە موسڵمانەکان بگرن، چەکێکی کۆکوژیان کەوتە دەست، کە ئێستا ڕاپۆرتی زۆر هەیە لەسەر توانای کیمیاوی و بایۆلۆژیان،

و توانییان بەکاری بهێنن لەدژی وڵاتانیتر، و هەزاران قوربانی لێ کەوتەوە! ئەگەر زاڵبوون بەسەریشیان ئاسا نەبوو بە شەڕێکی تەقلیدی، ئەگەر هەر بەردەوام بوون لە دوژمنکاری و ریسکی منداڵانە، بۆ بە دووری دەزانیت کە وڵاتانی بە توانای تەکنۆلۆژیای چەك و سەربازی بە چەکی کۆکوژی ئەتۆمی و کیمیاوی و هایدرۆجینی لێیان دەن، کە وەك کارەساتەکەی مەملەکەتی خوارەزم ببێتە هۆی کوشتنی سەدان هەزار خەڵکی بێ تاوان، و لەناوچوونی دەیەها وسەدەها وڵات. تۆ بڕوانە بە سەربڕینی ئەو چەند ڕۆژنامە نووسە ئەوروپاییە و ئەمریکاییانە، و هێرشەکەی شارلی هیبدۆی فەرەنسا، چۆن خەڵکی ئەو وڵاتانەی وروژاندوە، و کاردانەوی خراپیان پەیدا بوە لەدژی خودی ئیسلام و موسڵمانان.

ئەی ئەگەر خوانەخواستە توانیان چەندین کردەی تیرۆرستی گەورەی وەك ١١ی سەپتەمبەر و گەورەتر ئەنجامدەن، دەبیت کاردانەوەی زلهێزەکانی خاوە هەموو چەکێکی کوشندە دەبێت چی بێت؟! چۆن منداڵی لاسار ئەگەر دەستی نەگریت و سزای نەدەیت ڕۆژانە شەڕت بۆ پەیدا دەکات و مەترسیەکی بەردەوام دەبێت بۆ بوونت لە شوێنێکدا، بە هەمان شێوە توندرەوی و تیرۆرستی ئایینی کاری یەکەمی موسڵمانانە ڕێگای پی بگرن و دەستی ببڕن، دەنا ئەو ئومەتە لەبەر ڕەزا قورسبوونی و ترسناکی بە دەردی مەملەکەتی خوارەزم دەچێت!

06-05-2015خەندان

## دیموکراسیەت لە نێوان براگەورە Big Brother و سایبەرسپێسدا Cyberspace

جۆرج ئۆرویل (1903 -1950) رۆمان نوس ورۆژنامەنوسی بەناوبانگی ئینگلیز کە هەردەم لە بەرەی هەژاران وژێردەستەکان بوە، وژیان ونوسینی تەرخان کردبوو لە پێناوی ئازادی تاك وگشتیەکان، ئازادی خەڵك هەردەم خەم ونیگەرانی ئۆرویل بوو تا ڕادەی فۆبیاو ترسی جۆرج ئۆرویل لە زەوت کردنی ئازادییەکان دەگاتە چڵەپۆپەی بە دەرکردنی ڕۆمانە بە ناوبانگەکەی بە ناوی (1984) کە لە بنەڕەتدا ناوی (دوا پیاو لە ئەوروپا The Last Man in Europe) دا بوو. لەم ڕۆمانە جۆرج ئۆرویل باسی چارەنووسی خەڵك دەکات لە ژێر سایەی حکومەت وحزبە شمولی وتۆتالیتاریەکان کە لەلایەن دیکتاتۆرێکی ئولیگارشییەوە حوکم دەکرێت وخەڵك بە شێوەیەکی گشتی دەخرێنە ژێر چاودێریەکی توند وتیژی 24 سەعاتی بە هۆی کامێرا وشاشەی گەورە بە ناوی (تیلیسکرین Telescreen (ئەو کۆمەڵگایە ترسناکە ناونابوو بە کۆمەڵگای (برا گەورە .Big Brother (کۆمەڵگای (برا گەورە) جۆرج ئۆرویل لەوەدا هاتوە کاتێ شاشە وتێلیسکرینە گەورەکان بەبەردەوامی چاوەدێری ژیانی تایبەتی وگشتی خەڵکی دەکرد ولەکاتی ڕودانی بچوکترین شت بە دڵی براگەورە نەبێت شاشەکان بە دەنگ دێن ودەڵێن: براگەورە ئاگادارتە ودەتبینێ BIG BROTHER IS : WATCHING YOU، بێگومان تاڕادەیەك ئەو پێشبینیانەی جۆرج ئۆرویل هاتۆتە دی کاتێ حکومەت وحزبە دەسەڵاتدارە تۆتالیتاریەکان تەکنۆلۆژیا بەکار دەهێنن بۆ زیاتر چاوەدێری کردنی کۆمەڵگا وداپلۆساندنیان، هەتا جیهانی ئازاد ودیموکراسیش لەو دەردە بە دوور نین ئەمڕۆ شار وشارۆچکەکانی ئەوروپا ملیۆنەها کامێرا چاودێری جوڵەی خەڵك دەکەن و هەزار فەرمانبەر کاریان تەنها چاودێری کردنی شاشەی ئەو کامێرانەیە، تەنها جیاوازیەك لە نێوان وڵاتانی دیموکراسی وتۆتالیتارەکان ئەوەیە کە وڵاتانی دیموکراسی لەبەر هۆی ئاسایش ئەو چاودێرییە وکامێرانە بەکار دەهێنن لە چوارچێوەی یاسادا ولەبەر متمانەی خەڵك بەو سیستمە سیاسیانە خەڵکی دەستبەرداری کەمێك لە ئازادی خۆیان بوون لە پێناو ئاسایشی گشتی. بەڵام لە وڵاتە تۆتالیتاریەکان بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ یاسایەك خەڵك دەخرێتە ژێر چاودێری

وهەموو ژیانی دەخرێتە مەترسیەوە تا ڕادەی ئەوەی دەگاتە بڕیاری ڕەشەکوژیشی... ئەو ڕوانگەیەی ئۆرویل ئەگەرچی سەرتاسەریش نەهاتەدی بەلام هیچ لە بلیمەتی ئەو کەمناکاتەوە چونکە ئەو جۆرە کۆمەڵگایە بە شێوەیەك لە شێوەکانی پیادەکرا لە وڵاتانی تۆتالیتاری پێشوو وەك یەکێتی سۆڤیەت ودیکتاتۆرەکانی ڕۆژهەڵات وچین وبۆرما وڤێتنام وتا دوایی، بێگومان ئەوەی کە ئۆرویل بیری لێنەکردبۆوە ئەوە بوو وەك والتەر ریستن سەرۆکی گروپی سیتیگروپ لە ساڵی 1997 وە نوسیویەتی :"لەجیاتی پیادەبوونی تێڕوانینی جۆرج ئۆرویل لەبارەی چاوەدێری کردنی براگەورە بۆ هاوڵاتیان، زانست و تەکنۆلۆژیا هاوڵاتی دەکاتە چاودێر بەسەر براگەورەدا "ئەمڕۆ هاوڵاتی دەتوانن وەك براگەورەی پێشو بڵێن: هاوڵاتی ئاگادارتە ودەتبینێ CITIZEN IS WATCHING YOU :

ئەمڕۆ شۆڕشی سایبەرسپەیس)Cyberspace واتە فەزای ئەلیکترۆنی) لە هۆکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن وئینتەرنێت و فەیس بوك وتویتەر توانیان تا ڕادەیەکی زۆر گرەو لە براگەورە وەرگرنەوە لە چاوەدیری کردن وژماردنی هەناسەکانی خەڵك وخورپەی دڵەکانیان، کاریگەری ئەو تەکنۆلۆژیا نوێیە یەکەم جار لە فیلیپین دەستی پێکرد لە ساڵی 2001 کە لە ڕێگای تێکستی مێسەجەوە توانیان خۆپیشاندانێکی ملیۆنی ڕێك خەن وسەرۆکی وڵات جۆزین ئیسترادا لە شوێنەکەی لادەن، ئینجا لە لوبنان هەر بە هۆی تێکستی مێسەجەوە لە 2005 توانیان سوریا ناچار بکەن بە کشانەوەی داگیرکاری خۆی لە لوبنان نمونوە تر زۆرن لە مایەنمار وزیمبابۆی وکۆلۆمبیا وڕوداوەکانی ئێران کە خەڵك بە مۆبایل وئینتەرنێت توانیان قەبارەی نارەزاییەکانیان نیشانی جیهانی دەرەوە بدەن، تا گەیشتە شۆڕشەکانی فەیسبوك وتویتەر لە تونس ومیسر ویەمەن ولیبیا وسوریا کە پێدەچێت تیۆری براگەورە بەتەواوی بەرەو نەمان بەرێت،. ئەو حزب ودەسەڵاتانەی کە جاروبار لە ژێر پەردەی دیموکراسیەتیشدا دەیانەوێت حەز وویستە براگەورەییەکانیان بسەپێنن بەسەر خەڵك لە ڕێگای قۆرخکردنی دەسەڵات بۆ حزبێك یان بنەماڵەیەك یان لەڕێگای بەدبەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا لە چاوەدێریکردنی خەڵك دەبێت چاك بزانن ئەمڕۆ شۆڕشی سایبەرسپەیس چەکێکی زۆر قورستری لەوەی براگەورەی بەخشیوەتەوە دەستی جەماوەر وهاوڵاتیان، بۆیە پێویستە براگەورە لە عەقڵیەتی خۆی بگۆڕێت وتەوازوع بنوێنێت بەرلەوەی بکەوێتە ژێر ڕەوڕەوەی شۆڕشی سایبەرسپەیس.Cyberspace

لەندەن 08.07.2011

# ئۆپۆزسیۆنی مۆدرن و ئۆپۆزسیۆنی ئایینی

بە حوكمی دابەش بوونی كوردستانی باشور بۆ دوو ناوچەی هێزو دوو ئیدارە وهەندێك پێیان چاكترە ناوی بنێن بە دوو ئیمارەت، وەک دوو ئیمارەتە مێژوییەكەی سۆران و بابان كە زۆر شتیان لەیەك دەچێت لەگەڵ دوو ئیمارەتەكەی هەولێر وسلێمانی، وەک ناكۆكیی بەردەوام وترسی هەڵلوشینی لایەک بۆ لاكەی تر، دابەشبوونیان لە پابەنبوون ووەلا بۆ دەوڵەتی عوسمانی وسەفەوی وچەندین دیاردەی تر، ئۆپۆزسیۆنیس دوو ڕەنگی جیاوازی وەرگرتوە. یەكگرتنەوەیەی دوو ئیدارەكەی هەولێرو سلێمانیش وەك كێشە سواوەكەی فەلەستینیان لێكردوە كە نە چارەسەری دەكەن و نە وازیشی لێدەهێنن، شەو وڕۆژ مێشكمانی پێ ئازار دەدەن.

جیاوازی ئەو دوو ئیدارەو ئەو دوو حزبە سەرەڕای چەند خەسڵەتێكی زاتی و تایبەتی دوو ناوچەكە لە ڕووی ئۆپۆزسیۆنەوەش دوو ڕەنگی جیاوازی وەرگرتوە... لە ناوچەی ئیدارەی یەكێتی سەرەڕای بوونی هێزێكی سیاسی گەورەی وەك گۆڕان كە تەكانێكی گەورەی بە كاری ئۆپۆزسیۆن دا، چەندین حزبی تریش وەک دوو حزبە ئیسلامیەكەش یەكگرتوو و كۆمەڵ دەورێكی دیار دەگێڕن لە دەوڵەمەندكردن وجۆراندنی كاری ئۆپۆزسیۆن، لەوەش گرنگتر وكاریگەرتر بوونی میدیایەكی بەهێزوتاڕادەیەكی زۆر سەربەخۆ لەگەڵ بوونی قەڵەمی بە هێز ورۆشنبیری بوێر كە كارو فعلی ئۆپۆزسیۆن بوونی خستۆتە سەر ڕێچكەی دروست وسروشتی خۆی.

لە بەرامبەردا لە هەولێرو تا ڕادەیەكیش دهۆك ناوچەكانی تری ژێر كۆنترۆڵی پارتی و ئیدارەی هەولێر كارو فعلی ئۆپۆزسیۆن بوونی ناوچەكە بە مەلا ومامۆستایانی ئایینی سپێردراوە كە وادیارە دەسەڵاتیش خۆشی لێ دێت وئەو حاڵەتەی پێ باشترە لە بوونی چەند حزبێكی سیاسی وخاوەن خیتابێكی مۆدرن وسەرەڕای بوونی چەند رۆشنبیرێكی بوێر وشارەزا بە هونەری دواندنی خەڵك و پەردە لادان لەسەر هەموو كەموكورتیەكانی دەسەڵات بە شێوەیەكی هەستیاری نەشتەرگەرانە...

هەمو كوردستان جۆرێک لە دینداریەكی پاک و میانرەوانەی تێدایە، هەولێریش بە شایەدی دیندارانی شارەكانی تری كوردستان سەرقافڵەیە لەو دینداریەدا لە ڕۆشنایی ئەو رۆڵە مێژووییەی هەولێر یاریكردوە لە دین پەروەریدا، لە سەرتاسەری كوردستان وجیهانی ئیسلامدا. بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو سروشتە دیندارەی هەولێر كە هەندێ جار دەگاتە رادەی ساویلكەیی لەلایەن هەندێ مەلا زۆر بەخراپی ئیستغلال كراوەو دەكرێت، دەیانەوێت هەموو

بیرورا توند وخورافات وشازەکانی خۆیان بەسەر ئەو شارە بسەپێنن، وەتوانیشیانە برەو بەزۆر بیروورای توند و شاز بدەن، هەر ئەوەش بەداخەوە وایکردوە ئەمرۆ جلەوی سیاسەتکردن و ئۆپۆزسیۆن بوون بکەوێتە دەستی چەند مەلایەک لە هەولێر، ودەسەڵاتیش لە بەرامبەردا هەر بەمەلا وەڵامی مەلاکانی بەرەی ئۆپۆزسیۆن دەداتەوە.

زۆر جار وەك هەولێریەک هەست دەکەم شەڕی ئایینی موعتەزیلە وئەهلی حەدیس لە هەولێر دەکرێت لەجیاتی تەرکیز کردن لەسەر کێشە هەقیقی وهەنوکەییەکان، وەک چۆن ئەو شەڕەی ئەوساش لە دەستکردی دەوڵەتی ئەمەوی بوو بۆ دوور خستنەوەی خەڵک لە کێشە هەقیقیەکان، بۆ نمونە لە شەڕی گۆڤاری [چرپە] کە توانیان مەلاکان زۆر بە توندی بوروژێنن لە بەرامبەر نەفرەتکردنی چرپە، چەند مەلایەکی دەسەڵات دەستخۆشیان لە گۆڤاری چرپە کرد ودژی داخستنی بوون، چونکە موسڵمانانی گوایە ئاگادار کردۆتەوە لەوەی کە دژی خوا وئیسلامدا نوسراوە!!!

لە ڕاستیشدا نە ئەو وتارەی چرپە کە پڕ لە سوکایەتی کردن بوو بە پیرۆزیەکانی خەڵك کە بە هیچ شێوەیەك ناچێتە پۆلێنی ئازادی دەربڕین شایەنی ئەو شۆڕشە ئایینیە بوو، نە ستایش کردنی کاری گۆڤارەکەش بەو بیانوە پوچانەی مەلای ئەو دیوی مەلاکانی ئۆپۆزسیۆنیش قەناعەت بە هیچ کائینێکی عاقڵ دەکات، خەڵک خەریک کردنیش بە یاری موعتەزیلە و ئەهلی سونە وکێشە ئاینیەکان و کردنیان بە بەرەی دژی خودا و لەگەڵ خودا سەری دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە سوك وڕەحەت دەکات...

ئەوە بە واتای ئەوەش نییە کە هەولێر ڕۆشنبیری ئازاو میدیای بوێری لێ نەبێت، بۆ نمونە دەزگای ستاندارد وکاک مەسعود عبد الخالق وهاوکارانی تری نمونەی لە خۆبوردن وبوێرین لەو ڕوبەرە تەسکەی ئازادی کە لە هەولێر هەیە، وسەرەڕای هەموو سەر ئێشەکانی دەسەڵات هەر خۆراگرن، پێویستە هەموو لایەنێک دان بەو هەقیقەتە دابنێن.

گومانی تێدا نییە کە مامۆستایانی هەولێرو شارەکانی تری کوردستانیش ڕۆلێکی خێرخوازی چاکیش دەبینن لە بەرگرتن لە گەندەڵی مۆڕاڵ و پاراستنی بەها بەرزەکانی کۆمەڵی کوردەواری، دەنا بۆی هەیە کەسانێکی سەرمایە پەرست کوردستان بکەنە مەلهایەکی پڕ لە ئایدز، بۆیە بوونی ئەوانیش لەو گۆڕەپانەدا بە خیتابێکی میانڕەوانەی دوور لە توند وتیژی وتەکفیر کردن و هەڕەشە ئامێز پێویستە، بەڵام بەداخەوە ئەو مەلایانەشی کە وتاریان هێشتا لە ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگاکە نین ژمارەیان کەم نییە.

بۆ نمونە مەلایەک پێش ماوەیەک لە وتارێکدا زۆر بە توندی بەرەنگاری هەردو حزبەکەی دەسەلات و پەرلەمان و خودی سەرۆکی هەرێم دەبێتەوە گوایە لەسەر دین و شەرەف و ناموس بە شێوازێکی زۆر عاتیفیانە لە دژی یاسای ژمارە ٨ سالی ٢٠١١ بەناوی (یاسای بەرەنگاربوونەوەی خێزان لە توند و تیژی لە هەرێمی کوردستان)، لەکاتی خوتبەکەدا لەبەر ناشارەزایی بە خیتابی هاوچەرخ وچۆنیەتی دواندنی هەموو تاکێکی کۆمەڵ بە پیاو وژن وفرە ئایین ونەتەوەکانەوە سەرلەبەری خیتابەکەی لە دژی رەگەزی مێینە بوو.

ئەو شێوازەش خۆی لە خۆیدا هاندانی خەلکێکی سادە و ساویلکەی مزگەوتەکان بوو بۆ زیاتر بەکارهێنانی توندوتیژی لەگەڵ رەگەزی مێینە، بۆ نمونە بە شێوازێکی زۆر کۆمیتراژیدیایی دەیگوت: " ئەگەر کچەکەم سبەینێ لە پێش چاومان تەلەفۆنی عاشقایەتی کرد دەبی هیچی لێنەکەم و لە حەیفان یان ئینتیحار کەم یان وەک دەیوسەکان بەدیاریەوە بوەستم..." لە هەموشیان کارەساتتر بەرگری لە لێدانی ژن دەکرد بە شێوەیەک هەتا زانا و موفەسیرانی بەراییش زاتی ئەوەیان نەکردوە بۆ نمونە گەورە موفەسیرێکی وەک تەبەری لە پێش نزیکەی هەزار سالدا کەباسی تەفسیری ئایەتی: [واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن في المضاجعِ واضرِبوهن] لەو سەردەمەدا هێندە هەستیارانە وموراعات ئاسایانە باسی دەکات دەیان ریوایەت دەهینێتەوە بۆ بەلاوەکی کردنی لێدانەکە و سەد شەرت و شروتی بۆ دادەنێت ئینجا کە باسی لێدانەکەش دەکات دەیسەلمێنێت کە لێدانەکە بە مانای وشە لێدان نییە، بەلکو رەفتارێکی دەرونییە دەنا چۆن لێدان بە سیواکێکی چەند گرامی مانای لێدان دەهێنێتە دی؟ !

یان ئەوەندە بە گەرمی دژی قەدەغە کردنی خەتەنەی مێینە بوو دەتگوت دیفاع لە ئایەتێکی راشکاوی قورئان دەکات، ئەوە لە قورئاندا هەر باسیشی لێنەکراوەو لە حەدیسیشدا ئەوەی هاتوە ئاراستەی دەمی لە نێرە، جگە لە چەندین حەدیسی لاوازداو لە سیرەشدا یەک بەلگە نییە کە پێغەمبەر هیچ یەکێک لە کچەکانی خەتەنە کردبێت، ئەوەشی دەڵێت پێغەمبەر لە روی نەهاتوە باسی بکات وەک چۆن بەرچاوم کەوتوە، ئەوە ئەو سەختگیرە نە لە ئیسلام و نە لە پێغەمبەر باش تینەگەیشتوە ئەو کارەش زانایانی ئیسلام بە تاوان دانە پال پێغەمبەری دەژمێرن بە نەگەیاندنی هەموو پەیامەکەی. لەوەش سەیرتر خەتەنەکردنی مێینە لە مەنزلگای وەحیشدا (دورگەی عەرەب و سعودیەش) بوونی نییە، ئەو وڵاتەی کە فەقیهەکان [عمل اهل المدينه ] کاری خەلکی مەدینە بە سەرچاوەیەکی شەریعەت دادەنێن.

ناکرێت ئەو هەموو هەقیقەتە پشتگوێ بخەین هەر لەبەر خاتری قەولێک لە کتێبێکی مەزهەبیدا هاتوە، هەموو ئافرەتانمان لە پێناویدا سەقەت بکەین، با ئەو قەولە نەک هی شوێن کەوتەکانی شافیعی بێت با هی خودی شافیعیش بێت؟ !هەتا شێخ یوسفی قەرەزاوی لە سالی ٢٠٠٩ فەتوایەکی دەرکرد بە پشت بەستن بە ئەنجام گەلێکی چەندین توێژینەوەی زانستی کە

کەسانی متمانەدار پێی هەستا بوون کەوا خەتەنەکردنی مێینە نە فەرزێکە تا جێبەجێ بکرێت و سەرباری زیان بەخشیشە بە ئێستا و دوارۆژی ئافرەتان، شێخ قەرەزاوی لە فەتواکەیدا ئاماژەی بەوە کرد کە سکاڵا و دادی ئافرەتانی خەتەنەکراو زۆر بوە، دەناڵێنن بە کاریگەری نێگەتیڤی ئەو خەتەنەکردنە بەسەر ژیانی هاوسەریان... یان بەو دواییە ئەو هەموو کێشە گەورە وبێ شومارانەی کوردستانیان خستبوە لاوە شەڕی بە کافرکردنی جەژنی نەورۆز و بە خائین کردنی کاوەی ئاسنگەری بەدبەختیان دەکرد کە لە چەند وتاردا وەڵاممان دانەوە...

ئەوەیە جیاوازی نێوان ئۆپۆزسیۆنێك ئاماژە بە گەندەڵیەکان دەکات بە ژمارە وداتا دەسەڵات ڕووت دەکاتەوە، بە خیتابێکی سەردەمانە وبێ ڕوشاندنی دڵی هیچ پێکهاتەیەکی کۆمەڵگاکە، ولە نێوان ئۆپۆزسیۆنێکی ئاینی کە هەموو خۆشین ومۆرکردنەوەکانی لە پێناو بەرگری کردنە لە خوایەکی قادر وبەهێزدا، لە کاتێکدا بەندە زەعیف و بێ دەسەڵاتەکان زیاتر پێویستیان بە بەرگری لێکردن هەیە لە بەرامبەر جەبەروت وگەندەڵی وتاڵان وبڕۆی دەسەڵاتی گەندەڵدا، هەموو کێشەکانیان کورت دەکەنەوە لە بەگری کردن لە خەتەنە کردنی ئافرەتان ومافی لێدانیان یان حەرامکردنی نەورۆز وهەتا کۆتایی لیستی کێشە ئاسودە بەخشەکان بە دەسەڵات .
ئەو خیتابەی ئۆپۆزسیۆنی ئایینی مەلاکان بەو هەموو کەموکورتیەوە، بەو توندوتیژیەوەو بەو بی مەنتیقیەوە وبەو پەی نەبردن بە زمانی هاوچەرخەوە، وەڵامدانەوەو تەشهیر پێکردن وتاوانبارکردن وسەرکوتکردنیشی زۆر ئاسانترە بۆ دەسەڵاتیك کە خۆی بەرهەمهێنەر و پاڵپشتکەری ئەو جۆرە خیتابە لاوازەی ئۆپۆزسیۆنی ئایینیە.

22-05-2012

# به‌در شاكر سه‌یاب: من شیوعی بووم! ( به‌شی یه‌كه‌م)

محه‌مه‌د هه‌ریری...

به‌ر له‌ماوه‌یه‌ك پۆستێكم بڵاوكردەوه‌ له‌سه‌ر باوكی شیعری ئازادی عه‌ره‌بی به‌در شاكر سه‌یاب، كه‌ شیعرێكی به‌هێزی بۆ نه‌ورۆز وتبوو، برادەرێكی رۆشنبیری خۆم كاك سیروان سه‌عید له‌ كۆمێنتێكدا گووتی: من كتێبێكی به‌در شاكر سه‌یاب م هه‌یه‌ به‌ ناوی [كنت شیوعیا] كه‌ باسی ئه‌زموونی خۆی ده‌كات له‌ناو حزبی شیوعی عێراقیدا.

من هه‌ر له‌ ناونیشانی كتێبه‌كه‌وه‌ زۆر به‌ تامه‌زرۆ بووم بۆ خوێندنه‌وه‌ی ئه‌و كتێبه‌، هه‌ر ئه‌ورۆ كاك سیروان ماڵی ئاوابێ كتێبه‌كه‌ی گه‌یانده‌ ده‌ستم، هه‌ر لییم وه‌رگرت جاری له‌ ده‌ره‌وه‌ بووم له‌ لایه‌كه‌وه‌ دانیشتم چه‌ند به‌شێكیم خوێنده‌وه‌ زۆر به‌تام بوو، چونكه‌ ئه‌و پیاوه‌ واته‌ به‌در شاكر سه‌یاب، له‌و جۆره‌ كه‌سانه‌یه‌ كه‌ زۆر به‌ ڕاشكاوی قسه‌ ده‌كات، منیش ڕاشكاوی گه‌وره‌ترین كێشه‌مه‌.

ئه‌و یاده‌وه‌ریانه‌ به‌در شاكر سه‌یاب له‌ ساڵی ١٩٥٩ له‌ ڕۆژنامه‌ی [الحریة] به‌غدادی به‌ ٤٠ ئه‌ڵقه‌ بڵاوی كردۆته‌وه‌، له‌ ئه‌ڵقه‌ی یه‌كه‌مدا ده‌ڵێت: ده‌میكه‌ بیرۆكه‌ی نووسینم ده‌رباره‌ی ئه‌زموونی خۆم له‌ناو شیوعیه‌ت له‌ میشكم ده‌خولیته‌وه‌، ده‌مه‌وێ بنووسم ده‌رباره‌ی چۆنیه‌تی چونه‌ ناو شیوعیه‌ت وچیم دیت له‌ ناویدا وله‌ ده‌ستیدا، وچی وای لێكردم ببمه‌ دوژمنی باوه‌كوشته‌ی! ل٧

ئینجا باسی خێزانی خۆی ده‌كات كه‌ خاوه‌ن ڕه‌ز وبێستانی دار خورما بوون، وه‌هه‌رچه‌نده‌ زۆر باش بوون له‌گه‌ڵ هه‌ژار وجوتیاره‌كان، به‌ڵام هه‌ر سته‌مكاریان ده‌كرد وزۆر سته‌می ئه‌وانم به‌ چاوی خۆم دیتوه‌، ئینجا باسی ژنه‌ جوتیاریك ده‌كات [زه‌نوبه‌ ] چۆن له‌به‌ر هه‌ژاری وبرسێتی كه‌میك برنجی له‌ عه‌ماره‌كه‌ی ماڵیان دزیوه‌، دوایی كه‌ پییان زانیوه‌ سزای توندی ئه‌و ژنه‌ هه‌ژاره‌یان داوه‌ وكه‌رامه‌تیان ڕوشاندوه‌! هه‌ر بۆیه‌ ده‌ڵێت: 'وا گه‌وره‌ بووم كه‌ دژی جه‌وروسته‌م بم ولایه‌نگری هه‌ژاران بم، شیوعیه‌تیش هات بانگه‌شه‌ی خواردن بۆ هه‌موان، وكار بۆ هه‌مووان، ودادپه‌روه‌ری بۆ هه‌موان ویه‌كسانی بۆ هه‌موان ده‌كرد، كێ هه‌یه‌ كار وخواردن ویه‌كسانی وعه‌داله‌تی بۆ هه‌مووان نه‌وێت؟! ئێمه‌ شیوعیه‌تمان وه‌ها ده‌ناسی له‌ سه‌ره‌تادا. له‌ ١٩٣٠ یه‌كه‌م حزب به‌ناوی الحزب اللادیني دامه‌زرا، مامی شاعیریش یه‌كیك

بوو له‌ دامه‌زرێنه‌رانی یه‌كه‌می حزبه‌كه‌! حزبی نادینی پییوابوو كه‌ دینه‌كان هۆی سه‌ره‌كی به‌دبه‌ختی مرۆڤن. ئینجا باسی خزمێكی خۆیان ده‌كات كه‌ جوتیارێك بوه‌، وده‌ڵێت: زۆر سه‌خیف ونه‌زان بوو، هه‌رچه‌نده‌ خۆی به‌زانا وبه‌ مه‌عریفه‌ت نیشان ده‌دا، وناوی عبداللطیف بوو داوای له‌ خه‌ڵكی ده‌كرد بانگی كه‌ن به‌ [له‌تیفنوف] له‌سه‌ر وه‌زنی خرۆشۆف!! ئه‌و له‌تیفنۆفه‌ ئیستا به‌رپرسی حزبی شیوعیه‌ له‌ ئه‌بی خه‌سیب له‌ به‌سره‌" ل٩

حزبی لادینی یه‌كیتی سۆڤیه‌تیان زۆر خۆش ده‌ویست وبه‌ ده‌وڵه‌تی بێ دینی وئیلحادیان ده‌زانی وستالینیشیان زۆر خۆش ده‌ویست!

به‌در شاكر سه‌یاب ده‌ڵێت: " كۆبونه‌وه‌كانی ئه‌و هه‌ڤاڵانه‌ بی ئاره‌ق وبتڵ وكاس نه‌بوو، ژنێكیش به‌ ناوی به‌لقیس مه‌جلیسه‌كه‌ی ده‌رازانده‌وه‌، كه‌ ئافره‌تێكی جوان بوو، باوكی جوتیار بوو، میرده‌كه‌ی له‌به‌ر به‌دره‌وشتی ته‌ڵاقی دابوو، ئه‌و ژنه‌ له‌گه‌ڵ هه‌ڤاڵانی ڕاده‌بوارد به‌ شێوازێكی شاز نه‌بادا توشی سكپڕی ببێت! هه‌ڤاڵ فه‌هد [دامه‌زرێنه‌ری حزبی شیوعی] یش یه‌كێك بوو له‌وانه‌ی له‌گه‌ڵی ڕایده‌بوارد"!!

دوایی ئه‌و هه‌ڤال فه‌هده‌ حزبی شیوعی عێراقی دامه‌زراند، وئه‌حمه‌د علوان ێک فۆرمی دا به‌ ئێمه‌ تا بچینه‌ ناو حزب شیوعی، به‌و شێوه‌یه‌ بومه‌ حزبی.

له‌ ئه‌ڵقه‌ی دووه‌م ده‌لێت خۆپیشاندانیان كردوه‌ له‌ سالی ١٩٥٢ له‌ به‌غداد وخۆی یه‌كێك له‌ ڕێكخه‌ری خۆپیشاندانه‌كان بوه‌، فه‌رمانی ده‌ستگیركردنی بۆ ده‌رچوه‌ وئه‌ویش تا نه‌گیریت ڕای كردوه‌ به‌ره‌و ئیران، ئینجا ده‌چێته‌ كوێت ودوایی ده‌یه‌وێت بچێته‌ بوخارستی رومانیا بۆ ڤیستیڤاڵی لاوان. له‌ ئیران ده‌بێته‌ میوانی حزبی توده‌ وپاسپۆرتی بۆ ده‌رده‌كه‌ن. ئه‌و كاته‌ سه‌رده‌می مصدق بوه‌ وئێران له‌ ته‌نگژه‌یه‌كی سیاسی گه‌وره‌دا بوه‌، تییدا كوده‌تا كراوه‌ به‌سه‌ر مصدق. سه‌یاب هه‌ڵوێستێكی سه‌یر ده‌گێڕێته‌وه‌، ده‌ڵێت كاتێ به‌ توره‌یی پێموتن بۆ بێده‌نگن له‌ كاتێكدا سه‌دان هه‌زار كه‌ستان هێنابوه‌ سه‌ر شه‌قام، ده‌ڵێت: وتیان ئێمه‌ ده‌توانین زاهیدی رابه‌ری كوده‌تاكه‌ وردوخاش بكه‌ین به‌ڵام ئێمه‌ له‌سه‌ر سنوری شوره‌وییین، ئه‌گه‌ر ئێمه‌ی كۆمه‌نست ده‌ست به‌سه‌ر حوكم دابگرین، پێتوایه‌ ئه‌مریكا بێده‌نگ ده‌بێت؟ هه‌ڵبه‌ته‌ نه‌خێر، ده‌ست ده‌خه‌نه‌ ناو كێشه‌كه‌وه‌، ئه‌گه‌ریش ده‌ستیان خسته‌ ناو كێشه‌كه‌، شوره‌وی [یه‌كێتی سۆڤیه‌ت] زه‌ره‌ر مه‌ند ده‌بێت!! ل ١٦

دەڵێت خوێن لە دەمارەکانم دەکوڵا لە توڕەییاندا وگوتم: ئێوە ئێرانین وسۆڤیەتی نین، لەسەرتانە بەرگری لە بەرژەوەندیەکانی ئێرانیەکان بکەن نەك بەرژەوندی سۆڤیەت وگەلەکەی، هەڤاڵ سۆڤیەت دەتوانێت بەرگری لە خۆیدا بکات! ئەو ئەوە باس دەکات بۆ سەلماندنی پاشکۆیەتی حزبە شیوعیەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت. دەڵێ کە گەڕامەوە عێراق باسی ئەو هەڵوێستەی تودەکانی ئێرانم کرد، ئەوانیش گوتیان هەڵوێستەکەیان ڕاستە، ونەیاندەتوانی لە غەیری ئەو هەڵوێستە وەرگرن لە پێناوی ئاشتییدا. بەو جۆرە پەیوەندیم تا دەهات لاوازتر دەبوو لەگەڵ حزبی شیوعی وچاوەڕوانی بچوکترین ورووژاندنم دەکرد بۆ پچرانی سەرتاسەری.

لە ئەڵقەی سێیەم باسی کێشەی عەرەب وشعوبیەت دەکات، کە چۆن دژی عروبەت بونە وچۆن شیوعیەکان هێرشیان کردۆە سەر نوسینەکانی وتاوانباریان کردوە بە جاسوسی، وئەویش هیرشی کردۆتە سەر هەندێك لەو سەرکردانەی کە کارەساتی بەدڕەوشتیان ئەنجامدابوو " لە نمونەی هەڤاڵ باسم [بهاء الدين نوري] کوردەکەی خۆمزن دەکات، کە سکرتێری حزب بوو و لاقەی هەڤاڵ [مادلین میر] ی کرد، کە پەناهەندە بوو لەلای حزب، دوایی سکی پڕبوو ومنداڵەکەی لە زیندان لە دایك بوو و ناوی نا سەلام!

دوایی باسی کتێبیکی دەکات کە وەرگێڕانی جەند شیعرێکی بێگانە بوو لە چەند شاعیرێکی شیوعی وەك نازم حیکمەت وبابلو نیرۆدا، وڕاسڕەویش وەك ت.س ئیلیوت و ستیڤن سپیندەر. شیوعیەکان زۆر تورە بوون لە وەرگێڕانی شیعرەکانی ڕاست ڕەوەکان وبە تایبەتی ستیڤن سپیندەر کە کاتی خۆی کۆمەنست بوو ووازی هێنا وبوە دوژمنێکی سەرسەختیان ویەکێکە لە بەژدارانی نوسینی کتێبی [ئەو خوداوەندەی نسکۆی هێنا!!.]

لە ئەڵقەی چوارەم باسی دژایەتی شیوعیەکان دەکات بۆ کەسی ئەو وتاڕادەی بە دەرکردن دانی لە کارەکەی ونانبڕینی لەلایەن هەڤاڵانی کۆنەوە. لەوە دەچێت ئەو جەنگانە ونانبرینەی زۆر کاریگەری هەبوبێت بەسەریەوە، بۆیە داد وپەنا دەبات بۆ زەعیمی تەنها عبدالريم قاسم ودەڵێت: ئێمە دژی سەردەمی گۆڕبەگۆڕین کە رزق ونانی شاعیری گەورە معروف الرصافی یان بڕی، چونکە دژی پاشا وڕژێمەکەی بوو، ئەوەتە منیش ئەمڕۆ کە شاعیرێکم لەو کەمتر شاعیر نیم ونیشتیمان پەروەرێی دڵسۆزم ودیموکراتێکی شیلگێرم موحارەبەم

دەکەن لە ڕزقم لە سەردەمی عبدالکریم قاسم دا، نەك لەبەرئەوەی دژی کۆمارم، بەڵکو چونکە من عبدالکریم قاسمم لە خرۆشۆف ومارکس ولینین خۆشتر دەوێت، وعێراقم لە یەکێتی سۆڤیەت خۆشتر دەوێت....بە هەر شێوەیەك بێت شیوعیەکان لە کۆتاییدا دەتوانن بەدەرکردنی بدەن لە کارەکەیدا، دوایی دەیەوێت وەك مترجم لە کۆمپانیایەکی نەوت کار بکات، ئەویشی لێ تێک دەدەن! ببینە باسی پەنجاکانە هەمان عەقڵیەتی پەنجاکان ئیستا لە کوردستانیش پیادە دەکرێت، بزانن یەکیك ناحەزیانە وا هەوڵی نانبڕینی دەدەن هەتا لای کەرتی تایبەتیش جێگای نەبێتەوە. لە کۆتایی ئەو ئەلقەیە دەڵێت: " ئێوەش ئەی جگەر گۆشەکانم کوڕەکەم [غیلان] وکچەکەم [غیداء] خواتان هەیە، ناهێڵێت لە برسان بمرن، ئەگەر دادپەروەری مرۆڤ کەموکوڕی تێدایە، ئەوە دادپەروەری خوا کامیلە وکەس لە رزقی بۆ نوسراوی مەحروم ناکات! ل٣٢

## بەدر شاکر سەیاب: من شیوعی بووم!

## بەشی دووەم

## خوێندنەوەی محەمەد هەریری

ئێستا بەدر شاکر سەیاب بوەتە ئەندام لە حزبی شیوعی عێراقی ونازناوی ]جەریر] بۆ خۆی هەڵبژاردوە، ئەو کاتە قوتابی ساڵی دووەم بوو لە خانەی مامۆستایانی باڵا [دار المعلمین العالیة] کە ماوەی خوێندن تیایدا پێنج ساڵ بوو. سەیاب نامەیەکی پشتگیری وتەزکیەی لە ئەحمەد عەلوان، بەرپرسی حزبی شیوعی لە ابو الخصیب وەرگرتوە، کە دەربارەی دەڵێت: ئیرانی بوو بە ڕەچەڵەك، وماوەیەك لەگەڵ حزبی تودەی ئێرانی کاری کردوە! شیوعیەکان بە گەرمی پێشوازیان لێیکرد لە خانەی مامۆستایان، وسەیاب دەڵێت جۆریك لە ئازادی هەبوو بۆ قوتابیان ئەو کاتە بۆ دروستکردنی یەکیتیەکانی قوتابیان، ئێمەی شیوعی ژمارەمان زۆر کەم بوو، هەر پێنج شەشیك دەبووین. باسی هەڵبژاردن هاتە گۆڕێ ودەستمان کرد بە هەڵمەتی هەڵبژاردن "بۆ لای هەر کۆمەڵێك دەچووین بەپێی هەوەستی ئەوان لەسەر تەلی ئارەزووی ئەوان ئاوازی خۆمان لیدەدا، لە نێو قوتابیە کوردەکان بڵاومان کردەوە کە نەتەوەپەرستەکان ڕقیان لە کورد ونەتەوەکەیەتی، بەڵام ئێمە بە برای خۆمانیان دەزانین، بەڵکو لەبەر چاوی ئەوان دەستمان کرد بە جوێندان بە عەرەب ونەتەوەی عەرەب، وتانە

وتەشەرە لیدانیان، ودەمانگووت میژووی عەرەب تەنها بریتیە لە كۆمەڵێ قەسابخانە وكوشتاری، وسەركردەكانی عەرەبیش تەنها كۆمەڵێ دەرەبەگی حەقیرن وخوێن ڕێژن" جولەكە پێویستیان بە بانگەشەی ئێمە نەبوو، هەرخۆیان لەگەڵ شیوعیەت دابوون، وئینجا لەسەر وەتەری تائیفیەت دەماژەنی، وبۆ هەندێكی تر هەڤاڵانی كجانی خۆمانمان دەنارده لایان بۆ كێشكردنی لاوان بۆ لای خۆمان.! سەیاب خۆی كاندید دەكات، چونكە خۆشەویست دەبێت، دەردەچێت لە هەڵبژاردندا لە كۆتاییدا دەبیتە سەرۆكی یەكیتی، و جاسم حمودی یش دەبیتە جێگری، هەرچەندە جاسم بە واقیع سەرۆك بوو، چونكە ئەندامێكی باڵاتر بوو لە حزبی شیوعی، بەڵام خۆی نەیویست ببێتە سەرۆك تا لە سێبەر بمینێتەوە وخۆی زۆر دەرنەخات، ولەكاتی قوربانیدا من ببمە قوربانی... چونكە لە حالەتی دەركردن لە خوێندن حزب بە دەركردنی پیاوی متمانەپێكراوی خۆی زیاتر زیانی لێ دەكەویت وەك دەركردنی من، كە ئەندامێكی ئاسایی بووم!! ل٣٤

ئەو جاسم حمودی یە پاش دەرچوون گیرا و دانی بە هەموو زانیاریەكان هێنا، وەك دەیان سەركردە وئەندامانی باڵای حزبی شیوعی عێراقی، دوایێ بۆ دان نەهێنێت، كە بەر لەئەو مالك سیف، سكرتێری حزب، ویەهودا صدیق ی جولەكە، ئەندامی لیژنەی ناوەندی و رەفیق چالاك، كە ئەویش سكرتێری حزب بوو لە پاس مالك سیف دانیان بە هەموو زانیاریەكانیان هێناوە !رەفیق چالاك پاش دانپیداهێنەكانی مالك سیف، بەیانیكی دەركرد وتێدا هاتبوو " : دووپشكەكانی مالك سیف هێشتا كونە دوپشكەكانیان تۆكمەتر دەكەن لە ناو حزب، دەبێت لەناویان بەرین، خیانەتی مالك سیف دووبارە نابێتەوە"!! لەگەڵ ئەو پاڵەوانبازیە كە گیرا خیانەتی كرد ودانی بە شتەكاندا هێنا و وەك پۆلیس كاری كرد لە بەشی لێكۆڵینەوەی تاوان!!! ل٣٥

بەدر شاكر سەیاب دەڵێت: ئەگەر خیانەتی مالك سیف پاكانەیەكی بۆ بكرێت، كە لە دواییدا وتی بۆیە وایكرد تا حزب لە دەستی جولەكە و زایۆنیزم ڕزگار بكات، بەڵام خیانەتی ڕەفیق چالاك هیچ بیانوویەكی بۆ نادرۆزێتەوە، رەفیق چالاك لە گەرەكیكی جولەكان گیرا، وگووتی من ناوم [ابغاهام] ە واتە [ابراهام] وتەنها جولەكەیەكی هەژارە، بەڵام پاش لێدانی دوو داری حەیزەران هاواری لێ هەستا وبە زمانی كوردی گووتی: " زانم"، ماشەڵلا لەو كوردیەی سەیاب! مەبەستی [دەزانم]ە، ودانی بە هەموو زانیاریەكاندا هێنا!! ئینجا دوایی باسی هاندانی قوتابیان دەكات بۆ مانگرتن وپشێوی نانەنەوە، كە كۆتایی دێت بە دەركردنی سەیاب بۆ ساڵێك لە خانەی مامۆستایان.

سەیاب دەڵێت هەوڵمان دا پەیوەندی بە ڕۆژنامەكاندا بكەین بۆ روماڵكردنی مانگرتنەكەمان، بەڵام هیچیان ئامادە نەبوون، تەنها ڕۆژنامەیەكی تایفی بەناوی [الساعة] كەمێك بایەخی نیشاندا، كە حسین مروة ی خەباتگێریش لە دەستەی كارگێری بوو، ئەو كاتە تایفی بوو، پێمان

وتن: كێشه‌كه‌ی ئێمه‌ هه‌رگیز په‌یوه‌ندی به‌ شیوعیه‌ت نیه‌، به‌ڵكو كێشه‌ی نێوان سونه‌ وشیعه‌یه‌" !!ئه‌و حه‌قاره‌ت وبه‌دره‌وشتیه‌ ده‌بینیت له‌ ئێمه‌دا؟ ئێمه‌ی شیوعی خه‌باتگیر ودوژمنی جیاوازیه‌ دینی وڕه‌چه‌ڵه‌كیه‌كان چۆن ده‌دواین؟!

هه‌ڤاڵ حسین مروة [ببورن هێشتا نه‌ببوو به‌ هه‌ڤاڵ!] له‌منی پرسی: تۆ شیعه‌یت؟ گووتم: به‌ڵێ، گووتی: ده‌ڵێن تۆ شیوعی. گووتم: ته‌نها واوێكیان بۆ هه‌قیقه‌تم زیاد كردوه‌ ، یانی شیعی یان كردۆته‌ شیوعی!!!

له‌ ئه‌ڵقه‌ی شه‌شه‌مدا باسی گه‌ڕانه‌وه‌ی ده‌كات بۆ لادیكه‌ی خۆی له‌ به‌سره‌ پاش ده‌ركردنی له‌ خانه‌ی مامۆستایان، ده‌ڵێت ئه‌و چه‌ند مانگه‌ی له‌وێ بووم گه‌رموگورترین چالاكی حزبی من بوو، هه‌وڵی بی برانه‌وه‌مان ده‌دا له‌ پێناو ڕاكێشانی جوتیاره‌ ساویلكه‌كان ولادییه‌ فه‌قیرحاڵه‌كان بۆ ناو حزب! كه‌ له‌گه‌ڵ مامم عبدالحمید، متمانه‌پێكراوی حزبی شیوعی وخزمێكی ترمان ده‌چووینه‌ ماڵه‌ جوتیاره‌كان ومه‌جلیسی شه‌راب خواردنه‌وه‌مان ده‌به‌ست له‌ گه‌ڵیان، زۆر سه‌رسا ده‌بوون، كه‌ چۆن ده‌چینه‌ كه‌پر و كوخه‌كانیان وئه‌ره‌قیان له‌گه‌ڵ ده‌خۆینه‌وه‌ وله‌ دڵه‌وه‌ ده‌یاندوێنین، عه‌قڵیان فڕی بوو به‌و ڕه‌فتارانه‌مان!

چونكه‌ به‌ بیریان گوزه‌ری نه‌ده‌كرد ئێمه‌ی خاوه‌ن بیستان وموڵك وله‌و خێزانه‌ ناودارانه‌، ته‌وازوع بنوێنین، و سه‌ردانی ئه‌وان بكه‌ین! په‌نامان ده‌برده‌ به‌ر فریودانیان، چونكه‌ ماقوڵ نه‌بوو بۆ جوتیارێكی ساویلكه‌ باسی مادیه‌تی دیاله‌كتیكی بكه‌ین، وبڵێین خاڵی سه‌ره‌كی ئه‌و فه‌لسه‌فه‌یه‌ نكولی كردنه‌ له‌ عه‌قڵی ڕه‌ها، وماده‌ بنچینه‌ی بوونه‌، واته‌ نكولی كردن له‌ بوونی خوادا، وله‌ناوبردنی هه‌موو به‌ها روحی و دینیه‌كان كه‌ ئه‌وان باوه‌ڕیان پێیبوو!! ل ٤١ پێمان ده‌گووتن: شیوعیه‌ت یانی هه‌وڵدان بۆ نه‌هێشتنی جیاوازیه‌كان له‌ نێوان خه‌ڵكدا، تا كه‌س له‌كه‌س باشتر نه‌بێت، وهه‌وڵدان بۆ دابه‌شكردنی زه‌ویه‌كان به‌سه‌ر جوتیاران، كه‌ ئه‌وه‌م بیرده‌كه‌وێته‌وه‌ هه‌ست به‌ ڕووقایمی وده‌به‌نگی ده‌كه‌م، جونكه‌ ئه‌و مولكدارانه‌ی بێستانی دارخورمایان هه‌یه‌ له‌ به‌سره‌ وئه‌بو خه‌سیب، له‌ هه‌قیقه‌تدا خه‌ڵكانێكی هه‌ژار بوون یان مامناوه‌ندی حاڵ بوون له‌ چاكترین ئه‌گه‌ردا، داهاتی ساڵانه‌ی ئه‌و مولكدارانه‌، كه‌ ناومان نابوون به‌ ده‌ره‌به‌گی بۆگه‌نی ئیستیغلالی ٦٠٠ دیناری ساڵانه‌ بوو، واته‌ مانگانه‌ داهاتیان ٥٠ دینارێک ده‌بوو!! ئاوا یاریمان به‌ ژێیه‌ هه‌ستیاره‌كانی ئه‌و جوتیاره‌ ساویلكانه‌ ده‌كرد، چونكه‌ برسێتی ئه‌وان بۆ زه‌وی، ئه‌و برسێتییه‌ ترسناكه‌ی كه‌ له‌ باوباپیرانیان بۆیان جێمابۆوه‌، ئامانجی خۆی له‌ تراویلكه‌ی سوری شێوعیه‌ت دۆزیه‌وه‌، وه‌ك ده‌ریچه‌یه‌ك بۆ هه‌ناسه‌دان لێیه‌وه‌!

کە ئەو دێرانە دەخوێنمەوە ئێستا تێدەگەم چۆن کاتی خۆی شیوعیەکان جوتیارانی کوردستان ودەشتی هەولێریان سەرتاسەر ڕاکێشابووە ناو حزبی شیوعی، ئەوە بەو جۆرە قسە وباسە فریودەرانە بووە. ئەو جۆرە پەیمان و خەیاڵ پڵاویە لە هەست ونەستی جوتیاران جیگای خۆی کردبوەوە، بەجۆرێك هاوسەنگی خۆیان لەدەست دابوو. بە نموونە باسی حەمەدێك دەکات کە جوتیارێکی سادە بوو ببوە شیوعی، ڕۆژیکیان لە مەجلسی خواردنەدا لەبەر خراپی جۆری عەرەقەکە، حەمەد خراپ سەرخۆش دەبێت وکۆنترۆڵی لەدەست دەدات و گوزارش لە خەونە ترسناکەکانی دەکات : " دوێنی چومە لای خاوەن بێستانەکەم وگووتی وەرە حیسابم لەگەڵدا بکە و نرخی ئەو خورمایەی فرۆشتوتە بمدەرێ. پێمگووت :خورمای چی و بێستانی چی؟!... تۆ بێستانت نیە، ومن جوتیارم وخاوەنی بێستانەکەم، کە درئژەی دایی دەنکێ خورمای السایر م تێیگرت، کە نە مرد دەمانچەکەم پڕکرد بە خورمای حلاوي، وپەنجەم پێوەی نا وکوشتم، دوایی پۆلیس هاتن گرتمیان وبەندیان کردم لە زیندانی ئافرەتان، ڕۆژانێکی خۆشم لەو زیندانە بردەسەر، بینە بەرچاوت حەمەد لەناو سەدان ئافرەتی جوان بێت؟؟"!

سەیاب دەڵێت: " خەونەکانی حەمەد جیاوازی نەبوو لەگەڵ خوەنی هەر شیوعی یەکی تر، دزین وزەوتکردنی پارەی خەڵك، وکوشتن، وهەتك کردنی ناموسی خەڵك، لە مانگەکانی مۆتەکەی سووری ترسناکدا دیمان چۆن ئەو خەونانە جێبەجێ دەکەن یەك بەدوای یەکدا، بینیمانن چۆن ماڵ ودوکانی خەڵك تاڵان دەکەن، مناڵانیان خەڵك دەکوژن، وکاری وا قێزەونیان کرد کە قەڵەم زاتی ئەوە ناکات بینوسێت!! ل٤٣ ئینجا باسی بێ ناوەرۆکی وتەفاهەتی شیعرەکانی خۆی دەکات کە بە بۆنە شیوعی یەکان دەینوسین، ودەڵیت کە شیعری شاعیرانی غەیرە شیوعی بەراورد دەکەین بە شیعری شیوعیەکان ئەو کاتە دەزانی بۆ چ ئاستێکی نزم دابەزیون ئەوانەی شەرم ناکەن ناو لە خۆیان دەنین شاعیر!! ئینجا باسی ڕۆڵی تێکدەرانەی جولەکەکانی ناو حزبی شیوعی دەکات بە زمانێک تاڕادەیەك عەرەبچیەتی ورەگەزپەرستی پیوە دیارە. لە ئەڵقەی حەوتەمدا سەیاب لەوە دەچێت زۆر ڕوحی نوکتەی تێدا بو بیت، باسی روداوێکی زۆر خۆشی کوردێك دەکات ودەڵێت: " هاوڵاتیەکی کوردی خەڵکی کوردستان بەژداری خۆپیشاندانێکی شیوعیەکانی کردبوو، مەجلیسی عورفی بە چەند مانگیك حوکمی دابوو، شیوعی یش نەبوو، بەڵکو هاوڵاتیەکی چاك بوو و وڵاتی خۆی خۆشدەویست. ئەو چەند مانگەی کە حوکمدرا بوو زۆر بە درێژی دەبینی وئارامی لی بڕا بوو، لەبەر خۆیەوە بە ناورانەوە دەیگووت: شەش مانگ!! تەنها دوو مانگی تێپەڕاندبوو، دەیگووت بەچی باقی ماوەکە تەواو دەبێت؟! هەڤاڵە شیوعیەکان کە زۆربەیان حەسقەلیەکان [واتە جولەکە] بوون، پێیان دەگووت: بێ ئومێد مەبە، جەماوەری شۆڕشگێر دێت وڕزگارمان دەکەن لە زیندان وبەسەر شانەوە هەڵمان دەگرن!

بەو قسە بەتاڵانە قەناعەتیان پێ هێنابوو، ڕۆژێك داوایان لێکردبوو سروودە بەناوبانگەکەیان لەگەڵدا بچڕێت : السجن لیس لنا نحن الاباة السجن للمجرمین الطغاة، زیندان بۆ ئیمەی سەرکەش نیە، زیندان بۆ ملهورە تاوانبارەکانە! ئەو هەژارە لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەو سروودە شەش مانگی تر خرایە سەر حوکمەکەی! دیسان بێزارتر بوو لە جاران، هەڤاڵان دیسان پێیانگووت: بێ ئومێد مەبە، جەماوەر ڕادەپەڕێت و دێت ورزگارمان دەکەن لە زیندان وبەسەر شانەوە هەڵمان دەگرن !دیسان متمانەی بەو پەیمانە خۆشانە کرد، توانیان پاش ماوەیەك قەناعەتی پێ بهێنن بەشداری لە مانگرتنیکیان بکات، وکیشمەکیش لە نێوان ئەوان ودەسەلاتی زیندان دروست بوو، ڕایان کیشانەوە بۆ دادگا، ئەو برادەرە کوردەمان ساڵێکی تریشی بۆ بڕایەوە! لە ئەنجامی ئەوەی ڕویدا ئەو هەژارە دوچاری هەژانی دەروونی وعەقڵی هاتبوو!

بۆ شەش مانگ هاتبوو کە پێی زۆر بوو ئێستا دەبیت دوو ساڵ بکێشێت، دیسان دەستی بە بێزاری دەربڕین کرد، حەجمانی نەمابوو .هەڤاڵان دیسان دڵنیایان کردوە کە جەماوەری شۆڕشگێر دێت ورزگارمان دەکەن لە زیندان وبەسەر شانەوە هەڵمان دەگرن! کابرا لە توڕەییان وەك بورکان تەقییەوە وهاواری کرد: جەماوەر، جەماوەر، کوان لە کوێن؟ ئەو واو واوانە بۆ نایەن ڕزگارم کەن؟!" ل ٤٨ بەدر شاکر سەیاب دیسان باسی دیاردەی بێ ناوەرۆکبوون وهیچگەرایی شیعر دەکات کاتێ بە ڕوحیەتێکی ئایدیۆلۆژیەوە دەهۆنرێتەوە، هەتا ئیدانەی شیعرەکانی خۆشی دەکات ودەڵێت زۆر بێ کەڵك وهیچ بوون، بە نموونە باسی شیعرێکی نازم حیکمەتی شیوعی وشیعرێکی ئیدیس ستوێل کە خانمە شاعیرێکی ئینگلیز بوو، دەڵێت ئەوەی شیعرە هیچەکەی نازم حیکمەت دەخوێنێتەوە وشیعری Edith Sitwell دەخوێنیتەوە توشی سەرسوڕمان دێت، شیعرەکەی حیکمەت ج بستە باڵایەکە لە چاو شیعرە مەزنەکەی ئێدێس!!

ئینجا باسی دیاردەی تێکشکاندنی بەها ڕەوشتیەکان دەکات لەلای جوتیارەکان لە ژێر کاریگەری بانگەشەکانی شیوعیەت، وباسی حەمەد دەکات وەك نمونە، چۆن جوتیاریکی هەڤاڵی نەخۆش کەوت، و لە نەخۆشخانە کەوتبوو، لە جیاتی یارمەتی دانی دایکی پیر وژنەکەی، کە ئافرەتێکی شۆخ و جوان بوو، حەمەد دەچوە لایان بە چەند جگەرەیەك کە دەیدایە دایکە پیرەکەی، دوایی بە دزیەوە دزەی دەکردە سەرجیی ژنە جوانەکەی!! دەڵێت ئامانجی خەباتەکەمان فێرکردنی رەوشتی بەرز نەبوو، بەڵکو وروژاندنی تەماعی وکینە بوو، کە تێیدا زۆر سەرکەوتوو بووین!

ئینجا هانی زەعیم عبدالکریم قاسم دەدات بۆ وەستان بە ڕووی شیوعیەت وپشتگیری لە وتاری زەعیم دەکات کە تێیدا ئاشووب وئاشووبگێڕی مەحکوم کرد وەك ئاماژەیەك بۆ کارە

ئاشووبگێڕیەکانی شیوعیەکان. ئینجا باسی جوتیاریکی تر دەکات، کە لای باپیری کاری دەکرد وهەموو کەرەستەکانی کشتوکاڵی لەگەڵ خۆیدا دزی وکاری بەجێهێشت. کە باپیرەی ناردی بەدوای جوتیارەکە ولێی پرسی: بۆچی ئەو کەرەستە وئامرازانەت بردوە؟ زۆر بە ڕوو قایمیەوە وەڵامی دایەوە: ئەو ئامرازانە هی منە، منی جوتیار! باپیرەی هیرشی بۆ برد ولە عەرزی دا وبەربوە گیانی بە حەیزەران، سەیابیش کە لەو کاتە ڕۆمانی دایکی مەکسیم گۆرکی ی دەخوێندەوە، خرۆشا بوو، نێوانیانی کرد ودارەکەی لە دەست باپیرەی دەرهێنا وخستیە دەستی جوتیارەکە تا لە باپیرەی بدات، وخۆم دەستیم بەرز دەکردەوە تا لە باپیرەم بدات کەچی زاتی نەکرد!

ئەو کارەم ئەو کاتە بە پاڵەوانیەك ژمێردرا، وسەرکەوتنیك بوو بۆ جوتیاری زەحمەتکیش، هەتا ئەگەر دزیشی کردبیت لە دەرەبەگێکی چەپەڵ! لە ئەڵقەی هەشتەمدا سەیاب باسی چەندین نمونەی تری دارِمانی ڕەوشت وئاکاری شیوعیەکان دەکات، لەوانە باسی ڕوداوێکی ئێران دەکات، ودەڵێت شیوعیەکان لە عیراق بن یان لە ئێران هەمان دارِمانی ئاکاریان هەیە. دوایی باسی روداوێکی تری جوتیارە بێ ڕەوشتەکەی بە ناوی حەمەد دەکات، دیارە حەمەد بەلایەك بووە بۆ خۆی بۆیە سەیاب وا نەمری دەکات بە نوسین؟! پاش تەواو بوونی پشووی هاوین، سەیاب دێتەوە بەغداد وسەردانی حسین شبیبی وهەڤالانی دەکات، کە بەرپرسی بەغدادی حزبی شیوعی عێراقی بوو، دەڵێت حسین نایابترین جگەرەی ئینگلیزی پێبوو، نیوەڕۆکەی لەگەڵ ئەوان نانم خوارد، هەرگیز نانی وا خۆشم نەخواردبوو، ئینجا حسین شبیبی تەکلیفی دەکات ببیتە بەرپرسی حزب لە خانەی مامۆستایان پاش دەرچوونی جاسم حمودی، بەڵام دەڵێت لەبەر ئەوەی من زۆر ئاشکرا بووم بۆ دەسەڵات وساڵێکیش فەسڵ کرابووم، داوام کرد یەکیکی تر هەڵبژێرن

، هەرچەندە هیچ چالاکیەکی حزبم تێنەدەپەڕاند. دوایی باسی خۆ پیشاندانێك دەکات بە حەیزەران و خوترمەوە، ودوایی کە پۆلیس دێت هەموویان ڕادەکەن تەنها خۆیی وچەند کەسێکی کەم نەبت، وترسنۆکی شیوعیەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ باوەڕ نەبوونیان بە زیندووبوونەوە وژیانێکی تر! دەڵێت کەسێك لە ئەفسەرێکی پۆلیسی پرسی چیان دەوێت ئەو خۆپیشاندەرانە؟ لەوەڵامدا دەڵێت: نازانم دەیانەوێت لینین بهێنن وبیکەنە پاشا! هەرچەندە پێکەنیم بەو قسەیە بەڵام ئێستا دەزانم راست دەکات ، هەرچەندە بە شێوەیەکی ساویلکە گوزارشی لێکرد، چونکە ئەوەی شیوعیەکانی هەموو دنیا هەوڵی بۆ دەدەن – شیوعیە یوگسلاڤیەکانی لێ دەرچێت- تەنها بەستنەوەی وڵاتیان بە سوکانی سۆڤیەت وخستنە ژێردەستی کەرملینە! ڕوداوی ژەنەراڵە سۆڤیەتیەکەت نەزانیوە کە بوە وەزیری بەرگری لە حکومەتی پۆڵەندای شیوعی؟!! ل٦٠.

هەر لەو سیاقەدا باسی سیاسەت هاوردەکردن دەکات بە پیی میزاجی بەرپرسە شیوعیەکە، کە کاتێ هەندێ بازرگان داوای هاوردەکردنی کوتاڵی ژاپۆنیان کرد کە سەرەڕای چاکی مادەکە وهەرزانی نرخی، رەتیانکردەوە مۆڵەتیان پێ بدەن بە بیانوی ئەوەی ژاپۆن وڵاتێکی پاشکەوتوخواز ورەجعیە، وگوتی ئەگەر دەتانەوێ لە چینی شیوعی گەلێر هاوردە بکەن! گوتیان نرخی چین گرانترە! گووتی گرنگ نیە، جونکە چین وڵاتێکی دۆستە وخورمایەکی زۆریشی لە عێراق کریوە! دواجار لە چین کڕیان، کە کوتاڵەکان گەیشتن ولەناو کارتۆنەکان دەریانکرد لە سەریان نوسرابوو لە ژاپۆن دروستکراوە، دیاربوو چینیەکان عێراقیەکانیان فریو دابوو!!

## بەدر شاکر سەیاب: من شیوعی بووم!

## بەشی سێیەم

## محەمەد هەریری

لە ئەڵقەی هەشتەمدا ٢٥ ئاب ١٩٥٩، سەیاب ناکۆکیەکانی زۆر پەرە دەسێنێت لەگەڵ شیوعیەکان دەگاتە ڕادەی ئەوەی برایەکی بچوکی خۆی، مصطفی شاکر السیاب، وتارێکی لە دژدا بنوسێت لە ڕۆژنامەیەکی سەربە حزبی شیوعی بە ناوی [أتهم اخي]!! براکەم تۆمەتباردەکەم!
سەیاب زۆر بە گاڵتە جاریەوە باسی ئەو وتارە و نووسەرەکەی دەکات وناوی دەنیت بە نووسەرۆکە [الكويتب] دەڵێت چۆن وەڵامی منداڵێکی پۆلی چواری ناوەندی وقوتابیەکی فاشیلی وا بدەمەوە، کە فریویان داوە ئەو کارە بکات؟!

براکەی بە زمانێکی زۆر رۆمانسیانەی شۆڕشگێرانە دەڵێت: " خۆی دۆزیەوە لەناو شەڕێکی حەتمیدا، وپێویستە شەڕەکە بکات لە بەرژەوەندی هێزە نیشتیمانیەکان "واتە شیوعیەکان! ل٦٥
سەیاب دەڵیت سەرەڕای ئەو هەموو پەیمانانەی بە هەژار وجوتیار وکرێکارانی دەدەن، کەچی کە چنگێکتان لە دەسەڵات گیر بوو، هەڤاڵانی گەورە بەرپرس تان بوونە خاوەن ساختمان وباڵەخانە وئۆتۆمبیلی گرانبەها وزەواجی هەڵەخەرجی گەورە، وەك ئێستا دەبینین؟!
دیارە گەندەڵی ئەحزابەکانی عێراق زۆر کۆنە، ئەوە باسی ١٩٥٩ دەکات!
براکەی سەیاب دەڵێت، سەیاب نوسراوێکی بە دەستی خۆی نوسیوە دان بە تاوانەکان وهەڵەکانی دەنێت بەرامبەر حزبی شیوعی!!

سەیاب لە وڵامدا دەڵێت: ئەو برایەم بەردەوام سەردانی دەکردم بۆ لۆمەکردنم لەسەر دەرکردنم لە کارەکەم، ودەیگووت ئەوان هێشتا تۆیان خۆش دەوێت، وعزیز الحاج کە هاوڕێی خوێندنم بوو لە خانەی مامۆستایان دەیەوێت بمبینێت، سەرەڕای ئافرەتانی ماڵەوەش هەر هانیان دەدا بۆ چوونە لای عزیز الحاج. کاتێ سەیاب دەچێت بەس جمال حەیدەری هەولێری وحمزە سلمان لەوێ دەبن، وداوای لێدەکەن باسی ناکۆکیەکانی لەگەڵ حزبی شیوعی بنوسێت تا بریارێکی پێویست سەبارەت بەو کێشەیە دەربکەن. سەیاب دەڵێت لاپەرەیەکم نووسی وباسی جیرۆکی [المومس والعمیاء] و [الاسلحة والاطفال]م کرد وەك پێشتر باسم کرد. جەمال حەیدەری کە دەیخوێنێتەوە دەڵێت: باشە، بەڵام هەڵەی خۆتت دیاری نەکردوە!! ئەوەی ئەدەبیاتی شیوعی خوێندبیتەوە دەزانێت ئەو ئیعترافات نووسینە تەقلیدێکی سیاسی باوی سەردەمی شیوعیەت بوو، و زۆربەی جار پاش نووسینی ئیعترافاتەکان دەیانکوشتن!

سەیاب دەڵێت نووسیم تەنها هەڵەی من ئەوەبوو کە وەڵامی هێرش وجوێنی شیوعیەکانم بە هێرش وجوێن دایەوە! وەڵامی سەیاب بۆ براکەی زۆر توند دەبیت تا ڕادەی گاڵتەکردن بە کەسایەتی وبچمی براکەی، لەوە دەچێت سەیاب زۆر بریندا بوو بێت بە وتاری برا بچووکەکەی کە بە هاندانی هاندانی حزبی شیوعی لەسەری نووسیبوو. لە ئەڵقەی دەهەمدا سەیاب باسی چۆنیەتی گیرانی هەڤاڵی نەمر [فەهد] دەکات، و دەڵێت: لە ساڵی ١٩٤٥ حزبێک بە ناوی [حزب التحرر الوطني] دامەزرا کە تەنها ڕوپۆشێك بوو بۆ حزبی شیوعی، خەڵك نەیدەزانی پاشکۆیەکی حزبی شیوعیە کە فێرە بە دامەزراندنی سەندیکای کرێکاران ویەکێتیەکانی قوتابیان وکۆمەڵەی جوتیاران وسەندیکای مامۆستایان!! گەنجێك بە ناوی عبدالوهاب و خوشکی [خ] زۆر بە گەرم وگوڕیەوە هاتنە ناو حزب وناودار ببوون بە تێکۆشانیان.

باوکیان قەساب بوو، کاتێك هەڤاڵان دەگیران، خواردن وگۆشتی بۆیان دەنارده زیندان بە دەستی [خ]. یەکێك لە بەرپرسان ئەو ڕۆژەی ئازاد بوو شوێنی نەبوو لێی بژێت، باوکی [خ] داوای لێکرد لە ماڵی ئەو ژوورێکی پێدەدات ولێی بمێنێتەوە، [خ] یش کچێکی جوان بوو، هەڤاڵ یش بە بیانووی تەسقیف کردنی هەر خەریکی داگیرکردنی بیر ودوایش جەستەی بوو، کار لە کار ترازا وهەڤاڵ کچەکەی کردە ژن! هەر پاش ئەوە بیانووی دۆزیەوە بار بکات بۆ شوێنێکی تر! کە کچە زگی بەرزبوەوە وباوك وبرای لێیان پرسی کێ لەگەڵی خەوتوە، گووتی ئەو هەڤاڵەی لە ماڵمان دەژیا، گووتیان ئاسانە لەگەڵی قسە دەکەین وقەناعەتی پێ دەکەین زەواجت لەگەڵ بکات، بۆ ئەوەی ئابڕومان نەچێت!

كە قسەیان لەگەڵ كرد گووتی: نامەوێ ستەم لە كچەكە بكەم بە هێنانی، چونكە من ڕۆژێک لە دەرەوەم، بیست ڕۆژ لە زیندانم، كاریشم نیە!! ل ٧٤ باوكەكە گووتی: ئێمە هیچمان ناوێت لە سەتركردن ونەهێشتنی ئابڕووچونمان، من ئامادەم بۆ بە خێوكردنی ئەو وتۆش، بەڵام هەڤاڵی [نەمر] سوور بوو لەسەر ڕەتكردنەوە!! باوكەكە هانای بردە بەر هەڤاڵ [فەهد]، فەهد كە قسەی لەگەڵ كردبوو، ئەوجارە بیانوێكی تری هێنابوەوە: "هەڤاڵ دەزانیت زۆر شت هەیە باوەڕمان پیی نییە بەڵام ناچارین موسایەرەی كۆمەڵ بكەین كە ئیمانی توندی پێیان هەیە، وەك ئیمان بە خوا ودینەكان، كە ئێمە ناتوانین بڵێین خەڵكینە باوەڕ بە خوا مەكەن چونكە نیە....ڕاستە ئێمە باوەڕمان بە جیاوازی مەزهەبی وتایفی نیە، بەڵام خۆی بەسەرمان دەسەپێنێت! دەزانیت من لە تایفەی فلانم [شیعیم] و[خ] لە تایفەی فلانە [سونەیە]، ئەگەر من هاوسەرگیری بكەم لە گەڵیدا، ئەوە باوكم كە ڕێوڕەسم و كاری دینی دەكات بەرامبەر بە پارە، ئەگەر خەڵک بزانن كوڕی ژنێكی هێناوە لە تایفەیەكی تر، دەمریت لە برسان وپایەی كۆمەڵایەتیمان زەرەرمەند دەبێت!! لە ئەنجامدا باوك وكوڕەكە بۆ ئاشكرانەبوونی فەزیحەتەكە كچەكە دەكوژن!! تاوانی شەڕەف بەدەستی شیوعی!

دوایی كوڕەكە بۆ تۆڵە سەندنەوە دەچێتە لای بەڕێوەبەرایەتی لێكۆڵینەوەی تاوان، ودەڵێت برادەرێكم منی ناردوە پێتان بڵێم، كە ئامادەیە جێگای فەهد و كەسانی تریشتان نیشان بدات، بە مەرجێك خۆی تاوانێكی كردوە دەیەوێت لێی خۆش بن! گوتیان باشە لێی خۆش دەبین ئەگەر مرۆڤیشی كوشتبێت، عبدالوهابی برای [خ [گووتی: منم ئەو كەسە ی كە شوێنی فەهد تتان نیشان دەدەم، منیشم كە خوشكی خۆم كوشتوە، چونكە هەڤاڵێك زینای لەگەڵدا كردبوو، بەو شێوەیە فەهد گیرا لە پێناو ڕابواردنی ئەو هەڤاڵە. سەیاب دەڵێت: لە ئیران دیتم كاتی ڕامكردبوو بۆ ئەوێ، چیرۆكی خۆیی بۆ گێڕامەوە بە چاوی پڕ لە فرمێسك!! ل٧٥

لە ئەڵقەی یازدەدا سەیاب باسی [لەتیفنوف ] دەكات، گوایە پێی زانیوە كە من لەسەریم نووسیوە ودەڵێت شكات دەكەم! سەیاب دەڵێت بێ منەتم وباسی چەندین شتی خراپتری دەكات وەك دزینی پارەی ئابوونەی جوتیاران وشتی تریش. باسی نامەی براكەشی دەكات كە دەڵێت: مەبەستت چیە لەو نووسینانەی دژی حزبی شیوعی؟! سەیاب لە وەڵامدا دەڵێت: ئێمە لەشەڕێكی عەقائیدی داین لە دژی شیوعیەت، چونكە مەترسی شیوعیەت كەمتر نیە لە مەترسی ئیمپریالیزمی چەپەڵ!...ئێمە لە جیهاد داین وبەرگری دەكەین لە نەتەوەمان و ئایینمان وداب ونەریت و سەربەخۆییمان! ل٨٢

له‌ ئه‌ڵقه‌ی دوازده‌مدا سه‌یاب باسی هه‌لپه‌رست حزبی شیوعی ده‌كات كه‌ به‌ژداریه‌كی ئه‌وتۆی نه‌بوو له‌ ڕاپه‌ڕینی كانونی شكۆدار، كه‌چی پاش سه‌ركه‌وتنی شۆڕش هه‌موو قاره‌مانیه‌ته‌كه‌یان دایه‌ پاڵ خۆیان، ئه‌وه‌ی شه‌هید بوو له‌ حزبیكی ناسراو نه‌بوو، گووتیان شیوعی بوو! ئینجا ده‌ڵێت شیوعیه‌كان به‌ ئاشكرا دژایه‌تی عروبه‌ ده‌كه‌ن وشعوبین، وله‌و پێناوه‌ هه‌ڵه‌یه‌كی گه‌وره‌ ده‌كات وه‌ك كاردانه‌وه‌ كه‌ ستایشی سته‌مكارێكی وه‌ك حجاج بن یوسف الثقفي ده‌كات ه‌ده‌ڵێت محمد شرارةی هاوڕێی له‌ بۆنه‌یه‌كدا زۆر هێرشی كرده‌ سه‌ر ئه‌و " قاره‌مانه‌ی كه‌ ویستی كوفه‌ بپارێزێت له‌ داگیركردنی فارسی، وفه‌رمانی كرد له‌ غه‌یری عه‌ره‌ب كه‌س نه‌یه‌ته‌ ناو كوفه‌وه‌!!" دیسان دێته‌وه‌ سه‌ر باسی [مادلین] كچه‌ جووه‌ شیوعی یه‌كه‌ ده‌كات، كه‌ سه‌یاب ده‌ڵێت: زۆر جوان بووه‌ وده‌ڵێت: ئاره‌زووم لێی بوو! به‌ڵام سه‌یاب زۆر به‌ سووكی وبازاڕی باسی جووه‌كانی حزبی شیوعی ده‌كات، به‌ نێر ومێ یان ده‌ڵێت نا شه‌ریف، به‌ زمانێكی زۆر بازاڕیانه‌ی ناو ژینگه‌ دواكه‌وتوه‌ عه‌ره‌بییه‌كان! هه‌تا كه‌ باسی برای مادلین ده‌كات ده‌ڵێت: برایه‌ [شه‌ریفه‌كه‌ی] شی ئه‌ندام بوو له‌ حزبی شیوعی، كه‌ زیندانی بوو له‌ نوگره‌ سه‌لمان، وهه‌ڤاڵان سوودیان لێی بینی، خۆشی به‌خش بوو پێیان!! ل ٨٨ دوایی كه‌ پۆلیس به‌دوای مادلین ده‌گه‌ڕێت له‌ ژێرزه‌مینێك دایده‌نێن له‌گه‌ڵ هه‌ڤاڵ باسم [بهاءالدين نوري] ئه‌و دۆن جوانه‌ به‌ ناوبانگه‌ی سلێمانی كه‌ به‌رله‌وه‌ی ببێته‌ سكرتێری حزب، توانی لاقه‌ی بكات، دوجار مادلین گیرا وله‌ زینداندا منداڵێكی بوو ناوی نا سه‌لام! سه‌یاب ده‌ڵێت دكتۆره‌ عدوية محمود ادیب شاهێدی ئه‌و له‌دایك بوونه‌ بوو وله‌به‌ر ئه‌و هۆیه‌ نا ڕه‌وشتیه‌ش حزب و شیوعیه‌تی جیهێشت.

له‌ ئه‌ڵقه‌ی سێزده‌مدا سه‌یاب باسی دڵ ڕه‌قی وقه‌سوه‌تی شیوعیه‌كان ده‌كات وباسی ڕه‌وشتی خراپیان ده‌كان به‌ گشتی وده‌ڵێت: شیوعیه‌كانی هه‌موو دنیا وان ته‌نها ئه‌وانه‌ی یوگسلافیای لی ده‌رچێت !! بۆ سه‌لماندنی ئه‌و قسه‌یه‌ نمونه‌یه‌ك له‌ ڕۆمانی [الارض البكر حرثناها] ی شۆلۆخۆف ده‌هێنێته‌وه‌، كه‌ چۆن بێ ڕه‌حمانه‌ هێرش ده‌كه‌نه‌ سه‌ر كۆلاكه‌كان تالانیان ده‌كه‌ن وهه‌تا جلوبه‌رگی منداڵانیان وبوكه‌ڵه‌ ویاریه‌كانیشیان تالان ده‌كه‌ن! كاتێك كه‌سێكی به‌ ویژدان به‌ ناوی ئه‌ندرێ، ناڕه‌زایی ده‌رده‌بڕێت له‌سه‌ر ئه‌و كاره‌ نامرۆییانه‌، هاوڕێیه‌كی پێی ده‌ڵێت: هه‌ی چه‌په‌ڵ! وا خزمه‌تی شۆڕش ده‌كه‌یت؟ تۆ دڵت پری به‌زه‌ییه‌، به‌ڵام من ده‌توانن هه‌زاران پیر وپه‌ككه‌وته‌ ومنداڵم بۆ ریزكه‌ن، وبڵێن ده‌بێت بكوژرێن له‌ پێناو شۆڕش، هه‌موویان قر ده‌كه‌م به‌ چه‌كه‌كه‌م!! ل٩٥ له‌ ئه‌ڵقه‌ی چوارده‌هه‌مدا سه‌یاب به‌رده‌وام ده‌بێت له‌سه‌ر باسی ڕه‌وشت وئاكاری خراپی شیوعیه‌كان، كه‌من به‌ پێویستی نازانم درێژه‌ی پێ بده‌م.

له‌ ئه‌ڵقه‌ی پازده‌هه‌مدا سه‌یاب باسی هه‌ڵوێست سۆڤیه‌ت و شیوعیه‌كان ده‌كات له‌ دابه‌شكردنی فه‌له‌ستین، كه‌ چۆن پشتگیریان لێكرد، دوایی باسی جوله‌كه‌یه‌كی هه‌ژارو نه‌دار [صعلوك]

دەکات بە ناوی خضوری کە کۆنە مس وزەرد دەکرێت، کاتێك رەگەزنامەی لێ دەسێننەوە، بڕیار دەدات بچێتە ئیسرائیل، ئەو هەژارەی کە بەرگەی گەرما وسەرما وئەزیەتی خەڵکی دەگرت لە پێناو چەند درهەمێك، بەدیار کەوت خاوەنی دە هەزار دینارە، وسەرەڕای خەڵک باسی چاوچنۆکی جولەکە وپارەپەرەستیان دەکات کەچی خضوری بەبی دڵ لەدڵدان پارەکەی بەجێ هێشت لە پێناو ژیان لەوڵاتەکەی ئیسرائیل! منیش کە پێم دەڵێن شاعیر وئەدیب، وپارەنەویست کە قەسیدەیەکی چاکم پێ باشترە لە هەزاران دینار، خیانەتم لە نەتەوەکەم کرد ونکولیم کرد لە هەموو بەها ڕوحیەکانی لە پێناو چیدا؟ ئەو بیرۆکەیە ئەشکەنجەی دەدام وهەوڵم دا لە دەستی ڕاکەم بە ئەرەق خواردنەوە وئالوودەبوون پێی، بەڵام هەر ڕاوی دەنام تا ئەو ڕۆژەی لە بیری شیوعیەت ڕزگارم بوو. ل١٠٨

## بەدر شاکر سەیاب: من شیوعی بووم!

## بەشی چوارەم

## محەمەد هەریری

لە ئەڵقەی شازدەهەمدا سەیاب پەشیمانی دەردەبڕێت لەو ڕۆژگارەی کە مامۆستا بوو لە ناوندی ڕومادی ١٩٤٨ – ١٩٤٩ کە چۆن سێ چارەگی دەرسی بە باسکردنی شیوعیەت وپرنسیپەکانی مارکسیزم دەبردە سەر، وئەو گەنجە هیمەت بەرزانەی وڵاتی فریو دەدا بە قسەی شیرین وخەونی ڕەنگاوڕەنگ وگفتی هەنگوینی، تا پێیان هەڵدەخلیسکێ بۆ ناو چاڵی کۆمەنستی، ئەو کاتە دڵیان پڕ دەبێت لە حیقد وحەسەد وشەڕ! ئەو دیاردەیە ئایدیۆلۆژیە ئێستاش باوە، ئیسلامیەکان قوتابخانە و دەرسەکانیان بە تەواوی کردۆتە خزمەتی فیکرەکەیان، جاروبار بە چەوساندنەوەی خەڵکیتری جیا کۆتایی دێت، وەک شەڕیان دژی ئافرەتە بێ سەرپۆشەکان، کە چەندین چیرۆک وڕوداوی لەو بارەم بیستوە، ناودارترینیان بابەتەکەی شنە خالید بوو. دیسان باسی ڕۆڵی کاریگەری جولەکەکان دەکات لەسەر شیوعیەکانی عێراق، ودەڵێت: فەهد لێیان دوو دڵ بوو ولەسەرەتادا نەیانتوانی پێدزە کەن بۆ ناو حزبی شیوعی، بۆیە جولەکە عێراقیەکان بە فەرمان وڕێنمایی زایۆنیزمی جیهانی وبە هاوکاری لەگەڵ چەند غەیرە جولەکەیەك توانیان حزبێکی شیوعی دامەزرێنن، کە ڕۆژنامەی نهێنیان بە ناوی [وحدة النضال] دەردەچوو .فەهد پێی ناخۆش بوو دوو حزبی شیوعی هەبێت، بۆیە داوای یەکگرتنی کرد، وئەوانیش قبوڵیان کرد وچونە ناو حزبی شیوعی، بەو شێوەیە توانیان بچنە ناو حزبی شیوعیەوە، ئەوەش سەرەتای داگیرکاری زایۆنیزم بوو بۆ حزبی شیوعی. ل ١١٤

لە ئەڵقەی حەڤدەهەم سەیاب باسی ڕوسیەک دەکات کەزۆر زەبەلاح وکەڵەگەت بووە، وپێییان سەیر بووە کەسێک لەو بەهەشتەی سەر دنیا ڕابکات بەپێی بۆچوونی شیوعیەکانی ئەو کاتە، دوایێ ڕوسەکە باسی ئەو دۆزەخەی بۆ کردوون کە ئەوان سەیریان پێهاتووە و گومانیان لێیکردووە..

ئەو ڕوداوە ئاساییە بۆ کاتی ئێمە، بەڵام لەو سەردەمە لە سایەی ئەو مەکینە زەبەلاحەی پروپاگەندەی سۆڤیەتی ئەوسا وەک خەیاڵ بوو کەسێکی ڕاکردوو لەو بەهەشتە خەیاڵیە ببینێت سەیاب دەڵێت سەرەڕای ئەو دروشمەی شیوعیەکان بەرزیان کردۆتەوە کە وتەیەکی مارکسە و دەڵێت؛ مرۆڤ پڕبەهاترین سەرمایەیە لە جیهاندا، بەڵام ئەوان گەورەترین دوژمنی مرۆڤن کە بە تەواوی دەیهاڕن...ڕوحی دەهاڕن وڕووتی دەکەنەوە و دایدەماڵن لە هەموو مافێکی لە گوزارشکردن دا. کە دەشڵێن مرۆڤ بۆ هەتایی فەنا دەبێت، نە قیامەت ونە زیندووبوونەوە ونە بەهەشت ودۆزەخ بوونیان نیە، ئەو شتانە تەنها وڕێنەی بۆرژوازین، بەو کارە لە نرخی مرۆڤ کەمدەکەنەوە وبێبەشی دەکەن لە نەمری وخلود، کە هەموو دینەکان موژدەی پێدەدەن.

لە ئەڵقەی هەژدەهەم وەڵامی گۆڤارێک دەداتەوە بە ناوی الوادي، کە ڕەخنەیەکی توندی لە سەیاب گرتوە سەبارەت بە سوک هەڵسەنگاندنی سەیاب بۆ شیعری شاعیرە شیوعیەکانی وەک نازم حیکمەت وسیمنۆف وکەسانی تریش، سەیاب جەخت دەکاتەوە لەسەر ناوەرۆک پووچی ئەو شیعرانەی لە ژێر فشار وزەغتی ئایدیۆلۆجیا دێنە بەرهەم. لە ئەڵقەی نۆزدەهەمدا باسی پروپووچی ئەدەبی شیوعی دەکات بە گشتی ودەڵێت کە شیعرێکی سیمنۆفی وەرگێڕاوە، بەڕاستی لە لوتکەی دزێوی وناوەرۆک پووچیە، کە منداڵێکی شەشی سەرەتایی دەتوانێت شتێکی وا بنووسێت وەک سەیاب دەڵێت؛ لە پێشەکی دیوانەکە.

سکورینۆ دەڵێت سیمنۆف شاعیرێکی شیوعیە، وچاک دەزانێت شتێک لە ئارادا نیە بە ناوی ئەدەبی ناحزبی، ئەو ئەدەبەی لە ژێر ماسکی ناحزبیەت خۆی دەشارێتەوە تا سەر ئێسقان بۆرژوایە. ئینجا هەر بۆ گاڵتە دوو دێر لە شیعری شاعیری هەرە گەورەی شیوعیەکان عبدالوهاب البیاتی دەخاتە بەر دیدمان کە دەڵێت؛ فالله في مدينتي يبيعه اليهود، الله في مدينتي قواد (نعوذ بالله) بەڕاستی سەیاب زۆر باش ئەو ناوە گەورە ودەرگا وێرانە دادەماڵێ، ئەو بەناو شاعیرەی کە هێندەیان پڤەدا ئەوەی نەشی دەناسی پێیوابوو شاعیرێکی مەزنە، سەیاب البیاتی تۆمەتبار دەکات بەوەی کە عەرەبیەکەشی باش نیە ونمونەیەکی تر دەهێنێتەوە، ە دەیسەلمێنێت کە کەسێکی نەخوێندەواریش هێندە نەزان نییە بە زمان وبە بەلاغەی عەرەبی .

لە ئەڵقەی بیست ویەک ودوودا سەیاب لە قوتابخانەوماmۆستایی دەردەکرێت، ودوایی هەر لە ماڵەکەی خۆیان لە گوندەکەیان دەیگرن وڕەوانەی بەغدادی دەکەن، هەر لەوڕۆژگارەدا

سەرکردەکانی حزبی شیوعی فەهد و حسین الشبیبی و زکی بسیم و یهودا سدیق لە سێدارە دەدرێن، هەرچەندە باسی یەهودا ناکەن ، چونکە دەیانگووت خیانەتی کردوە. دەڵێت پاش ئەو گورزە خەڵک زۆربەی لە حزب دەتەکێتەوە وکە گەرایەوە گوندەکەیان مامیشی گیرا بوو.، برای بچوکی مستەفا ببوە بەرپرسی حزب لە ئەبی خەسیب..

سەیاب دەڵێت لە ترسی وازهێنانی جوتیاران لە حزب هێندە وەعد ووعودی ڕەنگاڵەمان پێدەدان تا ڕادەی ئەوەی بە یارمەتی کەسانێک نەخشەی هەموو بێستان وزەویەکانمان کێشابوو وبە کەیفی خۆمان دابەشمان دەکردن بە سەر جوتیاران، ئەوانیش لەبەر ساویلکەیی خۆیان باوەڕیان دەکرد، بە تایبەتی کە نەخشە چاپکراوەکانیان دەدیت، چونکە باوەڕیان بەهەر نوسراوێکی چاپکراودا دەکرد. لە دواییدا لەپاش گیرانی شیوعیەکی نەجەفی برای سەیاب بە گرتن دەدات و لە ئەڵقەی بیست ودوودا کەس نامێنێت [لەتیف] لەتیفنۆف دەبێتە بەرپرسی حزب، دەڵێت هەواڵی نهێنی حزب لەسەر هەموو زمانێک بوو لە عەهدی لەتیفنۆف دا، لە ڕێگای ژن ومنداڵە حەوت ساڵەکەیدا!!! ل ١٤٩

لە ئەڵقەی بیست وسێدا سەیاب باسی ڕۆمانی بەناوبانگی جۆرج ئۆرویل دەکات بە ناوی [١٩٨٤] ودەڵێت ئەو کتێبە بە توندترین شێوە فەزحی شیوعیەت دەکات بەبێ ئەوەی هیچ باسی شیوعیەت بکات، بەڵام شیوعیەکانیش زوو زانیان لەسەر ئەوانە، پاش ئەوەی بە توندترین شیوە هێرشیان کردە سەر نووسەرەکەی ودەیان تۆمەتی ئامادەیان خستە پاڵی وەك خۆفرۆشی ئیمپریالیزم وجاسوس وهتد.. ئینجا بەراوردیک دەکات لە نێوان ڕۆمانەکە وحزبی شیوعی عێراقی، بەو شێوەیە لە ئەڵقەی بیست وچوار وپێنجییشدا سەیاب بەردەوام دەبێت لەسەر گێڕانەوەی ڕوداوەکانی ڕۆمانەکەی جۆرج ئۆرویل کە لیرەدا پێویست بە باسکردنی ناکات، ڕۆمانەکە بۆ ئەو کاتە زۆر شتێکی نوێ بووە.

لە ئەڵقەی بیست و شەشدا سەیاب باسی ئەو زیادەڕەویەی شیوعیەکان دەکات لە ڕۆلیان لە ڕوداو و شۆڕشەکانی عێراق ولە گەورەکردنی ڕۆڵی هاوڕێ فەهد دامەزرێنەری حزبی شیوعی عێراقی، دەلیت: " شیوعیەکان شانازی بە سەرۆکەکەیان دەکەن لە هەموو قۆناغێکی ژیانییدا لە سەردەمی منداڵیدا لە تەلکێفدا، وەك زانراوە لە بەرتلەی موسڵ لە دایکبووە لە خێزانێکی سریانی، ودوایی بە گەنجی لە ناسریە بوو، دوایی وەك قوتابیەکی دەرکراو لە حزبی نادینی، ئینجا وەك کرێکاری بەفر فرۆشتن لە ناسریە، ئینجا وەك قاوەفرۆش لە دوکانی براکەی لە بەسرە، وئینجا وەك سکرتێری حزبی شیوعی، دەلێ بە دووری نازانین بلین پێش دۆزینەوەی مارکسیزمیش بە مارکسی بزانن." مەبەستی سەیاب ئەوەیە هێشتا حزبی شیوعی

له حوکمدا نەبوو بە ڕەهایی کەچی لاسایی [برا گەورەی] ڕۆمانی ١٩٨٤ی جۆرج ئۆرویڵ یان دەکردەوە، ئەی کە دەسەڵاتیان گرتە دەست چۆن؟!

له ئەڵقەی بیست وحەوتدا سەیاب دیسان باسی ڕوداوەکانی کەرکوك دەکات بۆ جەندەمین جار باسی ڕوداوێك دەکات کە زیاتر له چیرۆکێکی هەڵبسەستراو دەچێت، گوایە شیوعیەکان پاش کوشتنی خێزانیك بە پیاو و ژن و منداڵەوە، منداڵێکی شیرەخۆر ماوە ومەمکی دایکی دەبرن دەیدەنە دەستی وئەویش دەست دەکات بە مژینی، ودوایی دەستی منداڵەکەش دەبڕن!!!!! ل ١٧٩

ئینجا دیسان ڕوداوکانی رۆمانەکە دەگیرێتەوە وله ئەڵقەی بیست وهەشتەمیشدا هەر باسی ڕۆمانەکە دەکات تا رادەیەک ناکرێت ئەو کارە وەك یاداشتی کەسێك حسیب بکریت. کۆتایی

## چی ئه‌بوو ئه‌گه‌ر مالیكی جێگای متمانه‌ی كورد با؟!

شه‌ڕی لێدوانه‌كانی مالیكی وبارزانی ئه‌گه‌ر له‌سه‌ره‌تاشدا كه‌مێك گشتگیری پێوه‌ دیار بوو، به‌ڵام وا خه‌ریكه‌ هێدی هێدی سیمایه‌كی شه‌خسی وه‌رده‌گرێت هه‌رچه‌نده‌ هه‌ردوو لا نكولی له‌ كه‌ساندن‌و شه‌خسه‌نه‌ی كێشه‌كه‌ ده‌كه‌ن، به‌ڵام له‌زۆربه‌ی سه‌ردێره‌كانی ئه‌و بابه‌ته‌ ناوی مالیكی وبارزانی پێكه‌وه‌ دێن، هه‌رچه‌نده‌ مالیكی جورئه‌تی كرد سنوری مام جه‌لال یش ببه‌زێنێت‌و له‌ نوێترین چاوپێكه‌وتنی له‌ گه‌ڵ كه‌ناڵی ئاسمانی (NRT) دا، كاتێک به‌ شێوه‌یه‌كی ناڕاسته‌وخۆ دواخستنی كێشه‌ی كه‌ركوكی خسته‌ ئه‌ستۆی ده‌سته‌ی سه‌رۆكایه‌تی كه‌ وتی ئه‌و وه‌ک سه‌رۆک وه‌زیر ئه‌وه‌ی له‌سه‌ری بوه‌ كردویه‌تی یه‌ک ملیار دۆلاری سه‌رفكردوه‌ بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌، به‌ڵام كاره‌كان له‌لای سه‌رۆكایه‌تی كۆمار وه‌ستێنرا كه‌ مام جه‌لال پێی وتوه‌ له‌به‌ر ڤیتۆی سێ ئه‌ندامه‌كه‌ی سه‌رۆكایه‌تی دواكه‌وتوه‌.

ئه‌وه‌ی مالیكی گوتی له‌ چاوپێكه‌وتنی كه‌ناڵی ئاسمانی(NRT) ئه‌گه‌رچی هه‌مووی نوێش نه‌بوون، به‌ڵام بای ئه‌وه‌نده‌ش زانیاری نوێی تێدا بوو كه‌ هه‌ندێكیان ڕاچله‌كێنه‌ر بوون، وه‌ك مه‌سه‌له‌ی نه‌هێشتنی مه‌سعود بارزانی له‌ به‌شداری پێكردنی گۆڕان له‌ حكومه‌تی عێراق، كه‌ كاتی خۆیشی ده‌نگۆیه‌كی وه‌ها هه‌بوو، به‌ڵام مالیكی له‌و چاوپێكه‌وتنه‌ به‌ته‌واوی دوپاتی له‌سه‌ر كردوه‌، ئه‌وه‌ش ئه‌گه‌ر ڕاست بێت به‌زۆر ده‌كه‌وێت له‌سه‌ر سه‌رۆكی هه‌رێم‌و په‌یوه‌ندیه‌كانی له‌گه‌ڵ هێزه‌ سیاسیه‌كانی سه‌ر گۆڕه‌پانه‌كه‌و به‌ تایبه‌تی هێزێكی گه‌وره‌ی وه‌ک گۆڕان كه‌ تازه‌ خه‌ریك بوو په‌یوه‌ندیه‌كانی له‌گه‌ڵ پارتی‌و یه‌كێتیش تا ڕاده‌یه‌ک به‌ره‌و ئاسایی كردنه‌وه‌ ده‌چوو، هه‌روه‌ها له‌به‌ر هۆیه‌كی تریش كه‌ ئه‌ویش هه‌ڵوێسته‌ جوامێره‌كه‌ی نه‌وشێروان موسته‌فا بوو له‌ به‌پیره‌وه‌ نه‌چوونی به‌ ده‌م بانگهێشتنه‌كه‌ی مالیكی بۆ لوتكه‌ی عه‌ره‌بی له‌ به‌غدا له‌ كۆتایی مانگی ئازارو ڕێگرتنی له‌ مالیكی له‌ درز خستنه‌ نێو ڕیزی كوردو قۆستنه‌وه‌و وه‌به‌رهێنانی بارودۆخه‌كه‌ كه‌ ده‌نگدانه‌وه‌یه‌كی زۆر پۆزه‌تیڤی هه‌بوو له‌لایه‌ن هه‌موو دۆست‌و نه‌یاره‌كانیشی بزوتنه‌وه‌ی گۆڕان‌و به‌ هه‌ڵوێستێكی كوردانه‌ بۆی تۆمار كرا.

ئه‌وه‌ی مالیكی باسی له‌باره‌وه‌ ده‌كرد له‌مه‌سه‌له‌ی یاساو ده‌ستور وپه‌یوه‌ست نه‌بوونی كورد به‌ یاساو ده‌ستوری عێراق له‌ مه‌سه‌له‌ی هێزه‌ سنوریه‌كان‌و كۆنترۆڵ كردنی گومرگه‌كان له‌لایه‌ن حكومه‌تی فیدراڵ‌و هه‌ناردەكردنی نه‌وت بۆ ده‌ره‌وه‌ به‌ قاچاغ وهاورده‌كردنی كه‌لوپه‌لی بێ ئه‌رزش‌و - كه‌ له‌ هیچ وڵاتێكی موحته‌ره‌م له‌ كۆنترۆڵی جۆری ده‌رناچێت- گومبوونی داهاتی نه‌وتی قاچاغ وپاره‌ی گومرگه‌كان، ده‌توانین بڵێین یه‌كه‌ به‌ یه‌كه‌ی ڕاسته‌و له‌ مێرد منداڵێكه‌وه‌ تا گه‌نج وپیرترین نێرو مێی كورد ئه‌و هه‌قیقه‌ته‌ ده‌زانن، ئاگاداری ئه‌و به‌ هه‌ده‌ردانه‌و

تالانكردنه‌ی سامانی ئه‌و میلله‌ته‌ن، ئاگاداری ئه‌و پێشبڕكێیه‌ گه‌نده‌ڵیه‌ن كه‌ تێیدا ئه‌وه‌ی زیاتر هه‌ڵلوشێت له‌ هه‌موان بلیمه‌تترو ئازاتره‌. یان ئاگاداری ئه‌و یاسا گه‌نده‌ڵه‌ن كه‌ ده‌ڵێت تا له‌ده‌سه‌ڵاتی بۆت ده‌كرێت هه‌ڵلوشه‌ چونكه‌ به‌خت جارێك له‌ ده‌رگا ده‌دات!!
به‌ڕای من ئه‌گه‌ر ئه‌و قسانه‌ی مالیكی، سه‌رۆك وه‌زیرێكی وه‌ك كامیرۆنی سه‌رۆك وه‌زیرانی به‌ریتانیا یان ستیڤن هاربه‌ری سه‌رۆك وه‌زیرانی كه‌نه‌دا له‌و ئاسته‌ به‌رزه‌ی په‌یوه‌ست بوونیان به‌ دیموكراسیه‌تو به‌ یاسا وبه‌رژه‌وه‌ندی باڵای به‌ریتانیاو كه‌نه‌دا دا بۆ خه‌ڵكی وێڵز یان ئوسكتله‌ندا یان هه‌رێمی كیوبیک یان كردبا، حكومه‌ته‌كه‌ی ئه‌و سێ وڵاتو هه‌رێمه‌ش هاووێنه‌ی حكومه‌ته‌ گه‌نده‌ڵستانه‌كه‌ی كورد بان، له‌ تالانی سامانی گه‌لو به‌ هه‌ده‌ردانی، له‌ هه‌مان ئاستی نابه‌رپرسیاره‌تی مێژوویی بان، ڕوحی پێناسی نه‌ته‌وه‌یان خنكاندبا له‌ پێناو به‌رژه‌وه‌ندی حزبیو بنه‌ماڵه‌یی ده‌كرا باوه‌ڕی پێبكه‌ین كه‌ كامیرۆنو ستیڤن هاربه‌ر له‌ خه‌می به‌رقه‌رابووونی دیموكراسیو ده‌ستوورو یاسا ئه‌و لێدوانانه‌ ده‌ده‌ن،و گومانم نییه‌ كه‌ خه‌ڵكی ئه‌و وڵاته‌ش پشتگیریان لێده‌كرد، وه‌ك چۆن خه‌ڵكی هه‌رێمی كیوبك له‌ كه‌نه‌دا له‌ دژی سه‌ربه‌خۆیی هه‌رێمه‌كه‌ ئه‌وه‌ بۆ چه‌ندین جاره‌ ده‌نگ ده‌ده‌ن، چونكه‌ ده‌زانن ده‌وله‌ت دامه‌زراوه‌یه‌و یاسا وده‌ستور سه‌روه‌رن، ڕۆژێک له‌ڕۆژان كه‌س بیر له‌وه‌ ناكاته‌وه‌ به‌ هێزی سه‌ربازی هه‌ڵكوتێته‌ سه‌ریان ویان هێز كۆكه‌نه‌وه‌ له‌دژیان...

ئه‌گه‌ر مالیكی له‌ ئاستی متمانه‌و كه‌سایه‌تی سیاسی كامێرۆنو ستیڤن هاربه‌ر بوایه‌ له‌ هه‌رێمه‌كه‌ی ئه‌و خه‌ڵک له‌سه‌ر جیاوازی تایفه‌گه‌ری نه‌كوژرابا، شه‌ڕی كه‌رخو ره‌سافه‌ی شیعه‌و سونه‌ی مێژوویی دووباره‌ نه‌ببوایه‌وه‌، هه‌موو كوردستان پێشوازیان لێده‌كرد له‌ ده‌ست بێزاریان له‌و هه‌رێمه‌ پڕ له‌ گه‌نده‌ڵیو نا عه‌داله‌ته‌...

ئه‌گه‌ر له‌ هه‌رێمه‌كه‌ی مالیكی گه‌نده‌ڵیو به‌ قاچاغ بردنی نه‌وت دوو هێنده‌ی قاچاغاكه‌ی ده‌سه‌ڵاتی كوردستان نه‌بوایه‌... هه‌موو خه‌ڵكی هه‌ریم به‌ ده‌میه‌وه‌ ده‌چوون، ده‌یانزانی مالیكی به‌ڕاستی خه‌می به‌ قاچاغ بردنی نه‌وتیه‌تیو هه‌ڵلوشینی پاره‌كه‌یه‌تیو هیچ مه‌رامێكی سیاسی له‌دوای نیگه‌رانیه‌كانی نییه‌.
ئه‌گه‌ر ئاستی گه‌نده‌ڵی له‌ ئاسته‌ ئابڕوبه‌ره‌كه‌ی كوردستانیش زیاتر نه‌بوایه‌،و منداڵی عێراق به‌ ئاشكرا له‌ بازاڕی به‌ندایه‌تی نه‌فرۆشرابان وه‌ک ڕاپۆرته‌كان باسی ده‌كه‌ن، خه‌ڵكی كوردستان باوه‌ڕییان به‌ خه‌مخۆریو لێدوانه‌كانی مالیكی ده‌هات له‌سه‌ر ڕێچكه‌ مافیاویه‌كه‌ی به‌رپرسانی هه‌رێم.
ئه‌گه‌ر شاره‌كانی باشورو ناوه‌ڕاست له‌ ئاستی خزمه‌تگوزاری ده‌ پله‌ له‌ خواره‌وه‌ی كوردستان نه‌بوایه‌، گومانم نییه‌ هه‌موو كوردستان پێشوازیان لێده‌كرد به‌ گوڵ، به‌ڵكو شاره‌كانی كوردستانیشی ده‌هێنایه‌ ئاستی شاره‌ چراخانه‌كانی ناوه‌ڕاستو باشوری عێراق...

ئەگەر مالیکی هەستو نیگەرانی کوردی نەوروژاندبا لە کەرکوک،و لێدوان وئیجرائاتی بەعس ئاسایانەی ئەنجام نەدابا، دوور نەبوو کورد بە تەواوی قسەکانی باوەڕ کردبا لەسەر کەمتەرخەمی دەسەڵاتی کوردی لەمەر دۆزی کەرکوکو کوشتنی ڕوحی کوردایەتی لەو شارە وزاڵکردنی سیاسەتی حزبایەتی وشەڕە پەڕۆ لە جیاتی...

ئەوە لە خۆشبەختی دەسەڵاتە گەندەڵەکەی کوردییە کە ئەمڕۆ سیاسیەکانی عیراق لەو ئاستە نزمەدان کە نابنە جێگای متمانەی خەڵکی کورد، یان سیاقی مێژوویی لە بەرژەوەندی دیارکەوتنی کەسایەتیەکی سیاسی وەک کامیرۆن وهاربەر نییە، دەنا یەک تۆزقاڵ گومانمان نییە هەر ڕزگارکەرێکی شایەنی متمانەی خەڵک لە دەرەوەو ناوەوە بەدەرکەوێت خەڵکی کوردستان هەموو دەدەنە پاڵی، چونکە ئەو دەسەڵاتە تا دێت گەندەڵو گەندەڵتر دەبێتو بڕیاریشی داوە نە بەخۆیدا بچێتەوەو نە فێری دەوڵەتداری بێت.

17-05-2012

# سەردەشت لە ڕفاندنەوە بۆ فڕاندن

**ڕفاندن و فڕاندن دوو وشەن یەکەمیان لە سلێمانی ودوەمیان لە هەولێر بۆ یەک مانا بەکاردێن، وهەژاریش لە هەمبانە بۆرینەکەی لەگەڵ یەکی ڕیزکردوون وەک هاوواتا لەبەرامبەر ڕفاندن هەژار نوسیویەتی فڕاندن. لە بۆ فڕاندن دەنوسێ: باڵ گرتنەوە، ڕفاندن کەوابوو هەردوو وشەکە یەک مانایان هەیە یان لە ڕێگای هەولێر بۆ سلێمانی لە فڕاندنەوە بۆتە ڕفاندن، یانیش لە ڕێگای سلێمانی بۆ هەولێر لە ڕفاندنەوە بۆتە فڕاندن. کەوابوو لە سلێمانی لەسەر شێوازی بەرنامە بەناوبانگە عەرەبیەکە [قل.... ولاتقل] بڵێ ڕفاندن ومەڵێ فڕاندن، لە هەولێریش بڵێ فڕاندن ومەڵێ ڕفاندن بەبێ خۆتێکدان وپێکەنین. ئەوانەی بەرگەی ڕەخنەکانی شەهید سەردەشتیان نەگرت، هەرچەندە توندیش بوون، هەردوو ماناکە وهەردوو شێوازی نوسینی وشەکەیان بەکارهێنا.**

پاش ئەوەی کەسایەتی سەردەشت بە دەستی خۆی ئاشکرا بوو، دەبوایە بیانزانیبا کە ئەو گەنجە زۆر هوشیارانە تەحەدا دەکات و باکی لە مەرگ نییە، بۆیە دەبوایە نەچنە ناو ئەو شەڕە دۆڕاوە، چونکە ئەگەر سەردەشت گیانی لە دەستدا، بەڵام بکوژانی هەموو ڕۆژێک ئیدانە دەکرێن وجوێن باران دەکرێن لەبەر خودی سەردەشت و لە پێناو مەرامی تریش بۆ حیساب ساف کردن، من گومانم نییە کە ئەو هەموو شینەی بۆ سەردەشت دەکرێت، هەمووی بۆ خودی سەردەشت نییە وبەشێکی زۆری وەك دەڵێن [بۆ حوسێن نییە، بەڵکو بۆ هەریسەکەیە]! بەڵام ئاسۆی مرۆڤی تورە زۆر بچوکە، بۆیە نەیانتوانی ئەو سەرەنجامانە ببینن و هەزار جار بیرکەنەوە بەر لەوەی دەستی بۆ بەر. لە ئەنجامدا سەردەشتیان ڕفاند [بە سلێمانی] وفڕاند ]بە هەولێری] لە سیناریۆیەکی زۆر لاواز و دزێودا کە ئەگەر ئەو برادەرەی سیناریۆکەی داناوە دەرهێنەری تەمسیلی تەلەفزیۆنی بوایە بێگومان خەڵاتی خراپترین دەرهێنەری بە نسیب دەبوو.

کە ڕفاندیشیان [بە سلێمانی [وفڕاندیان [بە هەولێری] لە خراپترین بەشی ئەو سیناریۆ فاشیلەدا دەبوایە بیریان بۆ هەرشتێک بچوبا بۆ خوێن ڕشتنی نەچوبا، بەڕاستی ئەگەر سەردەشتی جوانەمەرگ لەبەر ناحاڵی بوون لە هەندێك لە قسەکانی بە ڕوشێنەر وجوێن ودژی کەرامەتی کەسانێك لێکدراوەتەوە، بەڵام ئەوەی سەردەشت گوتبووی دەربڕینێکی ئەدەبی ڕووت بوو، هەرگیز نابێت بە حەرفی لێی وەرگیرێت وئەو پەنای بۆ کەرەستەیەک برد بۆ گەیاندنی واتاکانی پشت کەرەستەکانی کە ژینگەگە هێشتا ئاشنا نەبوون یان لە ئاستی

کەرەستەکان وهێماکان وئاماژەکانیدا نەبوون، وەک ئەو ڕادیۆیە بوو کە دەڵێن یەکەمجار کە گەیشتە سعودیە [جەزیرەی عەرەبی [زاناکانی وەهابیەت فەتوایان لە دژی دەرکرد، گوایە جنۆکە لەناو ئەو دەفرە داخراوەوە قسە دەکات، کە گوتیان باران لە هەڵمی ئاوەوەیە فەتوایەکیان دەرکرد بۆ بەکافرکردنی هەموو ئەوانەی وادەڵێن وبەناونیشانی:

السیف البتار في الرد على الكفار، القائلین بأن المطر من البخار!!!

سەردەشت پرۆژەی نووسەرێکی زۆر گەورە بوو بە ڕفاندن و کوشتنی بەو شێوەیە دڕەندانەیە سەردەشتیان فڕاند بە مانای دووەم واتە باڵیان تێڕواند چەند بەرز بوو، بەرزتریان کردوە وفڕاندیانە کەشکەڵانی ئاسمان... پێش شەهید بوونی نوسەرێکی نەناسراو بوو ولەژێر ناوی خوازراوەوە دەینوسی، لەوانەیە ژمارەی خوێنەرانی چەند سەد کەسێك تێپەڕی نەکردبا، بەڵام پاش شەهید کردنی بە ناهەق ژمارەی ناسراوانی لە کوردستانیش تێپەڕیوە بە ملیۆنەهایە.

سەدان کەس قەڵەمی داوەتە دەست قسەی وا بە بکوژەکانیان دەڵێن کە قسەکانی سەردەشت لە چاو قسەکانی ئەوان تەسبیحات کردنە!! ئەوەیە فڕاندن!

دەیەها ڕێکخراو وگروپ بەناوی سەردەشت عوسمانەوە دروست بوون! ئەی ئەگەر ئەوە فڕاندن نەبێت چی فڕاندنە؟

دەڵێن هەزاران دوکان لە بازاڕەکاندا داوای مۆڵەتی ناولێنانی دوکانەکانیان کردوە بە ناوی ئەو! ئەوە لوتکەی فڕاندنە بەبێ باڵ!

دەڵێن هەزاران کەس منداڵی خۆیان بەناوی سەردەشت دەکەن لە خۆشەویستی ئەو جوانە مەرگە. ئەی ئەگەر ئەوە شکاندنی ژمارەی پێوانەیی نەبێت لە فڕاندن دەبێت چی بێت؟ برالە سەردەشت بکوژەکانت هێندە پەشیمان بونەتەوە لە کوشتنت ئەگەر بۆیان بکرێ ئەوەی هەیانە دەخەنە ڕێی کڕینەوەی ژیانی تۆ، چونکە لە پاش مەرگتدا ژیانی ئەوانت نارەحەتتر کردوە. 07-05-2012 .

# پەیکەری کەر لە نێوان ئاژەڵدۆستی و کەربازاڕی

پەیکەرەکەی [کەرە ئەفەندیەکەی ] هونەرمەند زیرەک میرە لە سلێمانی مشتومڕێکی زۆری وروژاند، کە بەڕای من لەوانەیە لە شارێکی تربا هێندە کێشەی نەدەخوڵقاند .لەوانەیە کەسانێك بڵێن بۆ شارەکانی تر لە سلێمانی ڕۆشنبیرترن؟! نەخێر .بەڵام ئەو شارە مەخزونێکی گەورەی فەرهەنگی هەیە لە نوکتەی بێسەروبەرو وڕوشێنەر لەدژی شارەکان وخەڵکانی تری دەرەوەی سلێمانی وەک هەولێری و خانەقینی و کەرکوکی و بادینی و هەورامی.

کە پەیکەرەکە لە بەدبەختی سلێمانی لەوێ دانرا هەلێکی زێڕین بوو بۆ خەڵکی شارەکانی تر تا گاڵتە و لاقرتێ بە سلێمانی بکەن، چونە سلێمانی هەمیشە لە نوکتەکانی لەسەر شارەکانی تردا ئاماژە بەبێ عەقلّی وغەریب حالّی ئەوانی تر دەکات، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە کەری بەسەزمانیش بە ناهەق بە مەخلوقێکی دەبەنگ دەناسرێ، خەڵکی ئەوەی قۆزتەوە کە چۆن ئەو شارەی ناوی خۆی دەنێت بە پایتەختی ڕۆشنبیری ئەمڕۆ کەرێك دەکەنە سومبلی شارەکە و لە بەدبەختی خەڵکی سلێمانی کەرێکی عادیش نەبوو، بەڵکو بە چاکەت وپانتۆڵ وبۆینباغ لە مل و قەڵەم لە گیرفان بوو کە هەمووی هێما دەکەن بۆ کەسێکی ڕۆشنبیر یان بۆ ڕۆشنبیرانی شارەکە بەپێی لێکدانەوەی خەڵکی غەیرە سلێمانی!

هەندێ لەو کەسانەی سلێمانی کە خەریکی نوکتە وتانەن لەسەر شارەکانی تر، هەر ئەوانن لەدژی ئەو پەیکەرە قوت بونەتەوە، چونکە نوکتەکانیان هێندە بێتام وبایخ بوە لە لاشعوریان چۆتە قالّبی ڕاستیەوە، بە جۆرێک منالّەکانیان لەسەر پەروەردە دەکەن، بۆ نمونە کە ئەم ساڵ لە ئاهەنگێکی نەورۆزی قوتابخانەی کوردی منالان لە لەندەن کە گوایە ڕۆژێکە بۆ کوردایەتی، سەرەڕای ئەوەی چەندین نوکتە وترا لەسەر هەولێری و بادینی..هتد، بەوپەڕی بێ شعوریەوە، مندالّە ١٠ سالەکەم هاتە لام گوتی: بابە منداڵێکی سلێمانی پێم دەڵێ خەڵکی هەولێر ستیوپتن [دەبەنگن]!!

مندالەکان هێشتا وەک عەرەبێکی فێری کوردی بوو قسە بە کوردی دەکەن، کەچی دایك و باوکیان لە جیاتی کوردایەتی و خۆشەویستی کوردستان، فێری ڕق لێبونەوە و سوك سەرنجدانی شارەکانی تریان دەکەن، لە گۆڕەپانی سیاسیدا مەقولەتێك هەیە دەڵێن: ئەگەر لە کوردستان شەڕ هەڵگیرسا لە نێو دوو لایەن، مەپرسە لە نێوان کێ وکێ، بەڵکو بڵێ لە نێوان یەکێتی و کێ؟! لە بواری گاڵتەوەش دەڵێی کەسانێك لە سلێمانی ئەو یاسایەیان لەبواری گالتەجاری ولاقرتێ کردن بە خەڵکانی تر جێبەجێ کردوە، هەر کە گاڵتە کرا بە هەولێری و

بادینی و کەرکوکی و هەورامی و خانەقینی، ئەوە بە شێوەیەکی حەتمی تەرەفی یەکەم [واتە گاڵتەکەرەکە] کەسێکی سلێمانی دەبێت!

ئەگینا ئاژەڵدۆستی هیچ نەنگی نییە نە بۆ سلێمانی و نە بۆ هیچ شارێکی تر، و کە سوپای ئەسەدی تاوانبار قەسابخانەی کەریان کرد هەر بۆ گاڵتە بە قەد کوشتنی ئادەمیەکان پێی دڵ تەنگ بووین بەبێ ئەوەی ئەندامیش بین لە حزبەکەی عومەر کلۆڵ!!

کێشەی دوەمی کاک زیرەکی پەیکەرتاش بوونی حزبێکی کۆمیدی کەرگەلی کوردستان بە سەرۆکایەتی نێرەکەری یەکەمی وڵات هەڤاڵی تێکۆشەر عومەر کلۆڵ کە دەفەرموێ: کورد کەرە و عەرەب حوشترە، وتورکمان مانگا!!! کێشەی کاک زیرەک لەوەدا بوو خەڵکی کە وێنەی کلۆڵی لەبەردەم پەیکەرەکەدا دیت وایانزانی کاک زیرەکی پەیکەرتاش عەیب نەبێ ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبەکەی کلۆڵە!! بەڕای من سەرەڕای پێکەنین وخۆشی بەدیار قسەکانی عومەر کلۆڵ کە لە چاوپێکەوتنەکانی مردوو دەخاتە پێکەنین کاتێ لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ تەلەفزیۆنێکی لوبنانی دەڵێت: "انا اکبر حمار فی کوردستان!"، ئەو پیاوە بەو سنورونکردنە و [تەماهی بوونەی] لەگەڵ کەر زیان بە دۆزەکە دەگەیەنێت، واتە دۆزی کەر، کە من پێموایە ئەگەر حزبەکەی کلۆڵ لە چوارچێوەی ئاژەڵدۆستی گشتی و بەزەیی بە ئاژەڵ بوایە زۆر کاریگەرتر دەبو، هەرچەندە کارەکتەرێکی کۆمیدی کەربازاڕی گەورەی وەک کلۆڵمان لەدەست دەدا، بەڵام سودی بۆ هەموو گیاندار و ئاژەڵەکان دەبوو... چونکە هەر کەر دڵ ڕەقی بەرامبەر ناکرێت، مندالی کورد لە منداڵیەوە فێری رەفتارکردنێکی زبر و نامرۆیانە دەبێت لەدژی کەر و سەگ وپشیلە وچۆلەکە وچەندین زیندەوەری تردا! خودایە بمانبەخشە خۆشمان قوربانی ئەو پەروەردە گشتیە سەقەتە بووین تا تێگەیشتین سەدان ئاژەڵمان ئەزیەت دەدا، بەڵام لە ئێمەش دڵ ڕەقتر هەبوو بەرامبەر ئاژەڵ لەبیرمە [ئەردەڵان]ی گۆرانی بێژی ڕەحمەتی مەشهور بوو بە ئەزیەت دانی کەر و ئاژەڵی گەرەکی خانەقای هەولێر، یەک لەو جارانەی بە چاوی خۆم دیتم کەرێکی بەستبۆوە نایلۆنی بە ئاگرتواوەی بەسەر کەری بەستەزمان دادەکرد، دوایش ئەو ڕۆمانسیەی لێدەرچوو کە هەر باسی خۆشەویستی دەکرد!!

کاتێ کلۆڵ بەقسە کۆمیدیەکانی خۆی کەر دەکات، گوایە بەرگری لەکەر دەکات کاریگەری ناکاتە ١% ڕەخنەکانی خانمە ئەکتەری فەرەنسی بریژت باردۆ کە ساڵانە لە جەژنی قورباندا ڕەخنە ئاڕاستەی موسڵمانان دەکات لەسەر سەربڕینی قوربانیەکانیان!! یان ناگاتە ١% پامیلا ئەندەرسۆنی ئەکتەری نیمچە پۆرنۆ وروژاندن کە بەو دواییانە ڕەخنەی لە شای ئیسپانیا گرت بە هۆی ڕاوکردنی فیل لە پۆتسوانا لە ئەفریقیا و گوتی ئەو کارەی شا "ڕەوشتێکی هەمەجی و وەحشیگەرییە و گوزارش ناکات لە پیاوەتی !!"

تا شای ئیسپانیایان ناچارکرد داوای لێبوردن بکات و بڵێت:" من غەڵەتم کرد، داوای لێبوردن دەکەم، جارێکی تر دوبارەی ناکەمەوە!!" ئەوەیە ئاژەڵدۆستی نەک کەربازاڕیەکەی عومەری کلۆڵ!

hariri66@yahoo.com

01-05-2012

## ڕاستە جنێودان ڕەوشتی خراپە، بەڵام هەموو جوێندانێك لە بێ ڕەوشتی نییە!

سەرۆکی هەرێم لە ٢٠١٢/٨/٢٨ پەیامێکی گرنگی نارد وەك سەرۆکی پارتی بۆ هەموو ئەندام و هەڤاڵانی پارتەکەی تێیدا داوای لێکردبوون کە خۆیان لە زمانی جنێودان دوور بگرن، چونکە "جنێودان چەکی ئەو کەسانەیە کە بێ دەسەڵات و بێ ڕەوشتن"

ئەوەی کەمێک باوەڕی بە دیموکراسیەت ومافە سەرەکیەکانی مرۆڤ هەبێت دەبێت هاوڕا بێت لەگەڵ سەرۆک لەو پەیامەدا، چونکە بەداخەوە ئەمڕۆ فەیسبوک و سایتەکان لێواو لێوبوونە لە جنێو و قسەی ناشیرن وسوک بە یەکتر، نەك تەنها لە نێوان دەسەلات و ئۆپۆزسیۆن، بەڵکو لە نێو خودی دوو باڵەکەی دەسەڵاتیش، کە وابزانم پەیامەکەی سەرۆک بە تایبەتی ئاراستەی ئەوان کراوە، وەک لە وەلامە ناڕاستەوخۆکەی عیماد ئەحمەد دەردەکەوێت، سەیر لەوەدایە پارتی لەو وڵاتە ناتوانێت هیچ بڕیارێک یان یاسایەك تێپەڕێنێت ئەگەر بەسەر پردی یەکێتیدا نەپەڕێتەوە، هەتا یاسای دەزگای ئاسایشی هەرێمیش کە نارەزایەکی بەرفراوانی لێکەوتۆتەوە لە هە موو نێوەندەکان، کەچی ئەو یەکێتیانە لە جیاتی ئەوەی بە هەڵوێستەکانی خۆیاندا بچنەوەو بە ڕێکەوتنە بەناو ستراتیژیەکەیاندا بچنەوە هاتوونە چەند پەیجێکیان لە فەیسبوک دروست کردوە کاریان بەس سوکایەتی کردنە بە پارتی و بارزانی وەك بڵێی ئەوان لە دەسەڵاتدا نەبن وهیچ بەرپرسیارەتیەکیان لەسەر شان نەبێت لەو کارەساتانەی دەقەومێت لەسەر دەستی دەسەڵاتی کوردستاندا!

لە بەشێکی تری پەیامەکەی سەرۆك هاتوە: " هەر کەس خاوەن هەر بیرو باوەڕو بۆچوونێك بێت، ڕای خۆی بە مەنتقی دەر دەبڕێت، ئەوەی خاوەن هیچ بیرو باوەڕێکیش نەبێت پەنا بۆ جنێودان دەبات"

کەوابوو ئەوەی دوور لە جوێن وتەشهیر و بە شێوەیەکی مەنتیقی رەخنە دەگرێت ودەنوسێت کارێکی ڕاست ودروست دەکات بەپێی پەیامەکەی سەرۆك، بەڵام ئایە ڕاستە ئەوەی بەو شێوەیە رەخنە دەگرێت یان دەنوسێت دوورە لە سزای مادی ومەعنەوی دەسەڵات؟! من باوەڕ ناکەم، بۆیە پێویستە سەرۆك چۆن جنێودان بە بێ ڕەوشتی ناوزەد دەکات بە هەمان شێوە هەڕەشەش ئیدانە بکات و قەدەغە بکات وبڵێ هەڕەشەش بێ ڕەوشتیە وەك جوێندان. هەروەها پێویستە هەموو جۆری پێشێلکردنی مافی دەربڕین لە خەڵك قەدەغە وئیدانە بکات، ونەهێڵێ جڵەوی دەسەڵات بکەوێتە دەستی کەسانێك لەڕێگای زوڵم وستەمەوە وێنەی خۆیی ومێژوو وحزبەکەشی بشێوێنن.

شتێکی تریش کە پێویستە سەرۆك سەرنجی بدات ئەوەیە، ڕاستە جوێندان ڕەوشتێکی زۆر خراپە، هەتا من منالەکەم لە قوتابخانەکان لە پارکەکانی لەندەن منالە بێ تەربیەتەکان کە جوێنی پێدەدەن، ودێتەوە لامان نازانێت هەتا جوێنەکانیش مانای چیە، فێری ناکەینەوە کە جوێنەکەی پێ بداتەوە لە جیاتی فێری وشەی شیاوتری دەکەین، بەڵام هەموو جوێندانێك لە بێ ڕەوشتی نایەت، بەڵکو وەك سەرۆك خۆی ئاماژەی پێداوە لە بێ دەسەڵاتیەوە دێت!!

نازانم سەرۆك چۆن ڕازی دەبێت هاوڵاتی بێ دەسەڵاتی هەبێت لە وڵاتەکەیدا؟! باسی وڵاتانی پێشکەوتوو ناکەم کە چەمکێك نییە بە ناوی هاوڵاتی بێ دەسەڵات و بەدەسەڵات، جیاوازی نێوان هاوڵاتیەکان تەنها لە جۆری بەرپرسیاریەتیانە. ئەگەر بەس بچیتە سەر یوتیوب دەبینی چۆن دکتۆرێك بەو پەڕی توندیەوە بە دەیقێد کامێرۆنی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا هەڵدەشاخێت، چونکە پەیڕەوی مەرجە تەندروستیەکانی نەکردوە لە نەخۆشخانەکە لە کاتی سەردانی بۆ لای نەخۆشێك، یان شاگردێك لە بۆنەیەکی تر لێی دەخوڕێتەوە چونکە پەیوەستی نەکردوە بە سەرە گرتن، ئەو کاتە دەزانی شتێك نییە بە ناوی هاوڵاتی بێ دەسەڵات و بە دەسەڵات لە دنیای تازەدا، ئاگاداریشین ئەو دکتۆرو شاگردە نە کەس گرتنی ونە فەسڵیانی کرد لە کارەکەیانداو نە سوکایەتیان پێکرا!

با نەڵێین هەر باسی عەدالەتی ئەوروپا دەکات، کە شایەنی ئەوەشە هەردەم باس بکرێت، با باسی نمونەیەکی ئاینی ئیسلام بکەم کە حەزرەتی ئەبوبەکر لە وتارێکی دا دەفەرموێت: "خەڵکینە بومە سەرداری ئێوە، چاکترینشتان نیم، ئەگەر چاك بووم هاریکاریم بکەن، ئەگەریش خراپ بووم ڕاستم کەنەوە، بێ دەسەڵات و لاوازەکانتان لای من بەهێزن تا هەق ومافەکانیان بۆ وەردەگرمەوە، دەسەلاتدارو بە هێزەکانیشتان بێ دەسەڵات ولاوازن تا ماف وهەقیان لێ دەسێنمەوە" أيها الناس قد وُلِّيت عليكم، ولست بخيركم، فإن أحسنت فأعينوني، وإن أسأت فقوموني... والضعيف فيكم قوي عندي حتى آخذ له حقه، والقوي عندي ضعيف حتى آخذ منه الحق إن شاء الله تعالى" بڕوانە لەو وشە جوانانە بە بێ دەسەڵات دەستی پێکردوە و ڕازی نابێت بێ دەسەڵات هەر هەبێت وهەموو مافەکانی پارێزراوە وکەس ناتوانێ مافی زەوت بکات هەتا دەسەڵاتدارەکانیش!!

ئێمە دەپرسین لە سەرۆك بارزانی: ئەمڕۆ لەو وڵاتەی کە تۆ سەرۆکیەتی چەند دەسەڵاتدار بە ناوی حکومەتەکەی تۆ وپارتەکەی تۆ وکەس وکاری تۆ ستەم لە بێ دەسەڵات دەکەن؟!! جەنابت دیوانێکی زوڵم لێکراوان دابنێ وگەرەنتی بدە خەڵک کە بە ئازادی سکاڵات لا بکەن، ئەو کاتە دەزانیت چەند ستەم وزوڵم دەکرێت بە ناوی تۆ!! زۆرن ئەوانەی لە پەنا دەسەڵات وناو وهێماکانی ئێوە ستەم لە کەسانێکی بێ دەسەڵات دەکەن، ئەو بێ دەسەڵاتانەی کە نە دەبوایە ئەو سیفەتەیان هەبوایە ئەگەر دادپەروەری و دەوڵەتی یاسا بەرقەرار بوایە. وەك

گوتمان ئێمە هەرگیز پاكانە بۆ جوێندان ناكەین، بەڵام كە بێ دەسەڵات كەس لێی نەپرسیەوە، وستەمی لەسەر لا نەبرا چی بكات بۆ خاڵی كردنەوەی ئەو هەستە تاڵەی جەور وستەم؟ لەوانەیە لە تاو كەساسی خۆی بە ناوێكی خوازراو جوێنێكیش بدات لێرە ولەوێ، ومەرجیش نییە كە جوێن دەدات لەبەر بێ ڕەوشتی بێت، بەڵكو لەوانەیە لەبەر بێ دەسەڵاتی وبێ دەرەتانی بێت، هەقە سەرۆك هەوڵ بدات ئەو جوێنانە ببڕێت بە دادپەروەری و یەكسانی و دەستگرتنی كەسانێكی دەوروبەری دەسەڵاتەكەی خۆی لە ستەم كردن بە ناوی حكومەتەكەی ئەو وحزبەكەی ئەو وبنەماڵەی ئەو.

**ڕۆژی بڵاوبونەوە**

31-08-2012

## موقتەدا چی دەڵی دەربارەی سەردانی هەولێر؟! کێشانەوەی متمانە و سەرۆك کۆمارو شەڕی تایفی

له وتارێکی درێژدا [موقتەدا سەدر] له ژێر ناونیشانی [الهـــدف النبيـل .. من زيــاره اربيــل/ مقتدى الصدر] که لەوە دەچێت بەشیک بێت له نوسینەوەی بیرەوەریەکانی باس له چەندین بابەتی گرنگ دەکات که پەیوەستن به سەردانەکەی بۆ هەولێرو مەسەلەی کێشانەوەی متمانه له مالیکی و هەڵوێستی هەموو لایەنەکان به شیعه وکورد وسونەی عەرەبەوە.

بەرله سەردانەکەی وادیاره ئێران لەسەر داوای مالیکی دانیشتنێک بۆ مالیکی وسەدر ڕێکدەخەن، تێیدا سەدر به شێوەیەکی ڕاشکاوانه ڕەخنه و سەرنجەکانی خۆی ئاڕاستەی مالیکی دەکات، دەڵێت: "له نێو ئەو ئامۆژگاریانەی که کردم له پێناو خوادا، گوتم: هەدام [مەبەستی سەدامه] نەفرەتی خوای لێ بێت زیاتر له بیست ساڵ لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی بوو، له حالەتی خۆ کاندیدکردنەوەت بۆ پۆستی سەرەک وەزیران بۆ سێیەم جار دەبیته [نیوەی سەدام]، له وەڵامدا گوتی :دەستور مافم پێدەدات جارێک و چوار جار و دە جاری تریش خۆم کاندید کەمەوە ...ئەو قسەیەی کرد زۆر به جدیەت که تۆزقاڵێک گاڵتەی پێوه دیار نەبوو"

موقتەدا زیاتر لەسەر نەزعەی دیکتاتۆریەتی مالیکی دەروات ودەڵێت" له قسەکان گەیشتمه ئەو دەرەنجامەی که دەیەوێت دەست بگرێت بەسەر دەوڵەت به وردو درشتەوە... لەوانەیه ئەو بیرۆکەیه ڕاست بێت له ڕووی [مەرکەزیەتەوە] بەلام من ڕازی نیم بەو میکانیزمەی که گرتویەته بەر بۆ گەیشتن به [مەرکەزیەت[، چونکه ئەو میکانیزمانه بەرەو [مەرکەزیەت]ی نابات، بەڵکو بەرەو[دیکتاتۆریەت [دەچێت.

ئینجا سەدر به سەرسوڕمانەوە ئاماژە به ئامادەبوونی [قاسم سلێمانی] سەرکردەی فەیلەقی قودس له ئێران و دەرەوە دەکات له ماوەی جیاواز جیاوازی دانیشتنەکه!! وەک بڵێی سەدر نەزانێت که قاسم سلێمانی حاکمی فیعلی عێراقەو وەک مەندوب سامییەکانی سەردەمی داگیرکەری بەریتانی و فەرەنسی رەفتار دەکات!.

کاتێ سەدر باسی نیازی سەردانی دەکات بۆ هەولیر،" مالیکی به پشتگیری [قاسم سلێمانی] پێی دەڵێن: نەچیت، چونکه لەڕووی ئاسایشەوە ترسناکه بۆ تۆ، وئاستی جەماوەریشت لاواز دەکات، کوردیان به جۆرێك وەسف کرد نامەوێ لێرەدا باسی بکەم"..

سەیر لەوەدایە موقتەدا نالْیت قسەکانیان دەربارەی سەرکردەیەکی کورد بوو، بەڵکو دەڵیت دەربارەی کورد بوو، دەبێت ئە دڵە توقیەچیانە چی تێدا بیت دەربارەی کورد.

هەر لە بەشیکی تری وتارەکەیدا دێتەوە سەرباسی ئەو بابەتە و دەڵێت" ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام قسەی ئەوانەی تەهران بوو لە [قاسم سلێمانی]وهەروەها مالیکی کە گوتیان چونت بۆ کوردستان دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی جەماوەریت....ئەوەش کەمێکی رویدا، لەو هاژە هاژە میدیایەی کە لە دژمان بەڕێوەیە بەشێوەیەکی ساختەکاروبەرنامەداڕێژی"..

موقتەدا وەسف کردنی سەردانەکەی هەولێری بە مێژوویی لە لایەن کوردەوە بەرز دەنرخێنێت و بە هەقی وەسف دەکات چونکە " بۆ یەککخستنەوەی ڕیزی عێراقیەکان بوو بە شیعە وکورد وسونەی عەرەبەوە، بەڵام کەسانێک هەن کە لەسەر تەلی تائیفیەت دەژەنن جارێکی تر زۆر بەداخەوە، بۆیە ئەو جۆرە بەیەک گەیشتنانە دنەی دەدات ودەیوروژێنێت ".

موقتەدا : کێشانەوەی متمانە لە سەرۆک وەزیران نەک لە [قائیدی زەرورە] بەراستی یەکێک لەو موفاجەئانەی کە لە موقتەدا رانەدیترا ئەوەیە بەو تێروانیە ئایندەییە بیربکاتەوە، موقتەدا نایشارێتەوە کە لە دڵسۆزی خۆی بۆ شیعەکانەوە ئەو کارەی کردو بۆ ئەوەی شیعە لە عێراق گۆشەگیر نەبیت بە دەستی کردەوەکانی مالیکی، بۆیە بە شانازیەوە ئیمزای لەسەر ئەو کاغەزە کردوە "کە میدیا تەنها جەختی لەسەر خاڵی هەشتەمی پەیوەند بە کێشانەوەی متمانەکردوە، نازانیشم بۆ ؟! دەستور پاڵپشتمان دەکات، وديموکراتیەتیش هەروەها، ئێمە باسی پرۆژەی کێشانەوەی متمانە لە سەرۆک وەزیران دەکەین نەک لە [قائیدی زەرورە] یان ]مەعسومێک] یان کۆڵەگەی [شیعەگەرێتی]....ئەگەر هەنگاوەکانمان یاسایی ودەستوری وبەڵکو جەماوەری بن، بە ئیعتباری ئەوەی کەسانی کۆبونەوەکە خاوەن پێگەی جەماوەری گەورەن، ونوێنەرایەتی زیاتر لە [١٨٠] کورسی تا [٢٠٠] کورسی دەکەن، ئەوە مانای ئەوەیە دەکرێت [کێشانەوەی متمانە] وزیاتریش ئەنجام بدرێت. گۆڕینی سەرۆک وەزیران و یەک دەنگی لایەنەکان لەسەر قبول کردن بە کاندیدێکی نوێی [هاوپەیمانی نیشتیمانی شیعی] بەبێ قەید وشەرت، مانای بە هەدەردانی دەسەڵاتداری نایەت [لەدەستی شیعە]،و بە مانای مانەوەی بۆشایی نایەت، تەنها مانای گۆڕینیکی شەرعی وشەعبی وقانونییە پێویستە بە نەرمی و ئاسانی ئەنجام بدرێت".

ئامانجەکانی موقتەدا ئینجا دەڵێت ئەو خاڵانە هانی دام ئیمزا بکەم لەسەر ئەو پرۆژەیە: دووەم :ئەو کردەوانەی لە سەرۆک وەزیران دەرچوو کە تەنها بەوە لێکدەدرێتەوە کە جۆرێکە لە کەنار خستن وپەڕاوێزخستن وبنیاتنانی دیکتاتۆریەت وقائیدی زەرورەتە، کە ئەوەش لە بەرژەوەندی عێراق و پرۆژە دیموکراسیەکەی دا نییە.

سێیەم :گرنگترینیان، هۆی ئایینی وعەقائیدی بوو کە هانی دام لە پێناو کۆتایی هێنان بە موعاناتی ئایندەیی شیعەدا، کە لە ئەنجامی سیاسەتەکانی سەرۆک وەزیران وحکومەت، هەتا ئەو هاوپەیمانەی کە خەریکە هەموو هاوشانان وشەریکەکانی خۆشی کەنار دەخات، کە گۆشەگیری شیعەی لە هەموو لایەنەکانی تری عێراقی لێدەکەوێتەوە.

چوارەم: ئەوەی لە سەرۆکایەتی وەزیران دەردەچێت بە ڕای خەڵکانی تر ڕەنگدانەوەی وێنەی [شیعەگەرایەتیە]، ولەسەر تەشەیوعیش حسێبی دەکەن، بۆیە پێویست بوو بخرێتە ڕوو کە خەڵکانێکی شیعە هەن بەو رەفتارانە ڕازی نین، واتە ئەو رەفتارانە شیعی نین، بەڵکو تاکە کەسین.
لە کۆتاییدا موقتەدا ئاماژە بە خاڵێکی ترسناک دەکات کە زۆر لە نێوەندە سیاسیەکان پێشبینی دەکەن، کە ئەویش شەری سونە وشیعەیە کە هەموو ناوچەکە دەگرێتەوە، لەو بارەیەوە دەڵێت: "بەڵام ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بکریت ئەوەیە کە ناوچەکە لە لێواری شەڕێکی تایفەگەری سەخت نزیک دەبێتەوە، تەنها خوا ژمارەی قوربانیەکانی دەزانێت ئەگەر خوا نەخواستە کاروبار بەو سەخت گیرییە وبە شێوەیە مایەوە، بە تایبەتی عێراق سەنتەری ئەو کێشمە کێشانەیە، لەبەر بوونی ئەو مۆزایکە جوانە لە شیعە وسونە لە لایەک، ولە سەختگیری ووالایی لەلایەکی تردا...بەتایبەتی سونەی سەختگیر پەیمان پێدراوە بە دەسەلات وبە حوکم"

ئەوەی تیناگەین ئەوەیە خەڵکی عێراق بەگشتی سوپای مەهدی سەر بە موقتەدا سەدر تاوانبار دەکات بە چەپەڵترین شەڕی تایفی لە دژی سونە، هەتا بە عێراق نەوەستاون سوپای مەهدی دەنێریتە سوریاش کەچی هەر موقتەدا خۆی باسی ترسناکی ئەو شەڕە تایفیە چەپەڵە دەکات، ئەی کێ تاوانبارە لەو شەڕە؟! ئەگەر حزبە تایفیە سوپادارەکانیش بی تاوان بن؟!

هەڵوێستی مام جەلال

موقتەدا زۆر بە سەرسوڕمانەوە باسی هەڵوێستەکانی مام جەلال دەکات، وباسی کۆبونەوەکەی بە سەرۆکایەتی مام جەلال دەکات ودەڵێت: " گرنترین باسی کۆبوونەوەکە [کێشانەوەی متمانە] بوو لە سەرۆک وەزیران، لەگەڵ پاریزگاری ]تحفظ] ی سەرۆک کۆمار لەسەری، بە ئیدیعای ئەوەی کە لایەنێکی بێلایەنە لەبەر پلە وپایەکەی، بەڵام پشتگیری دەکات و تا کۆتایی لەگەڵی دەبیت، ئینجا پاش چەند ڕۆژێك ئیدیعای ئەوەی کرد کە تەوقعی بەردەوامی و هاتنە دی نەدەکرد .لەبەر هەستیاری دەقەکە ئەوە عەرەبیەکەیەتی: "وكان أهم ما دار بهذا الاجتماع, هو (سحب الثقه) عن رئيس الوزراء, مع تحفظ رئيس الجمهوريه عليه, مدعياً انه طرف محايد لمكانته ومنصبه الذى فيه, إلا انه يؤيد ما جاء فيه وسيتممه إلى اخره, ثم ادعى

بعد ذلك بأيام أنه لم يتوقع صيرورته ووصوله إلى (التحقق.".(
کاتێ ئەوەم لێی بیست کەوا دەیەوێت بە بێلایەن بمێنێتەوە، توشی سەرسوڕمان وڕاتەکانی کردم پاش ئەوەی کە بەر لە ماوەیەکی کەم گوێم لێی بوو گوتی کە ئەو ئارەزووی کێشانەوەی متمانەی هەیە، وناتوانێت پارێزگاری لە دەستور بکات وبەرگری لێبکات لە بوونی مالیکی دا لەسەر سەکۆی سەرۆکایەتی وەزیران، ئەو لە زۆر لە کارەکانی کۆتوبەند کراوە، هەرچەندە دەستور سەلاحیاتی پێداوە... بە سیفەتی پارێزەری دەستور ڕازی دەبێت لەسەر کێشانەوەی متمانە لە [مالیکی] لەبەر ئەو هۆیانە"..

لە شوێنیکی تری وتارەکەی موقتەدا دەڵێت: " زۆربەی زۆری سەرسوڕمانم لەسەر یەک کارە ئەویش ئەوەیە، بۆچی فەخامەتی رەئیس تەوقیعی نەکرد؟"!!

موقتەدا ئەگەر کەمێک بیربکاتەوە دەزانێت، سەرۆک کۆمار لە هەر کێشەیەکدا هەتا لە نێوان ئەمریکا و ئێرانیش بێت لای ئێران بەرنادات، چونکە چاک دەزانت ئێران بە فیعلی حوکمی عێراق دەکات لە ڕێگای [قاسم سلێمانی] وخۆشی باسی پەرۆشی قاسم سلێمانی کرد بۆ مالیکی، کەوابوو ئەوەی هەندێ لە نیوەندە یەکێتی وسیاسیەکان پێی دەڵێن حیکمەتی سەرۆک تاڵەبانی، تەنها ئیرادەیەکی مویەسەری نا موخەیەرەی سەرۆک بوو لە لایەنگری کردنی مالیکی وبەرەی ئێران.
بەڵام پێویستە ئەوەش بوترێت سیاسە چەوتەکانی پارتی وسەرۆکی هەرێم لە ناوەخۆ ولاسایی کردنەوەی مالیکی لە رەفتارەکانی بە شیوازی ترو جاروبار خراپتر لە خودی مالیکی، مام جەلالی دڵنیا کرد کە هەڵوێستەکانی کاردانەوەیەکی بەرفراوانی لێناکەوێتەوە، ئەگینا ئەگەر دەسەڵاتی هەرێم مایەی قبوڵ وپشتگیری جەماوەری هەرێم با، کار وهەڵوێستی مام جەلال لە مەسەلەی کێشانەوەی متمانەدا دەگەیشتە ئاستی خیانەتی عوزما، بەڵام کە تۆ ماڵت لە شوشە بوو ناتوانی بەرد بگریتە خەڵک.

hariri66@yahoo.com

٢٠١٥/٨/١٤

## یاسای پاراستنی پیرۆزیه‌ ئایینیه‌كان به‌رگری نییه‌ له‌ خوا، به‌رگریه‌ له‌ ئاشتی ئاده‌میزاد!

كاك مه‌ریوان وریا قانیع له‌ وتارێكدا به‌ ناوی [یاسای پاراستنی پیرۆزییه‌كان كێ ده‌پارێزێت؟] سه‌ره‌تای نوسینه‌كه‌ی به‌و جۆره‌ ده‌ست پێده‌كات " :

**ئایا به‌ڕاست خودا پێویستی به‌وه‌یه‌ ئینسان به‌ یاسا بیپارێزێت؟ ئایا كاری یاساكان ئه‌وه‌یه‌ ئینسانه‌كان له‌یه‌كتری بپارێزێت، یان خودا له‌ ئینسان بپارێزێت؟ "له‌ڕاستیدا هه‌ر له‌ سه‌ره‌تاوه‌ پرسیاره‌ سه‌ره‌كیه‌كه‌ به‌ هه‌ڵه‌ دارێژراوه‌، بۆیه‌ له‌سه‌ر خه‌تی خواری پرسیاره‌كه‌ درێژه‌ به‌ گریمانه‌كانی ده‌دات وده‌ڵێت " :له‌ بیركردنه‌وه‌ی دینیدا خودا بۆیه‌ خودایه‌ چونكه‌ نه‌ له‌كه‌س بووه‌ و نه‌ كه‌سی لێده‌بێت و نه‌ پێویستی به‌كه‌سیشه‌، خودا بۆیه‌ خودایه‌ چونكه‌ هه‌مووكه‌س پێویستی به‌وه‌ بۆ پاراستن، نه‌ك به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ .له‌ فیكری دینیدا خودا پێویستی به‌وه‌ نییه‌ كه‌س بیپارێزێت، چونكه‌ خۆی چۆنی بوێت به‌وجۆره‌ دونیا ده‌باتبه‌ڕێوه‌ و به‌وجۆره‌ شته‌كان و په‌یوه‌ندییه‌كان ڕێكده‌خات" .**

ده‌قی پرۆژه‌ یاسای پاراستنی پیرۆزیه‌ ئایینیه‌كان له‌ هه‌رێمی كوردستانم خوێندەوه‌، من وه‌ك ده‌ڵێن قه‌لبه‌ن وقالبه‌ن له‌ گه‌ڵی دام، ئه‌وانه‌ی كه‌مپین ونازانم شتگه‌لێكی وا ڕێكده‌خه‌ن له‌ دژیدا ده‌بێت هه‌ڵوه‌سته‌ له‌و هه‌ڵوێسته‌یان بكه‌نه‌وه‌، چونكه‌ ئه‌گه‌ر كه‌سانێكی رۆشنبیر بن، نابێ خۆیان دابه‌زێنن بۆ ئه‌و ئاسته‌ی به‌رگری له‌ سوكایه‌تی كردن بكه‌ن له‌ دژی خوا وپێغه‌مبه‌ران وپیرۆزیه‌كانی خه‌ڵك به‌ هه‌موو ئایین وتایفه‌كانه‌وه‌. هه‌ندێك له‌ بڕگه‌كانی پڕۆژه‌ یاسایه‌كه‌ ئه‌مانه‌ن:

"مادده‌ی یه‌كه‌م :سوكایه‌تی به‌ خوا (جل جلاله‌) وپیغه‌مبه‌ران )سه‌لامی خودایان له‌سه‌ر ) وه‌ قورئانی پیرۆزو كتێبه‌ ئاسمانیه‌كان تاوانه‌ له‌لایه‌ن هه‌ر كه‌س و لایه‌ن و ده‌زگایه‌كه‌وه‌ بێت , و به‌ ئازادی راده‌ربڕین دانانرێت.

مادده‌ی دووه‌م:

ئه‌م كرده‌وانه‌ به‌ سوكایه‌تی كردن به‌ پیرۆزیه‌كان داده‌نرێن

1. :جوێندان و گاڵته‌كردن به‌ خودای گه‌وره‌.

.2 جوێندان و گاڵته‌كردن و سووك باسكردن و وێنه‌ی ناشایسته‌كردنی پێغه‌مبه‌ران.
.3 سوتاندن و دڕاندن و فڕێدانی قوڕئان و كتێبه‌ ئاسمانیه‌كان به‌كارهێنانی ناوه‌رۆكه‌كانیان به‌ ناشیاوی.
.4 به‌كارهێنانی په‌ڕه‌كانی قوڕئان و ناوه‌رۆكه‌كه‌ی به‌ مه‌به‌ستی خراپ بۆ كاڵا بازرگانیه‌كان.
.5 هاورده‌كردن و فرۆشتنی كاڵای بازرگانی كه‌ بێڕێزی به‌رامبه‌ر خوا و پێغه‌مبه‌ران وكتێبه‌ ئاسمانیه‌كان تێدابێت.

.6 هه‌ر كه‌سێك ده‌ستدرێژی بكاته‌ سه‌ر شوێنێك تایبه‌ت كرا بێت به‌ خواپه‌رستی یه‌كێك له‌ ئایینه‌كان.

.7 هه‌ر كه‌سێك گاڵته‌ یان جوێن بدات به‌ یه‌كێك له‌ دروشمه‌ ئایینیه‌كان".

من تێ ناگه‌م كام مرۆڤی ڕێزدار و ڕۆشنبیر با مولحید وئێتیستیش بێت، با كافری هه‌ر سێ دینیش بێت، ڕازی ده‌بێت به‌: جوێندان و دراندن وگاڵته‌ كردن وسووک باسكردن به‌ پیرۆزیه‌كانی خه‌ڵک؟!!

نوسه‌رێكی به‌ڕێزی جیدی وه‌ك كاك مه‌ریوان وریا قانیع پێیوایه‌ ئه‌و یاسایه‌ كاره‌كه‌ی پێچه‌وانه‌وه‌ كردۆته‌وه‌، له‌جیاتی خوا پارێزگاری له‌ مرۆڤ بكات، ئه‌وه‌ مرۆڤه‌ به‌و یاسایه‌ پارێزگاری له‌ خوا ده‌كات، كه‌ خوا هیچ پێویستیه‌كی پێی نییه‌؟!

وابزانم كاك مه‌ریوان ئه‌و جاره‌یان به‌ هه‌ڵه‌ تێگه‌یشتوه‌ له‌ مه‌نتیقی كاره‌كه‌، كاتێ موسڵمان یان هه‌ر ئیمانداریك ده‌وروژێت له‌به‌ر سوكایه‌تی كردن به‌ ئاینه‌كه‌ی یان خواكه‌ی یان شوێنی په‌رستكاریه‌كه‌ی یان كتێبی پیرۆزی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نییه‌ كه‌ مرۆڤه‌كان ده‌توانن زیان بگه‌یه‌نن به‌ زاتیكی باڵای هێز له‌ سنوور نه‌ هاتووی وه‌ك خوا، به‌ڵكو له‌ خۆشه‌ویستی وباوه‌ڕی ئه‌وانه‌ بۆ ئه‌و زاته‌ باڵایه‌ كه‌ حه‌ز ناكه‌ن كه‌س له‌ پێش ئه‌وان وا به‌ ئاشكرایی جوێنی پێ بده‌ن یان سوكایه‌تی به‌ ناو و هێما پیرۆزه‌كانی بكه‌ن. هه‌ر بۆیه‌ قورئان داوا له‌ موسڵمانان ده‌كات جوێن به‌ خوداوه‌ندی كه‌سانی تری غه‌یره‌ موسڵمان نه‌ده‌ن، نه‌وه‌ك ئه‌وانیش له‌ به‌رامبه‌ردا جوێن به‌ خودای موسڵمانان ده‌ده‌ن، كه‌ له‌ ئه‌نجامدا فیتنه‌ وئاشوبی لێده‌كه‌وێته‌وه‌.

كه‌وابوو یاساكه‌ بۆ مرۆڤه‌كانه‌ وبۆ پاراستنی ئاشتی كۆمه‌ڵایه‌تی ومه‌ده‌نیه‌، نه‌ك بۆ به‌رگری كردن له‌ خوا كه‌ خوا هیچ پێویستی به‌ به‌رگری به‌نده‌ لاوازه‌كانی نییه‌، وه‌ک له‌ پرۆژه‌ی یاساكه‌شدا هاتوه‌: " له‌ پێناو پاراستنی ڕێز له‌ به‌ها ئایینیه‌كان له‌ سوكایه‌تی پێكردن و پاراستنی

ئاشتی كۆمه‌لایه‌تی وخراپ به‌كارنه‌هێنانی ئازادی ڕۆژنامه‌گه‌ری و ئازادی راده‌ربرین ، ئه‌م یاسایه‌ ده‌رچوێنرا".

بۆ ئه‌وه‌ی جیاوازی به‌ روونی بكرێت له‌ نیوان لێكۆڵینه‌وه‌ی جیدی وگاڵته‌جاری به‌ پیرۆزیه‌كان، ئه‌و یاسایه‌ زۆر پێویسته‌ وله‌ كاتی خۆی ده‌رچوه‌ بۆ پێش گرتن به‌ كه‌سانێكی كه‌م عه‌قڵ و سه‌رەڕۆ و شوهره‌ت ته‌ڵه‌ب كه‌ ڕیزی هیچ ناگرن و وادەزانن ئازادن له‌ سوكایه‌تی كردن به‌ هه‌موو به‌هایه‌ك وهه‌موو شتێك.

هه‌ڵێكی زێڕینیشه‌ بۆ خۆ جیاكردنه‌وه‌ی نووسه‌ره‌ جیدیه‌كان له‌وانه‌ی ده‌یانه‌وێت له‌سه‌ر پردی ئه‌و كارانه‌دا بۆ دنیای ناوبانگ وشوهره‌ت بپه‌ڕنه‌وه‌، چونكه‌ ده‌زانن ڕۆشنبیرانی كورد ئاماده‌ن بۆیان كامپین بكه‌ن هه‌رچیان كردبێت، چونكه‌ كامپین كردن بۆته‌ خوێكی ڕۆژانه‌ی گۆره‌پانی فه‌رهه‌نگی كوردی، بۆ بچوكترین وبێ ماناترین هۆ كامپین ده‌گرن!

سوكایه‌تی كردنی له‌و جۆره‌ كاری كه‌سانێكی هیچ له‌بار ونه‌ناسراوه‌، كه‌ نایانه‌وێ به‌ پرۆسه‌ی سروشتی ناوبانگ بوون وناو ده‌ركردن تێپه‌ڕن وهه‌ڵپه‌یانه‌ زوو خه‌ڵك باسیان بكه‌ن، هیشتا دوو وتاری پێنج سه‌د وشه‌یی نه‌نوسیوه‌، كه‌چی ده‌یه‌وێت له‌ لوتكه‌ی نوسه‌رانی كوردستان بێت.

له‌ وڵاتانی هوشیار هه‌زارانی وا كه‌ شتێك ده‌نوسن پڕ له‌ سوكایه‌تی خه‌ڵك فه‌رامۆشیان ده‌كات وته‌نها ئه‌گه‌ر شتێكی دژه‌ یاسای گوتبێت، ئه‌وه‌ ده‌درێته‌ دادگا وسزای دیاریكراوی وه‌رده‌گرێت، به‌ڵام لای ئێمه‌، مه‌به‌ستم هه‌موو جیهانی ئیسلامییه‌، هه‌ر نه‌ناسێك وشوهره‌ت ته‌ڵه‌بێك ده‌توانی به‌ دوو قسه‌ی سوك وڕیسوا یان به‌ كارێكی دزێو وبێ سه‌لیقه‌ی وه‌ك فیلمه‌ فاشیله‌كه‌ی خاوه‌نه‌ فاشیله‌كه‌ی له‌ دژی حه‌زره‌تی محه‌مه‌د [د.خ] له‌ شه‌و وڕۆژێكدا هێنده‌ی ناودار بكه‌ن كه‌ خۆشی خه‌ونی پێوه‌ نه‌دیبێت!

ئه‌وه‌ی كرا له‌ خۆپیشاندانی توند وتیژ وپه‌لاماردانی باڵوێزخانه‌كان وكوشتنی باڵوێزی ئه‌مریكی له‌ لیبیا وچه‌ندین كارمه‌ندی تر، كاردانه‌وه‌یه‌ك بوو زیاتر به‌ نێگه‌تیڤ به‌سه‌ر موسڵمانان وجیهانی ئیسلامدا شكایه‌وه‌، چونكه‌ بۆم ده‌ركه‌وت سروشتی مرۆڤی هیچ وپوچ وایه‌، ئه‌گه‌ر بزانیت به‌شتێك زۆر توڕه‌ ده‌بیت، ناڵێ با ئه‌و شته‌ نه‌كه‌م تا توڕه‌ نه‌بێت، به‌ڵكو به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ زیاتر دووباره‌ی ده‌كاته‌وه‌، وه‌ك چۆن خه‌ڵكی بازاڕ سه‌ر ده‌نێنه‌ سه‌ر هه‌ر كه‌سێكی فه‌قیر وساده‌ ئه‌گه‌ر بزانن به‌ شتێك توڕه‌ ده‌بێت تا كار به‌وه‌ ده‌گات شێتی ده‌كه‌ن به‌ ڕه‌سمی. له‌ هه‌ولێر وسلێمانی ودهۆك كه‌س هه‌یه‌ ئاگاداری چیرۆكی شێت كردنی چه‌ند كه‌س نه‌بێت كه‌ خه‌ڵكی بازاڕی وبێ ڕیز به‌رده‌وام ده‌یانوروژێنن له‌ كه‌سێكی سروشتی ونۆرماڵ

دەیانکەنە شێتێکی ڕەسمی؟! من خۆم لە بیرمە هەندێك لەو شێتانە کەسانێکی هەژار وبێ گوناح بوون، بەڵام چونکە خەڵک خاڵی لاوازیان زانیبوون، توڕەیان دەکردن تا وای لێدەهات هەر جارێ دەمدیتنەوە لە جارەکەی تر خراپتر ببوون.

ئەو هەموو توڕەییەی موسڵمانانیش کە نیشان دەدرێت تا ڕادەی پارانۆیی بوون، وەك ئەو خەڵکە نۆرماڵەیە کە کاتی خۆی کەسانێك پێیان زانی زوو توڕە دەبن، بۆیە قۆزتیتیانەوە بۆ زیاتر وروژاندنی موسڵمانان وزیاتر سوکایەتی کردن بە پیرۆزیەکانی.

پەیامم بۆ هەموو نوسەرێکی ڕیزدار ئەوەیە خۆتان مەخەنە بەرەی سوکایەتی کەران، ئایین بوارێکی پان وپۆڕی تێدایە بۆ نوسین لەسەری، بە مەرجێك نوسینی بابەتی وزانستی بن، چونکە ئەو یاسایە باسی قەدەغەکردنی ئەو جۆرە نوسینە ڕەخنەیی وجیدیانە ناکات، بەڵکو تەرکیزەکە لەسەر ئەو هیچ لەبارانەیە کە دەیانەوێت لە ڕێگای سوکایەتی کردن بەرژەوەندی مادی ومەعنەوی یان دەست کەوێت. من کە نیەتی سوکایەتی کردنم نەبێت بە هیچ ئایین ومەزهەبێك، دەتوانم بابەتی ئایینی ڕەخنەییش بنوسم، وە زۆریشم نوسیوە، بەڵام هەرگیزیش ناچمە ئەو بەرەیە و ئەو کەمپینانەی کە لە پێناو بەرگری کردن لە سوکایەتی کەران دەکرێن، با حەفتا جار دواکەوتو خواز بم، چونکە لەوە سوکایەتی تر نییە بۆ مرۆڤ کە سوکایەتی بە پیرۆزیەکانی خەڵک بکات، با ئەو خەلکە هەر کێ بن :موسڵمان یا مەسیحی یا یەزیدی یا بودایی یا هەر شتێکی تر بن.

لەندەن

٢٠١٢/١٠/١١

# عەلی باپیر وهەڵاوسانی منی باڵای*!

بەڕاستی جێگای ئەسەفەکەسێکی وەك مامۆستا مەسعود عەبدولخالیق ئەگەر بیەوێت رەخنەیەک یان سەرنجێك بخاتە ڕوو دەربارەی هەر لایەنێکی دەسەڵات یان ئۆپۆزسیۆن، لەجیاتی دەستخۆشی ونرخاندنی سەرنجەکانی پەلاماری ناڕەوا بدرێت بۆ سەر کەسایەتی بەر لەوەی لە بیروڕاکانی بکۆڵرێتەوە یان وەڵامێکی دۆستانەی بدرێتەوە. لەوەش ئەسەفتر ئەوەیە کە کەسانێکی سەر بە بە لایەنە ئیسلامیەکان ئەو رەفتارە دزێوە بگرنەبەر بەرامبەری، لە کاتێکدا پەرۆشی کاک مەسعود بۆ ئەو لایەنانە جێگای گومان نییە، بەڵکو خەڵکانی دەرەوەی بازنەی ئیسلامیەکان بە ئیسلامیەکی تۆخی دەزانن.

ئەو کۆمێنتە بي سەلیقە و بێ زەوقانەی لە دژی کاک مەسعود دەنوسرێت گوایە دژی ئیسلام وئیسلامیەکانە یان عیلمانیە یان یەکێتییە هەمووی دەچێتە خانەی جەهل و دەمارگرژی وپەروەردە نەکردنەوە. کە دەڵێین پەروەردە مەبەستم لە پەروەردەی سیاسی ورەخنەییە. کەسێك تەنها فێر بکرێت گوێ بگرێت بۆ ئەمیر یا سەرۆکەکەی وڕێگای پێ نەدەرێت ڕایەکی جیاواز بخاتە ڕووی ئەمیرو پێشەواکەی دەبێت هەر بەو ئاڕاستەیە بیر بکاتەوە، کە هەموو کەسێك هەڵەیە، گومڕایە، نەزانە، بێ دینە، علمانیە تا دەگاتە دژە ئیسلام ئەگەر بە حزبەکەی ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی ئەوی گوت هەڵەیت لەو کارەو لەو گوتارە.

بەڕای ئێمە هەموو شتێك لە سەرچاوەوە چارەسەر دەکرێت کە سەرچاوە سەقەت بوو ئاڕاستەی قاعیدەش سەقەت دەبێت، کە سەرچاوە لێڵ بوو هەرگیز جۆگەلەو و لقەکان سازگار نابن.

کێشەی عەلی باپیر لەگەڵ ڕاپەسەندی [اعتداد بالرأي] وگوێ لەکەس نەگرتن وهەڵاوسانی [منی باڵای] زۆر کەڤنارە، وادەزانێت ئەگەر دانی نا بە هەڵەبوونی لە ڕایەکی خۆی یان هەڵوێستێکی خۆی واتە دابەزین وخۆ بچوک کردنەوەیە. کەچی پێغەمبەر و خەلیفەکانی چەندین جار لەڕای خۆیان دابزیون بۆ ڕای کەسانی تر، هەتا حەزرەتی عومەر بۆ ڕای ئافرەتێك ڕای خۆی گۆڕی لەسەر مینبەردا.

قورئان هەر هانی شوراکردن و (وشاورهم في الامر) حەدیسیش هەموو دەزانین کە کەس لە پێغەمبەر زیاتر پرسوڕای بە هاوەڵەکانی نەکردوە، وچیرۆکی پرسوڕاکانی زۆر لەوە بەناوبانگترە کە سەرلەنوێ باسی کەین.

عەلی باپیر وەك چۆن دڵسۆز وزاناشی لێ دەبێتە دوژمن ولە ڕێگای شوێن کەوتە ساویلکە وسەرسامەکانی دەیان وەڵام و تاوانی ئەخاتە پاڵ وجوێن وگومان ئاراستەی ڕەخنە لێگرەکانی دەکات، لە بەرامبەردا کەسانێك کە گوێڕایەڵی ڕەهای ئەو بوون یان تەسلیم بە ئەو بوون بێ چەند وچوون، ئامادەیە بیکاتە موریدی خۆی با موریدەکان سەرانی بەعسی پێشووش بێت وەك لە کتێبی: (ئەشکەنجە و زیندان) دا پاش ئەوەی باسی ئەو سەرکردە دۆڕاوانە دەکات وخۆی بە فریاگوزاریان دەزانێت لە دۆزەخی ڕۆژی قیامەت "من لە ڕووی دڵسۆزیشەوەشتانەتان پێدەڵێم، بۆ ئەوەی لەسەری بوون چیدی لەسەری نەچن،... دەڵێم لانیکەم گەر دونیاشتان چوو، با قیامەتەکەتان هەبێت، خۆ من دڵسۆزتانم"ل ٢٥٥ خۆی لێ ببوە پێشەوای ئەو دۆڕاوانە "چونکە من ئیمامیشیان بووم وپێشنوێژم بۆ دەکردن، بانگم بۆ دەدان، دیارە من هەر ئەوە نەبووم وەکو نەیارێکی فیکری، ئەوان بە چاوی پێشەوایەتی تەماشایان دەکردم، وەکو بڵێی بەرپرسی دونیا ودینیان بم.." ل ٢٥٥

هەتا کۆمەڵی خاچی سوریش سەرسوڕمانی خۆیان لەو پەیوەندییە نا ئاساییە دەردەبڕێ وپێیان دەگوت:" چۆن دەتوانی لە گەڵیان دانیشی و قسە بکەیت؟" ل ٢٥٧

لە پاداشتی ئەو دەروێشیەتەیان بۆ عەلی باپیر، شێخ عەلی باپیر سەرانی ڕژێم دەکاتە موریدەکانی خۆی!، کاتێ پرسیاری لێدەکەن دەربارەی ئەو سەرانەی بەعس کێن کە باسی تەوبە وعیبادەت وتاعەتیان دەکەیت بە سەرسامیەوە، بەوپەڕی سادەییەوە دەڵێت:"وەڵڵا پێم خۆش نییە ناوی کەس بەرم، موریدەکانی خۆم پێم خۆش نییە ناویان بەرم!!" سەرانی بەعس بە موریدی خۆی حساب دەکات، نیشانەی سەر سوڕمانەکە لەلایەن ئەنجامدەری چاوپێکەوتنەکانی کتێبەکە دانراوە!

کاک مەسعود عەبدولخالیق ڕەخنە لە ڕەفتاری ئۆپۆزسیۆنی عەلی باپیر دەگرێت وەك سەلەفیە بێ حەوسەلەکان باسی عەقیدە و نەورۆزو لە پەرلەمان بوون ولادانی عەقیدی ناکات، بەڵکو باسی هەڵەیی لە سیاسەت کردن دەکات کە لەوە دەچێت تا ئێستا عەلی باپیر جیای نەکاتەوە لە کاری بانگەوازخوازی، ئاخر ناکرێت ناو لە خۆت بنێی ئۆپۆزسیۆن وەک ئینگلیز دەڵێت هەر لینگێکت لە سەربازگەیەک بێت has a foot in both camps لە گۆشتی دەسەڵات و چەلاوی ئۆپۆزسیۆن یش بخۆیت. دەسەڵات نابێت بەهیچ جۆرێك هەست بە خاوی ئۆپۆزسیۆن بکات لە سەرنجدانی ورد ودرشتی کارەکانی، چەمکی عەلی باپیر بۆ ئۆپۆزسیۆن بوون، بە سەردانی نهێنی و پرۆژەی شەخسی و ناوبژیوان لە نیوان دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن! ئەو جۆرە تێگەیشتنە موستەهقترە پێی بگوترێت تێگەیشتنی [لینگە وقوچە] لە ئۆپۆزسیۆن بوون، نەك سەرنجەکانی کاک مەسعود عەبدولخالیق.

ئەو کەسەی هەر لە منداڵیەوە پێی وابێت خوا ڕۆڵی براگەورەیی و ئاڕاستەکاری پێبەخشیوە وکردۆتە قەدەری وەك خۆی دەڵێت:**" خوای گەورەش بارەکەی بۆ من وا هەڵخستوە، هەر کە گچکەش بووم، منداڵیش بووم، لە گەڕەکێ کە تیپی تۆپێنەیان پێکدەهێنا، منیان دەکردە برا گەورە، هەر کە پێشڕا گەشتووم، ئەوە برای وەکو حەسەن بابەکر کە بەتەمەن لە من گەورەتر بووە، لە گەڵیاندا بووم، خوای گەورە بارەکەی بۆ من وا هەڵخستوە، کە من ئەوان ئاڕاستە کەم وئەوانە، ئەو برایانە کە لە من گەورەتر بوون، ڕەنگە لە منیش شارەزاتر بوو بن، بەڵام بە هەر حال خوای بەرز بارەکەی وا بۆ من هەڵخستبوو، واتە هەر لە سەرەتاوە وەزعەکەم وا بووە، زیاتر ڕۆڵی برا گەورەیی وئاڕاستەکار و ئەوانە ببینم.."**

ل١٠٢ – ١٠٣ زۆر زەحمەتە [منی باڵای هەڵاوساوی] ڕێگەی پێ بدات یەکێکی تر ئاراستەی بکات یان گوێ لە ڕەخنەی کەسێك بگرێت، ئەو جۆرە دەرونە هەلاوساوانە بەس چاوەڕێی ستایش ودەست خۆشی وبالروح بالدم دەکەن.

ئەوەی باسی حزبەکەی بکات وەک چۆن کەسێك باسی دوکانێکی یان کۆمپانیایەکی خۆی دەکات زەحمەتە شەریکێك لەو مولکایەتیە تایبەتیە بۆ خۆی بدۆزێتەوە، وەك دەڵێت: **" من وام هەست کردوە کە کۆمەڵی ئیسلامی بەهی خۆم دەزانم... هەمووی یەکە ومنیش هی هەموویم وهەمووشی بە هی خۆم دەزانم و لە خزمەتی هەمووشیدام تا هەبم وتا کۆمەڵی ئیسلامی من بە چاوساخ وئەمیری خۆی بزانێت، من بە برا گەورەی خۆی بزانێت.."** ل ٣٦٠

ئەوەی داوا لە سەرکردایەتی حزبەکەی بکات نەك قاعیدەی فەقیروعەوام بەرز بنەوە بۆ ئاستی عەلی باپیر، نەك ئەوان ئەو دابەزێنن بۆ ئاستی نزمی خۆیان، چۆن ڕێگا بە ڕەخنە لێگرتنی دەدات، لەو بارەیەوە دەڵێت:**"...بەڵام واش چاوەڕێ ناکەم هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی لە ئاستی بەندەدا بن، چونکە جارێك پێیانم گوت: ئەگەر هەرچی من دەیڵێم ولە توانامدا هەیە، ئێوەش وابڵێن بەو شێوەیە بن، ئەی بۆچی من برا گەورەتانم؟ دیارە دەبێ من هەندێ شتی زیادەم پێ بێ، جا دەبێ سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی هەوڵ بدات خۆی بێنێتە ئاستی من، نەك من نزم کاتەوە بۆ ئاستی خۆی"!!! ل ٣٦٠-٣٦١**

ئەوەی پێی وابێت، چەند هۆیەکی غەیبی و تەلیسماوی هەبێت کە ئەو ئیمتیازەی پێ دەدات شتێکی زیادەی پێ بێت لە بواری فیکری وڕوحی وئیمانی وپشت بە خوا بەستن، وەك دەڵێت: **" دیارە دەبێ من هەندێ شتی زیادەم پێ بێ" یان وەك دەڵێت: " بەڵام بەڕاستی ئەوەش دەزانم کە من هێندێ شتم پێیە، خەڵک هەمووی پێی نییە، لە بواری فیکری وڕوحی**

**وئیمانی وپشت بە خوا بەستن" ل٣٦١**، چۆن گوێ دەگرێ بۆ ئەوانەی ئەو شتانەیان پێ نییە؟ ئەگەر هەر باسی لە بواری ڕوحی وئیمانی وپشت بە خوا بەستنیش کردبا کارەکە ئاسایی بوو، لەوانەیە بەچاوپۆشینەوە بۆمان قوتدرابا، بەلام کارەساتەکە باسی بواری فیکری یش دەکات، کە بێگومان لەو بوارە هێشتا زۆری ماوە بڵێ خاوەن کەسایەتیەکی فیکری وموفەکیر بێت.

لە هەمووی ترسناکتر ئەوەی وابزانێت بە پێی قسەی پێغەمبەر [د.خ] ئەو گەورەیە، بەپێی خەون وخەیاڵاتی یان زیندە خەونەکانی، چۆن ڕێگا دەدات ڕەخنەی لێ بگیرێت لەلای ئەوانەی موئەیەد نین بەو ئیلهاماتە ئیلاهیانە وفیوزاتە ڕەحمانیانە! **ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی لە ئیدیعایەکی زۆر غەریبدا پاساوی زەرورەتی گوێڕایەڵی کردنی خەڵک بۆ ئەو گوایە لە قسە وئامۆژگاری پێغەمبەرەوە [د.خ] هاتوە کە دەڵێ:"ئەوە ڕەنگە ئامۆژگاری پێغەمبەریش بێ بۆ من کە فەرموویەتی: خوای پەروەردگار بە هۆی ئەو ناڕەحەتی و تاقیکردنەوانەوە تۆی گەورە کردوە، ئاگات لێ بێ خەڵکێك بچوکت نەکاتەوە" ل٣٦١، نازانم ڕواە کێ یان کێ ڕیوایەتی کردوە؟!**

**ئەگەر بە ناڕەحەتی وتاقیکردنەوە با، دەبوایە سەید قوتب ببێتە ئەو مەهدیە مونتەزیرەی کە شیعە وسونە چاوەڕوانی دەکەن بە پەرۆشیەوە.**

**کەوابوو کێشەکە لە ڕەخنە زانستیەکانی کاک مەسعود عەبدولخالیق دا نییە هێندەی لە عەلی باپیر وهەڵاوسانی منی باڵایەتی.**

* واتە [الانا العليا] کە چەمکێکی سایکۆلۆژیە

19-09-2012

## ڕاستی لە کوێیە لە شەڕی بەڵگەنامەکانی پارتی وکۆمەڵ دا؟!

لەو چەند رۆژەی دواییدا هەموو لایەك ئاگاداری ئەو شەڕە میدیاییەی نێوان پارتی وکۆمەڵی ئیسلامی بوو، کە بە هێرشێکی چڕوپڕی تەلەفزیۆنی زاگرۆس دەستی پێکرد وبە وەلامدانەوەیەکی توندتری کۆمەڵ کۆتایی یان پێی هێنا.

بێگومان نە بەڵگەنامەکانی زاگرۆس لەسەر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی عەلی باپیر لەمەر پەیوەندیەکانی بە ڕژێمی بەعس نوێ بوون وخەڵکی ڕاچڵەکاند وتوشی چورتم کرد نە وەلامەکانی کۆمەڵیش نوێ بوون وهیچ شتێکی نوێی خستە سەر ئەو شتانەی کە خەڵك دەیزانن دەربارەی پارتی.
بێگومان شەڕەکەش هۆی سیاسی هەنووکەیی لە پشتە کە زۆر بە زەقی دەتوانرێت چڕ بکرێتەوە لە بەشداری کردنی کۆمەڵ لە نارەزایەتیەکانی سەرای سلێمانی وئەو چاوپێکەوتنەی عەلی باپیر لە تەلەفزیۆنی زاگرۆس کە تێیدا زۆر بە ڕاشکاوی هەموو ڕەخنەکانی لەسەر دەسەڵات خستەڕوو ولە قسەکانی وا دەرەنجام دەکرا کە هیچی تر ئەگەری گەڕانەوە وخامۆش بون نیە لەلای کۆمەڵ وئیتر بڕیاری یەکجارەکی جیابوونەوەی داوە لە دەسەڵات، سەرەڕای ڕەتکردنەوەی بانگهێشتکردنی پارتی ویەکێتی بۆ کۆمەڵ و یەکگرتوو بۆ ئێران کەتێیدا دەسەڵات سوکایەتیەکی گەورەی بەو دوو حزبە کرد وبەزمانی حاڵ پێیان دەڵێت ئێوە دەسەنە ودروستکراوی ئێرانن ئەوە لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ خودی خۆتان ڕاستەوخۆ قسە بکەین لەگەڵ ئاغاکانتان ووەلی نیعمەتتان قسە دەکەین، ئەو هەوڵە نەزۆکەی دوو زلهێزەکەی دەسەڵات بەداخەوە گوزارش لە چەقبەستنی فیکری سیاسی وئیفلاسبوونی توانای بیرکردنەوەی دەسەڵات دەکات وهێشتا بەچاوی سەردەمی بەرەی جود وبەرەی کوردستانی سەردەمی شاخ قسە دەکات.

دەسەڵاتێك کە هەموو تواناو ئیمکانیاتی دراوی وساسی ویاسایی لە ژێر دەستە وسەدان قونسلگەری ئەوروپی وئەمریکی تێدا کراوەتەوە وپەیوەندی لەگەڵ هەموو جیهاندا باشە هەتا لەگەل قەزافی یش، کەچی کەسی نەماوە لەناوەوە و دەرەوە لە هاوڵاتیانی کوردستان بۆ ئەوەی بیکاتە نێوەند لە نێوان خۆیی وچەند حزبێکی ئۆپۆزسیۆن؟! ئەگەر هەرکەسیش دەست نەکەوت لەناوەوە بۆچی پەنابردنە بەر ئێران؟ بۆچی شەڕەفی ناوبژیوانکردن دەدەیتە ئێران؟

ئەوە پاداشتی ئێران دانەوەیە لە جیاتی تۆپبارانکردنی ناوچە سنوریەکانی کوردستان یان لە جیاتی لە سێدارەدانی کوردە تێکۆشەرەکانی کوردستانی بندەستی ئێرانە؟! ئێوە ئەگەر رۆژگارێك لەسەردەمی شاخ هەموو دونیاتان لێگیرابوو تەنها دەرگای ئێران نەبێت خۆ ئێستا دونیا هەمووی والایە بەسەرتان بۆچی ناتوانن لە پاڵتۆی ئێراندا دەربچن. کێشەکە لەوەدایە

ده‌سه‌ڵات بۆ ته‌رویج وبرووپێدانی لۆكاڵی تانه‌ وته‌شه‌ره‌ له‌ حزبه‌ كوردیه‌ ئیسلامیه‌كان ده‌دات سه‌باره‌ت به‌ په‌یوه‌ندیه‌كانیان یان وابه‌سته‌ییان به‌ ئێران كه‌چی هه‌ردوو حزبی ده‌سه‌ڵاتدار ئێران له‌گه‌ڵ ئێراندا وه‌ك باوكه‌ دڵ ڕه‌ق وپڕ له‌ دیسپلینه‌كانی وه‌ك كه‌سایه‌تی (سی سه‌ید) ڕه‌فتار ده‌كه‌ن كه‌ هه‌رچه‌نده‌ ئه‌زیه‌تیان ده‌دات وتوندوتیژه‌ له‌سه‌ریان به‌ڵام جاروباریش ڕه‌حمیان پێده‌كات وئاوڕێكی باوكانه‌ی په‌ترپاركیانه‌یان لێده‌داته‌وه‌!! هه‌ر ئه‌و هه‌سته‌شه‌ ئێرانی وا بوغراكردوه‌ تاڕاده‌ی ئه‌وه‌ی ڕاست وچۆپ ده‌ست ده‌وه‌شێنی له‌ كوردستانی عێراق ئه‌وه‌ باسی كوردستانی ئێران هه‌ر ناكه‌ین، وهه‌موو ده‌زگا سیخوڕیه‌كانی ڕه‌ها كردوه‌ له‌ كوردستان وبه‌ هه‌وه‌ستی خۆیان خه‌ڵك ده‌كوژن وتیرۆر ده‌كه‌ن وه‌ك میری گونده‌كه‌ ڕه‌فتار ده‌كات.

به‌نسبه‌ت په‌یوه‌ندیه‌كانی هه‌ردوولا به‌ ڕژێمی به‌عس یش ئه‌وه‌ زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆری حزبه‌ كوردیه‌كان له‌و په‌یوه‌ندیانه‌ به‌ دوور وبه‌ده‌ر نه‌بوونه‌، به‌ڵام نا ڕوونیه‌ك له‌ مه‌سه‌له‌كه‌دا هه‌یه‌ له‌ هه‌ندێك لایه‌ندا، بۆ نموونه‌ ئه‌گه‌ر بێینه‌ سه‌ر پارتی وپه‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ڕژێمدا به‌تایبه‌تی له‌ 31 ئابی 1996 ئه‌وه‌ پارتی بۆ ماوه‌یه‌ك زۆر بڕ وبیانووی بۆ دۆزیه‌وه‌ تا ڕاده‌ی ئه‌وه‌ی یادی ده‌كرده‌وه‌ وه‌ك سه‌ركه‌وتنێكی گه‌وره‌ به‌ڵام كه‌ زانیان ئه‌و ره‌فتاره‌ زۆر ئیستفزازیه‌ بۆ تاكی كورد له‌وه‌ ده‌چێت ده‌ستیان لێی هه‌ڵگرتبێت تا ڕاده‌ی ئه‌وه‌ی نیاز لاجانی به‌ڕێوه‌به‌ری زاگرۆس تیڤی له‌دوا قسه‌ی دا به‌ هه‌ڵه‌یه‌كی له‌قه‌ڵه‌مدا كه‌ ئه‌وه‌ش پێشكه‌وتنێكه‌ له‌ هه‌ڵوێسته‌كان هه‌رچه‌نده‌ ئه‌و له‌ هه‌ڵه‌كه‌ زۆر كه‌مده‌كاته‌وه‌ وه‌ك گه‌ردێكی نێگه‌تیڤ ده‌یخاته‌ پاڵ چیایه‌ك له‌ سه‌روه‌ری. به‌ڵام هه‌ر چۆنێكی بێت دان هێنان به‌ هه‌ڵه‌ چاكتره‌ له‌ به‌رگری لێكردنی یان بت بۆ تاشینی وئاهه‌نگ بۆ گێڕانی.

ئه‌گه‌ر بێینه‌ سه‌ر كۆمه‌ڵی ئیسلامی ئه‌وه‌ هیچ یه‌كێك له‌و حزبه‌ش ناتوانێت نكوڵی له‌ بوونی ئه‌و په‌یوه‌ندییه‌ بكات پاش ئه‌وه‌ی چه‌ندین دۆكیۆمنت وبه‌ڵگه‌ی نوسراو بڵاوبۆته‌وه‌ له‌پاش ڕوخانی ڕژێمی یه‌دامه‌وه‌، هه‌روه‌ها له‌پاش ئه‌وه‌ی لێپرسراوێكی گه‌وره‌ی كۆمه‌ڵ مامۆستا (موشیر گه‌لاڵی) به‌رپرسی پێشوی نوسینگه‌ی ده‌ره‌وه‌ی به‌ریتانیای كۆمه‌ڵی ئیسلامی دانی به‌و په‌یوه‌ندییه‌ هێنا، ئه‌گه‌ر جه‌ماوه‌رێكی وشیارتر له‌ كورد وله‌ بنكه‌ی حزبی كۆمه‌ڵی ئیسلامی له‌ كوردستان هه‌بوایه‌ ده‌بوایه‌ له‌پاش ئه‌و دانپیاهێنانه‌ی مامۆستا موشیر له‌ دوا كۆنگره‌ی كۆمه‌ڵ یه‌خه‌ی سه‌رانی ئه‌و حزبه‌یان گرتبا وهه‌موو كه‌ین وبه‌ینه‌كانیان پێیان ساغ بكه‌نه‌وه‌ نه‌ك ته‌نها مامۆستا (موشیر گه‌لاڵی) بكه‌نه‌ قۆچی قوربانی ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌، گرنگترین شت له‌و بواره‌دا پێویسته‌ خودی عه‌لی باپیر وئه‌وانه‌ی ناویان هاتوه‌ له‌ به‌ڵگه‌نامه‌كان بێنه‌ سه‌ر ته‌له‌فزیۆنه‌كه‌ی خۆیان وبه‌ شێوه‌یه‌كی یاسایی وئایینی یان دانی پێدابهێنن یانیش به‌ ڕه‌تی بكه‌نه‌وه‌، چونكه‌ هه‌رله‌پاش بڵاوكردنه‌وه‌ی دۆكیومێنته‌كان له‌ زاگرۆس تیڤی وه‌ڵامه‌ به‌راییه‌كانی كۆمه‌ڵ به‌تایبه‌تی له‌سه‌ر زمانی محمد حكیم كه‌ ناوی هاتوه‌ له‌و په‌یوه‌ندیه‌ گوماناوییه‌ی له‌گه‌ڵ ڕژێمی به‌عس زۆر لاواز وله‌رزۆك بوون، خه‌ڵكی كوردستان چاوه‌ڕێی

ئه‌وه‌ له‌ عه‌لی باپیر وكۆمه‌ڵ ده‌كات ڕاستیه‌كانی په‌یوه‌ندی بوون ونه‌بوونی خۆیانیان له‌گه‌ڵ به‌عس پێ بڵێن نه‌ك له‌وه‌ڵامدا باسی په‌یوه‌ندیه‌كانی پارتی وبه‌عس بكه‌ن...

من له‌ بازنه‌ی نزیكی كۆمه‌ڵ ڕاستی و‌هه‌قیقه‌تی بوونی په‌یوه‌ندی عه‌لی باپیر وچه‌ندین كه‌سایه‌تی ناوداری كۆمه‌ڵم گوێ لێبوه‌ له‌گه‌ڵ ڕژێمی به‌عس كه‌چی به‌داخه‌وه‌ تا ئێستاش كه‌سێك له‌ كۆمه‌ڵ جورئه‌تی مامۆستا موشیر گه‌ڵاڵی نییه‌ له‌ دانهێنان به‌ بوونی ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌، له‌ هه‌مووی سه‌یرتر له‌كاتێكدا زۆر له‌ حزبه‌ كوردیه‌كان په‌رده‌پۆشی فایلداره‌كانیان ده‌كه‌ن به‌ جۆره‌ها بڕوبیانو كه‌چی سه‌ركردایه‌تی كۆمه‌ڵ وشه‌خسی ئه‌میر ده‌ستێكی باڵایان هه‌بوو له‌و هه‌ڵایه‌ی كه‌ له‌ دژی مامۆستا موشیر گه‌ڵاڵی كرا وه‌ك چۆن موخابه‌راته‌ بێ مۆڕاڵه‌ گه‌وره‌كان ئه‌ندامی خۆیان ده‌كوژن بۆ ڕزگار بوون له‌و نهێنیانه‌ی كه‌ ده‌یزانێت، به‌هه‌مان جۆر و به‌هه‌مان شێوه‌ مامۆستا موشیر گه‌ڵاڵی یان تیرۆر كرد له‌ڕووی مه‌عنه‌وییه‌وه‌ له‌به‌ر چه‌ند حقد وحه‌سه‌د وموونافه‌سه‌یه‌كی حوجره‌ ئاسا، له‌كاتێكدا ئه‌و پیاوه‌ داینه‌مۆیه‌ك بوو له‌ ئه‌وروپا بۆ كۆمه‌ڵ وڕه‌وندی كوردی.

من زۆر ڕه‌خنه‌ی ئاشكرام گرتوه‌ له‌ مامۆستا موشیر گه‌ڵاڵی له‌سه‌ر په‌یوه‌ندیه‌كانی به‌ڵام بۆ یه‌ك ساتیش گومانم له‌ پاكی وكوردپه‌روه‌ری وئیسلامدۆستی ئه‌و پیاوه‌ نه‌بوه‌ چونكه‌ ده‌زانم به‌ته‌نها خاوه‌نی ئه‌و هه‌ڵه‌یه‌ وئه‌و ئیجتهاده‌ غه‌ڵه‌ته‌ نه‌بوه‌، خۆزگه‌ ئه‌وانه‌ی وه‌ك ئه‌و هه‌ڵه‌یان كردوه‌ وه‌ك ئه‌و ئازا بن ودانپیێدا بهێنن نه‌ك ئه‌مڕۆ خۆیان لێمان بكه‌نه‌ بێگوناه وبه‌ری وه‌ك به‌رائه‌تی گورگ له‌ خوێنی حه‌زره‌تی یوسف. جه‌ماوه‌ری كۆمه‌ڵ وكوردستان به‌ گشتی زۆر له‌وه‌ وشیارتره‌ ئه‌مڕۆ وه‌ك ئامرازێكی نێگه‌تیڤ بڕوانێته‌ شه‌ڕ وموونافه‌سه‌ی حزبی ومیدیایی پارتی وكۆمه‌ڵ، ئه‌مڕۆ جه‌ماوه‌ر ده‌یه‌وێت بزانێت ڕاستیه‌كان له‌ كوێیه‌ وچۆنه‌، بۆیه‌ گومانم نییه‌ كه‌ ئه‌و داوایه‌ داوای سه‌دان وهه‌زاران ئه‌ندامی كۆمه‌ڵی ئیسلامیشه‌ له‌ ئه‌میری كۆمه‌ڵ عه‌لی باپیر وئه‌ندامه‌ تێوه‌گلاوه‌كانی تر: ئایا ئێوه‌ په‌یوه‌ندیتان هه‌بوه‌ له‌گه‌ڵ به‌عس، ده‌مانه‌وێت به‌ سیغه‌یه‌كی شه‌رعی سوێند بخۆن كه‌ ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌تان هه‌بوه‌ یان نا، چاوه‌ڕوانی وه‌ڵامتانین.

محه‌مه‌د هه‌ریری
٢٠١١/٣/٤

# به‌خوا جوانه‌ ئێران له‌ به‌ریتانیا نیگه‌رانه‌!!

خه‌ڵكی نه‌فس نزم وپڕ شه‌ڕ وعه‌یب وعار هه‌رده‌م كه‌ سه‌رنج ده‌ده‌نه‌ ده‌وروبه‌ری خۆیان ئه‌گه‌ر خه‌ڵكه‌كه‌ له‌وان چاكتر وبێ گیروگرفت بن دڵیان شه‌ق ده‌بات، له‌به‌ر گرێی هه‌ستكردن به‌ نزمی ونه‌گریسی خۆیان حه‌زده‌كه‌ن هه‌موو كه‌سێك وه‌ك ئه‌وان بن تا ڕزگاریان بێت له‌ سوك سه‌رنجدانی خه‌ڵك.

ڕژێمه‌ دكتاتۆره‌كانی رۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست زۆر حه‌زیان به‌ هه‌واڵی گه‌نده‌ڵیی وپشێوی وسته‌م لێكردنه‌ له‌و وڵاتانه‌ی كا تا ئه‌و په‌ڕی ڕه‌چاوی مافی مرۆڤ ده‌كرێت.. ڕوداوه‌كانی ئه‌و دواییه‌ی به‌ریتانیا كه‌ له‌سه‌ر پێست ڕه‌شێكی جامایكی وقاچاغچی ماده‌ هۆشبه‌ره‌كان ڕویدا كاتێك ویستی چه‌ك به‌كار بهێنێت له‌ دژی پۆلیس وئه‌وانیش كوشتیان له‌لایه‌ن چه‌ند ڕژێمێكی سه‌قه‌ت وسته‌مكار وه‌ك ئێران وسوریا ولیبیا قۆزرایه‌وه‌ گوایه‌ به‌ریتانیا خه‌ڵك ده‌چه‌وسێنێته‌وه‌! هه‌موو كه‌سێك لێره‌ بژیت ئاگاداره‌ چۆن نه‌رم ونیانی پۆلیسی به‌ریتانی له‌گه‌ڵ ئه‌و منداڵه‌ لات وسه‌رسه‌ریانه‌ی سه‌ر شه‌قامه‌كان خه‌ڵكی بێزار كردوه‌، چونكه‌ ئه‌و هه‌رزه‌كارانه‌ هێنده‌ جورئه‌تیان له‌سه‌ر خه‌ڵك په‌یدا كردوه‌ وله‌به‌ر ئاستی نزمی په‌روه‌رده‌ییان ده‌ستدرێژی ده‌كه‌نه‌ سه‌ر ژن ومنداڵ وپیره‌مێرد، من به‌ چاوی خۆم دیومه‌ كۆمه‌ڵێ هه‌رزه‌كاری پایسكیل سوار به‌ شه‌قازڵله‌ له‌ پیره‌مێردێكی هه‌فتا ساڵه‌یان ده‌دا هه‌ر بۆ خۆشی! ئه‌و لۆتی ولاتانه‌ له‌ زۆربه‌ی گه‌ره‌كه‌ شه‌عبیه‌كان چه‌ندین گانگ (گروپی چه‌ته‌ییان) یان پێك هێناوه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌و ڕوداوانه‌ ده‌ستی پێكرد ڕووی دزێوی خۆیان نیشاندا كه‌وتنه‌ تاڵان وبرینی ماڵی خه‌ڵك، سه‌رۆك وه‌زیرانیش زۆر هه‌ڵوێستێكی توندی نیشان دا به‌رامبه‌ر ئه‌و كاولكارانه‌ وقسه‌ی وایكرد كه‌ هه‌موو سیستمی په‌روه‌رده‌یی خسته‌ ژێر پرسیار، بێگومان ئه‌وه‌ش مایه‌ی خۆشحاڵی زۆربه‌ی خه‌ڵكه‌ بوو.

ئه‌وه‌ هه‌مو چیرۆكه‌كه‌ بوو كه‌چی ئێران هاواری لێ‌َ هه‌ڵسا گوایه‌ نگه‌رانه‌ له‌مه‌ر پێشێل كردنی مافی مرۆڤ له‌لایه‌ن حكومه‌تی به‌ریتانیا وئێران ئاماده‌یه‌ لیژنه‌ی سۆراغكردنی ڕاستیه‌كان بنێرێت بۆ به‌ریتانیا!!!

له‌ هه‌مووی خۆشتر فه‌رمانده‌ی گشتی هێزه‌كانی به‌سیج ی ئێرانی گووتی: (كه‌تیبه‌كانی عاشورا وزه‌هرا ئاماده‌ن بچن بۆ به‌ریتانیا بۆ پاراستنی ئه‌من وئاسایشی ئه‌و وڵاته‌ !!(ئه‌مه‌و چه‌ندین لێدوانی ناعه‌قلانی تر. ئێران به‌و لێدوانانه‌ ده‌یه‌وێت تۆڵه‌ی خۆی له‌و وڵاتانه‌ بكاته‌وه‌ كاتێك به‌ دڕه‌نده‌ترین شێوه‌ خه‌ڵكی سه‌ركوت كرد له‌ خۆپیشاندانه‌كان، وسه‌دان قوربانی كوژران به‌ ده‌ستی حزب الله‌ یاكان وپاسداره‌كان، ده‌یه‌وێت ئه‌و خۆپیشاندان وناڕه‌زاییه‌

سەرتاسەریە سیاسیانە بشوبهێنێت بە کردەوە کاولکارەکانی ژمارەیەکی کەم لە چەتە ولۆتیی وتالانچی ودزەکان.
قەزافیش کە لە دوا رۆژەکانی تەمەنی رژێمەکەیدایە بۆ وەلامدانەوەی تاوانی پشت بەستنی بە مورتەزەقە وکرێگرتەی بێگانی لە تەلەفزیۆنی ڕەسمی خۆیان دەیڤید کامیرۆن یان تاۆمەتبار کرد بە هێنانی مورتەزەقەی ئێرلەندی وسکوتلەندی بۆ کوشتنی شۆڕشگێرەکانی لەندەن!!!
لەوەش نوکتەتر لە هەواڵێکی بەپەلە نوسیبویان: "ثوار بريطانيا على مشارف ليفربول في معارك كر و فر مع كتائب كاميرون ومرتزقة من ايرلندا واسكتلندا... الله أكبر.."
واتە: (شۆڕشگێرەکانی بەریتانیا لە تخوبی لیڤەرپول دان لە شەڕی کەڕ وفەردا لە دژی کەتیبەکانی کامیرۆن ومورتەزیقەکان ... الله ئەکبەر)!!!
وتەبێژی وەزارتی دەرەوە گوتی (دەبێت کامیرۆن بڕوا) (يجب على كاميرون ان يرحل)!!! بۆ کوآ؟!
سوریاش هەر خەریکی نیشاندانی ڕوداوەکان بوون گوایە پۆلیسی بەریتانی وەك شەبیحەکانی ئەوان خەڵك سەرکوت دەکەن! ئەوە بێجگە لە هێنانی دەیان زوڕناژەنی بەعسی بۆ شیکارکردنی وەزعەکە، ووا قسەیان دەکرد دەتوت هیچی نەماوە بەریتانیا وەك سوریا بڕوخێت.
لەبیرمە کە ئابڕوچونێکی گەندەڵی چەند پەرلەمانتارێکی بەریتانیا زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکرا لە وڵاتە گەندەڵەکان، ولە کوردستانیش بە حەماسەتەوە گەندەڵەکان پێشوازیان لێکرد بۆ ئەوەی بسەلمێنن ئەوانیش وەکو ئێمە گەندەڵن وکەس لە کەس باشتر نیە!!

19/8/2011

محەمەد هەریری

## چاودێرە سیاسییەکان شەکریان خوارد

تا کورد نەڵێت ئەو ڕۆژە خوراین، کە گای سپی خورا!

لە ماڵپەڕی ستاندارد کە بە شانازیەوە لە ڕۆژی دامەزراننیەوە تێیدا دەنووسم، هەواڵێک بڵاو کرایەوە لە ڕۆژی 2012/1/18 بە ناونیشانی (ئەوەی لیستی کوردستانی دەیکات لە بەرژەوەندی عەرەبە شۆفێنیەکاندایە) هەواڵەکە بەشێوەیەکی شیکاری دارێژراوە و هۆشداری دەدات کە: "چاودێرانی سیاسیش پێانوایە بە نزیك بوونەوەی لیستی کوردستانی لە لیستی العراقیە زیاتر خزمەت بە بەرژەوەندی عەرەبە شۆفینیەکان و بەعسیەکان دەکرێت، چونکە زۆرینەی سەرکردەکانی لیستی العراقیە پێشووتر پەیوەندی توونديان لەگەڵ ڕژێمی سەددامدا هەبووەو شۆفینیانە بیر دەکەنەوە"

ڕاستیەکەی ڕاستە زۆربەی سەرانی ئەو لیستە بەو شێوەیەن کە باسیان کراوە، بەڵام مرۆڤی سیاسی دەبێت بزانێت هیچ دۆخێک لە سیاسەت جێگیر نییە، ئەوەی هەڵوێستی هەردوو برایانی نوجەیفی بەراورد بکات لەگەڵ هەڵوێستی بەر لە ساڵێکیان هەست بە گۆڕان دەکات، هەمان قسەش دەکرێ بگوترێت دەربارەی ساڵح موتلەگ وعەلاوی وکەسانی تر. بێدەنگی کورد لە ئاست کارەکانی لە دژی سەرانی سونە و لیستی العراقیە و لەو کاتەدا کە کێرڤی هەستی تاکڕەوانەی مالیکی کە لە ڕۆژنامەوانی خۆرئاوا ئێستا بە صدامی شیعەکان ناوزەد دەکرێت، گەیشتۆتە چلەپۆپەی، ئەنجامی ترسناکتری دەبێت بۆ کورد.

مالیکی رەفتار دیکتاتۆر [ئەو تێرمە لە رەفتار فاشیەکەی مام جەلال وەرگیراوە] بەرلەوەی لە جەنگی لەناوبردنی پێگەی سەرانی عەرەبی سونە ببێتەوە زۆر دەمێکە جەنگی پەڕاوێز خستنی کوردی گرتۆتە بەر، سەرکردایەتی کوردیش بەوپەڕی سەرشۆڕیەوە قبوڵیانە و ئەگەر لە ترسی بودجە خەیاڵیەکەی بەغدا نەبایە دەبوایە دەمێک با ئەو هاوپەیمانیەتەی هەڵوەشاندبایەوە لەگەڵ ملهوڕێکی هیچ نەدیوی پەڕاگەندەی دوێنێی سوریا کە وەک تاوس پەڕوباڵی گیف کردۆتەوە لە عێراق.

سەدان ئەفسەری کورد لە سوپا لادران لە چەندین شوێندا، سەرۆک ئەرکانێکی غەریب و فەقیرمان هەبوو (بابەکر زێباری) کە مێشیش لە دەمی دا دەرناکات کەچی مالیکی سزای دەرنەکردنی مێشیشی دا وزیاتر پەڕاوێزی خست، نازانم کورد هیچ کەسێکی عەسکەری بە کەسایەتی تێدا نییە تا بتوانێت بەپێی یاسا هەموو سەلاحیەتەکانی پیادە بکات یان هەر دەبێت زێباری بێت تا بەکەڵکی ئەو پایەیە بێت؟!

سەیرە دەسەڵاتی کوردی هەر لەبەردەم دەرکەی ماڵی خۆی ئازایە، ئەگەرنا بۆ هەر لە کوردستان دەردەچن هەمووی هێندە لاواز وسەرکز خۆیان نیشان دەدەن زگت پێیان دەسوتێت.
مالیکی و بەر لەویش جەعفەری کاتێ حوکم دەگرنە دەست بە تامەزرۆیی ١٢٠٠ ساڵ لە مەحرومیەت [بە قەولی خۆیاندا] دەسەڵات وەردەگرن بۆیە هەتا لەڕووی سایکۆلۆژیەوە و زمانی جەستەوەش body language دەگۆڕێن تەماشای ڕۆیشتنی مالیکی و جەعفەری بکەن بەر لە بونە سەرۆک وەزیران و لەپاش بوونیان، وەک کەسانی بوغرای هیچ نەدیو هەموو سوڕخواردنیان بەدەوری خودی ئاوساویانە، سەیر لەوەیە ئێستا کورد باسی ئەگەری جەعفەری کردنەوە بە سەرۆک وەزیران دەکەن وەک بلێی نەیان ناسیبێت.

چیرۆکی مالیکی و سونە وکورد وەک چیرۆکی ئەو پەندە بەناوبانگەیە کە دەڵێت (اکلت یوم اکل الثور الابیض (کە دەڵێن شێرێک لە نزیکی سێ گای سور وڕەش وسپی دەژیا کە لەبەرئەوەی یەک دەست بوون لێیان دەترسا هێرشیان بکاتە سەر، ڕۆژێکیان بیرۆکەیەکی دۆزەخی بۆ هات و چووە لای گای سور و ڕەش وپێیانی گوت: بوونی گای سپی لەناومان چاک نییە بۆ ئێمە چونکە ڕەنگی جوانە هەموو ئاژەڵەکان خۆشیان دەوێت وهەروەها لەوانەیە تیرۆریستیش بێت، ڤیدیۆی ئیعترافی هەموو مەیمونەکانیشمان لایە وپاش تڕۆکردنی یان خواردنی نیشانی هەموو خەڵکی جەنگەڵستانەکەی دەدەین، گای سور و ڕەش پاش کەمێک وەستان ڕازیبوون شێرەکە بیخوا هەرنەبێ مونافسێك لە ئالیك خواردن کەم دەبێتەوە وکێ دەزانێ لەوانەشە شێر ڕاست بکات تیرۆریستیش بێت .گای سپی خورا وهێندە هاواری گای سور و ڕەشی کرد کەس وەڵامی نەدایەوە.

هێندەی نەبرد شێر برسیەتی وحەزی کەبابی جوڵا وبۆنەیەکی ئایینی گەورەی شێرانیش لە ڕێگادا بوو پێویستی بە قوربانی کردن بوو، شێر بە جورئەتتر چوە لای گای سور وپێی گووت: دەزانی گای ڕەش دیمەنی دزێو و ترسناکە هەموو ئاژەڵەکانی تر سەبارەت بە ئەو ڕقیان لە ئێمەش دەبێتەوە، هەروەها باپیرە گەورەی دەستی هەیە لە شەهید کردنی (شێرە مەزنەی) باپیرە گەورەمان ڕوحم بە قوربانی بێت کە چەند ڕۆژێکی تر یادی شەهید بوونی دەکەینەوە، چەندین شێر بەپێ لە جەنگەڵەکانەوە دێن بۆ ئەو یادە، ڕات چییە بیخۆم؟! گای سور بە بێ بیر کردنەوە گووتی: بیخۆ وخەلاسمان کە!!!
پاش ماوەیەک چوە لای گای سور وگووتی هەرچەندە پێویستم بە هێنانەوەی ئەسباب نییە بۆ خواردنت، بەڵام تا نەڵێن پیاوێکی دیموکراسی نییە پێویستە تاوانەکانت بۆ بخەمە ڕوو، تۆ تا بڵێی ئینفیساڵی وبەتەمای پارچە پارچە کردنی ئەو جەنگەڵەی کە هەزاران ساڵە هەموومان وەک برا تێیدا دەژین بە یەکەوە! جگە لەوە لە پشتەوە وبەنهێنی ئاوی جەنگەڵەکەمان دەفرۆشیتەوە بە کۆمپانیای نەرویژی وئەمریکی کە ئەوەش کاری سەرۆکی جەنگەڵە کە منم

[خوا بمپارێزێت] گای سور گووتی: پێویست بە خوێندنەوەی ئەسبابی تر ناکات چونکە منیش لە تۆ چاکتر نیم بەڵکو لە تۆش هیچ وپوچترم، بەڵام ئەو ڕۆژە خورام کە گای سپیت خوارد.

٢٠١٢/١/١٩
محەمەد هەریری

## ئێمە ئەمریکیەکانمان خۆش دەوێت، ئەوە کلیپی گۆرانییە یان سیاسەت!!

ئەو سەردێرە ڕێکلامی کلیپێکی نوێ گۆرانی نییە، بەڵکو وتەی ڕێزدار سەرۆک وەزیرانی کوردستانە کە لە هەواڵێکدا هاتوە کەوا وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە وەڵامی نیگەرانییەکانی کورد بەرامبەر سیاسەتە ترسناکەکانی حکومەتی نوری مالیکی دا دەڵێت:
[رۆبەرت وود وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا رایگەیاند پێویستە کوردەکان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دڵنیا بکرێنەوە نەک لەلایەن ئیدارەی ئەمریکاوە. هەر دلنیا کردنەوەیەک کە کوردەکان دەیانەوێت پێویستە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە پێشکەش بە کورد بکرێت نەک لەلایەن ئەمریکاوە ]. هەر لە نێو ئەو هەواڵەدا هاتوە کە بەرێز نێچیرڤان بارزانی وەک گلەیی وگازاندە نەک ڕەخنە، دەربارەی ئەمریکا دەڵێت:" ئێمە ئەمریکیەکانمان خۆش دەوێت بەڵام ئەوان گوێ بە ئێمە نادەن "ئەو قسەیەی بەرێز نێچیرڤان بارزانی دەرهەق ئەمریکا زیاتر لە ڕستەیەکی عاتیفی گۆرانی کلیپەکانی ئەو ڕۆژگارە دەچێت تا سیاسەت وهونەری دیپلوماسی. ئەخر خۆ ئێمە پەیوەندی خۆشەوستیمان لەگەڵ ئەمریکا نەبوە تا بەو شێوازە عاتیفییە بیدوێنین، عەقلیەتی بەرژەوەند خواز وپراگماتیکی ئەمریکا چۆن بەو خیتابە دەدوێنرێت؟! جگە لەوەی ئەو قسەیە دڵی ناحەزانی کوردی زۆر خۆش کرد بە ڕادەیەک لە سایتەکان هەموی مژدەی لەناوچونی کوردیان بە یەک دەدا. دەیانگوت ئەوەتە ئەو خاینانەی ناپاکیان لە عێراق کرد ئاغاکانیان پشتیان لێکردن پاشەوەی وەک سەگ بەکاریان هێنان !!

ئەوە هەڵەی ئێوەیە کە نەتانزانی چۆن لەگەڵ عەقلیەتی کاوبۆی ئەو ئەمریکایە هەڵس وکەوت بکەن. ئەوە ئێوە بوون سەرکردەکانی ئەوانتان گوڵ باران دەکردن لە شانۆکارێکی خراپ لە نواندن وخراپ لە ئیخراجدا، ئەوە ئێوە بوون بە جۆرێک پارێزگاریتان لێدەکردن بە درێژایی ئەو هەمو ساڵە نەتان هێشت لوتی سەربازێکیان بە خوێن بێت وشانازیشی پێوەدەکەن، ئەگەر لە سیاسەت حاڵی بان دەبوایە ئەگەر کەسیش نەبوایە لێیان بدات بۆتان دروست کردبان بەو دەزگا نهێنیانەی کە بە تەنها بۆ لەناوبردنی کورد ئازایە، ورۆژێک نەمان بیست کارێکی چاکی کردبێت لە بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی کورد!! بەڵکو پاش لێدانیان هەرنەبا بەقەد عەرەبی سونە حیسابیان بۆ دەکردن! هێندە ئێمەی کوردتان سوک کرد لەبەردەم ئەو سوک وریسوایانەی دەوروبەر بەو ڕەفتارە پڕ شەرمەزاریانە هەتا وای لێ هات ئێمە بە کرێگرتەی پلە یەکی ئەمریکا بزانن لە ناوچەکە، تا ڕادەیەک بە نهێنی وبە ئاشکرا

پەنجەی هەرەشەمان لێ دەكرۆژن وچەقۆی تۆڵەمان بۆ تیژ دەكەن بۆ قۆناغی دوای ئەمریكا. ئەوە لە كاتێكدا كورد بە نیوەی عەرەب خزمەتی ئەمریكای نەكردوە.!! تۆ بڵێی هێندە بێ باوەر بن بە میللەت تا ئەمریكا بكەنە پەناگای ئاوەل و ئەخیر؟! ئێوە كەمێك بە خۆتاندا بچنەوە وقەسابخانەی گەندەڕی بوەستێنن، ئەو كاتە دەبینن چۆن ئەو خاڵكە دەبنە پشت وپەناتان. خۆزگە زوتر ئەو ڕاستییەی ئەمریكاتان بە خەڵكی دەگوت نەك ئەو هەموو ساڵە وێنەیەكی ئاڵ ووالْیان بدەنێ. ئەگەر خەڵك لەگەڵ ڕازینەبونیشی هێشتا وا بەتەنگتانەوە بێت، ئەی ئەگەر لێتان ڕازیبوون دەبێت چیتان بۆ بكەن؟! ئەو كاتە سێ بەشی ترسەكانتان لە ئەمریكا وماليكی وتوركیا وئێران دەڕەوێتەوە، وئەو ساتە بۆت دەردەكەێ كە لە جیاتی گوتنی:" ئێمە ئەمریكیەكانمان خۆش دەوێت بەڵام ئەوان گوێ بە ئێمە نادەن " چاكترە بڵێی: ":" ئێمە میللەتەكەمان لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت، ئەوان پشت وپەنامان بن گوێ بەكەس نادەین هەتا ئەمریكاش!!

## خۆپیشاندانەکەی هەولێر رزقی دەبەنگان لەسەر شێتانە!

پێنج شەممە، 10 ئایار 2012 00:03

لە نوسینێکدا باسی سروشتی دینداری هەولێرمان کردبوو بە پێویستی دەزانم دووبارەی کەینەوە :" هەمو کوردستان جۆرێک لە دینداریەکی پاک و میانرەوانەی تێدایە، بەلام هەولێر و دینداری دوانەیەکی سیامین لێک جودابونەوەیان ئەستەمە لەبەر ئەو رۆڵە مێژووییەی هەولێر یاریکردوە لە دین پەروەریدا، بێگومان ئەو ئەدگارەشە زیاتر هەولێری جوانتر و میهرەبانتر و رێزدارتر کردوە لە سەرتاسەری کوردستاندا. بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو سروشتە دیندارەی هەولێر کە دەگاتە رادەی ساویلکەیی لەلایەن هەندێ مەلا زۆر بەخراپی ئیستغلال کراوە دێن ودەیانەوێت هەموو بیرورا توند وخورافات وشازەکانی خۆیان بەسەر ئەو شارە بسەپێنن، وەتوانیشیانە برەو بەزۆر بیروورای توند و شاز بدەن و خەلکیش لەبەر متمانەیان بە مەلا و دینداران بێ دڵ لە دڵدان لێیان وەردەگرن، هەر ئەوەش بەداخەوە وایکردوە ئەمرۆ جلەوی سیاسەتکردن و ئۆپۆزسیۆن بوون بکەوێتە دەستی چەند مەلایەک لە هەولێر، کە وانیشانی خەلک دەدەن کە چینی ئینتیلجنسیای هەولێر کەسی تێدا نییە لە مەلا بەولاوە.

گومانی تێدا نییە کە مامۆستایانی هەولێر رۆلێکی خێرخوازی چاکیش دەبینن لە بەرگرتن لە گەندەڵی و پاراستنی بەها بەرزەکانی کۆمەڵی کوردەواری، بەڵام بەداخەوە ئەو مەلایانەشی کە وتاریان هێشتا لە ئاستی گەشەکردنی کۆمەلگاکە نین ژمارەیان کەم نییە".

تێناگەین بۆ لە پێناو وتارێکی سوچێکی گۆڤارێک یا هەرچیەکی تێدا نوسرا بێت، بەو شێوەیە نارێکە رەفتار لەگەڵ ڕوداوەکە بکەین بە تایبەتی کە وتارەکە هەر بۆ ئەو مەبەستە نوسرا بوو تا خەڵک بوروژێنێت وهار وهاجیان بکات، من گومانم نییە کە سیناریۆکە دەستێکی لە پێشە نەک لە پشتە، وپیلانێکی پێشوەخت بوو بۆ دوور خستنەوەی بیری خەڵک لە پێشهاتی زۆر گرنگتر، ئەو پیلانەش ئاشکرایە بۆ هەموو خەڵکێکی ڕۆشنبیر وادیارە تەنها مەلاکانی هەولێر لێی بێ ئاگان!

دەربڕینی نارەزایەتیەکەی ڕۆژانی ئەوەلی زۆر چاکتر بوو کاتێک سەرۆک وەزیران بە ناچاری هاتە سەر هێڵی تەنگژەکە وسەرنوسەری چرپە گیرا وچەندین ئیجرائات وەرگیرا کە پێموایە مرۆڤی عاقڵ دەبێت حیکمەتی بێت وبەوەندە بەس بکات، هەتا بەیاننامەکەی خودی

گۆڤاری چرپە کە زیاتر لە تۆبەنامە دەچوو بەس بوو بۆ کەسانێکی عاقڵ وژیر نەک بەو جۆرە خەڵک وگەنجی دینداری هەولێر وا گێل ودەبەنگ نیشان بدرێت ولە هەمووی سەیرتر کاری توند وتیژی ئەنجام بدەن بە ئاڵای سەوزی [سعودی] وە کە من دەزانم ئەو گەنجانەی هەڵیان گرتبوو لەبەر خاتری دەستەواژەی [لا اله الا الله محمد رسول الله] بوو، تێیاندا بوە هەرنەشی زانیوە ئەوە ئاڵای سعودیەیە، ئەوەش بێسەروبەری وساویلکەیی ڕێکخەری ئەو خۆپیشاندانە دەردەخات. ڕاستە پیرۆزیەکان گەورە وجێگای ڕیز وتەقدیسن بەڵام ئەوەی هەموو ڕۆژێک دەرچێت لەبەر نوسینێک و وتارێک زۆر ماندوو دەبێت، کەسانێک هەن پارەش دەدەن بۆ ئەوەی خەڵکێکی ساویلکەی وەها لە خۆپیشاندان لە دژیان دەرچن، کابرایەکی بێ سەلیقە وبێ هونەر لەسەر یوتیوب هەموو بلیمەتیەکەی ئەوەیە قورئان دەسوتێنێ، توخوا شێتی نییە بۆ دەبەنگێکی وا شۆڕدراوە لە هەموو بەهایەکی بەرز بچم خۆپیشاندانی بۆ سازدەم، دەمێکە گوتویانە: رزقی دەبەنگان لەسەر شێتانە**!!**

بەڕاستی هەولێر دوچاری چەندین مەلای بێ حیکمەت بوە لە شارەکە، ئەخر کێشە نیە تۆ هەرچی بیت وحیکمەتت نەبێت، بەڵام کە مەلا بویت حیکمەتت نەبێت لە شارێکی ئاینپەروەری عاتیفی وەک هەولێریش بیت ئەوە کارەساتە.

# پاڵەوانیەتی جیهانی VIVA تەقلیدێکی بێ ئەرزشی چینیە بۆ FIFA

محەمەد هەریری

لە زۆربەی بۆنە جیهانیەکان سیاسی بێت، کۆمەڵایەتی یان وەرزشی هەموو جارێک ئەو هەستە تاڵەی بێ دەوڵەتیی کورد زیاتر لەلای هەر تاکێکی هۆشیاری کوردا تۆختر وتۆختر دەکاتەوە. ئەو هەستەی کە ڕۆژانە برین دەخاتە بەدەنمان وجەستەمان، و ڕۆژانە دڵ ودەرونمان ژەهراوی دەکات، کاتێک خشتەی دەوڵەتان دەبینیت، کاتێ ئاڵای دەوڵەتان هەڵدەکرێت لە بۆنە جیهانیەکان، کاتێ بەرپرسانی کورد وەک (هەتیوی سەر خوانی هەرچی وپەرچیان) سەردانی وڵاتان دەکەن ولە پشتیان هیچ ئاڵایەک هەڵناکرێت. ئەو هەستە ژەهراویەی دەتخنکێنێت کە سۆماڵیەک یان ئەفغانیەک سەرەڕای بەدبەختیان وهەژاریان ودواکەوتوویان کە خێریان پێ دەشێت، کەچی هەر وەزعی قانونیان وەک وڵات لە تۆ چاکترە، وبۆی هەیە لافی دەوڵەت بوون بەسەر ئێمەی کورد لێ بدەن!

ئەو هەستە ژەهراویەی بینە وقورگم دەگرێت کاتێک کوڕەکەم لە قوتابخانە وەک مناڵەکانی تر شانازی بە کوردستان دەکات ووێنەی ئاڵاو شاخەکانی دەکێشێت، وەک چۆن هاوپۆلەکانی شانازی بە جەزائیر ومیسر وسودان ولوبنان وئەفغانستان وپاکستان وبەنگلادیش دەکەن، ورۆژێک بەنیگەرانیەوە دێتەوە دەڵێت هاوپۆلێکی کە منداڵێکی جەزائیریە باوکی پێی گوتوە: کوردستان نیە، کوردستانی چی؟ دەوڵەتێک نییە بە ناوی کوردستان!! ئەو قسەیە هەر بەدەن ودڵی منی ژەهراوی نەکرد بەڵکو شۆکێک بوو دڵە ناسک وبچوکەکەی مناڵەکەشم لەو تەمەنە ناسکەدا خەمی بێ وڵاتی بخوات. لە هەمووی ناخۆشتر پرسیارەکانی بوو؛ بابە بۆ کوردستان دەوڵەت نییە؟ چەند ساڵە بێ دەوڵەتین؟! بۆ چوار پێنج کوردستان هەیە وهیچیان دەوڵەت نین؟!

ئەگەر ئەو بێ دەوڵەتییە تاوانی ئیمپریالیزم وگەلانی زڕبرا موسڵمانەکانی تورک وفارس وعەرەب وهەڵکەوتەی جوگرافی بێت لە بەشە هەرە گەورەکەی، بەڵام تاوانی ئێمەی کوردیش کەم نییە لەو وەزعەدا. تاوانی لە دەستدانی هەلە مێژوویەکان، تاوانی خنکاندنی خەونەکەمان بە شڕەخۆری وگەندەڵیەکی لە سنوور بەدەر، تاوانی لەوەتی هەین هەر خەریکی خۆخۆرین، تاوانی لەوەتی هەین باسی حوکمی زاتی ولامەرکەزیەت کردن، ولە چاکترین حالەتدا باسی فیدرالی کردن. تاوانی ئێمەشی تێدایە کاتێک ئەو هیوایەی کورد

لەسەر زمانی یەکەم سەرۆکی کورد لە مێژووی عێراقدا وەسف دەکرێت بە خەون وخەیاڵی شاعیران. تاوانی خۆمانی تێدایە کاتێک لە جیاتی ئیستیفتا وڕاپرسی بکەین لەسەر سەربەخۆیی یان مانەوە لەگەڵ عێراق وەک گەلی باشوری سودان لەجیاتی ئەوە هەموو هێز وهزرمان دەخەینە گەڕ بۆ ڕاستکردنەوەی حکومەتە شۆڤێنیەکەی بەغدا ومادەی نەگریسی ١٤٠ دەکەینە مەکۆی ئاواتە بەرزەکان!! یان کاتێ ئەو خاکانەی ساڵەهایە شەڕیان لەسەر دەکەین دەیخەینە مەزادخانەی مادەی ١٤٠.

تاوانمان زۆرە وناکرێت هەمووی باسکەین، بەڵام دوا تاوانمان ئەو فیکرەیە بلیمەتەی یەکیەتی تۆپی پێی کوردستانە کە لەلایەن سەرۆکێکی نیمچە خوێندەوار بەڕێوە دەبرێت وزۆر بە پەرۆشەوە دەچن بەشداری دەکەن لە پاڵەوانیەتی هەرێمەکانی جیهانی VIVA World Cupکە لەلایەن) Non-FIFA-Board دەستەی نا ئەندامانی فیفا) وە ڕێک دەخرێت گوایە بۆ ئەو میللەتانە ڕێکدەخرێت کەبێ دەوڵەتن وکەمایەتین بێ وڵاتن (وەک قەرەجەکان ) یان نەتەوەی زۆر بچوکن .Micronations تیمی کوردستان ئەوە بۆ چوارەم جارە تێیدا بەشداری دەکات ، یەکەمیان لە 2008 کە لە هەرێمی سامیلاندی سوێدی ڕێکخرا، ودوەمیان لە 2009 کە لە هەرێمی پادانیای ئیتاڵی، وسێیەمیشیان لە قوبرس ڕێکخرا.

بەڕاستی شەرمە نەتەوەیەکی چل ملیۆنی وەک بڵێی بێ وڵاتی ئەو قەدەرێکی ئیلاهیە، وبەدوای بڕوبیانوی تر دەگەڕێت بۆ سەلماندنی بچوکی خۆی، وبەپێی خۆی بچێتە ناو خولێکی هەرێم و میللەتە مایکرۆکان یان هەرێمەکانی وەک (پادانیای) ئیتاڵیا و(سیمی لاند) ی سوێد و(بروڤێنس) ی فەرەنسا و (ئۆکتانیا) ی ئیسپانیا کە ئەو هەرێمانە لەچاو کوردستان لە وڵاتانی پێنج ئەستێرە دەژین، نەچەوساوەن ونە لەچاو کورد دڵۆپێک خوێنیان ڕشتوە بۆ سەربەخۆیی، بەڵکو زۆربەیان هەربیریشی لێناکەنەوە، نە ڕۆژێک وەک کوردستان ودۆزە گەورەکەی سەردێری هەواڵەکانی جیهان بوون!

لە هەمووی سەیرتر ئەو کوردستانە گەورەیە تیپی سریانەکانیشی لەگەڵ خۆی دەباتە ئەوێ وهەر تورکمانی کەم بوو، کە ئینشاڵڵا لە بتوڵەی داهاتوو ئەوانیش دەبات! لەگەڵ ڕیزمان بۆ هەر نەتەوەیەک هەرچەندە بچوکیش بێت. سەرەڕای ئەوەش ئەو وێنە وڤیدیۆیانەی کە دیتمان لەو پاڵەوانیەتانە هێندە سارد وسڕ بوون دەتگوت بتوڵەی یان پاڵەوانیەتی فەریقە شەعبیەکانە، یاریگای بێ مودەرەجات ونەبوونی تەماشاکەران، ولە هەمووی خۆشتر وێنەی ئەو مناڵە بوو کە بە خۆیی ودایکی وپاسکیلەکەی وەستا بوو ئاڵایەکی کوردستانیان دابویە دەستی

ودەیشەکاندەوە! نازانم چەندیان پێی دابوو تا ئەو کارە بکات! یان لەوەش خۆشتر لە یاریەکان بانگەشە بۆ کۆرەک تیلیکۆمیش دەکرا وەک بڵێی ملیۆنەها کەس دەیبینێت وەک جامی جیهانی FIFA!! عەبقەریەتی یەکێتی تۆپی پێی کوردستان هەر بەوەش ناوەستێت بەڵکو ئەو ساڵ میوانداری پاڵەوانیەتەکەش دەکات لە هەولێر کە لەکاتی ئەو نوسینەدا دەستی پێکردوە!

ئەگەر لە کاتێکدا تەنها یەک جامی جیهانی FIFA هەیە لە سەرتاسەری جیهان، بەڵام چەندین پاڵەوانیەتی هەرێمی جیهانی هاو شێوەی VIVA تەزویرەکەی خۆمان هەیە، هەندێکیان باس دەکەین بەڵکو ئەو بلیمەتانەی تۆپی پێی کوردستان سودی لێ وەردەگرن وبودجەیەکی چاکیش لەو ڕێگایەوە دەخۆن:

پاڵەوانیەتی جیهانیThe FIFI Wild Cup

کە لە لایەن [فیدراسیۆنی جیهانی سەربەخۆی تۆپی پێ] بەرێوە دەبرێت لە ئەڵمانیا.

پاڵەوانیەتی جیهانیUNPO

ئەوەش پاڵەوانیەتێکە بۆ UNPO واتە ئەو میللەت و ڕێکخراوانەی ئەندام نین لە جامی جیهانی FIFA دا، یەکەم جار لە هۆلەندا لە ساڵی ٢٠٠٥ ڕێکخرا.

پاڵەوانیەتی جامیELF

ئەوەش پاڵەوانیەتیەکی جیهانیە لە قوبرسی تورکی بەڕێوە دەچێت بە ناوی پاڵەوانیەتی جامی جیهانی] ELF یەکسانی وئازادی وبرایەتی] یەکەم جار لە قوبرسی تورکیدا لە ساڵی ٢٠٠٦ ڕێکخرا. ودەیان پاڵەوانیەتی تر.

پاڵەوانیەتی VIVA و پاڵەوانیەتی جامی جیهانی FIFA بەکارە ساختەکانی چینیەکان دەچێت، کە زۆر جار خەڵکی بێ سەواد ونەخوێندەواری پێ فریو دەدەن بۆ نمونە:

لاسایی SONY بە SQNY کردۆتەوە،کێ ئاگای لەو کلکە بچوکەی Q کیو هەیە؟! لاسایی NIKEبە NEKI کردۆتەوە،کێ ئاگای لەو تەڵەکەبازیە هەیە؟!

دەبا لاسایی FIFA بە VIVA بکرێتەوە.

ئەگەر ئەوە پاڵەوانیەتیەکی نێودەوڵەتی وجیهانی بێت حاڵی وا نابێت، لەوبڕوایە دام دەوری عێراقی وکوردستان زۆر گەرم وگوڕترە لەو بەناو جامی جیهانیە، پێویستمان بەوەیە کەمێک کەرامەتی نەتەوەییمان هەبێت، مرۆڤی بەکەرامەت برسیشی بێت ناچێتە ڕیزی سواڵکەران، بەڵکو بیر لە چارەسەرێک دەکاتەوە بەبێ لە دەستدانی کەرامەتی .

FIFAش کەوتۆتە ناو زۆنگاوی سیاسەت چونکە چەندین پێوەری هەیە لە بەخشینی ئەندامیەتی. ڕاستە کورد سەربەخۆیی نییە و فیفاش FIFA گوایە تەنها یانەیەکە بۆ میللەتانی خاوەن دەوڵەت وقەوارەی سیاسی، بەڵام هەندێ ئەگەر بە وردی سەرنج دەینە ئەندامانی FIFAدەبینین کە سەربەخۆیش مەرج نیە بۆ ئەندام بوون لە FIFA بۆ نمونە کۆسۆفا کە نزیکەی ٧٠ دەوڵەتیش دانیان بە سەربەخۆیان هێناوە، کەچی هێشتا هەر ئەندام نیە لە FIFA لەبەر خاتری ڕوسیای دژی ئازادی وسربیا. یان فەلەستین کە تا ئێستاش دەوڵەت نییە کەچی ئەندامە لە فیفاFIFA ، هەروەها دورگەی گوام Guam کە سەربەخۆش نییە وئەندامیش نیە لە نەتەوە یەکگرتوەکان وژمارەی دانیشتوانیشیان ١٧٨٠٠٠ کەسە وسەر بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە کەچی ئەندامیشە لە .FIFA هۆنگ کۆنگ کە ناوچەیەکی کارگێری تایبەتە لە چین، بەڵام هەرچی بێت دورگەیەکی چینییە ولەوانەیە بە فەرمانی کۆلۆنێلێکی چینی بە چەند سەعاتێک بیخەنەوە ژێر حوکمی ڕاستەوخۆی چین کەچی سەیرە نە وڵاتێکی سەربەخۆیە، ئەندامیشە لە .FIFA بە هەمان شێوە ماکاو Macau کە دوەم ناوچەی کارگێری تایبەتە لە چین نە کە نە سەربەخۆیە ونە ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، کەچی ئەندامە لە FIFA ی مەڵتی ستاندارد [فرە پێوەر !]

یان دورگەکانی مارشاڵ Marshall Islands کە کۆمارێکی سەربە خۆی بچوکی ٦٨٠٠٠ کەسیە، ئەندامیشە لە نەتەوە یەکگرتوەکان ، بەڵام ئەندامێتی نیە لە FIFA ، هەروەها دورگەی کۆماری ناورۆ Republic of Nauru کە ٩ نۆ هەزار کەسێکن!

بەڕاستی شورەییە بۆ سیستمی نەتەوە یەکگرتوەکان و FIFA کە مایکرۆوڵات ومایکرۆنەتەوەی وەک دورگەی گوام Guam و دورگەکانی تورکس وکایکۆس Turks and Caicos Islands٢١ هەزار کەس، وکیبیریتی Kiribati ١٣١٠٠٠ هەزار کەس وسان مارینۆ San Marino ٣١٠٠٠ هەزار کەس و دورگەکانی مارشاڵ٦٨٠٠٠ کەس، یان دورگەی کۆماری ناورۆNauru کە ٩ [نۆ] هەزار کەسن. ئەو وردە نەتەتەوە ووڵاتانە نوێنەرایەتیان هەبێت و ئەندام بن لەو دوو ڕێکخراوە، کەچی میللەتێکی گەورەی وەک کورد

٤٠ ملیۆنی ئەگەر زیاتریش نەبێت، بەو قەبارە جوگرافیە گەورەوە وبەو مێژوە پڕ لە کارەساتەوە نوێنەری نەبێت وئەندام نەبێت لە نەتەوە یەکگرتوەکان و لە.FIFA

کەوابوو لە جیاتی بەژداری کردن لەو پاڵەوانیەتە ساختانە کە مرۆڤ توشی بێ ئومێدی دەکات، کاتێ خۆت دەهێنیتە ڕیزی نەتەوە وردیلەکانی چەند هەزار کەسی ئەم وئەو هەر نەبێ وەک فەلەستین کە کورد بەلایەنی کەمەوە پێنج شەش قات لە فەلەستینیەکان زیاترن هەوڵی بوونە ئەندامیەتی بکەن لەFIFA ، لەجیاتی سەرف کردن وئەنفالکردنی چەند سەد دەفتەر دۆلارێک لە میواندارییی پاڵەوانیەتی هەرێمەکانی جیهانیVIVA World Cup ، هەوڵ بدەن سود لە پێشینە یاسایەکانی وەک گوام و هۆنگ کۆنگ و ماکاو وشوێنی تر وەرگرن تا ببنە ئەندام لە فیفا FIFA نەک سەرقاڵ بن بەو گاڵتە جاریەی VIVA World Cupکە گومانم نیە لەوەی ١% خەلکی جیهان نازانن پاڵەوانێتی تۆپی پێی VIVA هەر چیشە، لە کاتێکدا ١٠٠% جیهان دەزانێت پاڵەوانێتی تۆپی پێی FIFA چییە.

لەندەن

٢٠١٢/٦/٧

ناونیشانی بابەتەکان



محەمەد یوسف مەحمود، لە ساڵی 1966لە هەولێر دایكبووە .لە بواری نوسیندا بە "محەمەد هەریری "ناودێر كراوە. كۆلیژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانكوی سەلاحەدین تەواو كردوەو، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.

* لە كۆتایی هەشتاكانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیكری و كۆمەڵایەتی.

* لەساڵی 1995 كۆچی هەندەرانی كردوەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە .سەرنوسەری رۆژنامەیەكی كوردی و گوڤارێكی عەرەبی بووە، بە كوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت.

*بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە كوردی و عەرەبیەكان، وەك نوسەرێكی كوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو كێشانەی لە گۆڕەپانی كوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.

* سەرەكیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە كوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوكراوەی هەیە. توندڕەوی دینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەكانیەوە. بەڕای نووسەر خوێندنەوەیەك و فكرێكی نامۆیە بە سروشتی دینداری كوردی، ڕاستە لە كۆنەوە كەمێك چەمكەكانی لە ڕێگای مەزهەبی شافیعیەوە هاتۆتە ناو كورد، بەڵام وەك ئەو لێشاوە سەلەفیەتە نەبووە كە جێگای مەترسی جیدی بێت لەسەر ڕووحیەتی دینداری كوردی. نووسەر پێی وایە دەبێت كورد ڕزگاری بێت

له‌ هه‌موو فۆرمه‌ ئیسلامه‌ نامۆکانی عه‌ره‌بی و غه‌یری عه‌ره‌بی، خاوه‌ن دیدو خوێندنه‌وه‌و فۆرمی تایبه‌تی خۆی بێت.

* هه‌روه‌ها له‌ بواری ڕه‌خنه‌ی سیاسیش ده‌نووسێت، به‌ تایبه‌تی له‌سه‌ر ئه‌زموونی ده‌سه‌ڵاتی کوردی. نوسه‌ر خه‌بات له‌ پێناو به‌رقه‌رابوونی دیموکراتیه‌ت و مافه‌کانی مرۆڤ له‌ کوردستانی باشووردا ده‌کات، که‌ پێی وایه‌ هه‌نگاوێك له‌ پێش به‌شه‌کانی تری کوردستانه‌ وده‌بێت خه‌باتیشی جیاواز بێت له‌ به‌شه‌کانیتر. له‌ کاتێکدا به‌شه‌کانیتر هێشتا له‌ قۆناغی خه‌باتی ڕزگاریخوازیدان، کوردستانی باشوور تا راده‌یه‌کی زۆر ئه‌و قۆناغه‌ی تێپه‌ڕاندوه‌ .

به‌رهه‌مه‌کانی:

**1- داعش کێیه‌ و مه‌شروعیه‌تی له‌ کام سه‌رچاوه‌ وه‌رده‌گرێت.**

**2- ئه‌دیب و گزیری پۆلیس کێشه‌ی ئه‌ده‌ب وسیاسه‌ت له‌ وڵاته‌ سۆشیالیسته‌کان ... وه‌رگێران.**

**3- خوێندنه‌وه‌یه‌ك له‌ کتێبی ئه‌و (حه‌سه‌ن به‌نا) یه‌ی که‌ که‌س نایناسێت.**

**4-ئافره‌ت له‌ نێوان سه‌ره‌ڕۆیی فێمینیزم و توندڕه‌وی ئاینیدا.**

**hariri66@yahoo.com**

محەمەد یوسف مەحمود، لە ساڵی 1966 لە هەولێر دایکبووە. لە بواری نوسیندا بە "محەمەد هەریری" ناودێر کراوە. کۆلیژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانکوی سەلاحەدین تەواو کردوەو، لە ساڵی 2006 لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.

★ لە کۆتایی هەشتاکانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیکری و کۆمەڵایەتی.

★ لەساڵی 1995 کۆچی هەندەرانی کردوەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. سەرنوسەری رۆژنامەیەکی کوردی و گوڤارێکی عەرەبی بووە، بە کوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت. بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە کوردی و عەرەبیەکان، وەك نوسەرێکی کوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو کێشانەی لە گۆڕەپانی کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.

★ سەرەکیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوکراوەی هەیە. توندڕەوی دینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەکانیەوە

Kurdistan Through Alienation Window

Written by:

Mohammed Hariri